


بەرگی یەکەم بەرگی دووەم

نووسینی
ئەیووب ڕۆستەم

چاپی سێیەم
2011 زایینی 2711 کوردی
لەبڵاوکراوەکانی مەڵبەندی ڕۆشنبیریی هەورامان





n

ناوی کتێب: هەورامان

بابەت: لێکۆڵینەوەی مێژوویی کولتووری

نووسەر: ئەیوب رۆستەم

کۆمپیوتەر: نووسەر

نەخشەسازیی و بەرگ: کۆردۆنیا

چاپخانە: کۆردۆنیا

چاپی سێیەم سلێمانی بەهاری 2011

ژمارەی سپاردن: (72)ی ساڵی 2004 دراوەتێ

ناوەرۆک

**پێشکەشە بە**

**ئەو ئەقڵە داهێنەرانەی ( هەورامان )یان کردووە**
**بە پێشەنگی ژیانی کوردەواری**

**یادی خوالێخۆشبووان باوکم و دایکم**
**هاوسەرەکەم و کوڕ و کچەکانم کە لە کات و پیشووی**
**خۆیان پێمبەخشی، هەتاکو ئەم کتێبە رووناکی ببینێت**

## پێشەکییەك

زستانی ساڵی (2004ز) بەرگی (یەکەم)ی ئەم کتێبە لە دوو توێی (403) لاپەڕە و هاوینی هەمان ساڵیش بەرگی (دووەم) لە دووتوێی (400) لاپەڕەدا لە چاپدران، هەر بەرگەو کۆمەڵێك بابەتی لەخۆ دەگرت، ئەگەرچی هەردوو بەرگەکە تەنها لە چاپخانەی (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) بۆ فرۆشتن دامنابوون، لە گەڵ ئەوەشدا هەموو تیراژەکەییان فرۆشران، زیاتر لە دوو ساڵە گەلێك لە خوێنەران و ئاشنایان بە کولتووری دەوڵەمەندی هەورامان، هەروەها ژمارەیکی زۆر لە خوێندکارانی زانکۆ بە تایبەت لە هەورامییەکان، داوای ئەوەم لێدەکەن بۆ جاری دووەم لە چاپیانبدەمەوە، لە راستیدا من نەمدەویست وەك چۆن پێشتر لە چاپدرابوون، بۆ جاری دووەم بە هەمانشێوە لە چاپبدرێنەوە، هەر بۆیە لە چاپدانەوەیان بۆ ئەم کاتانە دواکەوت، کە دەشڵێم نەمدەویست وەك پێشتر لە چابدرێنەوە، ئەڵبەتە لە بەر ئەم هۆیانەی خوارەوە بوو:

1 ماوەی ساڵێك زیاترە بە بابەتەکاندا دەچمەوە و بە پێی پەیوەنییان بە یەکترەوە، سەر لەنوێ ریزبەندییان رێکدەخەمەوە، بۆ ئەوەی تەواوکەری یەکتربن.

2 ئەو هەڵە چاپییانەی کە لە چاپی یەکەمدا کرابوون، ئەوەندەی بەرچاوم کەوتبن، هەڵەبرێم کردوونەتەوە، دڵنیاشم چەندین هەڵە ماون راستنەکراونەتەوە، ئەمەش لە گەڵ تەمەن و توانای بینینی ئێمەومانان، ئەگەر شتێکی ئاسای نەبێت، زۆریش لۆمەناکرێین..

3 گەلێك پەراوێزی زیادەم لەسەر باسەکان نووسیون و هەرچەندە بۆمکرابێت هەوڵمداوە دەوڵەمەندیابکەم، هاوکات ئەو سەرچاوانەی کە پێشتر لەبەردەستمدا بوون، لە ماوەی چاپی یەکەمەوە تا ئێستا هینی تریش هاتوونەتە پاڵیان و سوودم لێیان وەرگرتووە.

4 بەو پێیەی سەرەڕای بواری نووسین و کاری رۆشنبیری، لە بواری راگەیاندنی رادیۆیی و تەلەفزیۆنیشدا کاردەکەم، ئەوەش سەردان و هاتوچۆ و چاوپێکەوتن و رازونیازی زۆرم بۆ دەهێنێتە پێشەوە و دەرفەتێکی باشی بۆ رەخساندووم بۆ ئەوەی لە دەیان کەسەوە زانیاری وەرگرم، دیارە ئەو زانیارییانەش کەڵکی باشیان بۆ پێداچوونەوەی زانیارییەکانی چاپی یەکەمی ئەم کتێبە بووە. لە بەر ئەم هۆیانەی کە خرانەڕوو، لەچاپدانەوەی کتێبەکەم کەوتە ئێستا، هیوادارم ئەم چاپەشی جێی خۆی بگرێت و سوودێك بە خوێنەرانی بگەێنێت.

ئەیوب رۆستەم
30/ 31/ تشرینی یەکەم/ 2008ز
8/ 9/ گەلاڕێزانی 2708 کوردی

<u>**تێبینی**</u>

**وا بۆ جاری سێیەم ئەم کتێبە لەچاپدەدرێتەوە، سەرقاڵی ماوەی نەدام جارێکی تر بە بابەتەکانیدا بچمەوە و هەندێ زانیاری تری گرنگم لابوون بیخەمەسەری، پشت بە خودای گەورە کاتێك کە بەرگی سێیەمی بۆ چاپکردن ئامادەدەبێت، ئەم کارە دەکەم و پێکەوە هەر سێ بەرگەکە لە چاپدەدەم.**

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا

زۆرجار هەندێك لە برادەران، یان خزم و کەسوکار داوایان لێکردووم، شتێك دەربارەی ژیاننامەی خۆم بنووسم و لە یەکێك لە کتێبەکانمدا بلاّویبکەمەوە، وا لێرەدا ئەو داواکارییەیان بەڕێزەوە جێبەجێدەکەم و ئەوەی لەم بارەیەوە بە پێویستی بزانم بەم شێوەیە دەینووسم:

نــاوم (ئــەیوب کوێخــا ڕۆســتەم کــەریم) و بــە (مامۆســتا ئــەیوب) ناســراوم، بنەماڵەکەمان بە (هەمزەیی) ناویدەرکردووە.

دایکم ناوی (ڤەتحێ حەمەلاو فەتحولاَ) و لە تیرەی (ئاغەلەر)ەکانی تەوێڵەیە.

ڕۆژی (1 / 4 / 1954) لــە گــەڕەکی (مالێــدەر)ی شــارەدێی تەوێڵــە و لــە نــاو خێزانێکی گوزەران مامناوەندیدا لە دایکبووم، لە تەمەنی شەش ساڵییەوە لە قوتابخانـەی سەرەتایی تەوێڵە خراومەتە بەرخوێندن.

ساڵی (1961ز) شۆڕشی ئەیلوول دەستیپێکرد و ئەو دەمە تەمەنم حـەوت سـاڵ و پێنـج مانگ و چەند ڕۆژێك بوو، سوپای ئێـراق زنجیرەیـەك هێرشـی بـۆ سـەر کوردسـتان دەستپێکرد، بـاوکم یـەکێکبوو لـەو پێـشمەرگانەی لـە بـەرەی (دەربەنـدیخان)دا بەشـداری بەرپەرچدانـەوەی هێرشی سوپایان کرد و لە ئەنجامی ئەو هەڵوێـستەیاندا لـە حکوومـەت ڤاچاخبوون، ئەوانەیان خەڵکی تەوێڵەبوون ئەو ماوەیە لە شوێنێك دەژیـان پێیـدەوترێت (تەوەنێ)، ئەو شوێنە باخ و کانیاوێکی زۆر خۆشـە و دەکەوێتـە پـشت گونـدی (بەڵخـە)ی هەورامان.

پاشـان حکومــەت لێبــوردنێکی ســاختەکارانەی بــۆدەرکردن و بــۆ نــاو (تەوێڵــە) گەڕانەوە، بەلاَم بۆ ڕۆژی دوایی هەموویان بە ناوی بانگکردنیانەوە بۆ کۆبوونەوە لە گەڵ کاربەدەستانی میریدا دەستگیرکران و لە (زینـدانی سـلێمانی) پەسـتێنران، زینـدانیکردنی باوکم گورزێکبوو لە بناگوێم سرەوێندرا و بۆ ماوەیەکی زۆر جوانییەکانی دنیای منـداڵی لێشێواندم و لە ناخەوە ئازاریدام.

ڕووداوەکــان وا ڕۆیــشتنە پێــشەوە بــاوکم و هەڤاڵــەکانی بــە لێبــوردنی گــشتی ئازادکران، پاش کەمتر لە ساڵێك تەوێڵەش ئازادکراو کەوتە ژێر دەسەلاَتی شۆڕشەوە، ئیتر ئەویش سەرەتا بۆ ماوەیەکی کـەم وەکـو ئەنـدامی ڕێکخـراوی تەوێڵـەی (پـارتی) و پاشـان وەك لێپرسراوی ئەو ڕێکخراوە کاریدەکرد، لە لایەکەوە کاری سیاسی باوکم و لـە لایـەکی تریـشەوە قەڵەباڵغی خێزانەکـەمان کە لـە (3) کوڕ و (6) کـچ پێکـدەهات وایـانکردبوو ماڵمان هەمیشە جەنجاڵبێت، خـەڵکێکی زۆر بـۆ ڕاپەڕانـدنی هەنـدێك کاروباریـان لـە نـاو

ناوچـەکە و لـە دەرەوەی ناوچەکەشـەوە هاتوچـۆیاندەکردین، مـن لـەو ماڵـەدا هـەر لـە منداڵییەوە جۆرە حەزێکم هەبوو، بەوەی دەبوایـە ڕۆژانـە هـەواڵی بـاوکم بزانیایـە و لـە مەجلیسەکانیدا گـوێم بـۆ قـسەبگرتایە، ئـەوەش وایکردبـوو دەیـان ڕاز و سەرگوزەشـتە و قسەوباس لـە مێـشکمدا کەڵەکەببن و هاوکات جۆرئەتیـشم بـۆ قـسەکردن پەیـداکردبوو، زۆرجـار لاسـایی هەنـدێك لەوانــەم دەکـردەوە دەهاتنــە ماڵمــان، بــە تایبــەت ئەگـەر هەڵـسوکەوتێکی سـەیریان لێدەربکەوتایــە، لەسـەر ئـەو لاسـایی کردنــەوەش جارجـار سەرزەنشت و جارجاریش ئافەریندەکرام، لەو لاسایی کردنەوانەشەوە جۆرە حـەزێك بـۆ هونەری نواندن لە ناخمدا چەکەرەیکرد.

ساڵی خویندنی (1967-1968) خوێندنی سەرەتایم تەواوکرد، لەبەر ئەوەش لـە نـاو (تەوێڵـە)دا خوێندنگەی ناوەنـدی لێنـەبوو، ناچـار بنەوبارگەی خوێنـدنم بـۆ شـاری سـلێمانی پێـچایەوە، پـۆلی یەکـەمی ناوەنـدیم لـە ناوەنـدی (سـیروان) و (پـۆلی دووەم و سێیەم)یشم لە ناوەندی (ئەزمڕ) تەواوکردن، هەر سێ ساڵەکەش لە بەشی نـاوخۆیی (دار الطلبة) بووم.

من بۆ خۆم پاش ئەوەی خویندنی ناوەندیم لە ساڵی خوێندنی (1969-1970) تـەواوکرد، ئـاواتم ئـەوە بـوو بـچمە پەیمانگـەی هونەرەجوانـەکان و ئـەو کاتانـەش ئـەو پەیمانگەیە لە سلێمانی نـەکرابووەوە، بۆیـە هەوڵمـدا لـە پەیمانگـەی هونـەرە جوانـەکانی (بەغداد) وەربگیرێم، بەڵام یەکێك لە خاڵۆکانم خوای گەورە لێیخۆشـبێت بـوو بـەرێگر و بـە وابەسـتەبوونی بـە ئەقڵیـەتی خێڵەکییـەوە نەیهێـشت ئـەو ئاواتـەم بێتـەدی، ئـەوەش گـورزێکی تـر بـوو لـە بنـاگوێی مێردمنـداڵیم سـرەوێندرا و ڕێـڕەوی ژیـانی گـۆڕیم، ئـیتر بەناچاری و خۆنەویستانە سەرمکرد بە (ئامادەیی کشوکاڵی بەکرەجۆ)دا.

هـەر لەسـەرەتای دەسـتپیکردنی خوێندنـەوە لـەو ئامادەییـەدا، هەوڵمـدا ئاواتـە هونەرییەکەم بە جۆرێکی تـر بهێنمـەدی، بۆیـە لەگـەڵ چـەند هاوڕێیەکدا هەسـتاین بـە درووسـتکردنی تیپێکـی نوانـدن و مـن بـە سـەرۆکی ئـەو تیپـە هەڵبـژێردرام، یەکـەم بەرهەمیشمان شانۆگەریەك بوو بە ناوی (کچ بۆ فرۆشتن) لە نووسینی من و دەرهێنانی (سەیفەدین بەرزنجی) بوو، ئەو شانۆیە لە ئاهـەنگی یەکترناسـین و لـە هـۆڵی نـانخواردنی

خوێندکاران لە ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆدا نمایشکرا، پاش ماوەیەکیش لە ئاهەنگێکی گەورە لە هۆڵی ئامادەیی سلێمانی کوڕان نمایشکرا، لەو ئاهەنگەدا هونەرمەندەکانی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی بەشدارایانکرد و ژمارەیەکی زۆر لەکاربەدەستانی ئەوکاتەش لەوانە: (پارێزگار و بەڕێوەبەری پۆلیس و بەڕێوەبەری پەروەردە) ئامادەبوون، بەشی ئێمەش ئافەرین لێکردن و خەڵاتکردنبوو.

هاوینی ساڵی (1971ز) لەگەڵ چەند هاوڕێیەکمدا لە تەوێڵە (تیپی شانۆی تەوێڵە)مان درووستکرد، ئەو تیپە سەرەڕای سادەیی و بێئەزموونی زۆربەی ئەندامەکانی، بەڵام هەوڵێکی دڵسۆزانە و بۆ خزمەتکردنی هونەری شانۆ لە ناوچەکەدا نیەتپاکییەکی گەورەبوو، بەرهەمەکانیشی تا ئازاری ساڵی (1974ز) بریتیبوون لە (4) نمایشی شانۆیی، ئەرکی نووسین و دەرهێنانی هەر چواریشیان لە ئەستۆی مندا بوو.

لێرەدا پێویستە باس لەوەبکەم شانبەشانی حەزی هونەری، زۆریش حەزم بەخوێندنەوە و چوونە (سینەما) دەکرد، ئەو سێ ساڵەی لە (بەکرەجۆ) بووم، بەردەوام رۆژنامەی (ژین) و هەرسێ گۆڤاری (مەوعد، شەبەکە، عەرەبی) ئەو دەمەم دەکڕین و دەمخوێندنەوە، هاوکات کتێبی (مێژوویی، ئەدەبی و دیوانی شاعیرەکان)م دەخوێندنەوە و هیچ فلیمێکی (هیندی و ئەمریکی)شم لەدەست خۆم نەدەدان، تەنانەت ئەگەر لەو رۆژانەدا تاقی کردنەوەشمان بوایە، ئەمانەی باسمکردن تا رادەیەك لەسەر فراوانبوونی مەودای بیرکردنەوەم کاریگەریان هەبوو.

ساڵی خوێندنی (1972ا1973) خوێندنی ئامادەیی کشتوکاڵم تەواوکرد و دەبوایە لە مانگی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا بۆ سەربازی بچوومایە، سەرەتا ملمنەدا، چونکە نەچوون بۆ سەربازی بۆ ئێمە و مانان کە ناوچەکانمان لە ژێر دەسەڵاتی شۆڕشدا بوون ئاسانبوو، دواجار لە ژێرفشاری هەندێك لە خزمانمدا ناچار ملی رێی چوونەسەربازیم گرت، بەڵام تەنها (13) رۆژ لە (دیوانیە) مامەوە و پاشان بۆ تەوێڵە گەڕامەوە.

سالی (1974ز) شانبەشانی ئەوەی لە ناو شۆڕشدا کارمدەکرد، بەردەوام کتێبم دەخوێندنەوە، بوونی کتێبخانەیەکی گەورەش لە تەوێلەدا بە ناوی (کتێبخانەی خەبات) ئەو کارەی بۆ ئێمە زۆر ئاسانکردبوو، چونکە سەدان کتێبی بەنرخ و سەرچاوەی جۆراوجۆری تێدابوون، لە دوا حەفتەی مانگی شوباتی سالی (1975ز)، لە گەڵ ئامۆزازایەکمدا بە ناوی (ناهیدە عارف حەمەشەریف) زەماوەندمانکرد و بوو بە هاوسەری ژیانم، بەرهەمی ئەو هاوسەرێتییەش (دوو کوڕ و دووکچ)ن بە ناوەکانی: (هەردی، هەڵمەت، خەرمانە، شۆخان).

پاش شکستی شۆڕشی ئەیلوول جارێکی تر بەناچاری بۆ (دیوانیە) و لەوێشەوە بۆ (شوعەیبە) بۆ سەربازی بەڕێکرام، لە کاتێکدا نائومێدی ئەو دۆخە و دوورکەتنەوەم لە ماڵ بەردەوام مێشکمیان دەکرۆشت، بڕیاری (تەسریح) کردنمان تا رادەیەك دەروویەکی ئارامیی لێکردمەوە و بۆ تەوێڵە گەڕامەوە.

رۆژی (20 / 5 / 1976ز) لە فەرمانگەی کشوکاڵی سلێمانی کە ئەوکاتە پێیدەوترا (رئاسە المنطقة الزراعیە) بە فەرمانبەر دامەزرام، ماوەی دە مانگێك لە لقی کشتوکاڵی هەڵەبجە دەوامکرد، پاشان بۆ خولێکی هەرەوەزی بۆ ماوەی چوار مانگ لە (پەیمانگەی راهێنان و رێنمایی کشتوکاڵی) لە ئەبوغرێب نێردرام، پاش تەواوکردنی ئەو خولە بە (15) رۆژ بۆ لقی کشتوکاڵی کەلار گوێزرامەوە.

سەرەتای چوونم بۆ کەلار و دەستبەکاربوونم لە سەرکارەکەم بۆ من زۆرناخۆشبوو، چونکە لە لایەکەوە بێجگە لە هەندێك هاوڕێی دائیرە کەسی ترم لەوێ نەدەناسی، لەلایەکی تریشەوە مانگی (تەمووز) بوو چووم بۆ ئەوێ و کەشوهەوا زۆر گەرم و وشکبوو، بۆ کەسێکی وەك من کە پەروەردەی ناو ساباتی فێنکی باخە رەنگینەکانی تەوێڵە و فێری خەوی شەوانی ئەفسووناوی ژێر شۆڵەی مانگەشەوی سەربانەبەرزەکانی بووم، زۆر گرانبوو، بەلاَم هەر پاش چەند رۆژێك منداڵەکانم برد بۆ ئەوێ و تێیدا نیشتەجێبووم، ژمارەیەکی ئێجگار زۆر خەڵکم ناسی و هاتو چۆم لە گەڵ هەندێکیاندا گەرمبوو، بۆمدەرکەوت خەڵکی ئەو ناوە بە شێوەیەکی گشتی، بەلاَم بەبەرچاوگرتنی پەندی کوردی (چەم بێ چەقەڵ نابێت)، خەڵکێکی (پاك، سادە،

رۆحسووك و غەریبدۆستن)، بۆیە تا ئێستاش شانازی بە ناسین و دۆستایەتییانەوە دەكەم.

پاش یەك مانگ لە چوونم بۆ (كەلار)، هەوڵمدا كەسانێك بناسم كە ئاشقی هونەربن، ئەو كاتە تەنها كەسێكم لەوێ ناسی بە ناوی كاك (حەسەنی عەلی بەگ) كە خولیایەكی لەو چەشنەی هەبێت، ماوەیەك پێكەوە هەوڵماندا كارێكی شانۆیی بكەین، بەلاّم لەبەرئەوەی هاوكاری ترمان نەبوو هیچمانپێنەكرا، ساڵی (1984ز) لە گەڵ چەند گەنجێكی ئەوێ تیپێكی شانۆییمان بە ناوی (تیپی شانۆی سیروان) درووستكرد، نۆبەرەی بەرهەمەكانیشمان شانۆگەرییەكی كۆمیدی بوو لە نووسین و دەرهێنانی من بە ناوی (پیسكە).

ئەو ساڵانەی لە (كەلار)دا بووم زۆرم دەخوێندەوە، هەر بۆ نموونە نەوەك سەرژمێر چەندین كتێبی مێژوویی و ئەدەبی بە نرخی وەك: (شەرەفنامە، یاداشت، چیم دی، كورد، مێژووی ئەدەبی كوردی، خولاّصەیەكی تاریخی كورد و كوردستان، كاكەیی، الاكراد، كردٱترك ٱعرب، رحلە المتنكر الی بلاد مابین نهرین وكردستان) و چەند شاكارێكی تری وەك: (حەمەدۆك، كارێتە، گێلەپیاو، ذكریات فی بیت الموتی) و ژمارەیەكی زۆری دەقە شانۆییەكانی نووسەرە جیهانییەكانم خوێندنەوە، هاوكات هەموو ژمارەكانی (هاوكاری، ئاسۆ، رەنگین، الف باو، دستور، صیاد)م دەخوێندنەوە، هەر لەو ساڵانەدا چەند وتارێكی كولتووریشم لە (هاوكار و رەنگین)دا بلاّوكردنەوە.

ساڵی (1988 ز) لە كاتێكدا بەرێوەبەری (وێستگەی باخاتی كەلار) بووم، لەبەر دواكەوتنم (تخلف) بۆ سەربازی لە كارەكەم دەستمكێشایەوە، ئیتر خەریكی كاروباری (كێڵگەی مریشك) و نووسینگەی كشتوكاڵی بوووم، لە رەوە ملیۆنییەكەی ساڵی (1991ز) بە خێزانەوە چووینە دیوی ئێران و كەمتر لە مانگێك لە شاری (بانە) ماینەوە، پاش گەڕانەوەمان بۆ ئەمدیو ئەو هاوینە لە تەوێڵە بووین، پاشان ماوەی ساڵێك لە شاری سلێمانی نیشتەجێبووین، دواتر چووینە هەڵەبجەی تازە و ئێستاش لە شاری سلێمانی دەژین.





پاش راپەرین و لە ژێر سایەی ئازادیدا دۆخێکی لەبار هاتە پێشەوە بۆ ئەوەی بە تەوژمێکی ترەوە لە بواری رۆشنبیریی و هونەردا کاربکەم بە م شێوەیە:

یەکەم بواری نووسین: دەیان وتار و لێکۆڵینەوەی (مێژوویی و کولتووری)م نووسیون و لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستانی ئازاددا بە تایبەتی لە (کوردستانی نوێ، الاتحاد، هەرێم، ئاڵای ئازادی، رێبازی ئازادی، بەدرخان، پەیڤین، رێبەری پێشمەرگە، هەورامان، سوورێن، سۆسیالیست..هتد)دا بلاْوکراونەتەوە، هەروەها سێ (نامێلکە) و شەش (کتێب)م بەم ناوانەی خوارەوە بەچاپگەیاندوون:

1 دەروازەیەك بۆ سۆسیال دیموکراتنامێلکە.

2 عەلمانییەتنامێلکە.

3 عەولەمە شۆڕشی ئەقڵەکانەنامێلکەوەرگێڕان.

4 هەگبە و هەوارگەکتێب.

5 هەورامانبەرگی یەکەمکتێب.

6 هەورامانبەرگی دووەمکتێب.

7 یارسان کتێب.

8 سرووتە دینی و کۆمەلاْیەتییەکانی خەڵکی هەورامان کتێب.

9 هۆزی وەڵی لە رابوردوو و ئێستادا کتێب.

پێداچوونەوەی کتێبی (خێزگەی سەیدی و خەرمانەی ئەدەب) لە نووسینی (رەووف مەحموود پوور).

نووسینی پێشەکی بۆ کتێبی (شەبەنگی زوانی کوردی هۆرامی لە گاسان تا.....) لە نووسینی (عادڵ محەممە پوور).

دووەم بواری رۆشنبیری= دەیان کۆڕ و سیمینارم لە شار و شارۆچکەکانی (سلێمانی، کەرکووك، هەولێر، هەڵەبجەی تازە، هەڵەبجەی شەهید، سەی سایەق، خورماڵ، پێنجوێن، زەڕایەن، عەربەت، تەوێڵە،)دا بۆ سازدراون، کە بابەتی (فیکری، مێژوویی، سیاسی، رۆشنبیری گشتی)م تێیاندا پێشکەشکردووە.

سـێیەم: بەرنامــەی رادیــۆیی و تەلــەفزیۆنی= مــاوەی زیــاتر لــە (10) ســاڵە بەرنامەیـەکی رادیـۆیی بـەناوی (وەشـەن هـەورامان) ئامـادە و پێـشکەشدەکەم و هـەموو چوارشەمەیەك لە دەنگـی گـەلی کوردسـتانەوە پەخـشدەکرێت، هـەروەها ئـەرکی ئامـادە و پێشکەشکردنی بەرنامەی (هەوارگـەی شـیعر) و ئامـادەکردنی بەرنامـەی (لاپەڕەیـەك لـە مێژوو) و بەرنامەی (فەرهەنگی زانیار)م بۆ ماوەی زیاتر لە دوو ساڵ لـە ئەسـتۆدا بـووە، ئەم بەرنامانە لە دەنگـی گـەلی کوردسـتانەوە هەفتانـە پێـشکەشکراون، پێویـستە ئـەوەش بڵێم بەرنامـەی (هەوارگـەی شـیعر) ماوەیـەك لـە گـەڵ بێـژەری جوانەمـەرگ (لـەیلای سەقزی) پێکەوە پێشکەشمانکردووە، بەڕێزان (کاك کەمال هەورامی و چنوور عەزیز)یش یەکەمیان وەك ئامادە و پێشکەشکار و دووەمیان وەك پێـشکەشکار هەریەکـە و بـۆ شـەش مانگێك لە بەرنامەی (وەشەن هەورامان)دا هاوکاریانکردووم.

هـەروەها بەدرێـژایی دووسـاڵ و سـێ مـانگ ئـەرکی ئامـادەکردنی بەرنامەیـەکی تەلەفزیۆنی بە ناو (هەگبە و هەوارگە)م لـە ئەسـتۆدا بـووە، ئـەو بەرنامەیـە لـە شاشـەی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستانەوە پیشاندراوە.

دەیــان بەرنامــەی تەلــەفزیۆنی جــۆرا و جــۆرم دەربــارەی مێــژوو و کولتــووری هــەورامان ئامــادەکردووە و لەهەندێکیــشیاندا وەك پێــشکەشکار بەشــداریمکردووە، ئــەم بەرنامانە لە جەژن و بۆنەکاندا لە شاشەی تەلەفزیۆنی گـەلی کوردسـتانەوە پیـشاندراون، هەندێکیشیان لە کەناڵی ئاسمانی کوردساتەوە پیشانـدراون.

ماوەی حـەوت ساڵیش بـەردەوام هـەر دوو حەفتـەجارێك بەرنامـەی تەلـەفزیۆنی (سۆزی هەورامان)م ئامادە و پێشکەشکردووە، هەروەها چەند بەرنامەیەکیشم بۆ هەردوو کەناڵی تەلەفزیۆنی (میدو رۆژ) کردووە.

ئێستاش بەرنامـەی تەلـەفزیۆنی (ئامیـان) بـە دیـالێکتی هـەورامی بـۆ سـەتەلایتی گەلی کوردستان ئامادە و پێشکەشدەکەم.

بـواری هونـەری بەشـداری چـەند بەرهـەمێکی شـانۆییم وەك: نووسـین دەرهێنـان نواندن) کـردووە، کـە لـە (هەڵەبجـەی شـەهید، هەڵەبجـەی تـازە، سـەی سـایەق، خورمـاڵ، تەوێڵە، بیارە)دا نمایشکراون.

ئێستا ئەندامی کارای رێکخراوی هونەرمەنـدانی کوردسـتان= کـارگێڕی مەڵبەنـدی رۆشنبیریی هەورامان و سەرنووسەری گۆڤاری (هەورامان)م.

ئەگەر تەمەن و تەندرووستی بواربدات پرۆژەی ئایندەم لە بـواری نووسـیندا بـەم شێوەیە:

1 بەرگی سێیەمی کتێبی هەورامان

2 وەرگێڕانی کتێبی پیرۆزی سەرەنجام.

O

## هەورامان وەك ناو
## ناوچە و هەورامی وەك دیالێکت لەسەرچاوە مێژووییەکاندا

ناوچـەی هـەورامان هـەرێمێکی جـوگرافی نموونەییـە و شـێوەی سێگۆشـەیەکی بـەخۆوە گرتووە، هەریەك لەشارەکانی (هەڵەبجە، مەریوان، پاوە) گۆشەیەکی ئەو سێگۆشەیە پێکدەهێنن، ئەگەرچـی سێگۆشـەکە پڕبـەپڕ ناوچـەکە ناگرێتـە خـۆی، چـونکە لـە گۆشـەی هەڵەبجـەوە کورتدەهێنێت و لە دوو گۆشەکەی ترەوە زیاددەهێنێت.

ئەم ناوچەیە بەشێوەیەکی گشتی سەرزەمینێکی شاخاوی و سەختە، بەشێکی بـچووك لـە تێکڕای زنجیرە چـیاکانی زاگـرۆس پێکـدەهێنێت، سـەرجەمی بـەرزی ناوچـەکە لـەڕووی دەریـاوە

لـەنێوان (3000-700م) دایـە، رووبەرەکەشـی نزیکـەی (3500-3000) کیلۆمەتردووجایـە. رووالّەتـە سروشـتییەکانی هـەورامان لەگـەڵ روالّەتـە سروشـتییەکانی ناوچـە دەشـتاییی و پێدەشـتەکانی دەوروبەریـدا، وەك ناوچـە دەشـتاییەکانی (مایدەشـت، روانـسەر، کامیـاران) لـە کوردستانی ئێران و ناوچەی (شارەزوور) لە کوردستانی عێراق جیاوازیان زۆرە[1].

کەشـوهەوای هـەورامان بـە زسـتان سـاردە و بـەفر و بـارانی زۆری لێـدەبارێت، لـە چوارچـێوەی ئـەو ناوچـانەدایە کـە بارانیـان مـسۆگەرە، لـە هەنـدێك سـاڵدا وەرزی سـەرما و سەهۆڵبەندان درێژە دەکێشێت و لە لوتکەی ژمارەیەك لە شاخە بەرزەکانیـشدا بەدرێـژایی سـاڵ بـەفر دەمێنێتـەوە، بـەڵام لـە وەرزی هاوینـدا کەشـوهەوایەکی خۆشـی هەیـە، شـەماڵی فێنـك و کانیاوی سارد و باخی رەنگین چێژێکی ئەفسانەیی بە هەورامییەکان دەبەخشن.

ناوچـەی هـەورامان بەگـشتگیری دەکەوێتـە نـاو سـنووری نێودەوڵـەتی هـەردوو دەوڵـەتی ئێراق و ئێرانەوە و بەهێڵێکی سنووری بـەناوی (هێڵی هـەمایۆنی) کـراوە بـە دووبەشـەوە، ئـەو هێڵـە سـنوورییە سـاڵی(1848ز) کـراوە بەبنـەمای جیاکردنـەوەی سـنوور لـە نێـوان هـەردوو دەوڵـەتی (عوسمـانی و قاجـاری)دا، پاشـان لـە سـاڵی (1905ز) لەلایـەن دەسـتەیەکی تایبـەت بەجیاکردنەوەی سنوور بەیەکجارەکی پەسەندکراوە[2].

دەربارەی هەورامان، هـەم وەك نـاو، هـەم وەك ناوچـە و دیـالێکتی خەڵکەکـەی، لەچـەند سەرچـاوەیەکی مێژوویـدا قـسەوباس خراونەتـەڕوو، لـەم بـوارەدا رۆشـنایی دەخەینـە سـەر ژمارەیەکیان کە لەلایەن (مێژوونووسان، جوگرافیناسـان، ئـەدیب و نووسـەران، خۆرهەڵاتناسـان، گەشـتیار و گەڕیـدەکان، سیاسـەتمەداران، ئەفـسەرە سیاسـیی و سـیخوڕەکانی بیـانی)، هـەروەها مێژوونووس و نووسەرانی کوردەوە نووسراون:

1- لە (فەرهەنگی بورهان قاطع)دا ناوی هـەورامان بـە (ئورامـەن) هـاتووە، باسـیش لـەوە کراوە (ئورامەن) جۆرە گفتوگۆیەکی شیعرییە و شـیعرەکان بـە زمـانی (پەهلـەوی) نووسـراوون،

---

[1] م. فـەیرۆز حەسـەن- سیـستمی ئابووری،سیاسـی و کۆمەڵایـەتی هـەورامان لـەم چـوار سـەدەی دواییـدا،گۆڤاری هەورامان ژمارە (1) زستانی 2003.

[2] (سیسل جۆن ئێدمۆندز)- کرد،ترك،عرب- لاپەڕە (140) .





لە (فەرهەنگی عەمید)یشدا نووسراوە، هەورامان لە (ئەورامەن)ەوە هاتووە کە یەکێکە لە ئاهەنگە موزیکییە کۆنەکانی فارسەکان و شیعرەکانی بەزمانی (پەهلەوی)ن[لح].

2 دکتۆر موحەممەد عەلی سوڵتانی لە کتێبی (ایلات و طوایف کرمانشاهان) بەشی یەکەمدا بە پشتبەستن بە (کوههایی ناشناختە اویستا) دەربارەی هەورامان نووسیویەتی: ناوی (هەورامی) لە (ئاهورایی)یەوە هاتووە، سەرەتا ناوەکە (ئورا) بووە وەك کورتکراوەیەکی ناوی (ئاهورا)، هەورامانیش واتای شوێنی نیشتەجێبوونی ئاهوراییەکان دەگەیەنێ[لخ].

3 عیمادەدین دەوڵەتشایی لە کتێبی (فەروەردینیەشتی ئاوێستا)دا نووسیویەتی: چەند هەزار ساڵێك لەمەوبەر لە کەناری گۆمی (ئورامیە) کە ئێستا بە هەڵە بە گۆمی (ئورومیە) ناودەبرێت، تیرەیەك لە (نەتەوەی مادەکان[لد])ی تێدا ژیاون و پێیانوتراوە (ئەورامی)، ئەمڕۆ پێیاندەوترێ (هەورامی، هەورامانی)[لذ].

4 (ژەنەراڵ ڕۆسۆ) کە لە کۆتایی سەدەی حەڤدەمدا کۆنسوڵی فەرەنسا بووە لە بەغداد، ساڵی (1807ز) سەفەری کوردستانی کردووە، ساڵی (1809ز) لە پاریس کتێبێکی بەناونیشانی: وەسفێکی پاشالیکی بەغدا (scription du pachalik de baghdad)

---

[لح] (د. محەممەد عەلی سوڵتانی). ایلات وطوایف کرمانشاهان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (22) .

[لخ] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (22).

[لد] بەگەڕانەوەیەکی خێرا بۆ ئەو سەرچاوانەی دەربارەی نەتەوەی (ماد) و دەوڵەتەکەیان نووسیویانە،لەوانە: نووسینەکانی (ئاشووری و بابلی)،کتێبی پیرۆزی تەورات،کتێبەکانی مێژوونووسەکانی وەك: (هیرۆدۆت)،(کتزیاس)،ئەوەمان بۆ ئاشکرادەبێت مادەکان ئاری نەژادبوون،تەنها کەسێك لەم بارەوە بۆچوونی جیاوازی هەبووبێت خۆرهەڵاتناسی فەڕەنسی (زیر ئۆپەڕ) بووە کەمادەکانی بە (تووڕانی ئاڵتایی) لەقەڵەمداوە.

هیرۆدۆت نووسیویەتی مادەکان شەش تیرە بوون بەم ناوانە: تیرەی بووز،تیرەی پارتاگن،تیرەی سترۆخان،تیرەی بودی،تیرەی ئاریسانت،تیرەی موغەکان.

ئەم نەتەوەیە ساڵی (700پ.ز) دەوڵەتێکی بەهێزیان دامەزراندووە و دەوڵەتەکەشیان ماوەی (150) ساڵ بەردەوامبووە،ژمارەیەك پادشای بەناوبانگیان هەبووە وەك:

1 کەیقوباد= دیاکۆ= دیوکس

2 فراوەرتیش

3 هواخشترە=فاخشترا=هشتریت= خشتریت= کەیئەکسار

4 ئازیدەباك= ئازیدەیاك= ئەژدەهاك= زوحاك

[لذ] (عیمادەدین دەوڵەتشاهی)، فەروەردین یەشتی ئاوێستا.

بڵاوکردۆتـەوە، نـاوبراو لـەم کتێبـەدا باسـی ڕووداوەکـانی کوردسـتانی کـردووە و نووسـیویەتی: (ئەورامان) عەشرەتێکی کوردە و لەدەورووبەری کرماشان دەژین[يم].

5/ (باسیل نیکیتین)ی کونسوڵی ڕووسیا لـە (ورمـێ) لـە کتێبـی (الاکـراد)دا نووسـیویەتی: ناوچـەی هـەورامان بەشـێکبووە لـە قـەمرەوی ئەردەڵانییـەکان، بـەڵام زۆربـەی کـات لەلایـەن هەورامییەکان خۆیانەوە حوکمڕانیکراوە، سروشتی ناوچەکە و هەڵوێستی خەڵکەکە وایکـردووە ملکەچی هیچ کەس نەبن[سم].

6/ کتێبی (نورالانوار)ی شێخ عەبدولـسەمەدی تـووداری، یـەکێکی تـرە لـەو سەرچـاوانەی نزیکەی چوارسەد ساڵ بەرلـە ئێـستا نووسـراوە و باسـی زۆر لایـەنی شـێوەزمانی هـەورامی تێـدا کـراوە، بەرهـەمی شـیعری چـەند شـاعیرێکی ئـەو سەردەمانەشـی تێـدا خراوەتـەڕوو بەتایبـەت ئەوانەیان کە ئایینناس و دیندارى ناسراو بوون[شم].

7/ لـە کتێبـی (نیگـاهی بـەجـاذبـەهای اکوتوریـستی اورامـان)دا نووسـراوە، شـێوەزمانی هـەورامی یەکێکـە لـە شـێوەزارەکانی زمـانی کـوردی و لێکـچوونێکی زۆریـشی لەگـەڵ زمـانی ئاوێستایدا هەیە، لە هەمان سەرچاوەدا نووسراوە: ناوچـەی هـەورامان شـوێنی چـەندین جـەنگ بووە لەنێوان هێزە ڕکەبەرەکاندا وەك: هێرشەکانی ئەسکەندەر، جەنگەکانی لەشکری ئیسلام و ساسانییەکان[لمحلمج].

8/ لە کتێبی (عموم الممالك) کە لە ساڵی (1894ز)دا لە شاری ئەستەمبوڵ لـە چاپدراوە، ناوی (شهر اورامان) هاتووە، هەروەها لە نەخشەیەکدا بـەناوی (نقـشە مفـصل کـشور ایـران) کـە ساڵی (1816ز) لە هەمان شار لەچاپدراوە، ناوی (شهر اورامان) نووسراوە[لمجلمج].

9/ لــە کتێبــی (شــەرەفنامە)ی شــەرەفخانی بەدلیــسیدا نووســراوە، (مــەئموون بــەگی ئــەردەڵانی) لەســەردەمی حــوکمڕانی خۆیــدا وڵاتەکــەی بەســەر کوڕەکانیــدا دابەشــکردووە،

---

[يم] (د. فەرهادپیربالّ)/ سەرچاوەکانی کوردناسی/ لاپەڕە (51).

[سم] (باسیل نیکتین)/ الاکراد/ لاپەڕە (150).

[شم] (محەممەد ئەمین هەورامانی)/ مێژووی هەورامان/ لاپەڕە (560).

[لمحلمج] (د. بورهانەدین وڵەدبەگی)/ نگاهی به جاذبەهای اکوتوریستی اورامان/ لاپەڕە (5،6).

[لمجلمج] (محەممەد ئەمین هەورامانی)/ مێژووی هەورامان / لاپەڕە (562).





**قەڵـەمڕەوی (هـەورامان)ی داوە بـە (بێگـە بـەگ)ی کـوڕی، ئـەو قەڵـەمڕەوە لـەو کاتـەدا (زەڵـم، نەوسوود، هاوار، گوڵعومەر، شەمێران)ی گرتۆتەوە.**

10 **سیسڵ جـۆن ئێدمۆنـدز لـە کتێبـی (کـورد، تـورك، عـەرەب) و لەباسـی (جـاف و هەورامان)دا چەند جارێك ناوی هەورامانی هێناوە، باسی ئەو گەشتەی کـردووە کردوویـەتی بـۆ هەورامان و زۆر باسی ژێری و سەلیقەی هەورامییەکانی لە بوارەکـانی باخـداری و دامەزرانـدنی سیـستمی ئـاودان و پیـشە دەسـتییەکاندا کـردوە، زۆریـش بـە سروشـتی هـەورامان و شارستانییەتەکەی سەرسامبووە و نووسیویەتی: ئەو شارستانییەتەی لـە هەورامانـدا بینـیم، لـە هیچ جێگایەکی تری خۆرهەڵاتدا نەمـدیبوو، لەڕاسـتیدا هێنـدەی شارسـتانییەتی ڕۆمانـەکان لـە سەردەمی (ساباڤستیان)دا پێشکەوتووبوو.**

11 **(سێر هنری ڕاوڵنسون) کـە بەچاوسـاخی (مەلاعەبدولغـەفووری ڕواری) لـە ناوچـەی هەورامان گەشتیکردووە، چوەتە شارەدێی (نەوسوود) و چـەند دەستنووسێکیـشی لەگـەڵ خۆیـدا بردووە، ناوبراو وشەی (هەورامان)ی بە (ئەڤرومان) نووسیوە و وای لێکداوەتەوە گوایا ئەم ناوە لە وشەی (ڕمان)ی عەرەبییەوە هاتووە، بەڵام (کارڵ هادنـگ)ی ئەڵمانی، کاتێك بە بەرهەمەکـەی (دراسات کردیە، فارسیە، لهجات گوران)ەکەی (ئۆسکارمانی ئەڵمانی)دا (چۆتەوە، ڕەخنەی لەم بۆچوونەی (ڕاوڵنسن) گرتووە.**

12 **لە کتێبی (مذکرات مامون بیگ بن بیگەبیك)دا نووسراوە: شوێنەواری (پاڵنگان) کـە لە (هەورامان)دایە و نزیك (زەڵم)ە، پێشتر یەکێکبووە لەقەڵاکانی میرەکانی کـەڵهوڕ و ئێـستا وێرانـەیە.**

---

(شەرەفخانی بەدلیسی) شەرەفنامە لاپەڕە (199،200) وەرگێڕانی (هەژارموکوریانی).

(سیسڵ جۆن ئێدمۆندن) (کرد،ترك،عرب لاپەڕە (157).

(ئۆسکارمان) دووجار سەردانی ناوچە گۆراننشینەکانی کردووە،یەکەمجار لەساڵانی (1901 1903ز) و دووەمجاریش لەساڵانی (1906 1907ز).

بڕوانە کتێبی (پەیامی هەورامان) لاپەڕە (90) نووسینی (هادی بەهمەنی).

(محەممەد ئەمین هەورامانی) مێژووی هەورامان لاپەڕە (563).

[16] شوێنەواری پاڵنگان لە نزیك (زەڵم)دا نییە،بەڵکو دەکەوێتە ناوچەی (ژاوەڕۆ) و لە پەنای شاخی (شاهۆ)دایە. (ئەیوب)

(مذکرات مامون بیك بن بیگە بیك) پەراوێزی لاپەڕە (79) وەرگێڕانی (مامۆستا مەلاجەمیل بەندی ڕۆژبەیانی و مامۆستا شوکور مستەفا).

13 (ڤلادیمیر مینۆرسکی) دەربارەی دیالێکتی هەورامی نووسیویەتی: (شێوە زمانی گۆران) لە کوردستانی خوارووا دەورێکی گرنگ دەبینێت و زاڵبووە بەسەر زمانی فارسیدا، ئەم شێوەزمانە کەلەپووری تایبەتی خۆی هەیە[سملج]، شێوەزمانی گۆران لە بنەڕەتدا زمانە و چەند شێوەزمانێکی لێبووەتەوە، لەوانە: (هەورامی، زازایی، لوڕ، زەنگەنە).

14 (محەممەد ئەمین زەکی بەگ) لە کتێبی (خولاصەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان)دا ناوی هەورامی بە (هاورامی) هێناوە و ئاماژەی بە هەردو هەورامانی (لهۆن و تەخت)کردووە، لە باسوخواسی دیالێکتی هەورامیشدا نووسیویەتی: هەورامییەکان وەکو گۆرانی دێهاتی زمانی خۆیان پاراستووە و ئیمرۆ بۆتە زمانێکی کاریگەر و شیرین و ئاوازدار، لەهەورامان و پاڵنگان و پاوە و دەوروبەری قسەیپێدەکرێت[شملج]، هەرلەهەمان سەرچاوەدا هاتووە، لە هەندێك دیهاتی ناوچەی دەرسیمدا (زمانی زازا) هەیە کەئەویش شێوەزاری هەورامییە[لمحلج].

15 (مسعەر کوڕی موهەلهەلی خەزرەجی) لەباس و خواسی شاری (نیم از رای= کۆنەشاری شارەزوور)دا، ناوی هەورامانی هێناوە و وتوویەتی: شوێنی کۆنەشاری شارەزوور نزیکە لە دووشاخ، یەکێکیان بەناوی (هەورامان) و ئەوی تریان بەناوی (کەژی زەڵم)[لمجلج].

16 مامۆستا محەممەد ئەمین هەورامانی لە کتێبەکانیدا وەك (زاراوەکانی کوردی لەتای تەرازوودا، کاکەیی، فەرهەنگی ئێریەن ڤاچ، مێژووی ڕێبازی زمانی کوردی، مێژووی هەورامان)، دەربارەی ناوی هەورامان و ناوچەی هەورامان، دیالێکتی هەورامی، ڕەگەزی هەورامییەکان، زانیاری زۆری نووسیون، ناوبراو وتوویەتی: (هەورامان) ناوچەیەکە لەسەروکلاوی ئەشکانییەکاندا ئەم ناوەی بەسەردا بڕاوە، خەڵکەکەی لە نەتەوەی (ماد)ن، زمانەکەشیان هەمان زمانی میدی کۆنە و پاشان ناوی زمانی ئاوێستایی هەڵگرتووە، لەبواری ناوی هەورامانیشدا

---

[سملج] (ڤلادیمێر مینۆرسکی) کورد) وەرگێڕانی بۆ عەرەبی (د.مارف خەزنەدار)،وەرگێڕانی بۆکوردی (حەمەسەعید حەمەکەریم) لاپەڕە (92).

[شملج] (محەممەد ئەمین زەکی بەگ) خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان بەرگی یەکەم لاپەڕە (224) .

[لمحلج] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە(220).

پێویستە لێرەدا بلێین: (زەڵم،پاڵنگان،پاوە)ش سەربە ناوچەی هەورامانن. (ئەیوب)

[لمجلج] بڕوانە کێکۆڵینەوەی (المدن الاثرية المندرسة فى محافظة السليمانية وتعين مواقعها) گۆڤاری کاروان بەشی عەرەبی لاپەڕە (152) لە نووسینی (د. حوسامووددین نەقشبەندی).

چەند بۆچوونێکی خستۆتەڕوو، بەڵام خۆی زیاتر لەگەڵ ئەوەدایە گوایا ناوی هەورامان لە (ئاهورا مەزدامان[لجلج]) وە هاتووە، پاشان ناوەکە کورتکراوەتەوە، (ئاهورا) بووە بە (هورا) و (مەزدامان) بووە بە (مان)، ئیتر بەسەریەکەوە بووە بە هەورامان[لجلج].

17ـ (میرزا شوکرڵای سەنەندەجی) کە بە (فخر الکتاب) ناسراوە، لە کتێبی (تحفەی ناصری در تاریخ وجغرافیای کردستان) و لەباسی (هەورامانی لهۆن، هەورامانی تەخت، هەورامانی شامیان)دا قسەی لەسەر جەنگەکانی نێوان قاجارییەکان و هەورامییەکان کردووە، زۆری بە باڵای لەشکرکێشیی و زیادەڕەوییەکانی قاجاریەکاندا هەڵداوە، ناوبراو لەبەرئەوەی ئەڵقەلەگوێی قاجارییەکان و نووسەری تایبەتی (عەلی ئەکبەرخان)ی حاکمی جوانڕۆ بووە، لە کتێبەکەیدا هەورامیەکانی بە شەڕەنگێز و پیاوخراپ، هەروەها یاخی لە یاسا و دەوڵەت لەقەڵەمداوە[لخلج].

18ـ (هادی بەهمەنی) لە کتێبی (پەیامی هەورامان)دا نووسیویەتی: سەرچاوەیەکی ئەڵمانی پێیوایە، هەورامییەکان پێش کۆچکردنیان بۆ هەورامان لەخۆرهەڵاتی (شاری تاران)ی ئێستا و لەشاخی (دەماوەند)دا ژیاون، بەڵام ساڵی (485) پێش زایین لە دەست ستەمی (داریوش) کە لەنێوان ساڵەکانی (493ـ 424 پ.ز) حوکمڕانیکردووە، یەکەم کۆچییانکردووە[برلج].

19ـ لە کتێبە دەستنووسەکەی (موزەفەرخانی رەزاو)دا، سەبارەت بە هەورامان قسەوباسی زۆر وەك: باسوخواسی ژمارەیەك لە پیرەکانی هەورامان و خستنەڕووی چەند رازێکی ئەفسانەیی لەبارەیانەوە، هەندێك لە کردار و هەڵسوکەوتەکانیان، هەروەها باسی

---

[لجلج] ناوی (ئاهورامەزدا) لە دووبەش پێکهاتووە،(ئاهورا) و (مەزدا)،ئاهورا لە دیینی ئارییەکاندا قووڵاییەکی مێژوویی دێرین و پیرۆزییەکی گەورەی هەیە،چونکە ( خوای خێر= هێزی خێر)یانە و بەمانای سەروەر دێت،(مەزد)یش بەمانای (زانا،ژیر) دێت،هەردوو بەشی ناوەکە بەسەر یەکەوە دەبن بە (سەروەری زانا= سەروەری ژیر) کەبەرامبەر دەستەواژەی (العلی العلیم)ی عەرەبیە،لەباس و خواسی دین لای هەورامییەکان زیاتر لەسەر ئەم باسە دەوەستین.

[لحلج] (محەمەدئەمین هەورامانی)ـ مێژووی هەورامانـ لاپەڕە (609).

[لخلج] (میرزا شوکروڵای سنندەژی ناسراو بە فخر الکتاب)ـ تحفە ناصری درتاریخ وجغرافیای کردستانـ لاپەڕەکانی (200ـ 299).

[برلج] (هادی بەهمەنی)ـ پەیامی هەورامانـ لاپەڕە (113).

تێبینی: بە لەبەرچاوگرتنی زۆربەی بەڵگە مێژووییەکان ئەم بۆچوونە لەراستییەوە دوورە. ( ئەیوب).

سانەکانی هەورامان و رەچەڵەکیان، جەنگ و لەشکرکێشییەکانیان کراون، ئەو فۆتۆکوبییەی لەبەردەستی ئێمەدایە زۆر گەورەیە و (607) لاپەڕەیە[ترلج].

20 محەممەد مەردۆخی کوردستانی، لەبەرگی یەکەم و دووەمی (تەئریخی مەردۆخ)دا باسی هەورامان و هەورامییەکانی کردووە، دەربارەی هەورامان سەرەڕای ئەوەی هەمان قسەکانی شەرەفخانی بەدلیسی دووبارە کردۆتەوە، باسی بنەماڵەی حوکمڕانی سانەکانی هەورامان و جەنگ و لەشکرکێشیەکانیانی کردووە، زۆر بەشان و باڵی دەسەلاّتدارانی دەوڵەتی ئێراندا هەڵیداوە و هەورامییەکانی بە یاخی و بێموبالات لەدەوڵەت لەقەڵەمداوە[يرلج].

21 مامۆستا (عەلائوددینی سەجادی) لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا باسی لەو هۆکارانە کردووە کە بۆ سەردەمانێکی دوورودرێژ، شێوەزمانی هەورامانیان کردۆتە زمانی ئەدەب و رۆشنبیری گەلەکەمان[سملج].

22 کتێبی دەستنووسی (ماریفەتو پیشالیاری= ماریفەتی پیرشالیار)، یەکێکە لەو سەرچاوە بەنرخانەی لە دووتوێیدا گەلێك زانیاری سەبارەت بە هەورامان و هەورامییەکان دەخوێنرێنەوە، ناوەرۆکەکەی بریتیە لە (سروودی دینی، نزا، هەندێك لە پەندی پێشینان)، سروودەکان لەسەر شێوەی دووبەیتی هۆنراونەتەوە[شملج].

23 کتێبە پیرۆزەکانی هەڵگرانی رێوڕەچەی یاریسان، وەك: کتێبی پیرۆزی (سەرەنجام) بەهەر شەش بەشەکەیەوە کە بریتین لە:

---

[ترلج] پێش نووسینی ئەم کتێبە لە رێی بەڕێز (جەمیل هەورامی)یەوە،دەستنووسێکم وەرگرت کە باسی لە مێژووی سانەکانی هەورامان و ژمارەیەك لە پیرەکان دەکرد،بەخەتێکی زۆر رێکوپێك و بەفارسی شکستە نووسرابوو،بەلاّم (37) لاپەڕەی سەرەتای پێوەنەمابوو و نەمتوانی ناوی نووسەرەکەی ساخبکەمەوە،لەگەڵ ئەم دەستنووسەی (موزەفەرخان) بەراوردمکردن هیچ جیاوازییەکیان نەبوو،بەرای من سێ بەشەکەی پێشەوەی ئەو دەستنووسە بەدەستی مەبەست لابراون و چەندین شتی بەنرخیان دەربارەی مێژووی هەورامان تێدایە. شایانی نووسینە پاشان کە سەرقاڵی پاکنووسکردنەوەی چاپی دووەمی ئەم کتێبە بووم بۆمدەرکەوت نووسەری دەستوونەسەکە (قازی مەلا عەبدولاّی شەیدا)یە. (ئەیوب)

[يرلج] (محەممەد مەردۆخی کوردستانی) تاریخ مردوخ بەرگی دووەم لاپەڕە (72).

[سملج] (عەلائوددینی سەجادی) مێژووی ئەدەبی کوردی لاپەڕە (167،166،165).

[شملج] لەبابەتی پیرەکانی هەوراماندا باسی پیرشالیار دەکرێت و چەند دووبەیتییەکیشی دەخرێنەڕوو.






**(بارگه بارگه، دەورەی حەوتەوانە، دەورەی چلتەن، گڵێم و کۆڵ، دەورەی عابـدینی جـاف، ورده سەرەنجام =کورتـەی سـەرەنجام)، هـەروەها کتێبـە پیرۆزەکـانی تریـان وەك: (دەورەی بـالوی ماهی، دەورەی باواسەرەنگ، دەورەی شاخۆشێن، دەورەی باوانـاوس، دەفتـەری شـندروێ، دەورەی باواجەلیل، کەلاّمی پەردیوەری، دەفتەری دیوانە گەورە، کەلاّمی نـەورۆز، کـەلاّمی شـا تـەیمووری بانیارانی) وەیان دەفتەری تر، ئەم سەرچاوانە بە گشتگیری بەشێوەزمانی هـەورامی نووسـراون، بێجگـە لـە (دەورەی عابـدینی جـاف) کـە یەکێکـە لـە شـەش بەشـەکەی سـەرەنجام، هەمووشـیان بریتین لە سروود، پەخشان، وردەکارییە دیینییەکانی هەلگرانی ڕێوڕەچەی یاریسان.**

**24 ئەنـسکلۆپیدیای ئیـسلام، لـەم سەرچـاوەدا بـاس لـەوە کـراوە لـە سـەرەتای سـەدەی بیستەم، لـە هەورامانـدا سـێ قەواڵـە دۆزراونەتـەوە[لمحلح]، قەواڵـەکان دەربـارەی کـڕین و فرۆشـتنی پارچە زەوی و ڕەز و باخ نووسراون.**

---

[لمحلح] دەربارەی ئەو سێ قەواڵەیە لە هەوراماندا دۆزراونەتەوە کەمێك جیاوازی لـە سەرچاوەکاندا هـەن،بۆ نموونـە (دکتـۆر محەممـەد عـەلی سـوڵتانی) لـە لـە بـەرگی یەکـەمی (ایـلات و طوایـف کرمانـشاهان)دا نووسـیویەتی: سـاڵی (1910ز) سـێ قەواڵـە لەلایـەن کەسـێکەوە بـەناو (سـەی حـسێن) کـە یـەکێکبووە لـە موریـدەکانی شـێخ عەلائـەدین نەقشبەندی لە ئەشکەوتێکدا لە (کێوی کۆسالاّن) نزیك شاری هـەورامان دۆزراونەتەوە،قەواڵـەکان پـاش سـێ سـاڵ لـە دۆزینەوەیان وەك هەزاران بەڵگەنامە و شتی تـری دێرین و گرانبـەها لـە ئێران براونەتـە دەرەوە،ئەو قەوالاّنـە بەڵگـەی حاشـاهەڵنەگرن بـۆ شارسـتانێتی پێـشکەوتووی هەورامان،مێـژووی دووانیـان بـۆ سـەردەمی حـوکمڕانی (بەهمـەنی یەکەم) دەگەڕێتەوە،قەواڵەی دووەمیـان سـاڵی (291سلوکی) بەرامبـەر بەسـاڵی (22‌21پ.ز) نووسراوە،سێیەمیشیان ساڵی (300سلوکی ) بەرامبەر بەساڵی (13‌12پ.ز) نووسراوە و مۆریش کراون.

هـەروەها باسـی ئـەوەی کـردووە ئـەو قەوالاّنـە لـە ڕێگـەی (د.محەممـەد سـەعیدخانی کوردسـتانی)یـەوە بـراون بـۆ لەنـدەن و لـەوێ دراونەتـە دەسـت ئێرانناسـی گـەورە و ئـەدیبی ناسـراو (پرۆفیـسۆر ئـەدوارد بـراون)،پاشـان بـە مۆزەخانەی لەندەن فرۆشراون.

لە ئەنسکۆپیدیای ئیسلامدا مێژووی نووسینی قەواڵەکان بە ساڵەکانی (88 و 12پ.ز) دیاریکراوە.

مامۆسـتا (محەممـەد بەهائـەدین مەلاصـاحب) لـە کتێبـی (پیرشـالیاری زەردەشـتی)دا نووسـیویەتی: سـاڵی (1328ك=1910ز) سەی حسێن ناوێك لە هەورامان و لەناو کوپەیەکی پڕلە هەرزندا سێ نووسراو دەدۆزێتەوە،ئەو نووسراوانە کەتونەتە دەست پرۆفیسۆر براون و ئەویش داونیەتیە دەستی پرۆفیسۆر (منسن)،ناوبراو یـەکێکبووە لـە شارەزایانی زمانی یۆنانی کۆن،یەکێك لەو نووسراوانە (88پ.ز) بە زمانی کوردی و بە شێوە زمانی هـەورامی کـۆن نووسـراوە،ئەوەی تێدا ئاشـکرا کـراوە کـە حـوکمڕانی ئـەو سـەردەمەی هـەورامان نـاوی (بەهمـەن) بووە،بـەلاّم دوو نامەکەی تریان بە زمانی یۆنانی کۆن نووسراون.

(د. صدیقی بۆرەکەیی) باسی ئەم قەوالاّنەی کردووە و نووسیویەتی،چەند قەواڵەیەك لەهەوراماندا دۆزراونەتەوە کە لەسـەر پێستی ئاسك نووسراون،کۆنترین شوێنەواری زمـانی پەهلـەوین کە لـە ڕاستەوە بۆ چەپ دەنووسرێت و داگری (24) پیتە.

25 هەندێك دەڵێن ناوی هەورامان لە (ئورامـان)ەوە هـاتووە، (ئـورا) بـەمانای سـەخت و قایم (مان)یش بەمانای (نـشینگە) دێـت و هـەردوو بەشـەکە بەسـەریەکەوە دەبـن بـە نـشینگەی قایم و سەخت، گوایـا لەبەرئـەوەی ناوچـەکە زۆر سـەخت و رژدە، هـیچ داگیرکارێـك بـە ئاسـانی نەیتوانیوە خۆی بۆ بکوتێت، لە فەرهەنگی (برهان قاطع)دا ئەم بۆچوونە خراوەتەروو.

26 رایەکی تر هەیە دەڵێت: ناوی هەورامان لە (ئاورمان= ئازەرمان)ەوە هاتووە بـەمانای (ئاگرگە= ماڵی ئـاگر)، گوایـا لەبـەر ئـەوەی خـەڵکی ناوچـەکە سـەردەمانێکی دووورودرێـژ لەسـەر دینی زەردەشتی بوون و لە هەموو ماڵێکیاندا ئاگر گڕاوە هەمیشە وەك ئاگردانێك بووە.

27 (مامۆسـتا حـاجی مـەلا زاهیـدی ضـیائی) مامۆسـتاو زانـای گـەورەی پـاوەیی دەڵێـت: بردنـەوەی نـاوی هـەورامان بۆسـەر (ئورمـان) هەڵەیـە، چـونکە نـاوی هـەورامان خـۆی لەخۆیـدا نـاوێکی هەورامییـە و لـە زمـانی خـەڵکی ناوچـەکە خۆیانـەوە هـاتووە، مانـای (هـەڵتۆقین) و بەرزبوونەوە دەدات، لەبەر ئەوەش ئەم ناوەی بەسەردابڕاوە، لـە هـەر شـوێنێکەوە بـۆ هـەورامان بڕۆیت، دەبێت بۆی سەربکەویت، چونکە لە هەموو شوێنەکانی دەوروبەری بەرزترە[لجلح].

28 هەندێك بۆچوونی تریش هەن دەڵێن گوایا هەورامان لە (هۆرئامان) بەواتای (هـەور هـات)، یـاخود لـە (وەر ئامـان) بـە واتـای (خـۆر هـات= خۆرهـەڵهات)ەوە هـاتووە، بـەڵام ئـەم بۆچوونانە زۆر لاوازن چونکە خۆ تەنها هەورامان نییە کە خۆری لێهەڵبێت و هەور بیگرێتەوە، بەڵکو ئەم دیاردە سروشتییانە لەهەموو سووچێکی جیهاندا هەن.

ناوچەی هەورامان پێشینەیەکی مێژوویی زۆردێرینی هەیە، لەم بارەوە (مامۆستا رەشید یاسـەمی) نووسـیویەتی: گۆتییـەکان لـە بـاکوور و خۆرهـەلاَتی شـارەزووردا بـەمانای هـەورامانی ئێستادا ژیاون و هەوڵیانداوە دەسەڵتیان بەسـەر ناوچەدەشـتاییەکانی نزیـك خۆیانـدا بـسەپێنن، لەم بوارەدا هێرشیانکردۆتە سەر (لۆلۆکان) و هەتاکو شارەزوور پێشڕەوییانکردووە[لحلح]، هـەر لـەم بوارەدا (د. محەممەد عەلی سوڵتانی) نووسیویەتی: یەکێك لە حوکمڕانەکانی گۆتییەکان بـەناوی

(محەممەد ئەمین هەورامانی) لە کتێبی (مێژووی هەورامان)دا زۆر بە دووورودرێژی باسی قەواڵەکان و مێژووی نووسینیان و هەموو ووردەکاریەکانی ناویانی کردووە و فۆتۆکۆپی قەواڵەکانیشی بلاَوکردۆتەوە.

[لمجلح] (د. محەممەد عەلی سوڵتانی). ایلات وطوایف کرمانشاهان) لاپەڕە (22).

[لحلح] (رەشید یاسمی) کرد و پیوستگی نژادی وتاریخی او لاپەڕە (28،27).





(ئەنئویاتینی) کە پێش سەردەمی (سەرگۆنی ئەکەدی) لەناوچووە، هاتووەتە هەورامان و (هاڵمان)ی گرتووە، بەبڕوای مێژوونووسەکان ئەم ناوە هەمان (ئاڵمانە)یە کەپاشان حوکمڕانەکانی(ڕەزاو) تێیدا ژیاون، لەهەمان سەرچاوەدا باسی ئەوەکراوە (تەگەلات پلاسەری ئاشووری) لە لەشکرکێشییەکانیدا بۆسەر نەتەوە زاگرۆسییەکان سەرکەوتنێکی وەهای بەدەست نەهێناوە، دوای ئەویش (ئەداد نیراری) و کوڕەکەی بە ناوی (ئاشوور ناسر پاڵ)، دەستیان تەنها بەهەندێك لەناوچە شاخاوییەکانی هەورامان گەیشتووە و هەموو هەورامانیان بۆ داگیرنەکراوە[لحلح].

(عەبدولقادری بابایی) لەکتێبی (سیر الاکراد)دا نووسیویەتی: لەگەرمەی پەلامار و لەشکرکێشییەکانی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) لەنێوان ساڵەکانی (330ـ327 پ.ز) هەورامان ئاوەدانبووە، (ئەسکەندەر) توانیویەتی ژمارەیەك لەشاکانی (کیانی) لەهەورامانـدا زینـدانیبکات، هەروەها باسی ئەوەیکردووە زمانی خەڵکی ناوچەکە جۆرێکە لەزمانی کوردی.

لەسەدەی دووەمی پێش زایینـدا هەورامان کەوتۆتە ژێردەسەڵاتی حکومەتی(ئەرمەنستان ئارتاکسیس).

مامۆستا (محەممەد ئەمین هەورامانی) لە کتێبی (مێژووی هەورامان)دا نووسیویەتی: هەر لە سەردەمی گۆتی ولۆلۆکانەوە هەتا سەدەی یانزەمینی زایینی پەیوەندی بەردەوام لەنێوان هەردووناوچەی (هەورامان و لوڕستان)دا هەبووە، ئەو پەیوەندییەش لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی گرتۆتەوە، هەندێك پێیانوایە ڕەگی ئەو پەیوەندییە یۆئەوە دەگەڕێتەوە گوایا (ئەفراسیاب) باپیرەگەورەی هەرە دێرینی حوکمڕانەکانی (هەورامان، لوڕ، بەختیاری) بووە، هەر لەم بوارەدا دەڵێن شتێکی نەگونجاو نییە ئەگەر ریشەی شێوەزاری هەورامی، باجەلان، کەلوڕ، لوڕ، زەنگنە، بەختیاری بەریشەیەکی گۆتی بزانین.

هەر لەم بوارەدا پیویستە باس لەوە بکەین تا ئەم ڕۆژانەش تێگەیشتنێکی هەڵە دەربارەی هەورامی و هەورامان هەیە، بەوەی هەندێك نووسەر هەورامییان بە عەشیرەت و هەورامانیان بە شوێنی ژیانی ئەو عەشیرەتە لەقەڵەمداوە، بۆ ئەوەی بەشدارییەکی بچووك لەڕەواندنەوەی ئەو بەرچاو لێڵییە و ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەیەدا بکەین، دەڵێین: هەورامی عەشیرەت نییە، بەڵکو دیالێکتێکی ڕەسەنی کوردەوارییە و ڕەگەکانی بۆ زمانی (ئاوێستایی) کە

---

[لحلح] (د. محەممەد عەلی سوڵتانی)ـ ایلات وطوایف کرمانشاهان)ـ بەرگی یەکەمـ لاپەڕە (24،25).

زمانی زەردەشت بووە، هەروەها بۆ زمانی (پەهلەوی ئەشکانی) دەگەڕێنەوە، ئاشکرایە زمانی (پەهلەوی ئەشکانی) یەکێکە لە زمانە کۆنەکان و لەسەردەمی حوکمڕانی ئەشکانییەکاندا زمانی رەسمی دەوڵەت بووە.

دیالێکتی هەورامی هەتاکو دەرکەوتنی سێکوچکەی شاعیرانی بابان (نالی، سالم، کوردی) زمانی سەرەکی ئەدەب و رۆشنبیری گەلەکەمان بووە، زۆربەی عاریف و کەڵە شاعیرانی کورد هەرچەندە خۆیان هەورامی نەبوون، بەڵام بەم شێوە زمانە شیعریان هۆنیوەتەوە، هەر بۆنموونە نەك سەرژمێر ناوی چەند کەسێك لە و زاتانە دەهێنین:( بالوولی ماهی، باوا لوڕەی لوڕستانی، باوا حاتەمی لوڕستانی، دایە خەزانی تەورێزی، شاخۆشێنی لوڕستانی، دایراك خاتوون، سان سەهاکی بەرزنجی، مەولەوی تاوەگۆزی، خانای قوبادی، مەلا عیسای جوانڕۆیی، خەسرەوخانی ناکام، غولامشاخانی ئەردەڵانی، فەقێ قادری هەمەوەند، ئینجەی گەلاڵی، دەروێش نەورۆزی سۆرانی، مەلای جەباری)، دەیان و دەیانی تریش.

کەسێك کە دەڵێت من (هەورامی)م، مەبەستی ئەوە نییە لە عەشیرەتی هەورامییە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە بەشێوەزمانی هەورامی قسە دەکات، ئەگینا وەك واقعی عەشایری لەگەڵ رێزمان بۆ هەندێك بەهای جوانی وەك: (نانبدەیی، بەجێهێنانی سیلەی رەحم، هاوکاریکردنی یەکتری..هتد)، هەورامییەکان سەردەمانێکی زۆرە ئەو واقعەیان بەجێهێشتووە و بە شێوازێك لە ژیانی مەدەنی ئاشنا بوون، لەبابەتەکانی دواتری ئەم کتێبەدا زیاتر تیشکدەخەینەسەر ئەم باسە.

سەبارەت بەوەش کە کەسێك دەڵێت من (هەورامانی)م، مەبەستی جۆرێك لە زیندوکردنەوەی گیانی ناوچەگەری نییە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە لەو ناوچەیەدا نیشتەجێیە دانیشتوانەکەی بە هەورامی قسەدەکەن، چونکە شتێکی ئاشکرایە هەورامان دێیەك، یان شوێنێکی بچووکی دابڕاو نییە خەڵکەکەی لەسەر گیانی ناوچەگەرێتی پەروەردەکرابن، بەڵکو هەورامان لە هەردوو دیوی عێراق و ئێراندا نزیکەی (350) شارۆچکە، شارەدێ، دێ، دەگرێتە خۆی.

# 0

# رەچەڵەکی هەورامییەکان

**لەچەند سەرچاوەیەکی مێژووییدا باس لە رەچەڵەکی هەورامییەکان و حوکمڕانـەکانیان کـراوە و لـەم بـارەوە زانیـاری جۆراوجـۆر خراونەتـەڕوو، هەنـدێك لـە سەرچـاوەکان رەچـەڵەکی هەورامییــەکان و بنەماڵــەی حوکمڕانــەکانی هــەورامانیان بــە یــەك رەچــەڵەك لەقەڵەمــداوە، سەرچاوەی تریش هەن جیاوازییـان لەنێوانیانـدا کـردووە، لێـرەدا دەمەتەقێیـەکی هەنـدێك لـەو سەرچاوانە دەخەینەڕوو:**

**1 محەممــەد ئــەمین هــەورامانی بەپــشتبەستن بــە کتێبــە دەستنووســی (نــژاد طائفــة اورامان) لە کتێبی (مێژووی هەورامان)دا نووسیویەتی: باواگەورەی بەگزادەکانی هەورامان ناوی (بەهمەن کوڕی دارا کوڕی بەهمەن کوڕی ئەسفەندیار کوڕی گوشتاسـپ کوڕی لەهراسـپ کـوڕی سـیاوەش[لخلح] کـوڕی کـەیکاوس کـوڕی مــەرمهاد کـوڕەزای مەنووچـەر کـوڕی سـیامەك کـوڕی کەیومەرث)ە[برلح].**

---

**[لخلح] سیاوەش کوڕی کەیکاوس گەنجێکی جوان و ئازا و زۆر خۆشەیستی خەڵك بووە،(سودابە کچی ئەفراسیاوی شـای تـوران) کەهاوسـەری کـەیکاوس بووە،حـەزی لێکـردووە و زۆر هەوڵیـداوە لەخـشتەی بەرێت،بـەڵام بێسوود بووە،لەئەنجامدا لای کەیکاوس بەدزمانی لێکردووە و قسەی بۆ هەڵبەستووە ،ئەویش فـەرمان کوشتنی داوە،کاتێك هـەواڵی کوشـتنتی بـە (رۆسـتەم) سـەرکردەی سوپای کـەیکاوس گەیشتووە،یەکسەر چووەتە سـەر کۆشـکی پاشـا و (سـودابە)ی وەك کـارە کۆرپــە سەربڕیوە،لەشکرێکیـشی ڕێکخـستووە و پــەلاماری وڵاتــی تــورانی داوە وخــاپووری کــردووە،رووداوی کوشــتنی (ســیاوەش) بــەجۆرێك لــەبیر وهــزری خــەڵکی کوردســتاندا چەســپیوە،تا ئێــستاش**

2 هـادی بەهمـەنی لـە کتێبـی (پـەیامی هـەورامان)دا نووسـیویەتی: هەورامییـەکان بەرەچـەڵەك خۆیـان دەبەنـەوە سـەر (بەهمـەنی یەکـەم کـوڕی ئەسـفەندیار کـوڕی گوشتائەسـپ کوڕی ویشتا ئەسپ) کە یۆنانیەکان بە (ئارتا کزرس) و (ئارتا کزرسز) ناویانهێناوە[ترلح].

3 سیـسڵ جـۆن ئێدمۆنـدز لـەکتێبی (کـرد تـرك عـرب)دا نووسـیویەتی: بـەگزادەکانی هـەورامان بـە پێـچەوانەی زۆربـەی بنەماڵـە و تـیرە و هۆزەکـانی کوردسـتان هەوڵیانـنـەداوە رەچەڵەکی خۆیان بە پێغەمبەری ئیـسلامەوە (د.خ) ببەسـتنەوە، بـەڵکو خۆیـان دەبەنـەوە سـەر (ئەسفەندیار) و پاش ئەویش زنجیرەی بنەماڵەکە بەچەند نـاوێکی دیـاردا هاتۆتـە خـوارەوە، بـۆ نموونە یەکێك لەوانە (کیومەرث)ی باپیرە گەورەی بنەماڵەی (پێشدادی)یەکانە[یرلح].

4 عەبدولقادری بابایی لە کتێبی (سیر الاکراد)دا نووسیویەتی: بنەماڵەی حوکمڕانەکانی هەورامان خۆیان دەبەنەوە سەر بەهمەنی کوڕی ئەسـفەندیار، ئـەم بنەماڵەیـە لـەپاشماوەی ئـەو شازادە (کیانی)یانەن (ئەسکەندەری کـوڕی فەیلـەقووز = ئەسـکەندەری مەکـدۆنی) لـە سـاڵەکانی نێوان (330 327پ ز) لەو کێوە سەختانەدا زیندانیکردن کە پاشان بە زیندانی ئەسـکەندەر ناونـرا، بـەڵام لەگـەڵ تێپـەڕبوونی رۆژگـار و لـە ئـەنجامی زاوزێکـردن و زۆربـوونی ژمارەیانـەوە، توانیان دەست بەسەر هەموو ئەو ناوچە شاخاویانەدا بگرن و ببنە خاوەنیان[سملح].

5 د. محەممەد عەلی سوڵتانی لـە کتێبـی (ایـلات و طوائـف کرماشـاهان) بەشـی یەکەمـدا نووسـیویەتی: بەهمـەن نـاوی بنایتنـەری بنەماڵـەی حوکمڕانـەکانی هەورامانـە، نـاوبراو کـوڕی (بـەهلوو) ناوێکـە و پـاش کۆچـی دوایـی بـاوکی ماوەیـەك لـە کێوەکـانی هەورامانـدا خـەریکی شوانکارەیی و ئاژەڵ لەوەڕاندن بووە[شملح].

---

هەرکێشەیەك گەورە بکرێت وچارەسەری گران بێت،دەڵێن بووە بە خوێنەکەی سیاوەش وئەمەش بووە  بە یەکێك لە پەندەکانی ناو کولتووری کوردی.

[برلح] (محەممەدئەمین هەورامانی) مێژووی هەورامان) لاپەڕە (572).

[ترلح] (هادی بەهمەنی) – پەیامی هەورامان – لاپەڕە 112 چاپی یەکەم – چاپخانەی ژین  هەولێر2001ز.

[یرلح] سیسڵ جۆن ئێدمۆندز (کرد ترك عرب) لاپەڕە 141 ترجمە جرجیس فتح الله – مطبعة تایمس بغداد1971.

[سملح] (عەبدولقادری بابایی)  تاریخ و جغرافیای کردستان = سیر الاکرا لاپەڕە (46).

[شملح] بڕوانـە کتێبـی (ایـلات و طوایـف کرمانـشاهان) بـەرگی یەکـەم لاپـەڕە 29 – نووسـینی (د.محەممـەد عـەلی سوڵتانی) لەم نوسینەدا (نووسەر) پشتی بەستووە بە خاوەنی کتێبی (تاریخ اورامان) (مەلا عەبدوڵای کوڕی مەلا عەبدولعەزیزی قازی) کە بە (شەیدا) ناسراو بووە.





5ـ باسـيل نيكيـتين لـە كتێبـی (الاكـراد)دا نووسـيويەتی: هەوراميیـەكان بـە ڕەچـەڵەك دەچنەوە سەر نەتەوەی فارس[لمحلخ]، يەكێك لە ئەفسانەكانيان باس لەوە دەكات گوايا بـاپيرە هـەرە دێرينـی هەوراميـەكان بـەناوی (ئـەورام) لەگـەڵ برايەكيـدا (قەنـدول = كەنـدول)، بـە فـەرمانی داريوشی مەليكی فارس لەشوێنی خۆيان دەركراون و ڕوويانكردۆتە ئەو ناوچـە شـاخاوييەی كـە ئەمڕۆ پێيدەوترێ هەورامان و لەوێ بنەماڵەيەكيان دامەزراندووە[لمجلخ].

شتێكی ئاشكرايە مێژووی ژيانی حوكمڕانـەكانی هـەر وڵاتێـك، گـەلێك، نەتەوەيـەك، يـان ناوچەيەك.. بەشێك لەمێژووی ئەو وڵات و گـەل و نەتـەوە و ناوچـەيە پێكـدەهێنێ، چـونكە لـە دووتوێيدا باسوخواسی جۆراوجۆر دەربارەی ئەو حوكمڕانانە خراونەتە ڕوو، بەتايبەت لەچـەند ڕوويەكەوە وەك:

1ـ باسی جەنگ و ململانێ و لەشكركێشيەكانيان.

2ـ باسی پەيماننامە و ئاشتيكردن و بەڵێننامەكانيان.

---

[لمحلخ] ـ لە بواری ڕەچەڵەكی هەوراميەكان و بنـچينەی شـێوەزمانی هـەورامی گـەلێك لـە (خۆرهەڵاتناسان،گەشتيارو گەڕيدەكان،مێژوونووسان ...هتد) بەهەڵەدا چوون،ديارە يەكێك لەوانەش (باستيل نيكيتين) بووە،ناوبراو ڕەچەڵەكی هەوراميـەكانی بردۆتـەوە سـەر فارس،بێئاگـا لـەوەی كـە لـە ديـاريكردنی سنوورەكانی مەملەكەتی (زامـوا)و نەتـەوەی (لۆلـۆ)دا نـاوی (نارمـان) و (هاڵمـان) هـاتوون،(نارمـان) بـەو هەرێمـە وتـراوە كـە ئێـستا هـەورامانی پێيدەوترێ،(هاڵمان)يش گوندێكە لەناوچەی (هەورامانی ڕەزاو) پێيدەوترێ (ئاڵمان=ئاڵمانە).

هەروەها لەزۆر سەرچاوەدا باس لەوەكراوە (گۆتييەكان) لە هەوراماندا ژياون،بۆنموونە كتێبی (كرد و پيوستگی نـژادی و تـأريخی او)ی (ڕەشـيد يـاسمی)،لێرەدا دەمانـەوێ بڵـێين: گۆتييـەكان و لۆلۆكـان لـە نەتـەوە زاگرۆسـييەكان بوون،لـە هـەزارەی سـێيەم و دووەمـی پـێش زايينيـدا ژيـاون و حوكمڕانيانكردووە،لـەو كاتانـەدا هـيچ قسەوباسێك دەربارەی فارس نەبووە و نييە.

هـەر لـە بـواری ئـەو هەڵانـەدا دەربـارەی نـاوی هـەورامان و ڕەچـەڵەكی هەوراميـەكان و شـێوەزمانەكەيان كـراون مامۆستای مێژوونووس (ئەمين زەكی بـەگ) لـە كتێبـی (خولاسـەيەكی تـەئريخی كـورد و كوردسـتان)دا نووسـيويەتی: (لەهجەيەكی غەيری كوردی لە هەردوو هەوراماندا هەيە و قسەی پێدەكرێ،لای خەڵك بە (ماچۆ) مەشهوورە لە بـەعزێ دێهاتی پاوەشدا هەر بەم زمانە قسەدەكرێ).

(ڤلاديمير مينورسكی)يش دەربارەی ديالێكتی هـەورامی كەوتۆتە هەڵـەوە،كاتێك ئەم ديالێكتـەی بردۆتـەوە سـەر زمـانی (پـارتی كـۆن)،هـەر لـەم بـوارەدا لـەكتێبی (ديـالێكتی ئـەڤرومانی لهـۆن) كـە لەلايـەن (مەكـەنزیو تەحـسينی حەمەمينسان)ەوە بڵاوكراوەتەوە،لە پێشەكيەكەيدا شتێكی سەيروسەمەرەيان نووسيوە، گوايا شێوەزمانی هـەورامی لهۆن كوردی نييە بەبێ ئەوەی هيچ بەڵگەيەكيان بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونانەيان خستبێتەڕوو.

(ئەيوب)

[لمجلخ] ـ باسيل نيكيتيل (الاكراد)ـ لاپەرە (150) ـ دار الروائع بيروت.

3- پرۆژە و کارە خزمەتگوزارەکانیان.

4- وێرانکاری و کاولکارییەکانیان.

5- قەناعەتی دینی و مەزهەبییان و کارکردنیان لەو پێناوەدا.

6- پەیوەنـدیان لەگـەڵ هاووڵاتیانیـان هـەروەها لەگـەڵ حوکمڕانـەکانی دەوروبەریانـدا و چەندین بابەتی تر.

ئەگەر لەم روانگەوە لە ژیـانی حوکمڕانـەکانی هـەورامان وردببینـەوە دەبیـنین بەشـێکی زیندوو لە مێژووی هەورامان پێکدەهێنن، دەربـارەی ئـەم حوکمڕانانـە لـە چـەندین سەرچـاوەی مێژوویدا زانیاری خراونەتەڕوو، بەڵام زۆربەی زانیارییەکان لەسەر ئـەوە یەکدەنگن کـە بـاپیرە گەورەیان کەسـێکبووە بـەناوی (بەهمـەن[لخلخ])، هەنـدێك بـە (بەهمـەن بـە کـوڕی ئەسـفەندیار) و هەنـدێکی تـریش بـە کـوڕی (بـەهلوو)یـان لەقەڵەمـداوە، لەکاتێکـدا بـاس لـەوە کـراوە گوایـا لـە سـەدەی دووەمـی پـێش زایـین لەسـەردەمی حـوکمڕانی حکومـەتی (ئەرمەنـستان ئارتاکـسیس)دا حوکمڕانی هەورامان (بەهمـەنی سـێیەم) بـووە کـە بـە هەژدەپـشت دەچـێتەوە سـەر (بەهمـەنی یەکـەم)، کەچـی مامۆسـتا (مـەلا عەبـدوڵای قـازی) سـەرەتای حـوکمڕانی ئـەم بنەماڵەیـەی گەڕاندۆتـەوە بـۆ سـەدەی پێنجـەمی کۆچـی و رووالّـەتێکی عیرفـانی و سـۆفیگەریانەی بـە

[لخلخ] - دەربارەی بەهمەن هەندێك جیاوازی لەسەرچاوە مێژووییەکاندا هەن لە کتێبی (پەیامی هەورامان)دا باسی سێ بەهمەن کراوە و مێژووی ژیانیان بەم شێوەیە خراوەتە روو:

ا- بەهمەنی یەکەم (602-533پ.ن).

ب- بەهمەنی دووەم (464-242پ.ن).

ج- بەهمەنی سێیەم (971-1056ن).

د. محەمەد عەلی سوڵتانی لەکتێبی (ایلات و طوائف کرماشاهان) ئاماژەی بەوە کردووە گوایا بەهمەنی سێیەم لە سەدەی دووەمی پێش زاییندا حوکمڕانی هەورامانی کردووە.

زۆربەی سەرچاوەکانی تریش باسیان لەوە کردووە بەهمەنی سێیەم بە هەژدە پشت دەچێتەوە سەر بەهمەنی یەکەم، بەڵام ئەگەر ماوەی نێوان ژیانیان بەراورد بکەین دەبینین نزیکەی (1504)ساڵە،شتێکی ئاشکرایە ئەم ماوەیە بۆ تەمەنی حوکمڕانی هەژدەپشت زۆر زۆرە و پێدەچێ بە نزیکەی (50) پشت بچنەوە سەریەك،لە کتێبی پەیامی هەوراماندا پشتەکان بە (47) پشت خەمڵێنراون،لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامگیرییەی کە لەسەر رۆشنایی هەندێك لەو سەرچاوانەی باسیان لە مێژووی هەورامان کردووە و ئاماژەمان پێیان کرد ئەڵقەیەکی ونبوو لەنێوان ماوەی ژیانی بەهمەنی یەکەم (602 – 533 پ.ن) هەتا ماوەی ژیانی بەهمەنی سێیەم (970 – 1056ن) هەیە،بەپێی هەندێ سەرچاوەی تریش ماوەی ئەو ئەڵقە ونبووە لەنێوان (350-400) ساڵدایە کە هیچ باس و خواسێکی لەسەر نەکراوە.

حوکمڕانـەکانی هـەورامان داوە، بـەوەی گوایـا سـەرەتا لەلایـەن (شـێخ جەلالـەدینی غـازی کـوڕی ئیمام محەممەدی باقر)ەوە کە یـەکێکبووە لـە قوتبـەکانی سـۆفیگەری سـەدەی پێنجـەمی کۆچـی لەناوچەی هەوراماندا ئیرشادیکردووە، (بەهمەن) کراوە بە حوکمڕانی هەورامان.

# حوکمڕانی هەورامان

لـە سـەر ڕۆشـنایی تێکـستێکی کـۆن کـە تەمـەنی بـۆ (409) سـاڵ لەمەوبـەر دەگەڕێتـەوە و بـە ڕێنووسی فارسـی شکستە نووسـراوە و چـەند بابـەتێکی وەك: (ژیـلاو مەرێ, نەوەدوو نۆ پیرە, حوکمڕانی هەورامان...هتد)ی تێدایە بۆمان دەردەکەوێت کە:
حـوکمڕانی هـەورامان بـۆ چـەندین سـەدەی دوور و درێـژی سـەردەمی حـوکمڕانی ئەشکانییەکان و پاشـان ساسـانییەکان, لـە زۆر شـوێنی ناوچەکەشـدا هـەتاکو سـاڵی (330 کۆچی), لە لایەن ئەنجومەنێکی هەڵبژێردراو و بەشێوازێکی دیموکراسییانە بەڕێوەبراوە, ئەو ئەنجومەنە بە (ژیلاو مەرێ) بەناوبانگبووە, وا لەم خاڵانـەی خـوارەوەدا لـە شـێوازی هەڵبژاردنی (ژیلا و مەرێ) و چۆنییەتی حوکمڕانییەکەیان دەدوێم:
لـە بـەر ئـەوەی (پـیر) ڕۆڵێکـی زۆر گـەورەی لـە هەڵبـژاردنی (ژیـلا و مـەرێ)دا هەیـە, پێمباشە سەرەتا کەمێك لە بارەی (پیر)ەوە قسەم هەبێت.
پـیر وەك واتـا سـادە و ڕواڵەتییەکـەی لـە لای ئێمـەی کـورد واتـای خـەڵکی بـە تەمـەن و بەساڵاچـوو دەگەیـەنێ, بـەلاّم لـە ڕووی دینییـەوە بەمـشێوەیە نییـە و تـەواو جیـاوازە, چەمکی (پیر) پێشینەی دینی لە مێژووی دینـەکانی ئێمـە و لـە کولتوورمانـدا هەیـە و ڕەگ و ڕیـشەی زۆر قـووڵ و دێـرینن, چـونکە چـەمکێکی دینییـە و زۆریـش پیرۆزکـراوە, ئەوەی لە ڕووی دینییەوە بە پلەی (پیر) گەیشتبێت ئاهەنگ و شایی بـۆ سـازدراون, وەك

رابەرێکی دینی گوێی بۆ گیراوە و هەمیشە فەرموودەکانی پیرۆزکراون, ئیتر مەرج نییە ئەو کەسە بە تەمەن بووبێت, خەڵکانێك هەن لە تەمەنێکی کەمدا بە پلەی پیر گەیشتوون و هەشن ئەگەرچی زۆر دینداریش بوون و تەمەنێکی زۆریشیان گوزەراندووە, بەلاّم نەبوون بە (پیر).

(پیر) لە ناو دینی میترائی دوا پلەی دینییە, چونکە پلە دینییەکانیان بەم شێوەیەن: (کولاغ= قەلەڕەشکە, هاوسەر, سەرباز, شێر, ئاییندار, پەیکی خۆر, پیر), ئەوەی بە پلەی پیر گەیشتبێت ئیتر لە رووی دینییەوە بووە بە رابەر و رێنماییکار.

لە دینی زەردەشتیدا پلە دینییەکان بەم شێوەیەن: (هەربەد, گەورە هەربەد, مووبد, مووبد مووبدان), ئەوە گەیشتبێتە پلەی (موبد مووبدان) بە پیری مۆغان ناوبهێنراوە, شتێکی دیارە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا زۆر بە بالاّی (پیری مۆغان)دا هەڵدراوە.

لای شوێنکەوتووانی رێوڕەچەی یارسان دوو بازنەیان لە پیران هەن بەمشێوەی خوارەوە:

1- بازنەی (72) پیر, لێرەدا پێویستە بڵێین ژمارەی (72) لای زەردەشتییەکان پیرۆزە, چونکە سروودە دینییەکانی زەردەشت بە ناوی (گاتاکان) بریتین لە (72) بەند, هەروەها پشتوێنی زەردەشتی لە (72) تاڵە خوری رێسراو درووسدەکرێت.

2- بازنەی (99) پیر, ئەم زاتانە ژمارەیان (99) کەسە بووە و بە فەرمانی (سان سەهاکی بەرزنجی) لە کێوی شاهۆ دینداریانکردووە هەتا بە پلەی (پیر) گەیشتوون, پاشان بە ناوچە جیاجیاکادا بە مەبەستی رێنماییکردنی خەڵك لە سەر دینی یارسان بلاّوەیان لێکردووە.

یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی یارسانەکان (سەرسپاردن)ە, سەرسپاردن بە دوو زاتەوە دەکرێت یەکەمیان پیر و دووەمیان دەلیلە, هەر یارسانێك سەرنەسپێرێت لە سەر رۆشنایی تێکستە دینییەکانیان ئەوە بە یارسان لە قەڵەمنادرێت و لە رۆژی کۆتاییدا لە سەردینی ئەوان حەشرناکرێت, لە باسوحواسی (رێوڕەچەی یارسان) لەم بابەتە دەدوێم.

دێمە سەر ئەوەی رێوڕەچە دینییەکانی وەك (نەقشبەندی, قادری, ریفاعی, مەولەوی, سەهروەردی..هتد), پیرەکانیان بە لایانەوە زۆر پیرۆزن و وایان سەیردەکەن کە

**گەیشتوونەتە قۆناغی (بەقای دوای فەنا), هەر لەوەوە ئیتر لە هێز و توانای خوای گەورە بەهرەمەند بوون, بۆیە دوای مردنیشیان لە کاتی زیکرەکان و کۆڕەکانیاندا رابیتەیان لە گــەڵ دەبەســتن, بــۆ نموونــە نەقــشبەندییەکان هــەر لــە ســەرەتای ســەرهەڵدانی رێوڕەچــەکەیانەوە بــە تێپــەڕبوونی بــە ناوەکــانی (صــدیقی, تــەیفوری, خواجــایی, نەقــشبەندی), پیرەکانیــان زۆر گــەورەن بــە لایانــەوە و هــەردەم گوێڕایــەڵی فەرموودەکانیانن, هیچ فەرموودەیەکیان بە لایانەوە جێگای گومـان و رەتکردنـەوە نییـە, لەم بوارەدا شاعرێکی گەورەی وەك مەولەوی بەمشێوەی خوارەوە لە پیرەکەی دەڕوانێت:**

**حەیفەن تۆ میراو سەر جۆی بادەبی**

**بە هەرکەس وە قەد کەفاف دادەبی**

**من کشتم رووزەرد هامفەردانم بۆ**

**دانەم رووسیای هامدەردانم بۆ**

**سا هۆرکەر با بێ جۆ جۆ جۆگەی مەی**

**بە سەر کشتمدا پەی پەی پەیا پەی**

**(پــیر) بــە درێــژایی ژیــانی پــیرۆزە و کــاتێ کــە کۆچــی دوایــیش دەکــات بــەلای شوێنکەوتووانییەوە هـەر زینـدووە, چونکە ئـەوە تـەنها جەسـتەکەیەتی دەمرێـت, بـەلآم رۆحەکەی لە ژیانی نەمریدایە, هەر لێرەوەیـە دەبیـنین سـەر مـەزاری پیرەکـان هەمیـشە شوێنی نیاییش و پاڕانەوە و نیازگرتنن و بەردەوام سەردانیاندەکرێت.**

**تا ئێرە بۆ پیر بەسەو دێمە سەر ئـەوەی قـسەی بـاپیرە و داپـیرەو خـەڵکانی بـە تەمـەنی هەورامان سەبارەت بە (ژیلاو مەرێ), هەر لـە سـەردەمی منـداڵی و مێردمنـداڵیمان و تـا ئەوێ رۆژێ لە گوێماندا دەزرنگێنەوە, لەو کاتانـەدا (ژیلـۆ مـەرێ) بـە چـەند جۆریـك بـۆ ئێمـە باسـدەکرا و پێمـان دەناسـرا, هـەبوون دەیـانوت (ژیـلا) کـە ئـەوان بـە (ژیلـە) ناویاندەهێنا, کەسێکی دڵپاك و لـە خواترسـبووە, کـاتی بـەفربارین بـە هەورامییـەکانی وتـووە, سـەربانەکانتان پەرژینبکـەن, ئـێتر بەفرەکـە بۆیـان بـووە بـە ئـارد, هەنـدێکیش دەیـانوت (ژیلـە) هێنـدە ئـازاو بـەهێز بـووە, توانیویـەتی بـەردی گـەورە هـەتا نـاو قـەدی بەرزبکاتــەوە, هەشــبوون بــە بابــەتی (کــۆڵێ بــڕدێ) بۆمانیــان پێناســەدەکرد, هەرلــەو**

**کاتەشەوە ناوی چەندین شوێن کە زاراوەی (مەرێ)یان پێوەیە بەگوێماندادەدرێت, وەك: (مەڕۆ مەرێ لە دزڵی, چەمۆ مەرێ لە کەمالاّ, دەرۆ مەرێ لە دزاوەر, هانۆ مەرێ لە دەگاشێخان, دەرۆ مەڕێ بە پشتی سەرگەتەوە و دەگاو مەرێ لە هەورامانی ئەودیو.......هتد), هەر لەوەوە ئیتر لە بیرەوەری ئێمەدا, هەم ژیلا و هەم مەرێ شوێنی خۆیان گرتووە, بەلاّم وەك رازێ دەماو دەمیی, نەوەك شتێکی بەرجەستە, کەچی ئەوەی کە مایەی تێڕامانێکی گەورەیە لە سەر (ژیلاو مەرێ), ئەمەیە کە (ژیلا) ئەنجومەنی هەڵبژێردراوی خەڵکی هەورامان و (مەرێ)ش بارەگای حوکمڕانییان بووە.**

**1ـ هەر چوارساڵ جارێك هەڵبژاردنی (ژیلا) لە هەموو گوندەکانی هەورامانـدا ئەنجامدراوە, کۆتاییهاتنی ماوەی حوکمڕانی (ژیلا)ی پێشوو و هەڵبژاردنی (ژیلای) نوێ لە لایەن (پیر= پاوەر)ەوە راگەیەنراوە.**

**2ـ ئەوانەی ویستویانە خۆیان کاندیدبکەن لای (پیر) ناوی خۆیان تۆمارکردووە, ئەگەرچی هەموو کەسێك لە خۆکاندیدکردندا ئازاد بووە, بەلاّم هەمیشە خەڵکانی (دانا, زانا, عاریف و شاعیر, خزمەتگوزار و خەمخۆر) کە پێشینەیان لە بواری خزمەتکردنی خەڵکەکەدا هەبووە, خۆیان کاندیدکردووە, پانزە رۆژ بەر لە رۆژی هەڵبژاردنیش ناوی کاندیدکراوەکان راگەیەنراوە, هەریەکەیان بە ناوی میوەیەکی وشکەوکراوی ناوچەکە, یان بەرو بوومی دارستانە سرووشتییەکانەوە وەك: (گوێز, توو, لەتکە هەرمێ, لەتکە بەهێ, مێوژ, هەڵووژە, هەنجیر, قەزوان, بەڕوو, سنجو, چەقاڵە...هتد.....)ەوە ناونراون. ژمارەی کاندیدکراوەکان (20ـ15) کەس بوون و لە ناویاندا بە پێی گەورەو بچووکی گوندەکان (4ـ 7) کەس هەڵبژێردراون, ناونانیشیان بە ناوی میوەی وشکەوکراو و بەروبووکی سرووشتییەوە, بۆ ئەوە بووە نەخوێندەوارانیشیان بتوانن وەك چۆن دەیانەوێ نوێنەری باوەڕپێکراوی خۆیان هەڵبژێرن.**

**3ـ ژن و پیاو کوڕ و کچ مافی دەنگدانیان هەبووە, بۆ ئەوانەی بۆ یەکەمجار دەنگیانداوە تاقیکردنەوەی (جەستەیی و هزری) کراون و بەو تاقیکردنەوە (مەرد ئازما) وتراوە, تاقیکردنەوەی جەستەیی بەوە بووە کە دوو بەرد لە بەردەم دەرگای مەرێ دانراون,**

بەردی کوڕان لە هینی کچان گەورەتر بووە, بۆ ئەوەی سەرکەوتووبن لە سەریان پێویستبووە تا ئاستی ناوقەد بەرزیانبکەنەوە, بۆ تاقیکردنەوەی هزریش هەر یەك و (3) پرسیاریان لە ئاوێستای هەورامان و ماریفەتی پیر لێکراوە, هەر یەکێکیان توانیبێتی (2) پرسیار بەڕاستی وەڵامبداتەوە, ئەوە لە تاقیکردنەوەی هزری سەرکەوتوو بووە.

4ـ بەر لە دەستپێکردنی دەنگدان پارچە قوماشێکی ڕەنگاوڕەنگ کە لە هەلاّوە درووستکراوە و بەرهەمی پیشە دەستییەکانی خۆیان بووە, لە لایەن (پیر)ەوە پیشانی ئامادەبووان دراوە, پیر سێ جار فەرموویەتی (ئەم قوماشە هیچی تێدایە) ئامادەبووانیش کە دڵنیابوون هیچی تێدا نییە, وتوویانە (نەخێر), ئینجا (پیر) فەرمانیداوە بە کەسێك قوماشەکەی وەك توورەکەیەك هەڵیدوریوە و ئیتر ئامادەبووان دەستیانکردووە بە دەنگدان, بەوەی هەر کەسێك ئەو میوەیەی کە ناوی ئەو پاڵێوراوە بووە بە لایەوە پەسەندبووە خستویەتییە ناویەوە, کاتێك کۆتایی بە دەنگدانەکە هاتووە, پیر سێ جار فەرموویەتی (کەس ماوە دەنگبدات), کاتێك دڵنیابووە کەسێك نەماوە دەنگبدات, ئیتر فەرمانیداوە توورەکەکە هەڵتەکێندراوە و لە بەردەم ئامادەبوواندا دەنگەکان ژمێردراون, توورەکەکەش پارچە پارچەکراوە و وەك موفەڕك بەسەر ئامادەبوواندا بەشکراوەتەوە, هەتا هەڵبژاردنی (ژیلا)ی ئایندە لە لایان پارێزراوە, هەروەها میوەکانیش بەسەریاندا بەشکراونەوتەوە و خواردوویانن.

5ـ ئەوانەی کە سەرکەوتنیان بە دەستهێناوە (پیر) پیرۆزیایی لێکردوون, بە وتارێکی کورتیش ستاییشی کارەکانی (ژیلا)ی پێشووی کردووە, ئەگەر کەموکوڕییەکیشیان هەبووبێت ڕەخنەی لێگرتوون, ئینجا فەرمانیداوە بە ئامادەبووان پیرۆزبایی لە ژیلای هەڵبژێردراوبکەن و ناوچاوانیان ماچبکەن.

6ـ هەمان ڕۆژ لە لایەن داراکانەوە چێشتێك کە لە (گەنمی کوتراو, گۆشت, نۆك, ترشی هەنار) و چەند گیایەکی بۆنخۆشی هەورامانی تێکراوە, ئامادەکراوە و بەسەر ئامادەبوواندا بەشکراوەتەوە, هەر یەکێك لە ئامادەوبووان لەسەری پێویستبووە قاپ و کەوچکێکی هێنابێت کە بەدەستی خۆی درووستیکردبێت, لەو قاپەداو بە کەوچکەکەی چێشتەکەی خواردووە.

7ا سەرۆك و ئەندامانی (ژیلا) بۆ ماوەی چوار ساڵ لە سەر رۆشنایی ئاوێستای هەورامان و ماریفەتی پیر حوکمڕانییانکردووە، خۆشیان بە پێی زەرورەتی رۆژگار و بۆ باشتر بەڕێوەچوونی کارەکانیان یاسا و عورفی نوێیان داناوە، بۆ دەربڕینی رەزامەندیش لە سەر یاساو عورفە نوێکان بە ئامادەبوونی هەموو گوندنشینان راپرسیکراوە.

8ا هەموو تاکێك لە سەری پێویستبووە ملکەچی بڕیارەکانی (ژیلا) بێت و سزای سەرپێچیکارانیش دراوە.

9ا (ژیلا) بەردەوام لە ژیان و گوزەرانی خەڵکەکەیان پرسیوەتەوە، لە پێناوی خۆشگوزەرانیشیاندا لە دەوڵەمەندەکان هاوکاری و قەرزیان بۆ وەرگرتوون.

10ا مافی ژن لە هەڵبژاردنی (ژیلا) بە تەواوەتی پارێزراوە، چونکە نەوەك هەر بۆی هەبووە دەنگبدات، بەڵکو بۆشی هەبووە بە ئەندامی (ژیلا) هەڵبژێردرێت، چەندین ژن هەن کە سەرۆك و ئەندامی ئەنجومەنی (ژیلا) بوون، یەکێك لەوانە (ئەدا خەنانێ) بووەکە بۆ سێ خولی لەسەر یەك هەڵبژێردراوەتەوە.

11ا ژیلای شاری هەورامان وەك ئۆرگانێکی بالاّ بۆ (ژیلا)کانی تر، سەرپەرشتی (ژیلا) هەڵبژێردراوەکانی گوندەکانی کردووە.

قسەوباسەکەمان سەبارەت بە شێوازی هەڵبژاردن و حوکمڕانی (ژیلا) تا ئێرە هاتن، ئێستاش کەمێك سەبارەت خستنەڕووی لایەنە ئەقلاّنییەکەی دەدوێین.

شتێکی دیار و ئاشکرایە کە ئەقلگەرایی هەموو سووچێکی ژیان و گوزەرانی خەڵکی هەورامانی گرتووەتەوە، هەر لەم کتێبەو لە بابەتێکدا بە ناوونیشانی (هەورامییەکان و ئەقلگەرایی) هۆکارەکانیمان خستووەتەڕوو، هەر بۆیە لێرەدا پێویستناکات لێیبدوێین، بەلاّم پێویستدەکات هەندێ لایەنی هەڵبژاردنی (ژیلا مەرێ) لە چەند خاڵێکدا وەك باکراوندێکی ئەقلگەرایی خەڵکی ناوچەکە لەم خالاّنەدا بخەینە بەر باس.

1ا ناونانی کاندیدکراوەکان بە ناوی میوەی وشکەوکراو و بەرهەمی دارستانە سروشتییەکانەوە، شتێکی ئاشکرایە یەکێك لە دەرهاویشتەکانی هەڵبژاردن لە زۆربەی هەڵبژاردنەکانی دونیادا، هەمیشە تاوانبارکردنی لایەنی براوەیە بە گرتنەبەری





ڕێوشوێنی نارەوا و لادان لە بنەماكانی دیموكراسییەت بۆ بەدەستهێنانی سەركەوتن, ئاشكرایە هەتا ئەوێ ڕۆژێش هەموو ڕێگاكانی پڕەپاگەندەو تەخشان و پەخشانكردنی پارە و پوول و هەندێكجار تەنانەت توندوتیژی و پێشێلكردنی مافی مرۆڤ لە هەڵمەتەكانی بانگەشەی هەڵبژاردندا دەگیرێنەبەر, هەروەها سەرەڕای ئەوەی كە بوارەكانی زالنست و تەكنەلۆژیا لە ترۆپكی پێشكەوتندان و زۆربەی چەمكەكانی ژیان لە هەموو بوارەكاندا گۆڕانیان بەسەردا هاتووە, كەچی تا ئێستاش زیادەڕۆیی دەكرێتە سەر مافی دەنگدەران و تەنانەت یاریش بە ویست و حەزی نەخوێندەوارانیان دەكرێت, كەچی لە هەڵبژاردنی (ژیلاو مەرێ) كەسێك نەیتوانیوە بەم ئاكارەدا كاربكات و هیچ شتێك لەمانەی باسكران نەبوون. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەگەر بەچاوی هەڵسەنگاندنەوە لەم خاڵە وردببینەوە, دەبینین لێوانلێوە لە ئەقلگەرایی و ئیرادەی گەورەی هەوراماییەكان لە ئەنجامدانی هەڵبژاردنەكە دەخاتەڕوو.

2ا ئەوەی لە چێشتەكەی ڕۆژی هەڵبژاردنی (ژیلای) خواردبێت, لە سەری پێویستبووە قاپ و كەوچكەكەی بە دەستی خۆی درووستیكردبن, دیارە ئەم خاڵە ئەگەر بە ڕواڵەتی لێی وردببینەوە بە سادە دێتەپێشچاو, بەلاَم كاتێك لە باگراوندە ئەقلاَنییەكەی وردببینەوە دەبینێن, ئەم كۆمەڵە پێماندەڵێت ئەوەی بیەوێت لێرەدا بژی, لە سەری پێویستە بەرهەمهێنەر بێت و بە هیچ شێوەیەك جێگەی كەسی مشەخۆر و تەوەزەل تێدا نابێتەوە, ئیتر مرۆڤەكان هاندەدرێن كە دەستوپەنجەیان لە گەڵ دەوروبەریان نەرمبكەن و بتوانن كاریگەری گەورە لە سەری درووستبكەن, هەر لەوە دەبینین خەڵكی هەورامان لە ناو سروشتێكی ڕژد و یاخیدا بەهەشتێكیان درووستكردووە و توانیویانە داهێنەربن, ئەگەر بمانەوێ ئەم دەربڕینە بسەلمێنین دەیان نموونەی زیندوو هەن, بەلاَم بۆ ئەوەی دووربكەوینەوە لە درێژدادڕی, هەر ئەوە دەڵێین, ئەگەر هەوراماییەك بیەوێت دەتوانێت هەر لە مێزەرەكەی سەریەوە هەتاكو دەگاتە پاپۆش و گۆرەوییەكانی پێی لە بەرهەمی پیشەدەستییەكانی ناوچەكەی خۆی بپۆشێت, هاوكات ئەوەش دەڵێن ئاخۆ چەند شوێن هەبن كە رووی زەوی و تۆپۆگرافییەت و كەشوهەوایان هاوشێوەی هەورامان بێت, ئایا خەڵكی ئەو شوێنانە توانیویانە وەك هەوراماییەكان لە باخداری و سیستمی

ئاودانـدا داهێنـەر بـن، بەدڵنیاییـەوە دەڵـێن نـەخێر. خـاڵێکی تـریش هەیـە کاریگـەری دروستکردنی چێشتەکەی ڕۆژی هەڵبـژاردنی (ژیـلا ومـەرێ) و بەشـکردنەوەی بـە سـەر ئامادەبووانـدا تـا ئـەم ڕۆژانـەش بـە زینـدوویی دەهێڵێتـەوە, ئـەوەش دروسـتکردن و دابەشـکردنی چێشتەکەی (جـەژنی پێشالیار)ە, کـە لـە هـەمان کەرەسـە خۆراکییـەکان دروستدەکرێت و تەنها جیاوازییەکی بچووکی ئەوەیە کە گەنمە کوتراوەکە لـە جـەژنی پیشالیاردا کراوە بە بڕوێشك.

3 بەر لە دەستپێکردنی دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی ژیلاو مەرێ, ئەو پارچە قوماشـەی کـە وەکو توورەکەیەك لەبەرچاوی ئامادەبووانـدا هەڵدووراوە, پیر پیـشانی هـەموویانی داوە و (3) جـار پێیوتـوون هیـچی تێدایـە, ئـەوانیش پـاش دڵنییابوونیـان لـە بـەتاڵی کیـسەکە وتوویانە نەخێر, هەروەها پاش تەواوبوونی دەنگدانیش (3)جار پێیوتوون کەسێك مـاوە دەنگبدات وتوویانە نەخێر, مەبەستی (پـیر) لێرەدا لـە لایەکـەوە بـۆ ئـەوە بـووە هـەموو ئامادەبووان لە ڕاستی و دروستی دەنگدانەکە دڵنیابن, لە لایەکی ترەوە پەیوەندبوونییان بووە بە پیرۆزی ژمارە (سێ)وە, دیارە خەڵکی ناوچەکە پێش سەرهەڵدانی دینی پیرۆزی ئیـسلام پـەیڕەوکاری دیینـی زەردەشـتی و پێـشتریش دیینـی میترایـی بـوون, دروشمـە سەرەکییەکانی دینی زەردەشتیش سێگانەیەکن کە لـە (ئەندێـشەی چاك= نییـەتی چاك, کـرداری چـاك, گوفتـاری چـاك)دا بەرجەسـتەدەبن, هـەموو زەردەشـتییەکیش کاتێـك پشتوێنی بەستووە کە لە (72) تاڵی لە خوری دروسـتکرا بـووە, سـێ گرێـی لـە پێـشەوە لێداوە و تا ئێستاش ئەم شێوازەی پشتوێنبەستن لای هەندێك خەڵکی کۆمەڵی کوردەواری بەردەوامە, هەر بۆیە (پیر)یش لە هەلبژاردنەکەدا ویستوویەتی پیرۆزییەکە بخاتەوەڕوو.

4 پارچە پارچەکردنی ئەو کیسە کـە میوەکـانی تێخـراون و دابەشـکردنی پارچـەکان بـە سەر دەنگدەرانـدا, پاشـانیش دابەشـکرنی میـوە وشـکەوکراوەکان وەك موفـەڕك, بـۆ ئـەوە بـووە هەڵبـژاردنی (ژیـلا ومـەرێ) هەمیـشە لـە یـادەوەری خەڵکەکـەدا بـە زینـدوویی بمێنێتەوە و لە بیر و هزریاندا ببێت بـە کـارێکی سـومبولیك, دیـارە هـەر کـارێکیش بـەم ئاکـارەدا ڕۆیـشت زۆر بـە ئەسـتەم لـە نـاو خەڵکـدا کاڵدەبێتـەوە, هـەر ئەمـەش بـووە





**وایکـردووە هەڵبـژاردنی (ژیـلاو مـەرێ) چـەند سـەدەیەکیش پـاش لـە گەیـشتنی دیینـی پیرۆزی ئیسلام بە ناوچەکە هـەر بمێنێتـەوە, ئـەو سکەیە کـە لـە گونـدی بێساران و لـە لایەن (مەلا قەحتانی بێسارانی)یـەوە دۆزراوەتـەوە و وێنـەی ژنیکی بـە سـەری رووتـەوە لەسـەرە, بەڵگـەی هـەرە زینـدووی مانـەوەی حـوکمڕانی هەورامانـە لـە لایـەن (ژیـلاو مـەرێ)وە لـەو سـەردەمەدا, ئـەگینا هـەرگیز ئـەقڵ نایـسەلمێنێ لـەو سـالأنەدا ژنێکـی موسـوڵمان بەسـەری رووتـەوە لـە سـایەی دەوڵـەتی ئیـسلامدا حوکمیکردبێـت و وێنـەی بەسەر سکەوە بووبێت.**

**5ـ ئەو تاقیکردنەوە هزرییەی بۆ ئەوانە ئەنجامدراوە بۆ یەکەمجار دەنگییانداوە, کارێکی زۆر گەورە بـووە بـۆ ئـەوەی لـە لایەکـەوە پێگەیـشتن و ئامـادەگی دەنگـدەرەکان لـە رووی هزرییەوە بۆ کارێکی لەوچەشنە بسەلمێنرێت, چـونکە ئـەو سـێ پرسـیارەی لـە ئاوێـستای هەورامان و ماریفەتی پیر لێیانکراون, راستەوراست پەیوەستبوون بەو دەستوورانەوە کـە لـە حـوکمڕانی ناوچـەکە و لایەنـەکانی تـری ژیـان و گوزەرانیانـدا رۆژانـە پـەیڕەوکراون, ئەمـەش سـەرەتایەك بـووە بـۆ ئـەوەی دەنگـدەرەکان لـە چوارچـێوەی ئـەو دەسـتوورانەدا هەڵسوکەوت بکەن, لە لایەکی تریشەوە دەنگدەرەکان ئەوەیان بە لاوە سەلماوە لـە کاتێکـدا مافێکی گەورەیان کە دەنگدانە بۆ هەڵبژاردنی (ژیلا) بە ئاوێستای هەورامان و ماریفەتی پیرەوە وابەسـتەیە, کەواتـە هـەر سەرکێـشییەك لـە بنـەما و یاسـاکانیان لـە ئایینـدەدا لـە بەرامبەر کۆمەڵەکەیان و حوکمڕانەکانیان رووبەڕووی لێپرسینەوەیان دەکاتەوە.**

**6ـ پاراستنی مافی ژنـان لـە دەنگـدان و خـۆ کاندیدکردنـدا, لـەو سـەردەمانەدا کـە لـە نـاو زۆربەی هەرە زۆری پێکهاتە کۆمەلأیەتییەکاندا, ژنان وەك مرۆڤی پلـە دوو, یـاخود وەك کۆیلە رەفتاریان لە گەڵدا کراوە, تەنانەت وەك دەزانرێت دیموکراسییەتەکەی (یونان)یش تەنها دیموکراسیەتی پیاوان بووە و ژنان هیچ مافێکیـان لـە دەنگـدان و خۆکاندیدکردنـدا نـەبووە, کەچـی لـە هەورامانـدا ژنـان بـۆ ئەنجومـەنی ژیـلا و تەنانـەت بـۆ سـەرۆکی ئەنجومەنەکەش هەڵبـژێردراون, ئەمـەش ئـەوە دەسـەلمێنێت کـە هەورامییـەکان هـەر لـە دێرزەمانــەوە لـە دەرهاویـشتەکانی کۆمـەڵی پیاوسـالاری و دێوەزمـەی چەوسـاندنەوەی رەگـەزی مێیینـە بـەدوور بـوون, ژنانیـان لـە شـوێنی شـیاوی خۆیـان لـە نـاو کۆمـەڵی**

مرۆڤایەتیدا داناون و بۆ پێکەوەنانی ژیانێکی ئاسوودە, بەها پیرۆزەکانی پەیوەندی نێوان هەردوو رەگەزەکەیان پاراستوون.

7 خووی نێوچاوماچکردن لە هەڵبژاردنی (ژیلا)وە ئیتر هاتووەتە نێو کولتووری کوردییەوە و تا ئێستاش نەوەك هەر پارێزراوە, بەڵکو پیرۆزیشی دراوەتێ, لە جەمی (یارسان= کاکەیی)دا کاتێك تەمبوور دەهێنرێتە ژوورەوە هەموو جەمنشینان لە بەری هەڵدەسن, ماچیدەکەن و دەیخەنە سەر چاویان, هەروەها ئەو گۆشتەش کە بە ناوی (پارووی حەڵاڵ) بە سەریاندا بەشدەکرێتەوە, بەر لەوەی بیخۆن ماچیدەکەن و دەیخەنە سەر چاویان, هەمووشمان دەزانین ماچکردن لە ناو هەموو گیاندارەکان و لە ناویشیاندا مرۆڤ, دەربڕینی خۆشەویستییە بۆ بەرامبەر, هەر مرۆڤێکیش کە لە دڵەوە و خۆویستانە مرۆڤێك, یاخود شتێکی تر ماچبکات ئەوە بە دڵنیاییەوە دەربڕینی خۆشەویستی و رێزیەتی بۆی, هەر لەوەوە ئەستەمە بە ئاسانی ئەو خۆشەویستی و رێزەی فەرامۆشبکات, بۆیە کاتێك (پیر)یش بە ئامادەبووانی فەرمووە نێوچاوانی (ژیلا) ماچبکەن, گرێدانیانبووە بەو رێز و خۆشەویستییەوە کە پێویستە بۆ ئەوانیان هەبێت, ئەوەش هۆکارێکی گرنگبووە بۆ پابەستبوونیان بە فەرمان و راسپاردەکانیانەوە.

پاش ئەم چەند دێڕەی سەرەوە سەبارەت بە (ژیرلا) و بۆ چوونە ناو باسی سانەکانی هەورامان، سەرەتا پێویستە قسە لەسەر ئەوە بکەین (35) سان لە هەوراماندا حوکمڕانیانکردووە، ئەمە بێجگە لەوەی هەندێك لە حوکمڕانەکانی هەورامان نازناوی (میر، بەگ)یان هەڵگرتووە، بۆیە پێویستە لێرەدا و پێش هەموو شتێك تیشکێکبخەینە سەر وشەی (سان):

★ مەریەك لە (مەردۆخ، ئێدمۆندز، هادی بەهمەنی) پێیانوایە وشەی سان لە وشەی سوڵتانی عەرەبیەوە هاتووە، گوایا سوڵتان وەك نازناوێك لەلایەن شاکانی دەوڵەتی صەفەوییەوە دراوە بە حوکمڕانەکانی هەورامان، ئەوەش وەك جۆرە کەمکردنەوە و سوکایەتیکردنێك بە پایەی سوڵتانەکانی عوسمانی.

★ هەندێکیش وتوویانە گوایا وشەی سان لە (شاە) یان (شیخ)ی عەرەبیەوە هاتووە پاشان وشەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووە بە (سان).

★ (مامۆستا محەممەد ئەمین هەورامانی) لە کتێبی مێژووی هەورامانـدا باسی لەوە کردووە، وشەی سان لە وشەی (ساتراپ)ەوە هاتووە کە وشەیەکی میدییە و واتای (حاکمی ناوچە، گەورەی ناوچە، کوێخای ناوچە، فەرمانداری ناوچە، کاربەدەستی ناوچە) دەگەیەنێت، چونکە وڵاتی میدییەکان ناوبانگی بە وڵاتی (ساتراپنشینان) دەرکردووە، تا ئێستاش وشەی (ساتراپ)ی میدی لە فەرهەنگە جۆربەجۆرە ئەوروپاییەکاندا بە هەمان ماناوە دێت، هەروەها یۆنانییەکان باسیان لەوە کردووە (وڵاتی میدیا) لەسەروکلاوی ئەشکانییەکاندا بۆ چەند ناوچەیەك دابەشکراوە هەریەك لەو ناوچانەش (ساتراپ)ێك حوکمیکردووە، (مامۆستا محەممەد ئەمین هەورامانی) لە درێژەی باسەکەیدا نووسیویەتی: لەسەردەمی حوکمی ئەشکانییەکاندا سەرۆك هۆزەکانی ناوچە جۆربەجۆرکان بۆ (ساتراپ) دیاریکران و حوکمیان گرتۆتەدەست، کەوابوو دەبێ بڵێین حوکمی ئەشکانییەکان حوکمێکی دەرەبەگی بووە، هەر لەو سەردەمەدا شێوازی حوکمی هەورامان ساتراپنشینبووە، وشەی (سان)یش کورتکراوەی وشەی (ساتراپ)ە.

حوکمڕانەکانی هەورامان ماوەیەکی دوور و درێژ حوکمی ناوچەکەی خۆیان کردووە و هەندێك جاریش دەستیان بە دەرەوەی هەورامان گەیشتووە، مەڵبەندی حوکمڕانییەکەیان لەم شوێنانەدا بووە:

1ـ مەڵبەندی حوکمڕانەکانی لهۆن (نەوسود) بووە، بۆ ماوەیەکی کەمیش گوێزراوەتەوە بۆ (گوندی نۆدشە) و لە سەردەمی حوکمڕانی (کەریم سان)یشدا (گوندی خانەگا) کراوە بە مەڵبەندی حوکمڕانی (هەورامانی لهۆن).

2ـ مەڵبەندی حوکمڕانەکانی تەخت (شاری هەورامان) بووە.

3ـ مەڵبەندی حوکمڕانەکانی (کەمەرە و ڕەزاو) سەرەتا (کەڕاوا) بووە، پاشان گوێزراوەتەوە بۆ (ڕەزاو).

4ـ مەڵبەندی حوکمڕانەکانی (دزڵی و شامیان) بەردەوام (گوندی دزڵی) بووە.

سەرەتای حوکمڕانییەکەشیان لە (بەهمەنی سێیەم)ەوە دەستیپێکردووە، پێش ئەوەی بێینە سەر باسی ژمارەیەك لە حوکمڕانە زۆر ناودارو ناسراوەکانی هەورامان

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین ، لەسەر رۆشنایی سەرچاوە مێژووییەکان چەند ئەڵقەیەکی وونبوو لە حوکمڕانی هەوراماندا هەن، ماوەی ژیانی نێوان ژمارەیەك لە حوکمڕانەکان درێژە و هەرگیز لەگەڵ ماوەی تەمەنی دوو کەسدا نایێتەوە، هەر بۆ نموونە ماوەی نێوان تەمەن و حوکمڕانی (میر جەلالەدین و میر سەعید جیاشا)، (لە باسو خواسی ئەم دوو میرەدا قسەیەك لەم بارەوە دەکەین) ، ئێستاش دیێینە سەر باسکردنی مێژووی ژیانی ژمارەیەك لە حوکمڕانەکانی هەورامان.

**1- بەهمەنی سێیەم**

هەرچەندە جیاوازی زۆر لەسەرچاوە مێژووییەکاندا لە بارەی ماوەی ژیان و حوکمڕانی (بەهمەنی سێیەم)ەوە هەن، بەڵام زۆربەی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن ناوبراو لەسەر فەرمانی (شێخ جەلالەدینی غازی) کراوە بە حوکمڕانی هەورامان، شێخ فەرمانیداوە کە هیچ کەس سەرپێچی لە حوکمی (بەهمەن) نەکات و پێویستە خەڵکی ناوچەکە هاوکاریبکەن بەمەرجێك ستەم بەرامبەر خەڵك نەکات[43]، هەرچەندە لە هەمان کاتدا ئاماژەی بەوە کردووە کە (بەهمەن) لە بنەماڵەیەکی حوکمڕان و دەسترۆیشتووە، گوایا وتوویەتی: (گورگ هەر گورگە).

(بەهمەن) پاش ئەوەی حوکمڕانی هەورامانی گرتۆتە دەست بە هاوکاری لەگەڵ شووڕای خەڵکی هەورامان کە لەو سەردەمەدا پێکهاتووە لە (ریشسپیان، پیاوماقوڵان، زانایان، سەرۆك هۆزەکان) حوکمیکردووە و لەبەڕێوەبردنی کارەکانیدا راوێژیپێکردوون، ماوەی (55) ساڵ حوکمێکی عادیلانەی کردووە و ساڵی (447ك –1056ز) کۆچی دواییکردووە[44].

**2- باریە بەگ**

پاش کۆچی دوایی (بەهمەنی سێیەم) لەسەر بڕیاری کۆبوونەوەی شورای خەڵکی هەورامان (باریە بەگ)ی کوڕی (بەهمەنی سێیەم) کراوە بە حوکمڕانی هەورامان، لەو

---

[43]- ملا عبالله قاضی اورامانی- تاریخ اورامان- ص (45)- دەستنووس.

[44]- (د.محمد علی سلطانی)- ایلات وطوایف کرمانشاهان- جلد (1)- ص (30).





سـەردەمەدا زۆربـەی گونـدەكانی هـەورامان خـاوەنی قـەڵا و بـورجی خۆیـان بـوون، ئـەوەش بـۆ پاراستنی گوندنشینەكان لە هەر هێرش و پەلامارێك كە كرابێتە سەریان[ترلخ].

(باریە بەگ) پاش ئەوەی دەسەڵاتی گرتۆتـە دەست، هەوڵیـداوە لەگـەڵ دەرودراوسـێكانی هەورامانـدا دۆسـتایەتیبكات و لێیاننزیكببێتـەوە، لەهەمانكاتـدا حـەزێك هـەبووە لەناخیـدا بـۆ فراوانكردنـی قەڵـەمڕەوی دەسـەڵاتەكەی، هـەر لـەم بـوارەدا كـچی حـوكمڕانی (دێوەزنـاو[ترلخ])ی خواستووە، وەك ڕێوڕەسمی ئـەو كاتـە كاتێـك هاوسـەرەكەی بـەرەو بـاوان كراوەتـەوە، پێیوتـووە: باوكت هەردیاری و خەلاتێكت بداتێ لێیوەرمەگرە بێجگە لە پارچە زەوییـەك كـە (باریـە بـەگ) خۆی بۆی دەستنیشانكردووە، پاش بەخشینی زەوییەكە بـە هاوسـەرەكەی، (باریـە بـەگ) حـەفتا خێزانی ناردووە بۆ ئـەو شـوێنە و ئاوەدانیانكردۆتـەوە، گونـدێكیان تێـدا دروسـتكردووە بـەناوی (نـوێن)، ئـەوەی لـە سەرچـاوە مێژووییەكانـدا هـاتووە دەربـارەی حـوكمڕانی (باریـە بـەگ) زانیارییەكی زۆر كەمە و تینوێتی ناشكێنێ، ناوبراو پاش (55) ساڵ حوكمڕانی، ساڵی (502ك – 1109ز) كۆچی دواییكردووە.

### 3 میر جەلالەدین

پاش كۆچی دوایی باریە بەگ (میر جەلالەدینی كوڕی) كـراوە بـە حـوكمڕانی هـەورامان، نـاوبراو سـاڵی (447ك – 1056ز[ترلخ]) لـەدایكبووە، هـەر لەسـەرەتای دەسـتبەكاربوونیەوە هەوڵیـداوە قەڵـەمڕەوی دەسـەڵاتەكەی فراوانبكـات، بارەگـای حوكمڕانییەكـەی پۆشـتە و

---

[45] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

[ترلخ] شـەرەفخانی بەدیلسی لـە كتێبـی شـەرەفنامەدا نـاوی (قـەڵای دێوەزنـاو)ی بـە (قـەڵای دێـودز) هێنـاوە،دێودز هەمان گوندی دێوەزناوی ئێستایە.

بڕوانە كتێبی (شەرەفنامە) لاپەڕە (596) وەرگێڕانی (هەژار موكوریانی).

[ترلخ] ئـەو سەرچاوانەی باسیان لـە مێـژووی ژیـان و حـوكمڕانی دەسـەڵاتدارانی هـەورامان كـردووە سـاڵی (447ك) بەساڵی لەدایكبوون و ساڵی (698ك)یان بەساڵی كۆچی دوایی (میر جەلالـەدین) دیاریكردووە،هـەرەها باسیان لـەوە كـردووە (مـیر سـەعید= جیاشـا) كـوڕی (مـیر جەلالـەدین)ـەـو پـاش كۆچـی دوایـی بـاوكی سـاڵی (698ك) حـوكمی گرتۆتەدەست،بەلاَم ئەگەر كەمێك لەم مێژووانە رامێنین بۆمان دەردەكـەوێت كـەدەبێت (میر جەلالـەدین) مـاوەی (251) ساڵ ژیابێت،دیارە ئەم ماوەیەش زۆر زۆرە بۆ تەمەنی كەسێك بۆیە پێدەچێت (میر سەعید) لەنەوەی (میر جەلالـەدین) بێت نەوەك كوڕی،ئەمەش دەمانگەێنێتە ئەو دەرئەنجامـەی كـە ئەڵقەیـەكی ونبـوو لـە حوكمڕانی هەورامانـدا لـە نێـوان (میر حەلالەدین و میرسەعید)دا هەیە. (ئەیوب)

نوێکردۆتەوە، لە سەردەمی حوکمڕانی (میر جەلالەدین) هەورامان گەلێك شوێنی گرتۆتەوە هەر لە (پاڵەنگان)ەوە هەتا (دزڵی) و سەرپاکی گوندەکانی (هەورامانی لهۆن) و لە دامێنی (کێوی مڵەوەرد= مڵەخورد) و (کەماجەڕ) تا دەگاتە (پاوە)، لە (کەڕاوا) و (ڕەزاو)ەوە تا دەگاتە (مەریوان) لەژێر فەرمانی ناوبراودا بووە، (میر جەلالەدین) ماوەی (95) ساڵ حوکمڕانیکردووە[سملخ] ساڵی (698ك – 1298ز) کۆچی دواییکردووە.

### 4 میر سەعید = میرجیاشا

لەسەر ڕۆشنایی سەرچاوە مێژووییەکان (میر سەعید) لەو ساڵەدا باوکی کۆچی دواییکردووە، تەمەنی (18) ساڵ بووە، ساڵی (698ك – 1298ز) حوکمیگرتۆتە دەست، ئەم میرە پیاوێکی ئایینناس و ریندارێکی کەموێنە بووە، دەستێکی باڵای لە ئاوەدانکردنەوەی هەورامان و دروستکردنی چەندین قەڵا و قولەدا هەبووە، لە دامێنی شاری (هەورامان[شملخ]) مزگەوتێکی بەناوی مزگەوتی (میرجیاشا)ی درووستکردووە، لەسەردەمی حوکمڕانی (میرسەعید)دا هەورامان زۆر هێمن بووە و ئاسایش باڵی بەسەریداکێشاوە، هەروەها ژمارەیەك لە پیرەکانی هەورامان لەو سەردەمەدا ژیاون و بە ئازادانە تێڕوانینە عیرفانی و فەلسەفییەکانی خۆیان خستۆتەڕوو[لحبر].

تەنها ڕووداوێکی گەورە کە لەسەردەمی حوکمڕانی ئەم میرەدا ئاسایشی هەورامانی تێکدابێت، لەشکرکێشییە گەورەکەی (مەئموون بەگی ئەردەڵانی[لحبر])بووە کە هەورامییەکان بە

---

[48] ملا عبالله قاضی اورامانی، تاریخ اورامان، ص (48)، دەستنووس.

[شملخ] شاری هەورامان یەکێکە لەشارەدێکانی هەورامانی تەخت،لەبەر ئەوەی گوندێکی گەورە بووە مێژوویەکی دێرینی هەیە،ماوەیەکی دوورودرێژ مەڵبەندی حوکمڕانی سانەکانی هەورامان بووە،هەروەها مەرقەد و مەزارگەی پیرشالیاری لێیە، لەبەر ئەم هۆیانە ناوی شاری هەورامانی بەسەردا بڕاوە.

[50] ملا عبالله قاضی اورامانی، تاریخ اورامان، ص (48، 49)، دەستنووس.

[لمجبر] (مەئموون بەگی یەکەم کوڕی مونزیربەگ کوڕی حەسەن بەگی ئەردەلأنی) لە نێوان ساڵەکانی (1458ز، 1495ز) حوکمڕانیکردووە،سنووری قەڵەمڕەوەکەی هەتا (زێی گەورە)ی گرتۆتەوە،بەرامبەر بە (جەلائیری)یەکان وەستاوە و توانیویەتی باکووری وڵاتەکەی کەپێشتر ئەوان دەستیانکێشاوە بەسەریدا ئازادبکات،لێرەدا پێویستە باسێك لەوە بکەین زۆربەی ئەو سەرچاوانەی دەربارەی مێژووی ژیانی حوکمڕانەنی هەورامان نووسیویانە،باسیان





(بەگە مامونە) ناویانبردووە، بەڵام ئەو لەشکرکێشییە هیچ ئەنجامێکی نەبووە و پاش سێ ساڵ لـە گـەمارۆدانی مەڵبەنـدی حـوکمڕانی (مـیر سـەعید)، لـە ئـەنجامی بـەرەنگاری سـەختی هەورامییـەکان و بڵاوبوونـەوە نەخۆشـی و برسـێتی لـەناو لەشـکرەکەیدا، (مـەئموون بـەگ) شکستیهێناوە و زۆربەی لەشکرەکەی تیاچوون.

خەڵکی هەورامان بەرامبەر بەو سەرکەوتنەیان دوودێڕ شیعریان وتووە هەرچەندە ناوی بێژەری ئەو شیعرە لە هیچ سەرچاوەیەکدا نـەهاتووە، بـەڵام تـا ئێـستاش ئەوشـیعرانە وێـردی سەر زمانی خەڵکی ناوچەکەن و گـەواهی ئازایـەتی و جەسـووری هەورامییـەکانن، ئەمـەش ئـەو دوو دێڕە شیعرەیە:

نـە بـەگە مـاموونە نە تەیموری لەنگ

هیچ کەس هۆرامان نەگرتەن بەجەنگ[لح]

غێر جە خان ئەحمەد بەگلەری خانان

ئـــەویچ بە دهـــۆ[لح] گرتـــەن هـــۆرامـــان

پاش حوکمڕانییەکی دوورودرێـژ کـە مـاوەی (100) سـاڵی خایانـدووە، ساڵی (799ك – 1396ز) کۆچی دواییکردووە.

### 5 سلێمان بەگ

پاش کۆچی دوایی میر سەعید (سلێمان بـەگ)ی کـوڕی بـووە بـە حـوکمڕانی هـەورامان، (سـلێمان بـەگ) کەسـێکی دەروێـشمەشرەب بـووە هـەم لـە رووی کـردەوە و هـەم لـە رووخـسار و رووالەتەوە، بە دادپـەروەری و دەسـتبڵاوی بـەناوبانگبووە، لەسـەردەمی ژیـانی ئـەم حوکمڕانـەدا

---

لەوەکردووە گوایا (مەئموون بەگی ئەردەڵانی) لە سەردەمی حوکمڕانی (میر سەعید= جیاشا ساڵی 1298ز1396ز) هێرشـیبردۆتە سـەر هەورامان،لەلایـەکی تـرەوە ئـەو سەرچـاوانەی باسـی مێـژووی ئەردەڵانییـەکاننیان کـردووە نووسیویانە: (مـەئموون بـەگی یەکـەمی ئەردەڵانی) لـە ساڵانی (1458ز1495ز) حوکمیکردووە،کەواتـە دەبێـت ئـەو لەشکرکێـشییە لەسـەردەمی (مـەئموون بـەگی یەکـەم)دا نەبووبێت،وەوئەگـەر لەسـەردەمی نـاوبراودا بووبێـت دەبێـت حـــوکمڕانی هـــەورامان (ســـلێمان بـــەگی کـــوڕی مـــیر ســـەعید) بووبێـــت نـــەوەك خـــودی (مـــیر ســـەعید). (ئەیوب)

[52] (د.محمد علی سلطانی) ایلات وطوایف کرمانشاهان جلد (1) ص (32).

[لح] دهـۆ: وشـەیەکی هەورامییـە بـەمانای (فرتـوفێڵ و تەڵەکـەبازی) دێت،لـەم شـیعرەدا بـاس لـەوە کـراوە هـیچ داگیرکارێك نەیتوانیوە هەورامان بگرێت،بێجگە لە (خان ئەحمەد خان) کە لە ڕێی فرتوفێڵەوە بەومەرامە گەیشتووە.

**(مـیر تـەیمووری گورگـانیﷺ) بـە لەشـکرێکی زۆر گـەورەوە بـە هەورامانـدا تێپـەڕیوە بـەرەو شـارەزوور، (سـڵێمان بـەگ) زانیویـەتی بەرەنگاربوونـەوەی لەشـکرێکی وەهـا گـەورە لـە توانـای خـەڵکی هەورامانـدا نییـە، ئـەوەی بەباشـزانیوە نەچـێتبەگژیاندا و لـەو کەینوبەینـە هـەورامان**

---

ﷺ (میر تـەیمووری گورگـانی ناسراو بە تـەیمووری لـەنگ)،باوکی نـاوی (تـەرقائی)یە،ساڵی (1335ز) لـە شـاری (کـەش)ی وڵاتـی (ماوەڕائەننـەهر= ئۆزبەکـستانی ئێـستا) لـەدایاکبووە،نازناوی گورگـانی لـەوەوە وەرگرتـووە یەکـەم کەسێك لـە باپیرانی کـە بڕوای بەدیینی ئیسلام هێناوە نـاوی (کراشـەڕنۆیـان) بـووە و زاوای کەسێك بـووە بـەناوی (جغتائی)،لەبەر ئـەوەی خـەڵکی ناوچەکە بە زاوایان وتـووە (گورگـان) ئیتر نـاوی گورگان بە سـەر ناویراودا بڕاوە و وەچە بەوەچە وەك نازناو بۆبنەماڵەکـەیان ماوەتەوە،لـە تەمـەنی (20)سـاڵیدا و پاش کۆچی دواییی (میر یـەخماق)ی مـیری سـەمەرقەند حـوکمڕانی سـەمەرقەندی گرتۆتەدەسـت،لەتەمەنی (22)سـاڵیدا پـاش کوشـتنی شـەش سـەربازی بەدەستی سەربازانی (میری بوخارا) و قایلنەبوونی ئەو میرە بەوەی خوێنیانبدات،هێرشیبردۆتە سەر (شـاری بوخـارا) کـە دەکەوێتـە خۆرئـاوای ئۆزبەکـستانی ئێـستاوە،میرەکەی کوشـتووە و ئـەو شارەشـی خـستۆتە سـەر قـەڵمڕەوی دەسـەڵاتەکەی،یەکێکە لـەو جیهانگیرانـەی لـە مێـژوودا بـەخوێن رشـتن و دڵرەقـی ناوبانگیدەرکردووە،لـە لەشکرکێشییەکانیدا بـۆ سـەر وڵاتـە جیاجیاکـان چـەندین شاری خاپوورکردووە،خەڵکەکـەیانی بەکۆمـەڵ کوشـتووە و منارەی لە کەللەسەری خەڵکی ئەو شارانە درووستکردووە،هەر بۆ نموونە منارەکەی (شاری سـەبزەوار)،ی مەڵبـەندی حـوکمڕانی (خوراسـان)ی لەوسـەردەمەدا کـە لـە (150)هـەزار کەللەسـەری خـەڵکی ئەوشـارە دروسـتیکردووە،زۆربەی وڵاتـەکانی ئـەو سـەردەمەی داگیرکـردووە وەك: ( وڵاتـی ماوەڕائەننەهر،ئاسـیای بـچووك،خوراسان،وڵاتی فـارس،تووران،وڵاتی رۆم،عێراقـی ئێـستا،وڵاتی شام،هیندوسـتان....هتـد)،نـاوبراو بێجگـە لـەوەی سـەرکردەیەکی سـەربازی کەموێنـە بـووە، زانـاو عـاریفیش بووە،زمانـەکانی (عەرەبی،فارسـی،تورکی) زانیون،هـەموو قورئـانی پـیرۆزی لەبەربووە،لەسـەرەوە بـۆ خـوارەوە و بـە پێـچەوانەشەوە ئایەتـەکانی خوێندۆتـەوە و زۆر شـارەزای فقـەی ئیـسلامی بووە،هـەر وڵاتێکـی گرتبێـت زانـاو ئـەدیب وعاریفـەکانی ئـەو وڵاتـەی کۆکردۆتـەوە و لەسـەر بابەتـە جیاجیاکـانی ئـەو سـەردەمە کـۆڕی پرسـیار و وەڵامـی لەگـەڵیان سـازداوە و جـۆرە تاقیکردنەوەیـەکی کـردوون لەوانـە: ( شەمـسەدین محەممەدی ناسراو بە خواجەحافیزی شیرازی،سەباحەدینی سونبولی) لەشیراز و (ئیبن خەلدون،بەهائودینی حـەڵبی) لە وڵاتی شام،لەو تاقیکردنەوانەدا هەندێکجار لە بابەتـەجیاحیاکانی پەیوەست بە لێکدانـەوەی ئایەتـەکانی قورئان و فقەی ئیسلامییەوە ژمارەیەك لە زانایانی بۆڕداون.

(مـیر تـەیمووری گورگـانی) بـڕوای وابـووە بـۆ بڵاوکردنـەوەی دیینـی ئیـسلام دەجەنگیٚ،لـەم بـوارەدا وتوویـەتی: هەرکەسێك لەگەڵ مندا بووە و لە جەنگدا کوژراوە پلەی وەکو پلەی گەشمەردەکانی سەرەتای ئیسلامە.

ناوبراو لە لەشکرکێشییەکدا بۆ سەر (وڵاتی چین) نەخۆشکەوتووە،لە ئەنجامی نەخۆشییەکە ماوەی حـەوت رۆژ ئیفلیج بووە،پاش ئەو ماوەیە ساڵی (1405ز) لە تەمەنی (70) ساڵیدا مردووە.

بڕوانـــە (مارســـل بریـــۆن)، بیرەوەریـــەکانی تـــەیمووری لـــەنگ، وەرگێڕانـــی لـــە فارســـیەوە حەمـــەی حەمەسەعید،پێداچوونەوەی عوسمان محەممەد هەورامی، لاپەڕە (29).





**بێزیاندەرچووە، پاش (99) ساڵ حوکمڕانی ساڵی (898ك – 1492ز) کۆچی دواییکردووە و (بارام میرزابەگ)ی کوڕی لەشوێنی دانراوە[55].**

**شایانی وتنە حوکمڕانەکانی هەورامان لە سەرەتاوە هەتا سەردەمی (بارام میرزا بەگ)یش هە تەنها بە بڕیاری شورای خەڵکی هەورامان، دوور لە دەسەڵاتی داگیرکارانی کوردستان دانراون بەڵام پاشان ئەو دیاریکردنە لەلایەن (شاکانی صەفەوی، سوڵتانەکانی عوسمانی، میرەکانی ئەردەڵان وبابان)ـوە دەستیتێوەردراوە و ئیتر زۆرجار فەرمانی ئەوان یەکالاکەرەوە بووە بۆ دیاریکردن و لادانی حوکمڕانەکانی هەورامان.**

### 6، بارام میرزابەگ

**پاش کۆچی دوایی سلێمان بەگ، (بارام میرزابەگی کوڕی) لەلایەن (شورای خەڵکی هەورامان)ەوە بۆ حوکمڕانی هەورامان هەڵبژێردراوە، هەر لەو سەروبەندەدا (شا طهماسبی صەفەوی) چۆتە سەر تەختی حوکمڕانی ئێران، (بارام میرزابەگ) خۆی بە شای صەفەوی ناساندووە، هەر لەوێشەوە توانیویەتی کچی (ئەڵاوێردیخان)ی حاکمی لوڕستان بخوازێت، لەو ژنە سێ کوڕی بووە بەم ناوانە: (سلێمان بەگ، حسێنقولی بەگ، عەباسقولی بەگ)[56].**

**(بارام میرزابەگ) لە سەردەمی حوکمڕانییەکەیدا کەسێکی دادپەروەر و مرۆڤدۆست بووە، هەمیشە هەوڵیداوە خەڵکان ئاسوودە و خۆشگوزەران بن، بە ئایینناسی و دینداری ناوبانگی دەرکردووە.**

**حوکمڕانی (بارام میرزابەگ) هەتا ئەو دەمەی (خان ئەحمەدخانی ئەردەڵانی) لە صەفەوییەکان هەڵگەڕاوەتەوە بێگێرمەوکێشە بەڕێوە چووە، بەڵام دواتر بەو شێوەیە نەماوە.**

**(خان ئەحمەدخان) هەر لەبەر ئەوەی زۆر رقی لە (شا وێردیخان)ی ژنبرای (بارام یرزا بەگ) بووە ئەمیشی بە رقەکەیەوە تێگلاندووە، دەستیداوەتە دوژمنایەتیکردنی (بارام میرزابەگ) و لەشکرێکی گەورەی رێکخستووە بۆ پەلاماردانی هەورامان، سەرەتا ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکانی هەورامانی داگیرکردووە و پاشان گەمارۆی قەڵای هەورامانیداوە، دەربارەی ئەو**

---

[55] (د.محمد علی سلطانی)، ایلات وطوایف کرمانشاهان، جلد (1)، ص (32).

[56] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (33).

**گەمارۆدانە جیاوازی بەرچاو لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەن[*]، لە ئەنجامی گەمارۆدانەکەدا هەموو ڕێگاکانی هاتوچۆکردن بۆ (قەڵای هەورامان) بڕاون و لە هەموو ڕوویەکەوە فشاریانخستۆتە سەر جەنگاوەرەکانی هەورامان، ئازوخە و پێداویستی ڕۆژانەیان تا ئاستێکی مەترسیدار کەمیکردووە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو حاڵەتە (بارام میرزابەگ) بیری لە دوو نەخشە کردۆتەوە بەم شێوەیە:**

**1 هەوڵبدات لەگەڵ (شاوێردیخانی لوڕستان) بڕۆن بۆلای (شا عەباسی صەفەوی)و داوای کۆمەکی لێبکەن، پاشان لەگەڵ لەشکری شادا هێرشبەرنە سەر لەشکری (خان ئەحمەدخان).**

**2 یاخود (بارام میرزا بەگ) لەگەڵ ژمارەیەك لە دەستوپێوەندەکانی بە دزییەوە (قەڵای هەورامان) چۆڵبکەن و ڕوو بکەنە (شارەزوور).**

**پاش تاوتوێکردنی هەردوو نەخشەکە، (بارام میرزا بەگ) و زۆربەی سەردارانی هەورامی کە لەناو قەڵاکەدا بوون ئەوەیان بەباش زانیوە نەخشەی دووەمیان جێبەجێبکەن، دەربارەی جێهێشتنی (قەڵای هەورامان) لەلایەن (بارام میرزابەگ) و ژمارەیەك لە هاوڕێکانییەوە بۆچوونی جیاواز هەن، هەندێك پێیانوایە پاییزی دواساڵی گەمارۆکە ئەلقەی گەمارۆدان بەتەواوی سستبووە، (بارام میرزابەگ) و هاوەڵەکانی توانیویانە ڕۆژێك پاش نوێژی نیوەڕۆ قەڵا جێبهێڵن، هەندێکی تریش دەڵێن لە شەودا قەڵاکەیان جێهێشتووە، ئەوەی شایانی باسکردنە هەردوو بۆچوونەکە لەسەر ئەوە کۆکن ئەوانەی لە قەڵاکە هاتوونەتە دەرەوە، لەڕێی (کەماجەڕ)ەوە گەیشتوونەتە (گوندی سەرگەت[**])، لەوێشەوە بەرەو گوندی (هەرشەل)ی**

---

**[*] دەربارەی ماوەی گەمارۆدانی (قەڵای هەورامان) لەلایەن (خان ئەحمەدخان)وە،مامۆستا محەممەد ئەمین هەورامانی لە کتێبی مێژووی هەوراماندا نووسیوویەتی: هەندێك دەڵێن بۆ ماوەی سێ ساڵ دەوری قەڵای هەورامانی داوە،هەندێکی دیکەش دەڵێن گەمارۆدانەکە بۆ ماوەی حەوت ساڵ درێژەیکێشاوە.**

**د. محەممەد عەلی سوڵتانی لە کتێبی (ایلات و طوائف کرماشاهان)دا نووسیویەتی: گەمارۆی هەورامان بەپێی ریوایەتێك سێ ساڵ و بەپێی ریوایەتێکی تریش دە ساڵ درێژەیکێشاوە.**

**[**] (گوندی سەرگەت) یەکێکە لە گوندە دێرینەکانی (هەورامانی لهۆنبەشی ئێراق)،لە سەر ڕۆشنایی هەندێك لە سەرچاوە مێژووییەکان (مزگەوتی سەرگەت) زیاتر لە هەزار ساڵ بەر لە ئێستا مەڵبەندێکی دیاری خوێندنی دیینی و زانستەکانی ئەو سەردەمە بووە،هەر لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچییەوە ژمارەیەك کەسێتی ناودار لەم گوندەدا ژیاون کە هەموویان لە سەر ڕێو ڕەچەی (یارسان= کاکەیی) بوون لەوانە:**

**1 ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد ناسراو بە (باوا ناوسی جاف)**





ناوچەی زەهاو رۆیشتوون بەمەبەستی حەوانەوە و پشوودان لەو شوێنەدا لایانداوە، بێئاگابوون لەوەی کەسێك لە پیاوانی (بارام میرزابەگ) شەو لەکەناری (گوندی سەرگەت) خۆی لێیان دزیوەتەوە و رۆیشتووە بۆ (قەڵای زەڵم)، لەوێ سەرپاکی رووداوەکەی بۆ (خان ئەحمەدخان) گێڕاوەتەوە، بۆ ئەوەی باوەڕیپێبکەن جوتێك پێڵاوی (بارام میرزابەگ)ی وەك بەڵگە بۆ سەلماندنی قسەکەی لەگەڵ خۆی بردووە، (خان ئەحمەدخان) فەرمانیداوە (عەلی بەگی زەڵمی) بە سێسەد سوار و تەواوی چەك و چۆڵە و تفاقی جەنگییەوە شوێنیانهەڵگرێت و لەهەر شوێنێك توشیانبوون دەستیان لێبوەشێنن[59]، کاتێك (عەلی بەگی زەڵمی) و تفەنگچییەکانی گەیشتوونەتە گوندی هەرشەل، (بارام میرزابەگ) و هاوڕێکانی لە گەرمەی پشوودان و حەوانەوەدابوون، پاش روودانی شەڕ لە نێوانیاندا (بارام میرزابەگ) بریندار بووە، لەبەر سەختی برینەکەی و خوێنبەربوونێکی زۆر پاش کەمێك کۆچی دواییکردووە. مردنی (بارام میرزابەگ) بووە بە هۆی پەرش و بڵاوبوونەوەی هاوڕێکانی.

لێرەدا پێویستە بگەڕێنەوە سەر ئەوەی کاتێك (بارام میرزابەگ) و هاوڕێکانی قەڵای هەورامانیان جێهێشتووە (سلێمان بەگ)ی گوڕی لەگەڵ پاشماوەی تفەنگچییە هەورامییەکان لەناو قەڵاکەدا ماونەتەوە، شەوانە هێرشی کتوپڕیان بردۆتە سەر لەشکری (خان ئەحمەدخان) و زەرەر و زیانی زۆریان لێداون، ئەو زەرەر و زیانانە بە تەواوی (خان ئەحمەدخان)یان بێتاقەتکردووە و لەئەنجامدا ناچار بووە خۆی جڵەوی سەرکردایەتی لەشکرەکەی بگرێتە دەست، بەڵام ئەم رێگەیەش بێسوود بووە و هیچی بۆ نەکراوە، بۆیە بیری لە نەخشەیەکی تر کردۆتەوە، بەوەی لەڕێی هەڵخەڵەتاندن و پیلانگێڕانەوە بتوانێت بە مەرامەکەی بگات، لەم بوارەدا نامەیەکی بۆ (سلێمان بەگ) نووسیوە و (مەلا ئیسماعیلی قازی) وەك ناوبژیوان بە دیارییەکی زۆرەوە ناردووە بۆ قەڵای هەورامان و پەشیمانبوونەوەی خۆی لەکارەساتی کوشتنی (بارام میرزابەگ) بۆ (سلێمان بەگ) ئاشکرا کردووە، لەنامەکیدا باسی لەوە کردووە گوایا

---

2 دایە خەزانی سەرگەتی

3 قازی نەبی سەرگەتی

4 ئەحمەد کوڕی فەتاحی جاف

بڕوانە (د. صدیقی بۆرەکەیی) مێژووی وێژەی کوردی – بەرگی یەکەم لاپەڕەکانی (126،129،131،132)

[59] ملا عباللە قاضی اورامانی تاریخ اورامان ص (64) دەستنووس.

ناوچەی (کەمەرە و شامیان) دەخاتە ژێر فەرمانی سلێمان بەگەوە، سوێندیشی خواردووە تا گیانی زیندووە دوژمنایەتی هەورامییەکان ناکات.

لە ئەنجامی نامەکەی (خان ئەحمەدخان) و ئەو هەموو دڵدانەوەی (سلێمان بەگ)ە جۆرە ئاشتییەك کەوتۆتە نێوانیانەوە، پاش ماوەیەك (سلێمان بەگ) لەگەڵ چەند ریشسپی و پیاوماقوڵێکی هەورامان بە مەبەستی سەردانی (خان ئەحمەدخان) هاتووە بۆ (زەڵم)، ئەوەش دەرفەتێکی زێڕین بووە بۆ(خان ئەحمەدخان) بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکەی، بۆ ئەو مەبەستە چەند کەسێکی بۆ پێشوازیکردنی (سلێمان بەگ) دیاریکردووە و پێیڕاگەیاندوون خێوەتێکی قەشەنگ بڕازێننەوە بۆ پشوودانی، هاوکات پییوتوون پاش ئەوەی بەرەو خێوەتەکە دەیبەن دەستبەجێ زنجیریبکەن و بەنووسەرە تایبەتەکەیدا نامەیەك بۆ تفەنچییەکانی هەورامان بنووسن بەوەی بۆ رۆژی دوایی لەگەڵ خۆرهەڵاتندا پێویستە هەموو تفەنگچییەکانی هەورامان لەقەڵا بێنە خوارەوە هەتا چاویان بەنوێنەرانی (خان ئەحمەد خان) بکەوێت، هەر بە گەیشتی هەورامییەکان بۆ شوێنی مەبەست لەشکری (خان ئەحمەدخان) هێرشیان بۆ بردوون و غافڵگیرانە هەر لەو شوێنەدا سەدکەسیان لێکوشتوون، پاشان لەشکر چوونەتە ناو قەڵاکەوە هەرکەسێك لەنەوەی (بەهمەن = نەوەی حوکمڕانانی هەورامان) بووە لە ژن و پیاو و پیروکەنج و منداڵ هەموویان کوشتوون، بەوەش (خان ئەحمەد خان) توانیویەتی دەست بەسەر هەوراماندا بگرێت[60].

## 7 عەباسقولی سان

---

[60] (د.محمد علی سلطانی) ایلات وطوایف کرمانشاهان جلد (1) ص (34).

(عەباسقولی سان[لمجتر]) کوڕی بارام میرزا بەگ، دایکی کچی (ئەلاوردیخانی لوڕ)ە، پاش کوشتنی باوکی (سلێمان بەگ)ی برای و خزمەنزیکەکانی، لەماڵی باوکی دایکی لە لوڕستاندا گەورە بووە و پێگەیشتووە، ناوبراو خوێندەوارێکی چاك بووە و شارەزاییەکی زۆری لە تەفسیری قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) هەبووە، هەردوو زمانی عەرەبی و فارسی بەباشی زانیوە، لەڕووی سەربازییەوە کەسێکی ئازا و لێهاتووبووە، لەشەڕی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و صەفەویەکاندا لەگەڵ خاڵۆی (شاوردیخانی دووەم) شانبەشانی صەفەوییەکان دژی عوسمانییەکان جەنگاوە و ئازایەتی کەمنموونەی نواندووە، ئەو ئازایەتییەی بووە بەمایەی ڕەزامەندی و ستایشکردنی لەلایەن (شا ئیسماعیلی صەفەوی)یەوە، کاتێك (شا ئیسماعیل) هەواڵی ڕەچەڵەکی (عەباسقولی بەگ)ی پرسیوە (شاوردیخان) رازی کوشتنی (بارام میرزابەگی باوکی و سلێمان بەگی براگەورەی) وخزم و کەسوکارە نزیکەکانی بۆ (شا ئیسماعیل) گێراوەتەوە، باسی لەوەش کردووە لەو کاتانەوە ئیتر (عەباسقولی بەگ وحسێنقولی بەگی برای) هاتوون بۆ (لوڕستان) و لەوێ پەروەردەکراون، کاتێك (شا ئیسماعیلی صەفەوی) ویستوویەتی خەڵاتی (عەباسقولی بەگ) بکات، ناوبراو داوای ئەوەی لێکردووە حوکمڕانی هەورامانی پێببەخشێ، ئەویش ڕەزامەندی خۆی نیشانداوە و فەرمانیداوە (عەباسقولی بەگ) بە سانی هەورامان دابنرێت و رووەو ماوا و شوێنی باوباپیرانی بگەڕێتەوە، بە گەیشتنی (عەباسقولی سان) بۆ هەورامان لەلایەن خەڵکی ناوچەکەوە پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێکراوە و ئامادەبووانی ڕێوڕەسمی پێشوازییەکە بڕیاریانداوە دڵگەرمانە پشتگیریبکەن.

(عەباسقولی سان) لەماوەی حوکمڕانیەکەیدا یەکێکبووە لە هەڵکەوتووترین سانەکانی هەورامان و گۆڕانکاری بەرچاوی بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی خەڵکی ئەو سەردەمەی هەوراماندا هێناوە، هەر ئەوەش ناوبانگێکی زۆر باشی بۆ پەیدا کردووە، ناوبراو تەنیا کەسێك

---

[لمجتر] دەربارەی کەسێتی (عەباسقولی سان) لەسەرتاوە و چۆنیەتی گەیشتنی بە (لوڕستان) جیاوازی بەرچاو لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەن،لەم بوارەدا (ئێدمۆندز) لە کتێبی (کرد| ترك| عرب)دا ئەوەی خستۆتەڕوو گوایا کاتێك (بارام میرزابەگ) کوژراوە دایکی (عەباسقولی سان) بەسەردان لەماڵی باوکیدا بووە لە (لوڕستان) و دووگیان بووە،پاش ماوەیەك (عەباسقولی سان) لەدایکبووە.

کەچی (مامۆستا محەممەد ئەمین هەورامانی) لە کتێبی (مێژووی هەورامان)دا وای دەرخستووە گوایا (عەباسقولی سان و حسێنقولی بەگی برای) لەکاتی کوژرانی باوکیاندا لە گوندی (هەرشەل) مێرد منداڵی تەمەن (13 و 14) ساڵان بوون و لەماڵی باپیرەیاندابوون لە لوڕستان ( باپیرەیان لەسەری دایکیانەوە=باوکی دایکیان) ،(موزەفەرخانی ڕەزاو)یش لە کتێبی (پاسدارن مرز ایران = تأریخ اورامان) هەمان بۆچوونی باسکردووە.

بووە لەناو هەموو حوکمڕانەکانی هەوراماندا کە لە (کتێبی مێژووی سەردەمی صەفەویەکان)دا ناوی هێنراوە، هەروەها لەکاتێکدا مێژوونووسە ئەردەڵانییەکان ناوی هیچ حوکمڕانێکی ناوچەکانی کوردستان و سانەکانی هەورامانیان نەهێناوە تەنیا لەو کاتانەدا نەبێت باسیان لە لەشکرکێشیەکانی خۆیان بۆسەر ئەو حوکمڕانانە کردبێت، بەڵام (عەباسقولی سان) ناوی خۆی خستۆتە سەرزمانی مێژوونووسە ئەردەڵانیەکان.

(عەباسقولی سان) ئاوەدانیەکی زۆری خستۆتە هەورامان، لەکاتێکدا گشت موڵك و سامانی خۆی تەنها چەند پارچە باخێکی بچوك بوون لە گوندەکانی(بڵبەر، سلێن، شاری هەورامان)، یەکێك لە باخەکانی بەباخچە ناویدەرکردووە و یەکێکیشیان بە (هاڵە هاجب).

ئەم سانە لە وەرزی زستاندا لە (عەباسئاوا) نیشتەجێبووە، وەرزی هاوینیشی لە (کراویەدۆڵ و قولەی پیرڕۆستەم) گوزەراندووە، پایزانیش هەندێکجار لە (شاری هەورامان) و جارجاریش لە (گوندی نوێن)دا بووە. ساڵی (1075ك=1664ز) لەسەردەمی حوکمڕانی (شا عەباسی دووەم) کۆچی دواییکردووە و سێ کوڕی لەشوێن بەجێماوە ئەمەش ناوی کوڕەکانیەتی: (بارام بەگ، محەممەد بەگ، سلێمان بەگ)، پاش کۆچی دواییی (عەباسقولی سان) بارام بەگی کوڕی بووە بە سانی هەورامان.

### 8| بارام سان

ساڵی (1075ك – 1664ز) عەباسقولی سان کۆچی دواییکردوە، ژمارەیەك لە ریشسپی و پیاوماقوڵانی هەورامان یاداشتێکیان بۆ شای ئێران نووسیوە و داوایانلێکردووە یەکێك لە کوڕەکانی (عەباسقولی سان) بکرێت بە سانی هەورامان، لە وەڵامی یاداشتەکەیاندا شای ئێران فەرمانیداوە دوو کوڕی ناوبراو لە کۆشکی شادا ئامادەبن، بۆ ئەو مەبەستەش (بارام بەگ و محەممەد بەگ) رۆیشتوون بۆلای شا، بە فەرمانی شا (بارام بەگ) کراوە بەسانی هەورامان، محەممەد بەگی براشی دانراوە بە حوکمڕانی (کەلاتەرزان، کەمەرە، کوڕگوێز).

(بارام سان) پاش دەستبەکاربوونی لە حوکمڕانییدا دەستیداوەتە فراوانکردنی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی، لەسەردەمی ژیانی ئەم سانەدا تەنها لەشاری هەرماندا هەزار خێزان ژیاون، هەموو خێزانێکیش چەك و چۆڵەی خۆیان هەبووە، بەو مانایە لە هەموو کاتێکدا هەزار جەنگاوەر لەبەردەم ساندا ئامادەباشبوون، بێجگە لە (1500) جەنگاوەر کە لە گوندەکانی تری

**هەوراماندا نیشتەجێبوون[62]، هەرکاتێك ویستبێتی لەماوەیەکی کەمدا دووهەزارو پێنج سەد جەنگاوەری لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە.**

**بە مەبەستی فراوانکردنی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی سەرەتا پەلاماری شارەزووری داوە و چەندکەسێکی ناوداری بناری شارەزووری کوشتووە، لەوانە سێ کەس لە پیاوماقوڵانی (زەڵم)، پاشان فەرمانیداوە لەسەرووی جۆگەی دەڵێنەوە جۆگەیەکی گەورە دروستبکرێت بۆ ئەوەی رووبەرێکی زۆر لەو زەوییانەی لەناوچەکەدان بکرێن بە زەوی بەراو، پاشان ئەو جۆگەیە بە (سوڵتانەجۆ) ناویدەرکردووە.**

**باری ژیان و گوزەرانی خەڵکی هەورامان لەسەردەمی حوکمی ئەم سانەدا بەپێچەوانەی سەردەمی حوکمڕانی (عەباسقولی سانی باوکی) بووە، چونکە ئەو باج و سەرانانەی لەسەردەمی باوکیدا لەسەر خەڵکی ناوچەکە هەڵگیرابوون جارێکی تر گەڕێنراونەتەوە، بەوەش باری سەرشانی خەڵك قورسبووە.**

**(بارام سان) پاش (35)ساڵ لە حوکمڕانی ساڵی (1103ك – 1691ز) کۆچی دواییکردووە، (10) کوڕی لەشوێن بەجێماوە پاش خۆی بەم ناوانە: (قاسم سان، گەنجعەلی سان، عیسا سان، جەمشید سان، حسەین بەگ، نەجەف بەگ، مەنسوور بەگ، سەیفقولی بەگ، عەلیخان بەگ، مەنوچەر بەگ[63]).**

### 9 قاسم سان

**پاش کۆچی دوایی (بارام سان) ساڵی (1103ك – 1691ز) بە فەرمانی (شا ئیسماعیلی صەفەوی) قاسم بەگی کوڕی بارام سان بەسانی هەورامان دانراوە، ناوبراو خوێندەوارێکی باش و دەستێکی باڵای هەبووە لە خۆشنووسی و شیعر هۆنینەوەدا، زۆر حەزی بە ئاوەدانکردنەوەی قەڵەمڕەوەکەی بووە بەتایبەت شوێنە ئاوادەکان، کچی والی کوردستانی خواستووە، ئەوەش بووە بە هۆی پتەوکردنی پەیوەندی نێوانیان، پاش کۆچی دوایی هاوسەرەکەی کچی (عەلیقولی خان)ی گەورە کێشکچی شای ئێرانی خواستووە و لەو ژنەی کوڕێکی بووە[64].**

---

[62] ملا عبدالله قاضی اورامانی، تاریخ اورامان، ص (84)، دەستنووس

[63] ملا عبدالله قاضی اورامانی، تاریخ اورامان، ص (86)، دەستنووس.

[64] هەمان سەرچاوەی پێشوو (89).

لەسەردەمی حوکمڕانی (قاسم سان)دا جۆرە بشێوییەك کەوتۆتە ناو بنەماڵەی حوکمڕانی هەورامان، براکانی کە ژمارەیان نۆ کەس بوون هەریەکەیان لەشوێنی خۆیەوە داوای سانییەتی کردووە، دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانیش هەروەك پیشەی هەمیشەییان هەوڵیانداوە ئاگری دووبەرەکی لەنێوانیاندا خۆشبکەن و بەگژ یەکتریاندا بدەن، ئەوەش کاریگەرییەکی خراپی لەسەر بارودۆخی ناوچەکە هەبووە.

ساڵی (1110ك – 1698ز) قاسم سان لەشەڕێکدا لە مەریوان بەدەستی لەشکری (کرمانج کوژراوە)، پاش کوژرانی ناکۆکی و ململانێکانی نێوان کوڕەکانی (بارام سان) گەرمتر بوون و دەسەڵاتدارانی (عوسمانی، بابانی، ئەردەڵانی)یش هەریەکە و لەلای خۆیانەوە ئاگری ئەو ناکۆکیەیان خۆشکردووە، (گەنجعەلی سان) کە پاش (قاسم سان) حوکمیگرتۆتە دەست تەنها سێ ساڵ حوکمیکردووە و ساڵی (1113ك – 1701ز) کۆچی دواییکردووە پاش ئەویش (عەباس سانی کوڕی گەنجعەلی سان) تا ساڵی (1116ك – 1704ز) حوکمڕانیکردووە، پاشان (عیسا سانی کوڕی بارام سان) حوکمیگرتۆتە دەست، ساڵی (1128ك – 1715ز) بەدەست دوان لە براکانی بەناوی (حسێن بەگ و جەمشید بەگ) کوژراوە، لەژێر سایەی (جەمشید بەگ)دا ئیسماعیل بەگی کوڕی قاسم سان کە لە گوندی (دزڵی) نیشتەجێبووە، بە سانی هەورامان دانراوە، تا ساڵی (1138ك – 1725ز) بەردەوامبووە، پاشان (جەمشید بەگ) ماوەی شەش ساڵ حوکمی هەورامانی کردووە و نازناوی سانی دراوەتێ، (جەمشید سان) بەدەستی (یوسف بەگ) کوژراوە، (مەنوچەر بەگ)ی کوڕی حوکمیگرتۆتە دەست و بووە بە سانی هەورامان، بەڵام ماوەی حوکمڕانییەکەی زۆر کورت بووە و پاش دوو مانگ (حەمەیوسف بەگی کوڕی ئیسماعیل سانی کوڕەزای قاسم سان) بەسانی هەورامان دانراوە، ناوبراو پیاوێکی ئازا و لێهاتوو بووە بەڵام کورتەباڵا بووە، بۆیە (نادرشا) نازناوی (سانە بچکۆلە)ی داوەتێ، ساڵی (1165ك – 1751ز) لە تەمەنی (99) ساڵیدا کۆچی دواییکردووە[65].

10 **حسێن سان**

---

[65] (د. محمد علی سلطانی) ایلات وطوایف کرمانشاهان جلد (1) ص (38).





پـاش ئـەوەی فـەرمانی سـانیەتی هـەورامانی لهـۆن لەلایـەن دەسـەلاّتدارانی دەولـّەتی عوسمانییـەوە بـەناوی (حـسێن سـان) دەرکـراوە، بـۆ بـەرگرتن لـە زیـادبوونی دەسـتتێوەردانی عوسمانییەکان لەحوکمڕانی هەوراماندا (سوبحان وێردی خانی ئـەردەلاّنی[**]) لـەخولی چـوارەمی حوکمڕنییەکەیـدا لـەنێوان سـالاّنی (1158-1160 ك=1745-1747 ز)، لەلایـەن خۆیـەوە فەرمانی حـوکمڕنی (لهۆن)ی بـۆ (حـسێن سـان) و حـوکمڕانی (رەزاو)یـشی بـۆ (خەسـرەو بـەگی کوڕی بارام سانی دووەم) دەرکردووە، (حسێن سـان) دۆسـتایەتی پتـەوی لەگـەڵ عوسمانییەکانـدا بووە،،هـەر بـەفیتی ئـەوانیش هەوڵیـداوە حـوکمڕانی هـەموو هـەورامان بخاتـە ژێـر دەسـەلاّتی خۆیەوە، بۆ بەئەنجامگەیانـدنی مەرامەکەشی پیلانـی کوشـتنی (خەسـرەو بـەگ)ی داڕشـتووە و لەسـەر خـوانی میوانـداری سالّی (1160 ك=1747 ز) بەخەنجـەر کوشـتوویەتی، پـاش ئـەوەی هـەواڵی کوشـتنی (خەسـرەوبەگ) گەیـشتۆتە لای (بـارام سـانی دووەم)، ئـەویش بـۆ تۆڵـە سـەندنەوەی خـوێنی کوڕەکـەی خـۆی ئامـادەکردووە، بۆهـەمان مەبەسـت (خالیـد بـەگی بـرای خەسـرەو بـەگ) لـەناکاودا هەڵمـەتێکی بردۆتـە سـەر(مـۆمن خـان بـەگ و مـستەفا بـەگ) کەهەردووکیان بـرای (حـسێن سـان) بـوون، لـە شـیرین خـەودا هـەردووکیانی کوشـتووە، (حـسێن سان)یش لە گوندی (هانە گەرمڵە)وە بەرەو گوندی (نەوسوود) هەڵهاتووە، لەوێـشەوە ڕۆیـشتووە بـۆ (سـنە) و داوای کۆمـەکی لـە (سـوبحان وێـردی خـانی والی) کـردووە، والـیش پێیڕاگەیانـدووە پێویستە هەتا بەهار دان بەخۆیدابگرێت، بەهاری سالّی (1161 ك=1748 ز) (سـوبحان وێـردی خـان) فـەوجی کوردسـتان و چـەند فەرماندەیـەکی سـەربازی لەوانـە (محەممـەد عـەلی سـولّتان، مورتەزا قـولی بـەگ)ی خـستۆتە ژێـر فـەرمانی (حـسێن سـان)ەوە، لەبەرامبەریـشدا (بـارام سـانی دووەم) داوای کۆمـــەکی لـــە پاشـــای بابـــان کـــردووە، پـــاش ئـــەوەی پاشـــای بابـــان داواکـــەی پەسەندکردووە، بەلەشکرێکی زۆرەوە ڕووبەڕووی (حسێن سان) بۆتەوە، پاش شەڕێکی سەخت و خوێناوی کەتیایا هەردوو لەشکر هەتا دووا گولە جەنگاون، جەنگاوەران دەستیانداوەتە شمـشێر، (بـارام سـانی دووەم و حـسێن سـان)یـش بەهـەمان شـێوە ڕووبـەڕووی یـەکتری بوونەتـەوە،

---

[**] (سـوبحاوێردی خـانی ئـەردەلاّنی) یـەکێکبووە لـەو حوکمڕانانـەی ئـەردەلاّنی کەچـەند جارێـك لەسـە تـەختی حـوکمڕانی کوردسـتان دانـراوە و لادراوە،چـوار خـول حـوکمڕنیکردووە بـەم شـێوەیە: (1734-1737ز، 1738-1748ز).

لەئەنجامدا (حسێن سان) کوژراوە، پاش ئەو شەڕو وهەرایە بۆ جارێکی ترحوکمڕانی (لهۆن و ڕەزاو) بەیەکپارچەیی کەوتۆتە ژێر دەستی (بارام سانی دووەم).

لێرەدا پێویستە قسە لەسەر ئەوە بکەین، ساڵی (1161 ك=1748 ز) حەسەن عەلی خانی ئەردەڵانی بووە بەمیری ئەردەڵان، ناوبراو زۆر ڕێزی لە (بارام سانی دووەم) گرتووە، لەکاتی هێرشە گەورەکەی لەشکری زەنگنە بۆ سەر قەڵەمڕەوی ئەردەڵان، بەسەرکردایەتی( ئیمامقولی خان)، جەنگاوەرەکانی (بارام سانی دووەم) هاوکاری ئەردەڵانییەکانیان کردووە و شکستیان بەلەشکری زەنگنە داوە.

(بارام سانی دووەم) لەدرێژەی ساڵانی حوکمڕانییەکەیدا، بەهیچ شێوەیەك دۆستایەتی دەسەلأتدارانی عوسمانی و پاشاکانی بابانی نەکردووە و گوێینەداونەتێ، هەرلەبەرئەوە عوسمانییەکان (نەزەر عەلی سان) کەلەژێر فەرمانی ئەواندا بووە، لەبەرامبەریدا قوتیانکردۆتەوە و فەرمانی سانیان بۆ دەرکردووە، بەلأم (بارام سانی دووەم) هەتا ساڵی (1165 ك) گوێینەداونەتێ و بوارینەداوە ناوبراو لەهەورامانداحوکمڕانیبکات، ساڵی (1168 ك=1754 ز) کاتێك (سەلیم پاشای بابان) لەگەڵ سوپای (زەند)دا کەوتۆتە جەنگەوە، (نەزەرعەلی سان) هاوکاری بابانییەکانی کردووە، لە مەیدانی جەنگدا بەدەستی (محەممەدخانی زەند) بریندار کراوە و لەهەمان ساڵدا کۆچی دواییکردووە[67].

11 **خالید سان**

پاش کۆچی دوایی (بارام سانی دووەم)، خالیدبەگی کوڕی بووە بەسانی هەورامانی لهۆن و ڕەزاو، دەربارەی حوکمڕانی (خالیدسان) مەلا عەبدوڵای قازی نووسیویەتی:

ئەم سانە یەکێکبووە لە بەتواناترین و لێهاتووترین سانەکانی هەورامان، ناوبراو پیاوێکی ئایینناس ورۆحسۆك ومرۆڤدۆست و زیرەك بووە، هاوینی لە(کێوی ساردانی) و زستانیشی لە(هانەگەرمڵە) بەسەربردووە، لە سەردەمی حوکمڕانی ئەم سانەدا (حەیدەر بەگی بەڵخی[*]) کە ژنبرای مووسابەگ بووە بە نوێنەری دەوڵەت لە (نەوسوود) دانراوە، زۆربەی

[67] (د. محمد علی سلطانی) ایلات وطوایف کرمانشاهان جلد (1) ص (39).

[*] ماموٚستا حەمەمین هەورامانی لە کتێبی (مێژووی هەورامان)دا بە (حەیدەربەگی بەڵخەیی) ناویبردووە.

هادی بەهمەنی لە کتێبی (پەیامی هەورامان)دا بە (حەیدەربەگی بەڵخی) ناوی هێناوە.

لە کتێبی (ایلات و طوائف کرماشاهان)دا بە (حەیدەربەگ بەلخیە) ناویهاتووە.

سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن گوایا (حەیدەر بەگ) کەسێکی نەمەکحەرام بووە، بەرامبەر بە (خالید سان) دڕدۆنگ و دڵپیسبووە، لەگەڵ (سلێمان پاشای بابان) ڕێککەوتووە لەسەر ئەوەی بەناوی میوانییەوە (خالید سان) بانگبکەن بۆ شارەزوور و لەوێ زەفەری پێبەرن، (خالید سان) بێئاگا لە مەرامی (سلێمان) پاشا) هاتۆتە شارەزوور، پاش پێشوازی لێکردن لە شوێنی تایبەت بۆ حەوانەوە دانراوە و تاکیانخستووە، هاوکات چەند کەسێکیان راسپاردووە دەستبەجێ باڵبەستیانکردووە و خراوەتە زیندان، پاش سێ ڕۆژ بەدەستی (حەیدەر بەگی بەڵخی) ساڵی (1170 ك=1756 ز) کوژراوە.

پاش کوژرانی (خالید سان) لەلایەن پاشای بابانەوە، فەرمانی حوکمڕانی هەورامان بۆ(حەیدەر بەگ) دەرکراوە، ناوبراو تەنها کەسێکبووە لە مێژووی سانەکانی هەوراماندا لە بنەماڵەی (بەهمەن) نەبووبێت و حوکمڕانی هەورامانی کردبێت، پاش تەنها شەش مانگ لەدەستبەکاربوونی بەدەستی (محەممەد بەگی برای خالید سان) لەناو حەرەمسەرای خۆیدا کوژراوە[شمتر].

## 12ـ رەزا سان

(رەزاسان) یەکێکبووە لە سانە هەرە ناودار و زۆر ناسراوەکانی هەورامان، نەخشێکی زۆرگەورەی لەسەر ڕووداوەکانی ناوچەکە هەبووە، ساڵی (1170 ك= 1756 ز) پاش کوشتنی (خالید سان) بەدەستی (حەیدەربەگ) ناوێك کە لەسەردەمی حوکمڕانی (خالید سان)دا جێگری حوکمڕانی (نەوسوود) بووە، (خالید سان) بە باڵبەستراوی کوژراوە. بەرامبەر بەو تاوانە (محەمەد بەگی برای خالید سان) لە تۆڵەی خوێنی براکەیدا پاش شەش مانگ (حەیدەربەگ)ی کوشتووە، پاش گەیشتنی هەواڵی کوژرانی (حەیدەربەگ) بە پاشای بابان، ناوبراو فەرمانیداوە (رەزاسانی کوڕی حسەین بەگ کوڕی بارام سانی یەکەم کوڕی عەباس قولی سان) بە سانی هەورامان دابنرێ، هەر لەوکاتەدا (خەسرەوخانی والی) کە بەفەرمانی (حەمەحەسەن خانی

---

[ا] بە بڕوای ئێمەش ئەم حەیدەربەگ ناوە بەڵخەیی نییە،چونکە زۆر دوورە تاوانکاری لەو شێوەیە لەخەڵکێکی ناسراوی ناوچەکە بووەشێتەوە. (ئەیوب)

[69] (د.محمد علی سلطانی)ـ ایلات وطوایف کرمانشاهانـ جلد (1)ـ ص (39).

قاجـار) کـراوە بـە والی کوردسـتان، فـەرمانی حـوکمڕانی سەرانـسەری هـەورامانی بـەناوی (ڕەزاسان)ەوە دەرکردووە.

(ڕەزاسان) کەسێکی لەناو حوکمڕانەکانی سەردەمی خۆیدا کەمنموونە بـووە، لـەم بـارەوە مەلا عەبدوڵای قازی نووسیویەتی:

(ڕەزاسان) پیـاوێکی خـاوەن شـەهامەت و دینـدار و زۆر شـارەزای وردەکارییـەکانی بـواری حـوکمڕانی بـووە، لەسـەردەمی حـوکمی نـاوبراودا خـەڵکی هـەورامان خۆشـگوزەرانبوون و ناوچـەکەش پێـشکەوتنی بەرچـاوی بـەخۆوە بینیـوە، هـەرزانی هـەموو کـونجێکی هـەورامانی گرتۆتەوە، بـۆ نموونـە: هۆقەیـەك ڕۆن دراوە بـە نـۆ شـایی[1]، هۆقەیـەك لۆکـە بەسـێ عەباسـی، جوتێـك کڵاشـی پیاوانـە بـە سێ شایی، کرێـی دوورینـی کەوایـەکی پیاوانـە یـەك شـایی بـووە و ژنانـەش دووشـایی، شـتەکانی تـریش هـەموویان نرخیـان دیـاریکراو بـووە، کـەس نـەیوێراوە گرانفرۆشیبکات، یان پارەی زیاد لەخەڵك بسێنێ، هەروەها لەسـەردەمی حوکمڕانی ئـەم سـانەدا هەموو ئەو کەسانەی کە بێلانە و دەرەتان و پەککەوتووبوون، لەناو مزگەوتەکاندا بـەخێوکراون و نان و پۆشاك و پاپۆشیان پێدراوە.

لەماوەی دەسەڵاتی (ڕەزاسان)دا خـەڵك بەتـەواوی بـەئارامی ژیـاون و پاڵیـان لێداوەتـەوە، چونکە هیچ نائارامییەك رووی لەناوچەکە نەکردووە، هەموو بەگزادەکانی هەورامان لە شـوێنی دەسـەڵاتی خۆیانـدا لەگـەڵ خەڵکەکـەدا بـە ڕێکـوپێکی هەڵسوکەوتیانکردووە، هـیچ کەسـێکیان نەیتوانیوە ستەم بەرامبەر بە خەڵك بکات و لە گوندەکانیشدا چەندین کاری خێرییـانکردووە و خزمەتگوزارییەکان پەرەیانسەندووە، هەربۆ نموونە: (مـۆمن خـان) مزگـەوتی گونـدی (نـەروی) ئاوەدان و پۆشـتە کردۆتـەوە، (حەمەتایەربـەگ) پـردی (عەباسـئاوا)ی نۆژەنکردۆتـەوە، هـەر بـە فەرمانی (ڕەزاسان) دووپردی تر لە(شامیان) دروستکراون، هەموو ئـەو منداڵانـەی کـە بێـدایك وباوك بوون لەلایەن (ڕەزاسان)ەوە بەخێوکراون.

---

[1] (شایی= شاهی) و (عەباسی) دوو جۆر سکەی ئەو سەردەمە بوون و نرخیان زۆر نزمبووە،بۆ نموونـە پێـنج شایی تەنها یەك قەران بوون،پەنجا عەباسی یەك تمەن.





بەدرێژایی ڕێگەی گەڕانەوەمان لە(سنە)وە بۆ (جوانڕۆ) بێزاری و بێتاقەتییەکی زۆر بە (حەمەسەعید سان)وە دیاربوو، جاری وا هەبوو فرسەنگێک* دەکەوتە پێشمان و جاریش هەبوو دوو فرسەنگ لەدوامانەوە دەڕۆیشت، بەڵام من لەمەسەلەی ئەو دواکەوتن و پێشکەوتنەی خۆم تێنەدەگەیاند و زۆر لەلام مەبەستبوو ئەو دڵنیابێت کەهیچ نیازێکی خراپمان لەگەڵیدا نییە، بۆیە هەر هەواڵیشم نەدەپرسی هەتا بچووکترین گومان لەلای نەمێنێت، کاتێك گەیشتینە (جوانڕۆ) پێموت لە هەرشوێنێك دڵت پێوەیە لەوێ دانیشە چونکە هیچ بەدگومانییەك لەسەرت نییە، پاش دوو سێ ڕۆژ لەمانەوە و پشوودانیان لەسەر ئەوە ڕێککەوتین گوایا مانەوەی ئەوان لە (جوانڕۆ)دا هیچ سوودێکی نییە، بۆیە باشتر وایە بنێرێت بە شوێن (ئەوڕەحمان بەگی) کوڕیدا بێت بۆ لایان هەتاکو هەموویان پێکەوە بۆ (نەوسوود) بگەڕێنەوە، هاتنی ناوبراو بۆ (جوانڕۆ) لای من زۆر مەبەستبوو، چونکە فەرمانی شاهانە تەئکیدیکردبوو لەسەر ئەوەی پێویستە بەهەر نرخێك بووە بکوژرێت.

(حەمەسەعید سان) لەسەر بنەمای قسەکەی (عەلی ئەکبەرخان) ناردوویەتی بە شوێن (ئەوڕەحمان بەگ)دا و پاش چوار ڕۆژ گەیشتۆتە (جوانڕۆ)، کاتێك چووەتە لای (عەلی ئەکبەرخان) بەگەرمی پێشوازیلێکردووە و میهرەبانی بەرامبەری نواندووە، دیارە ئەوەش جۆرە فریودانێك بووە هەتا پیلانی لەناوبردنی سەردارە هەورامییەکان بەئاسانی جێبەجێبکرێت، هەر لەیەکەم شەوی گەیشتنی (ئەورەحمان بەگ) پاش ئەوەی چوار سەعات شەو بەسەرچووە، (عەلی ئەکبەرخان) ناردوویەتی بە شوێن (تەیفووربەگ)ی جێگریدا کەنۆکەرێکی دڵسۆزی خۆی بووە و فەرمانی نهێنی شاهانەی بە پێویستی لەناوبردنی (حەمەسەعید سان و کوڕەکانی) لای درکاندووە، هاوکات فەرمانیپێداوە کە دەبێت ئەو بەو ئەرکە هەڵسێت، پاش قسەو باسێکی زۆر گەیشتوونەتە ئەم بڕیارە:

ژمارەیەك تفەنگچی لە نۆکەرە دڵسۆزەکانیان بە چەك و تیغی جەنگییەوە هەرلەشەوەوە لەناو (قەڵای جوابڕۆ)دا حەشاربدرێن، کاتێك سفرەی نانخواردنی بەیانی دادەنرێت (سەیفوور بەگ) بێت بۆ لای (عەلی ئەکبەر خان)، شکات لە هەندێك لە نۆکەرەکانیان بکات گوایا سەرکێشییانکردووە و بەقسەیان نەکردووە بۆیە هەتاکە تەمێنەکرێن ناننا‌خوات، (عەلی ئەکبەرخان)یش دەربچێت گوایا بۆ تەمێکردنی نۆکەرەکان هاوکات لەولاوە ئەو

---

* (فرسەنگ= فرسەخ) بەرامبەرە بە (6) کیلۆمەتر.

نۆکەرانەی لە نـاو قـەڵادا حەشـاردراون، هەڵبکوتنـە سـەر سـفرەکە (حەمەسـەعید سـان و مـیرزا بابەکر)ی دەمراستی سان بکوژن.

لەگەڵ دانـانی سـفرەی نـانی بـەیانی، پیلانـە گڵاوەکـەی (عـەلی ئەکبـەر خـان وسـەیفوور بەگی جێگری) دەقا و دەق جێبەجێکراوە، (حەمەسەعید سان) بـە تیـغ و (مـیرزا بابـەکرا) بـە گولە کوژراون[88]، (فەیرۆزە خانم) کاتێك ئـەو هەواڵـەی بیـستووە روومـەتی خوێنـاویکردووە و پرچی خۆی رنیوەتـەوە، چـووە بـۆ لای (عـەلی ئەکبـەر خـان) و زۆر تکایلێکردووە (ئـەورەحمان بەگ) نەکوژێت،لەم بارەوە (عەلی ئەکبەر خان) وتویەتی:

کە (فەیرۆزە خـانم)م بـەو شـێوەیە بینـی بڕیارمـدا کوشـتنی (ئـەورەحمان بـەگ) چـەند رۆژێـك دوابخـەم بۆیـە ئەویـشم نـارد بـۆ زینـدان بـۆلای (رۆسـتەم بـەگی بـرای)، بـەلاّم هـەرگیز نەمـدەتوانی لەمەسـەلەی کوشـتنی چاوپۆشـیبکەم، چـونکە ئـەوە فـەرمانی شـاهانە بـوو و هـەر دەبوو جێبەجێبکرایە، پاش رۆژێـك فەرمانمـدا (رۆسـتەم بـەگ) ئازادبکـەن چـوونکە بەتەمـەن منـداڵبوو، مۆڵەتیـشمدا (فـەیرۆزە خـانم) پرسـەی مێردەکـەی دابنێـت و ماوەشمـدا بـە وەکیـل و بەگزادەکانی (جوانڕۆ) سەردانیبکەن و دڵیبدەنەوە،

(عەلی ئەکبەرخان)ی خائین و ئەڵقـە لـەگوێی داگیرکـاران وەك چـۆن لـە زمـانی خۆیـەوە وتوویـەتی کـە هـەرگیز نـەیتوانیوە لـە کوشـتنی (ئـەورەحمان بـەگ) چاوپۆشـیبکات، کەسـێکی ناسـراو بـە (فـەڕاش غـەزەب)ی راسـپاردووە چـووە لەزینـدانـدا (ئـەورەحمان بـەگ)ی بـە پشتوێنەکەی خۆی خنکاندووە، هاوکات خەبەریداوە بە (فەیرۆزە خانم) گوایـا فریـای کوڕەکـەی بکەوێت چونکە لەئەنجامی کوشتنی باوکیدا دەیەوێت خـۆی بخنکێنێـت، بـەڵکو بـچێت بـۆلای و هەوڵبـدات پەشـیمانیبکاتەوە، بـەلاّم هـەروەك چـۆن (عـەلی ئەکبـەرخان) ویـستوویەتی، هـەتاکو دایکی گەیشتۆتە زیندان (ئەورەحمان بەگ) بێگیانبووە.

(عەلی ئەکبەر خان) پاش کوشتنی (حەمەسەعیدسان ومیرزا بابەکر وئـەورەحمان بـەگ) فەرمانی حوکمڕانی (هەورامانی لهۆن)ی بۆ (رۆستەم بەگ) دەرکردووە، هەموو وردەکارییـەکانی پەیوەسـت بەچـۆنییەتی جێبـەجێکردنی پیلانەکەشـی لەنامەیەکـدا بـۆ (شـازادەفەرهاد مـیرزا) نووسـیون، (شـازادە)ش لەنامەیەکـدا بـۆ دەربـاری (شـای قاجـار) داوای پاداشـتدانەوی بـۆ (عـەلی

[88] (د.محمد علی سلطانی)، ایلات وطوایف کرمانشاهان، جلد (1)، ص (57).

ئەکبەرخان) کردووە، لە سەر رۆشنایی نامەکەی (فەرهادمیرزا) نازناوی (شەرەف ئەلمولك) بە (عەلی ئەکبەرخان) دراوە.

دەربارەی رازی کوشتنی (حەمەسەعیدسان) جیاوازی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەن، (مەردۆخ، محەممەد تایەری سوڵتانی[شمسم]، میرزا شوکروڵای سنەندەجی لە زاری عەلی ئەکبەرخان)ەوە، هەریەکەو بەجۆرێك باسیانکردووە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو تاوانە پەڵەیەکی رەشی شەرمەزاری وناپاکی و بێبەڵێنییە بەڕووی داگیرکاران و چڵکاوخۆرەکانیانەوە.

لەم بوارەدا پێویستە ئاماژەبدەین بەوەی (مەردۆخ) نووسیویەتی: (مەلا ئەحمەدی نۆدشی و مەلاعەزیزی هەورامی) کە لەسەر بەڵێنی (عەلی ئەکبەرخان) بە ئازارنەگەیاندن بە سەرداره هەورامییەکان، لەگەڵ (ئەوڕەحمان بەگ) و بنەماڵەی (حەمەسەعید سان) لە (نەوسوود)ەوە بۆ (جوانڕۆ) رۆیشتوون، پاش کوشتنی سان و کوڕەکەی پرسیاری ئەوەیان لێکردووە ئایا بۆچی بەڵێنەکەی خۆی جێبەجێنەکردووە؟ گوایا ئەویش دەقی ئەو تەلگرافەی پیشانداون بڕیاری کوشتنی(حەمەسەعیدسان وکوڕەکەی) تێدابووە، ئیتر هەرلەوێ (مەلاعەزیز) فەرمانی کفنکردن و بەخاکسپاردنیداون.

---

[شمسم] لێرەدا بە پێویستی دەزانین رازی کوشتنی (حەمەسەعیدسان و ئەوڕەحمان بەگ و میرزا بابەکر) لەزاری هەریەك لە (مەردۆخ و محەممەد تایەری سوڵتان)یەوە بخەینە بەرچاوی خوێنەران.

[1] مەردۆخ وتویەتی: گوایا لە ناو گۆڕەپانی تەلاری حکومەت لەناو قەڵای جوانڕۆ یەك لەدوای یەك تیربارانکراون.

[2] محەممەد تایەری سوڵتانی وتویەتی: پاش دەستگیرکردن و زنجیرکردنیان،(عەلی ئەکبەخان گشت تیرە و خێڵەکانی ناوچەکەی بۆ (قەڵای جوانڕۆ) بانگکردوون،فەرمانیپێداون کە پێویستە هەموویان لە رێوڕەسمی کوشتنی (حەمەسەعید سان)دا بەشداریبکەن،بەپێچەوانەوە هەمان چارەنووس چاوەڕێیاندەکات،هاوکات فەرمانیداوە (حەمەسەعیدسان) لە گۆڕەپانی (قەڵای جوانڕۆ)دا بەدارێکەوە شەتەکدراوە،سەرەتا داوایکردووە لە (مستەفاسان) کە پێویستە ئەو یەکەم خەنجەری لێبدات،کاتێك ناوبراو بۆ ئەو مەبەستە لێیچۆتە پێشەوە (حەمەسەعیدسان) وتویەتی: کوڕم (عەلی ئەکبەرخان) دەیەوێت دەستی هەموتان بەخوێنی من سووربکات،بۆ ئەوەی هەورامان و جاف و جوانڕۆ دەستیانبچێتە خوێنی یەکترییەوە و هەرگیز یەکگرتوو نەبن،من لە لایەکەوە کوڕم هەیە لەلایەکی تریشەوە مامی تۆم و بەساڵاچووم،پاش ئەو قسانە (مستەفاسان) چۆتەدواوە،بە (عەلی ئەکبەرخان)ی وتوە گوایا کوشتنی (میرزا بابەکر) بەو بسپێرێت،بەڵام ئاشکرایە (عەلی ئەکبەرخان) بەپلەی یەکەم کوشتنی (حەمەسەعیدسان)ی مەبەستبووە،هەر بۆیە دەستبەجێ فەرمانیداوە (میرغەزەب) گورزێکیکێشاوە بەسەری (سان)داو پاشان ئامادەبوانیش هەریەکە و خەنجەرێکیان لە جەستەی بێگیانی داوە.

**15ڕۆستەم سان**

(ڕۆستەم سان) یەکێکی ترە لەسانە بەناوبانگەکانی هەورامان هەر لە ڕۆژی دەستبەکاربوونیەوە کەوتۆتە هەوڵی ئەوەی سزای ئەو کەسانە بدات کە لە دوور، یان لە نزیکەوە دەستیان لە کوشتنی (حەمەسەعیدسان)دا هەبووە، بەڵام ئەم کارەی زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆ بردووە بەڕێوە نەوەك تاوانکاران دەرك بە مەرامی ئەو بکەن و لەناوچەکە دوور بکەونەوە، سەرەتا ناوی ئەو کەسانەی لای خۆی تۆمار کردووە و پاشان بەرنامەیەکی بۆ لێدانیان گەڵاڵە کردووە، کاتێك دەستیکردووە بە جێبەجێکردنی بەرنامەکەی، لە تەنیا شەوێکدا هەموو ئەو کەسانەی دەستگیر کردووە و زیندانیکردوون، لەزیندانیدا ئەشکەنجەیداون و سوکایەتیپێکردوون، دەگێڕنەوە مەسەلەی سزادانی ئەم تاوانبارانە لای ناوبراو ئەوەندە بایەخیپێدراوە، شەوێك لە شەوەکانی زستان هەورە بروسکە داویەتی لە ماڵ و باڵاخانەکەی، لەو کاتەدا بووە بە هەراوهوریا و خزمەتکار و کارەکەر و تفەنگچیەکان هاتوون بەیەکدا و سەریان لێتێکچووە و ترسیان لە گیانی سان و ماڵ و خێزانەکەی بووە، کەچی ناوبراو پێیوتوون واز لە هەموو شتێك بهێنن، هەرچی دەبێ باببێت، بەڵام ئاگاتان لێبێت ئەو زیندانیانە هەڵنەیەن، لەسەر ڕۆشنایی هەندێك لەو سەرچاوانەی باسیان لە حوکمڕانەکانی هەورامان کردووە، ئەو کەسانەی بە فەرمانی (ڕۆستەم سان) زیندانیکراون تەنها کەسێکیان بە زیندوویی لە زیندان نەهاتوونەتە دەرەوە.

دەربارەی ئەم سانە (محەممەد تایەری سوڵتانی) نووسیویەتی: (ڕۆستەم سان) بۆ دیدەنی (حەزرەتی شێخ عومەری بیارە) لەگەڵ ژمارەیەك لە تفەنگچییەکانی ڕوویکردۆتە (بیارە)، لەو کاتەدا گەیشتۆتە (بیارە) یەکێك لە براکانی بەناوی (جافربەگ) کەپێشتر لەترسی توندڕەوی (ڕۆستەم سان) هاتۆتە (بیارە) و لەماڵی خاڵوانیدا ژیاوە، بەڕێکەوت بەرامبەر ئەو ساباتەی بۆ پشودانی (سان) ئامادە کراوە تێپەڕبووە، هاوکات (سان) لەگەڵ (حەزرەتی شێخ عومەری بیارە) بەقسەکردنەوە خەریکبووە، (جافربەگ) کە (ڕۆستەم سان)ی بینیوە ترسێکی زۆری لێنیشتووە و شڵەژاوە، بەڵام (حەزرەتی شێخ عومەری بیارە) بانگیکردووە بۆلای خۆیان و پێیوتووە وەرە بۆلامان و خۆت مەدزەرەوە ئێمە چاوەڕوانی تۆین، چوونکە کاتێك کردمانی بە (سانی

هەورامان) ئەوانـەش ئێستا دوژمـنتن دەبـن بـە دۆسـتت و بەگوێتدەکـەن، قسەکانی (حـەزرەتی شێخ عومەری بیارە) بەتەواوی (رۆسـتەم سـان)یـان بێتاقـەتکردووە، بـەجۆرێك بـە درێـژایی ئـەو ماوەیـە لـە (بیـارە) ماوەتـەوە هـەر بـیری لـەو قـسانە کردۆتـەوە، لـەکاتی گەڕانەوەشـدا لەگـەڵ داروودەسـتەکەی لەشـوێنێك کـە پێیـدەڵێن (هانـە کاشمـا) تفەنگـچییەك بـەناوی (عەبدولـسەمەد ناسـراو بـە سـەمەڵە) کـە زۆر جێگـەی بـاوەڕی بـووە و رەشمـەی ئەسـپەکەی بەدەسـتەوە بـووە، دەرکی بە بێتاقەتییەکەی کـردووە و لـەو بـارەوە لێیپرسـیوە گـەورەم بـۆ بێتاقـەتی، ئـەویش لـە وەڵامدا وتوویەتی:

مـن دەزانم (شـێخ عومـەری بیـارە) پیـاوی خوایـە و هـەرگیز درۆناکـات، (جـافر بـەگ) دەبێت بە سەرەخۆرەم، دەڵێم بە (قوڕە) بیدزێت و بیـشارێتەوە، (سـەمڵە)ش پێیوتـووە گـەورەم تۆ ئەوەندە کەسێکی خەرافی نـەبوویت (شـێخ عومـەری بیـارە) فەرمایـشتێکی کـردووە و مـەرج نییە بەو شێوەیە بێت، حەزدەکەیت با من سوێندت بۆ بخـۆم (سـانییەتی هـەورامان) وەك گیـای بەهار بێنرخببێت، ناگاتە لای (جافربەگ) ئیتر دڵت بێخەمبێت و هیچ گوێیمەدەرێ.

رۆسـتەم سـان سـاڵی ($1310$ك=$1892$ز) لـە رۆژی زەماوەندکردنیـدا لەگـەڵ کیـژێکی هاواری بەدەستی (حسێن بەگی کوڕی مستەفا سانی دووەم ناسـراو بـە حـسێنە زەرد) لـە گونـدی هاوار کوژراوە، شایانی باسکردنە دایکی (حسێنە زەرد) پاش کوژرانی (مـستەفا سـانی هاوسـەری) شوویکردۆتەوە بە(رۆستەم سان)، ئەو دەمە (حسێنە زەرد) منـداڵبووە و لەگـەڵخۆی بردوویـەتی بۆ ماڵی نوێی، ناوبراو لـەماڵی (رۆسـتەم سان)دا گـەورە بـووە وپێگەیـشتووە، زۆر نزیکبـووە لـە سـانەوە و یـەکێکبووە لـە خزمـەتکارەکانی، دواجـار گوایـا لـە تۆڵـەی خـوێنی باوکیـدا (رۆسـتەم سان)ی کوشتووە.

### 18/حەمەساڵح سان

پاش کوژرانی (رۆستەم سان) لە گوندی هـاوار، (حەمەسـاڵح بـەگی کـوڕی) لەگـەڵ (مـەلا عەزیزی قازی) دەستبەجێ چوون بۆ (شاری سنە) و لەوێ چاویان بە (ئـەمیر نیـزام گەڕووسـی) حاکمی کرماشان و سنە کەوتووە، پاش ئەو چاوپێکەوتنە فەرمانی سـانیەتی (هـەورامانی لهۆن) بۆ (حەمەساڵح بەگ) دەرکراوە، هاوکـات (محەممـەد بـەگ)ی مامـەی کـراوە بـە جێگـری، مـاوەی چـەند مانگێـك لەگـەڵ (محەممـەد بـەگ) پێکـەوە حکمڕانییـانکردووە، پاشـان بـە فیتـی چـەند کەسێك لە خراپەکار ودڵڕەشانی نزیك بـە خـۆی (محەممـەد بـەگ)ی کوشـتووە و چـووە بـۆ نـاو بـەگزادەکانی (تـەخت و ڕەزاو)، ئـەوانیش لەشـکریان لـە گەڵیـدا نـاردووە و هاتووەتـەوە سـەر

(نەوسوود)، پاش گەڕانەوەی بۆ (نەوسوود) سێ ساڵ حوکمڕانیکردووە، پاشان بە دەستی (مەحموود بەگی کوڕی عوسمان بەگ و جافر بەگی مامەی) لە تۆڵەی خوێنی (محەممەد بەگ)دا لە سەر سفرەی میوانداری کوژراوە، لەکاتی پرسەکەیدا ژنان بۆ لاواندنەوەی ئەم دێڕە شیعرەیان وتووە:

**مامۆ مەحموودیم نمیەنش باڵم          مامۆ جافریم بڕیەنش تاڵم**

### 19جافرسان

(جافرسان کوڕی حەمەسەعیدسان کوڕی عوسمان سان کوڕی عەلیمەردان سان کوڕی حسێن سان کوڕی دەروێش بەگ کوڕی بارام سانی یەکەم کوڕی عەباسقولی سان کوڕی بارام میرزابەگ کوڕیسلێمان بەگ کوڕی میر سەعید کوڕی میر جەلالەدین کوڕی باریە بەگ کوڕی بەهمەن)ە، دایکی ناوی (فەیرۆزە خانمی کچی شێخ عەلی عەبابەیلێ)یە، کاتێك باوکی کوژراوە دایکی پێیەوە دوگیانبووە، پاش شەش مانگ لە تەکیەی (دەوڵەتئاوای روانسەر)دا لەدایکبووە.

(جافرسان) یەکێکە لە سانە زۆر بەناوبانگەکانی هەورامان، پاش (عەباسقولی سان و هەسەن سان) بە سێیەم سانی هەورامان دەژمێردرێت هەم لە رووی کەسێتی و هەم لە رووی ئەو دەسەلاًت و ناو و نەنگەوە کە بۆخۆی درووستیکردووە، ماوەی حوکمڕانی ئەم سانە پڕبووە لە رووداوی سیاسی و سەربازی و کۆمەلاًیەتی گەورە لە (ئێران)دا، هەر لەسەردانی راپەڕینی مەشرووتەکانەوە و لەشکرکێشی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر ناوچە خۆر نشینەکانی ئێران پێش رێککەوتنی سنووری ساڵی (1914ز) لە نێوان هەردوو دەوڵەتی (عوسمانی و قاجاری)یەوە بیگرە، هەتا دەگاتە بەرپابوونی جەنگی جیهانی یەکەم و سەرهەڵدانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری (ساڵی 1917ز) و پاشان هەرەسهێنانی حوکمی دەوڵەتی قاجاری وسەرهەڵدانی دەسەلاًتی پەهلەوی و رووبەڕووبوونەوەی زۆرینەی خێلە کوردەکانی ئێران لەگەڵ دەسەلاًتی تازە، لە ناو ئەو گشت رووداوانەدا (جافرسان) بەرامبەر بەداگاگیرکاران وەستاوەتەوە، بەوپەڕی توانەوە سەرکردایەتی هەورامییەکانی لهۆنی کردووە، پشتئەستوور بەچیا سەرکەشەکانی هەورامان و خەڵکە قارەمانەکەی هەردەم شۆڵی شۆڕش و بەرەنگار بوونەوە بووە.





لە سەر ڕۆشنایی ژمارەیەك لەو سەرچاوانەی باسیان لە حوکمڕانەکانی هەولرامان کردووە، (جافرسان) شەش ژنی هێناوە، سیان لەژنەکانی ژنی سانەکانی پێش خۆی بوون، لەو شەش ژنە (36) منداڵی بووە وا لە خوارەو ناوی ژن و منداڵەکانی دەنووسین:

1 دەوڵەت خانم، کچی (ئەحمەد سان) بووە منداڵکانی ئەمانە بوون:( ئەحمەد کە بەمنداڵی مردووە، ئەحمەد بەگ هاوناوی کوڕی یەکەمی، حەمەڕەشید بەگ، مستەفا بەگ، حەمەین بەگ، خاوەرخانم).

2 خاڵخاس خانم، خەڵکی گوندی (نۆدشە) بووە منداڵەکانی ئەمانە بوون: (فەتحولاّبەگ، ئەلیمحەممەد بەگ، حەمەتەقی بەگ، حەمەسەلیم بەگ کە بە منداڵی مردووە، مینا خانم، شکۆفە خانم، حەبیبە خانم).

3 بەیزا خانم، کچی (مەلا عەزیزی نەوسوود) و پێشتر هاوسەری ڕۆستەم سان بووە، منداڵەکانی لە جافرسان ئەمانە بوون: (حەمەسەعید بەگ، حەسەن بەگ، ئۆلغەفوور بەگ، مەحمود بەگ، سلێمان بەگ).

4 حەنیفە خانم کچی (شێخ محەممەدی عەبابەیلێ) و پێشتر هاوسەری (محەممەد بەگ) بووە کە بە (حەمیتە) ناسراوە، منداڵەکانی ئەمانە بوون: (حەمەعەلی بەگ ناسراو بە پاشا، پیرۆزە خانم).

5 شکۆفە خان کچی (مەلا عەلی نەوسوودی) ناسراو بە (نصیر الدیوان)، منداڵەکانی ئەمانە بوون: (حەمەڕەزا بەگ، ناسر بەگ کە بە منداڵی مردووە، ناسربەگی هاوناو، سەیفولاّ بەگ، مەنسووربەگ، مریەم خانم، لەیلا خانم، ئامینە خانم، حەمیدە خانم).

6 فاتمە خانم، پێشتر هاوسەری (مەلا عەبدولاّ) بووە، منداڵەکانی ئەمانە بوون: (کەریم سان، قادر بەگ، غەفار بەگ، ئەمنە خانم).

o

## تایبەتمەندییەکانی کەسێتی جافرسان

ئەگەر بەویژانەوە و بۆ مێژووفسەبکەین، هیچ زیادە رۆیی و پیاهەڵدانێکی تێدانییە بڵێین(جافرسان) جیاواز لە زۆربەی حوکمڕانە ناوچەییەکانی سەردەمی خۆی کەسێتییەکی تایبەتمەندی هەبووە، دەتوانین ئەو تایبەتمەندییە لەچەند خاڵێکدا بخەینە روو بەم شێوەیە:

1ـ نەهێشتنی ئەو ناکۆکیانەی بە فیتی داگیرکارانی کوردستان و ئەڵقە لە گوێکانیان بۆ ماوەیەك

بوونەتە مۆتەکە بۆ سەر بنەماڵەی سانەکانی هەورامان، لەم بوارەدا کوڕ و کوڕەزاکانی سانەکانی پێش خۆی لە خۆی کۆکردوونەتەوە، دڵخۆشیکردوون و یەکیخستوون بەشێوەیەك توانیویەتی بۆ گشت کارێکی گرنگ کە هێزی چەکداری پێویستبێت، سەد سوار لە (کوڕ، کوڕەزا،برا، برازا، ئامۆزا) وخزمە نزیکەکانی تری کۆبکاتەوە و لە پێشەنگی تفەنگچییەکانیدا بن.

2ـ نەهێشتنی هیچ جۆرە بشێوی و نائارامییەك و دروستکردنی پێکەوە ژیان لە ناو خەڵکی ناوچەکە و دەوروبەریدا.

3ـ چاککردنی باری ژیان و گوزەرانی خەڵکی هەورامانی لهۆن و هەوڵدان بۆ ئاوەدانکردەی قەڵەمڕەوی دەسەلاتەکەی.

4ـ کۆکردنەوەی خەڵکانی بەهرەمەند لە هەموو بوارەکاندا و سوودوەرگرتن لە بەهرەو توانایان بۆ بەرژەوەندی گشتی.

5ـ رێزگرتن لە خەڵکانی (زانا، ژیر، بەئەزموون، ریشسپی) و دروستکردنی جۆرە شوورایەك لێیان بۆ راوێژپێکردن و راوەرگرتنیان لە هەموو مەسەلە گرنگ و بڕیارە چارەنووسسازەکاندا و کاریگەرترکردنی رۆڵیان لەناو خەڵکی هەوراماندا.

6ـ بەدرێژایی ساڵانی حوکمڕانییەکەی بەردەوام لە ململانێ و رووبەڕووبوونەوەدا بووە لەگەڵ گشت ملهوڕ و داگیرکاران و هەرگیز سەری بەرزی لەبەردەمیان نەوینەکردووە.





7- هەوڵی خۆدەوڵەمەنـدکردن و مـاڵ و سـامان پێکـەوەنانی نـەداوە، بـۆ سـەلماندنی ئـەم ڕاستییەش دوو نموونە دەخەینە پێشچاوی خوێنەری بەڕێز:

یەکەم- ساڵی(1926ز) (میر عەبـدوڵاخانی تاماسـبی) بۆدڵدانـەوە و خۆنزیککردنـەوە لـە سەرداره هەورامییەکان سەردانی ناوچـەکانی (ڕەزاو، نەوسـوود)ی کـردووە، کاتێـك گەیـشتووەتە (نەوسوود) کە مەڵبەندی حوکمڕانی (هەورامانی لهۆن) بـووە، (جافرسـان) لەبەرئـەوەی تـەلار و باڵاخانە و ڕێ و جێیەکی وای نەبووە ناوبراوی تیا بحەوێتـەوە، ناچـاربووە بـۆ مـاڵی (قادربـەگی کوڕی) لە شارە دێی تەوێڵە بینێرێت.

دووەم- کاتێك لە سـاڵی (1931ز) هاتۆتـە ئێراقـەوە تـەنها (3)تمـەن لـە گیرفانیـدا بـووە، لەسەر سنوور فڕێیداونەتـەوە بـۆ ئـەودیو، لـەم بـارەوە (مامۆسـتا محەممەدئـەمین هـەورامانی) دەڵێت تەنها دوو قرانی پێبووە خستوونیەتە ناو (حەوزە لارەوە)[لمحشم].

8- زۆر شـەیدای زمـان و کولتـوور و ڕەسـەنایەتی ژیـانی کـوردەواری بـووە، بـە ڕادەیـەك کاتێك (میر عەبـدوڵای تاماسـبی) پێیوتـووە فارسـی دەزانیـت، ( جـافر سـان) بـەم شـێوەیە و بـە شێوەزاری هەورامی وەڵامیداوەتەوە: (بزانو نەزانو چێشا خـو ئایـەتو قورئـانی نیەنـە)، بـەمانای بزانم یاخود نەزانم چییە خۆ ئایەتی قورئان نییە.

وەك پێشتر باسمانکرد (جافرسـان) لـە درێـژەی سـاڵەکانی حوکمڕانیـدا تووشـی چـەندین شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوە بووە لەگەڵ دەسەڵاتداران و داگیرکارانی کوردستاندا لەوانە:

1- شەڕی (نوریاو) ساڵی (1910ز).

2- شەڕی (نۆبران و باخی شا=فیتنەی سالارئەلدەولەی قاجاری) ساڵی (1911ز).

3- شەڕی (کرماشان) ساڵی (1912ز).

4- شەڕی (نەوسوود) ساڵی (1914ز).

5- شەڕی (ڕووسەکان) ساڵی (1916ز).

6- شەڕی (مەنمی و گەڵباخی[لمجشم]) ساڵی (1919ز).

---

[لمحشم]- (محەممەد ئەمین هەورامانی) - مێژووی هەورامان- لاپەڕە (144) انتشارات بلخ- تهران ساڵی (2000).

[لمجشم]- گەڵباخی هۆزێکی کوردن،ڕۆڵێکی زۆریان گێڕاوە لە ڕووداوەکانی سـەردەمە جیاجیاکاندا،میرایەتییـەکیان دامەزراندوە بە نـاوی (میرایـەتی گـەڵباخی)،یەکەم کەسێك بنـەمای (میرایـەتی گـەڵباخی) دامەزرانـدوە نـاوی (عـەباس ئاغای ئوستاجلۆ) بووە،ناوبراو توانیویـەتی (مـەریوان) لـە (بێگـە بـەگی ئـەردەڵانی) بسێنێت و (ناوچەی بێڵەوە)شی لـەژێر دەسـتی (هـۆزی کـەڵهوڕ) دەرهێناوە،پاشـان ژمارەیـەکی تـر لـە هـۆز و تیرەکـانی دەوروبـەری لـە خـۆی

7ـ شەڕی (سەریاس) ساڵی (1922ز).

**لە هەموو ئەو شەڕانەدا جافرسان و تفەنگچییە هەورامییەکان ئازایەتی کەمنموونەیان نواندووە، بەشێوەیەك جەنگاون نەك هەر لەلای دۆستەکانیانەوە بەڵکو لەلایەن دوژمنەکانیشیانەوە ئەم راستییە نکولیلێنەکراوە، بۆ نموونە دەربارەی شەڕی (کرماشان) (فەرید ئەلولك قەرەگزلو) گەورەلێپرسراوی پەیوەندییەکانی دەرەوە لە (کرماشان) وتوویەتی: هەورامییەکانی لهۆن زۆر ئازا و ڕەشید بوون، بە سەرکردایەتی (جافر سان) توانیان دەست بەسەر (کرماشان)دا بگرن.**

**لە شەڕی (باخی شا) پاش ئەوەی (سالار ئەلدەولە) ویستوویەتی لە کرماشانەوە لەشکر بباتە سەر (تاران) و کۆتایی بە دەسەڵاتی (مەشروتەکان) بهێنێ، بە بیستوپێنج هەزار تفەنگچییەوە لە تفەنگچییەکانی (لوڕستان و کرماشان)ەوە کە بە گشتگیری لە: (کەڵوڕ، گۆران، زەنگنە، ئەردەڵانی، سنجاوی، هەورامی) بوون، لەناوچەی (باخی شا) و لە نزیك (ساوە) لەگەڵ لەشکری بەرامبەریان کەوتوونەتە جەنگ، هێزی دەوڵەتی بەگشتگیری بریتیبووە لە تفەنگچییەکانی (بەختیاری، تورك، کافکاسی، ئەرمەنی) کە بە چەك و جبەخانەیەکی گەورە و تۆپی قورسەوە جڵەگیرییان لە لەشکری (سالار ئەلدەولە) کردووە و شکاندوویانن، لەم شەڕەدا تفەنگچییە هەورامییەکان زۆر ئازا و بێباکانە جەنگاون، دەربارەی رۆڵی هەورامییەکان لەو شەڕەدا (ئایەتوڵا مەردۆخ) نووسیویەتی: (عەلیڕەزا خانی گەڕوسی و جافرسانی هەورامی) لە شەڕی (باخی شا)دا بە بەرزاییەکەوە بوون، کاتێك لەشکری (سالار ئەلدەولە) بەرگەی تۆپباران و شەستتیربارانی نەیارەکانی خۆیان نەگرت و لەگۆڕپانی جەنگدا پەرش و بڵاو بوونەوە و حاڵیان زۆر شڕبوو، (عەلیڕەزاخانی گەڕووسی و جافرسانی هەورامی) ماوەیانندا تفەنگچییە (بەختیاری)یەکان بکەونە شوێن لەشکری شکاوی (سالار ئەلدەولە)، ئەگەر قارەمانی ئەم دوو کەسە نەبووایە لەو شەڕەدا هەم (سالار ئەلدەولە) دەستگیردەکرا و هەم لەشکرەکەشی بەتەواوی**

---

**کۆکردوونەتەوە،(میرایەتی گەڵباخی) چۆتە ژێر چەتری (دەوڵەتی عوسمانی)یەوە،عوسمانیەکانیش چەند ناوچەیەکی تریان لە شێوەی (سنجاق) خستووەتە ژێر فەرمانی (عەلی خانی گەڵباخی)یەوە،لەو ناوچانە: (کرند،شێخان،چاکاران،خوڕخوڕە)،لە سەردەمی حوکمڕانی یەکێك لە میرەکانیان بە ناوی (یارەڵاخان) قەڵەمڕەوی ئەم میرایەتییە زۆر بەرفراوانبووە.**

لەناو دەچوون، ئازایەتی و بوێری (جافرسان) لەو جەنگەدا وایکردووە نازناوی (سردارمعتظد)ی بدرێتێ.

هەر لەم بووارەدا (سەردار ظفر بەختیاری) دەربارەی ئازایەتی هەورامییەکان وتویەتی: لە تفەنگچییە (بەختیاری)یەکانم بیست کە تفەنگچییەکانی (هەورامان و مەریوان) لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەیان پیادە بوون، بەڵام زۆر قارەمان و ئازایانە دەجەنگان، هەتا دوا هەناسە شەڕیاندەکرد و هەرگیز ئامادە نەبوون بە زیندوویەتی چەکیان لێبسەنرێت.

لەشەڕی (باخی شا)دا (کەریم بەگی کوڕی جافرسان) لەگەڵ ژمارەیەك لە تفەنگچییەکان و بەهیچ شێوەیەك قایل نەبوون گۆڕەپانی شەڕ بەجێبهێڵن، لە ئەنجامدا لەگەڵ ژمارەیەکی تر لەسەرداری هەورامییەکان لەوانە (عەزیز بەگ و حەمەخان بەگ) کە هەردوکیان برازای (جافرسان) بوون بەدیلگیراون و بۆ زیندانی (تاران) براون، پاش دووساڵ (کەریم سان) ئازاد کراوە، بەڵام (عەزیز بەگ و حەمەخان بەگ) لەگەڵ ژمارەیەك لە تفەنگچییەکانیان بێسەروشوێنکراوون، پاشان لەڕازی ئەو بێسەروشوێنکردنەیان هیچ شتێك نەزانراوە.

ساڵی (1914ز) و لە گەرمەی جەنگی جیهانی یەکەمدا دەسەڵاتدارانی (عوسمانی) پەلاماری هەورامانیان داوە و هەردوو شارۆچکەی (نەوسوود و نۆدشە)یان سووتاندووە، بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو حاڵەتە (جافر سان) تفەنگچییەکانی لە چەند قۆڵێکەوە پەلاماری (عوسمانی)یەکانیان داوە، (کەریم بەگی جافرسان) لەو پەلامارەدا سەرکردایەتی (جافە گەڵاڵییەکانی) پێسپێردراوە، لە شەڕێکی قارەمانانەدا ژمارەیەك لە سەربازانی عوسمانی بەدیلگرتووە.

(قادربەگی کوڕی جافرسان)یش بەیارمەتی خەڵکی تەوێڵە دەستیان بەسەر (تەوێڵە)دا گرتووە و (عوسمانی)یەکانیان ناچار کردووە ناوچەکە چۆڵبکەن، پاش ئەو رووبەڕووبوونەوەیە شانزە گوندی هەورامان کە پێشتر لەژێردەستی (عوسمانی)یەکاندا بوون ئازادکراون و بوون بە بەشێك لە قەڵەمڕەوی حوکمڕانی (جافرسان) لەوانە، (هەردوو شارە دێی تەوێڵە و بیارە، سۆسەکان، بەڵخە، دەگاشێخان، خەرپانی، هاوار...هتد).

0

## تفەنگچییەکانی هەورامان و مەریوان و شکستدان بە لەشکری ڕووسیای قەیسەری

لەگەرمەی جەنگی جیهانی یەکەم  زۆربەی شێخەکانی کوردستان و مەلا دیارەکانی ئەو سەردەمە، بە خەڵکی ناوچەکانیان ڕاگەیاندوە گوایا شەڕکردن لەگەڵ سوپای رووسدا غەزایە، چوونکە ئەوان هاتوون خاکی موسڵمانان داگیردەکەن و دژی دەوڵەتی ئیسلام دەجەنگێن، لەم بوارەدا شێخەکانی نەقشبەندی لە هەورامان دەورێکی کاریگەریان بووە، کەوتوونەتە ناو خەڵکی شوێنە جیاجیاکانی هەورامان و داوایان لێکردوون بەهەر نرخێکبووە پێویستە جڵەوگیری لە شاڵاوی رووسەکان بکەن، ئاشکرایە ئەو شێخانە خاوەنی دەسەڵاتێکی رۆحی گەورە و بوون و لە ناو خەڵدا زۆر ڕێزیان لێگیراوە، ئەو داواکارییەیان بووە بە هاندەرێکی گەورە بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ناوچەکە خۆیان بۆ شەڕکردن  لەگەڵ (سوپای رووس) ئامادەبکەن، لەو کاتەدا (جافر سان و مەحموودخانی دزڵی) لە هەردوو هەورامانی (لهۆن و تەخت) حوکمڕانیانکردووە.

لە (ساڵی 1916ز)دا کاتێك لەشکری (رووسیای قەیسەری) بە نیازی کۆنترۆڵکردنی هەموو ناوچەکانی (هەورامان ومەریوان) و گەیشتوون بە (شاری سلێمانی)، کەوتوونەتە جموجووڵ، خەڵکی ئەو ناوچانە خۆیان لە بەردەم مەترسییەکی گەورەدا دیوەتەوە، بەرامبەر بەو دۆخە سەرداران پیاو ماقووڵانی هەورامان و مەریوان بەهاندان و ڕێنمایی شێخەکانی نەقشبەندی چەند هەزار تفەنگچییەکیان لە سوارە و پیادە کۆکردۆتەوە و پەلاماری ئەو لەشکرەیان داوە، لەو پەلامارەدا ئازایەتییەکی وەهایان نواندووە مەگەر هەر لەخۆیان هاتبێت، بە جۆرێك رووسەکانیان شکاندووە و شپرزویانکردوون هەتا دامێنی (ئاویەدەر)ی پشت (شاری سنە) ڕاویانناون، (سەرتیپ زاخارچنکۆف)ی فەرمانەدەی (سوپای رووس) بۆ ئەوەی زەرەر و زیانی گەورەتر بە لەشکرەکەی نەگات، بەهیچ شێوەیەك نەیوێراوە لە ناو شار دەربچێت، دەربارەی ئازایەتی جەنگاوەرەکانی مەریوان و هەورامان (مەردۆخ) کە شایەتحاڵێکی زۆر نزیکە و ڕاستەوخۆ بەشداری شەڕەکانیکردووە و ئاگاداری ئەو بارودۆخە بووە وتویەتی:

(ساڵی 1334ك) پاش ئەوەی خەبەرهات (ژەنەڕاڵ باراتۆف) سەرکردەی سوپای رووسیای قەیسەری عەسری رۆژی چوارشەممەی مانگی جەمادی یەکەمی هەمان ساڵ رۆیشتووە بۆ (گوندی دادانە)، لەوێ گشت سەرۆك خێڵکانی (روانسەر، سەنجاوی، گۆران، کەمانگر)ی کۆکردوونەتەوە و فەرمانییپێداون لە ناوخۆیاندا ئەنجومەنێك بە ناوی (ئەنجومەنی خێڵە یەکگرتووەکان) درووستبکەن، ئێمە دەرکمان بەوە کرد ئەوکارەی ناوبراو کارێکی دڵسۆزانە نییە و هیچ بەرژەوەندییەکی خێڵەکانی تێدا نییە، بەڵکو بۆ مەرامە جەنگییەکانی خۆیانە، ئێمەش لە رێی (مەحموود بەگی شابەندەر)ەوە کە لە گوندی (دووڕۆ)دا بوو، هەواڵمان گەیانده (مەحیەدین بەگی کۆمەندان) لە پێنجوێن و ئەویش بەم شێوەیە وەڵامیداینەوە، (لەگەڵ شێخ مەحمودی حەفید دێین بۆ مەریوان، با جافرسان و مەحموودخانی دزڵی و سەرۆك خێڵەکانی مەریوان هەموویان لەوێ ئامادەبن بۆ گفتوگۆکردن و بڕیاری پێویست).

پاش گەیشتنی وەڵامەکەی (مەحیەدین بەگی کۆمەندان) بەڕەزامەندی سەردارەکانی هەورامان و مەحموودبەگی شابەندەر، (ئایەتوڵا مەردۆخ و حاجی شێخ عەبدولحەمید) رۆیشتوون بۆ (مەریوان)، لە ماڵی(مەحموود خانی کانی سانان) لەگەڵ (شێخ مەحموودی حەفید، مەحیەدین بەگی کۆمەندان، شێخەگەورەکانی نەقشبەندی) کۆبوونەتەوە و پەیمانی یەگرتنیان دژی (سوپای رووس) بەستووە، رۆژی (11 مانگی رەجەبی ساڵی 1334ك) بەشێك لە رووسەکان بە (12) بەتەریە تۆپی هەمەجۆرەوە بەرەو (مەریوان) کەوتوونەتەرێ و نیازمەندبوون هێرشبەرنە سەر (پێنجوێن)، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هێرشە تفەنگچییەکانی هەورامان و مەریوان کەوتوونەتە خۆیان، لە شوێنك کە پێیدەوترێ (سێڕیانی کاکۆ زەکەریا) رووبەڕووی رووسەکان بوونەتەوە و لە شەڕێکی دلێرانەدا سێ هێرشی گەورەی رووسەکانیان تێکشکاندووە، ژمارەیەکی ئێجگار زۆریان لێکوشتوون ودەسکەوتێکی بێشوماریان بووە و بەرەو (شاری سنە) پاشەکشێیانپێکردوون.

هەر لە بواری رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سوپای رووسدا، سەرەتای (مانگی شەعبانی ساڵی 1334ك) بۆدانانی بەرنامەیەك (مەحیەدین بەگی کۆمەندان)ی تورك، میوانداری (شێخ حوسامووددین، شێخ نەجموددین، شێخ عەلائوددین)ی کردووە و داوای لێکردوون هەرسێیان لە (رەزاو) ئامادەبن، پاش تەشریفبردنیان بۆ شوێنی دیاریکراو، هەموو تفەنگچییەکانی (هەورامانی تەخت، هەورامانی لهۆن، رەزاو، ژاوەرۆ، مەریوان) لە رەزاو کۆکراونەتەوە، پاش ئەوەی ژمارەیان گەیشتۆتە چوارهەزار، رۆژی (22مانگی شەعبان) رووەو (شاری سنە)

ڕۆیشتوون، بۆ بەرەنگار بوونەوەوی تفەنگچییە هەورامی و مەریوانییەکان (سوپای رووس) لە بەرزاییەکدا کەپێیدەوترێت (تەپەی شێخ حەمەسادق) چەند تۆپێکیان دامەزراندووە، کاتێك تفەنگچییەکان لە سەنگەرەکانی رووسەکان نزیکبوونەتەوە، دەستەیەك لەسەربازە سوارەکانیان رووەو ئاشەکانی ئاویدەر کەوتوونەتەرێ، لەو کاتەدا (مەردۆخ) بەجافرسانی وتووە: ئەگەر ئەو ژمارە سەربازە بگەنە بەرزاییەکانی ئاویدەر ئەمان هیچیانپێناکرێت ودەشکێن، (جافرسان) لەوەلآمدا وتوویەتی: لەگەڵ (ئەفراسیاو بەگ) ودووسەد تفەنگی بڕۆن لەوێ دۆخەکە چۆن پێویستدەکات وابڕیاربدەن، پاش ئەو گفتو گۆیە (مەردۆخ و ئەفراسیاو بەگ) و دووسەد تفەنگچی رۆیشتوون، ژمارەیەك لە تفەنگچییەکانیان لە (خدر ئەلیاس) داناون و سەنگەربەندییانکردووە، ژمارەیەکی تریان لەگەڵ (ئەفراسیاو بەگ) چوون بۆ شوێنێك کەپێیدەوترێ (خدری زیندە) و لەوێ دامەزراون، هەرچیشیان ماونەتەوە بۆ سەر لووتکەی (کێوی ئاویدەر) رۆیشتوون، رووسەکان کە بەدووربین چاودێری بارودۆخەکەیان کردووە، سەنگەرەکانی (مەردۆخ و ئەفراسیاو بەگ)یان داونەتە بەر تۆپ بەلآم هەرپاش ماوەیەکی کەم لە بەرپابوونی شەڕ لەنێوانیاندا رووسەکان شکاون وئەو ناوەیان جێهێشتووە.

(جافرسان) یەکێکبووە لەو سەرداره کوردانەی ماوەیەکی زۆر پشتگیری (عەباس خانی ئەردەلآنی ناسراو بە سەردار رەشید)ی کردووە لە هەوڵکانیدا بۆ گێڕانەوەی دەسەلآتی کوردستان بۆ بنەماڵەکەیان، (ساڵی 1337ك=1918ز) پاش ئەوەی (عەلیمحەممەدخان ناسراو بەشەریف ئەلدەولە) کراوە بە حوکمڕانی کوردستان زۆر بە دڵڕەقانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ خێڵە کوردە نیشتمانپەروەرەکاندا کردووە، بەو پەڕی دڵڕقی و بێبەزەییەوە سەرکوتیکردوون و ژمارەیەکی زۆر لە سەرداران و پیاوەدیارەکانیان بە فەرمانی ناوبراو لە مەیدانی (سنە)دا کراون بەدارا، ستەم و خوێنڕێژی ئەو کابرایە وایکردووە خەڵکی کوردستان بە (شەریف قەساب) ناویانبردووە، بەرادەیەکبووە یۆ لابردنی دەسەلآتی (شەریف ئەلدەولە)، تفەنگچییە هەورامییەکان بە سەرکردایەتی (جافرسان) یارمەتی (سەردار رەشید)یان داوە، (سەردار رەشید) لەلایەکەوە ویستوویەتی تەمێی (مەنمی و گەڵباخی)یەکان بکات کە ساڵێك پێشتر بەرامبەریان شکستیخواردووە، لە لایەکی ترەوە بۆ دەوڵەتی ئێرانی بسەلمێنێت کە ئەو لە هەممەکەسێك بۆ حوکمڕانی کوردستان شیاوترە، رۆژی (6 مانگی رەمەزانی ساڵی 1337ك=1919ز)لەگەڵ

تفەنگچییەکانی (روانسەر، جوانڕۆ، هەورامانی لهۆن) بۆ تەمێکردنی مەنمی و گەڵباخییەکان دەستیداوەتە جموجووڵ، رۆژی (9ی رەمەزان) بە تەواوی هێزەکانییەوە کە زیاتر لە (دووهەزار سوارە و یەك هەزار پیادە و سێسەد سەربازی نیزامی و دووبەتەریە تۆپی شاخاوی) بوون، پەلاماری لەشکری بەرامبەریان داوە، زۆربەی ئەو سەرچاوانەی دەربارەی ئەم شەڕە نووسیویانە ئاماژەیانداوە بەوەی لەسەرەتای شەڕەکەوە کە هێشتا تفەنگچییە لهۆنییەکان و سوارەکانی وڵەدبەگی دەستیان بە شوێنە بەرزەکان نەگەیشتووە، لەشکری (سەردار رەشید) شکستیانخواردووە، دواتر هەر بەگەیشتنی لهۆنییەکان و سوارەکانی (وڵەد بەگی) بەو بەرزاییانە، توانیویانە لەشکری بەرامبەریان بشکێنن.

(سالار ئەلدەولەی قاجاری) ساڵی 1927ز) بۆ جارێکی تر لەشکری بۆ هێرشبردنە سەر (شاری کرماشان) کۆکردۆتەوە، بەهاوکاری (جافرسان) و تفەنگچییەکانی بەرەو کرماشان کەوتوونەتە رێ، لەگوندی (دەوڵەتئاوا) لەگەڵ لەشکری حکومەت کەوتوونەتە شەڕەوە، لەو شەڕەدا ئوردووی (سالار ئەلدەولە) زۆر خراپ تێکشکاوە و پاشەکشێیانکردووە، پاش ئەو تێشکانەی هەم (جافر سان) و هەم ئەو سەرۆك خێڵانەی تر کەهاوکاری (سالار ئەلدەولە)یان کردووە، کە بۆیان ئاشکرابووە کەسێکی بوودەڵەو ترسنۆکە لێیدووركەوتوونەتەوە.

(جافرسان) بێجگە لەو شوێنانەی لەبەردەستیدابوون و پاش دوادەستگیرکردنی (عەباس خانی ئەردەلانی ناسراو بە سەردار رەشید) وناردنی بۆ (تاران)، دەستیکێشاوە بە سەر ئەو شوێنانەدا لە گەرمەسێری (هەورامانی لهۆن) کە لە لایەن ناوبراوەوە حوکمڕانیکراون وەك گوندەکانی: (نجار، نووریاو، دشە، خانەگا، بندەرە، دووریسان، دەرەمیان، شاری پاوە)، بۆ ئەم مەبەستەش (حەمەڕەشید بەگی کوڕی) و ژمارەیەك لە تفەنگچییەکانی بۆ ئەو شوێنانە ناردووە، ئیتر تا ساڵی (1348ك=1929ز) لەلایەن (جافرسان) و کوڕەکانییەوە براونبەڕێوە، دواتریش تاساڵی (1350ك= 1931ز) بە نۆرە لەلایەن لایەنگرانی (جافرسان و سەردار رەشید)ەوە براونبەڕێوە.

(جافرسان) لەساڵی (1894ز هەتاکو ساڵی 1931ز) لە ناوچەیەکی بەرفراواندا، کە هەر لە خۆرهەلاتی هەڵەبجەوە بۆسنووری پاڵنگان و جافەکانی (جوانڕۆ) درێژدەبێتەوە حوکمڕانی نکولیلێنەکرا و هیچ مشتومڕێك لە سەر حوکمڕانییەکەی نەبووە، ساڵی (1931ز) لەشکرێکی گەورەو زەبەلاحی دەوڵەتی ئێران هێرشکردۆتە سەر (هەورامانی تەخت و هەورامانی لهۆن)، هێزێك لە کرماشانەوە بەرەو هەورامانی لهۆن و هێزێکی تر لە سنەوە بۆ

ڕەزاو و دزڵی هاتوون، پاش ساڵێك لە بەرەنگاری قارەمانانە (جافرسان) هاتووەتە هەورامانی ئەمدیو و پاشان حکومەتی ئێراقی مافی پەنابەرێتی داوەتێ و لە (رومادی) نیشتەجێبووە، ڕژێمی شای ئێران زۆر هەوڵیانداوە دەسەلاتدارانی ئێراق قایلبکەن بە تەسلیمکردنەوەی بەلام بێسوود بووە، پاش ئەوەی لە هەوڵەکانیاندا نائومێد بوون (300) کەسیان لە خزم و دۆستانی لە خەڵکانی ناوچەکانی (ڕوانسەر، جوانرۆ، قوبادی، ئێناخی، کەمانگەر) دەستگیر کردوون، هەموو ئەو دەستگیرکراوانەش ماوەی دەساڵ لە بەندیخانەدا ماونەتەوە.

(جافرسان) هەتا ساڵی (1941ز) وەك پەنابەرێك ژیاوە، لەو ساڵەدا لەشکری (ڕووسیاو بەریتانیا) ڕژاونەتە خاکی ئێرانەوە، (جافرسان)یش بۆ (هەڵەبجە) گەڕاوەتەوە و لەوێ وەسیەتیکردووە (کەریم بەگ)ی کوڕی بکرێت بە (سانی هەورامان)، خۆشی پاش ماوەیەکی کەم کۆچی دواییکردووە لە گۆڕستانەکەی (گوندی عەبابەیلێ) لەنزیك گڵکۆی (تایەربەگی جاف)دا بە خاکسپێردراوە.

پێش ئەوەی کۆتای بە باسی (جافرسان) بهێنین ڕاستییەك باسدەکەین بۆ مێژوو، بەوەی تا ئێستاش بەرچاو لێڵییەك هەیە لە سەر کەسێتی ناوبراو، هەندێك کەسی بێئاگا و ناشارەزا لە مێژووی ژیانی و وردەکاری ڕووداوەکان، هەندێکجار قسەی بێسەرو بەر لەبارەیەوە دەکەن، بەلام بۆ دەرخستنی پێچەوانەی ئەو بۆچوونە هەلانە تەنها ئەم نموونەی خوارەوە دەخەینە پێشچاوی خوێنەر:

کاتێك ڕژێمی شاهەنشای پەهلەوی بڕیاری چەکداماڵینی هەموو تیرە و خێڵە کوردەکانی داوە، بیری لەوە کردۆتەوە لەبری چەکداری خێڵەکان سەرباز و هێزی دەوڵەتی لە شوێنیاندا جێگیربکات، دەسەلاتدارانی ئەو ڕژێمە هەوڵیانداوە لە ڕێی بەکارهێنانی هەندێك کەسی خاوەن پایەی دینی و کۆمەلایەتییەوە (جافرسان) قایلبکەن بەوەی چەکدانێت، بۆ ئەو مەبەستە (ئایەتولا مەردۆخ)یان ڕاسپاردووە نامەی بۆ بنووسێت، ناوبراو چەند نامەیەکی بۆ نووسیوە، ئەمەی خوارەوە چەند دێڕێکە لەدوا نامەی (ئایەتولا مەردۆخ) بۆ (جافر سان) و چەند دێڕێکیشە لە وەلامی سان بۆ ئەو:

(مەردۆخ) لە نامەیدا نووسیویەتی: (پێشتر چەند نامەیەکم بۆ ناردوویت، سەردەمی خێلایەتی بەسەرچوو، گشت سەرۆك جێڵەکانی ئێران لەبەردەم دەرگای شاهەنشای خاوەن پایە





سەریاندانەواند و گوێڕایەڵی فەرمانن، خۆشبەختی و بەدبەختی خۆت و تاقمەکەت بەستراوە بەوەڵامی ئەم نامەوە بەفەرمانبەرداریت، یاخود یاخیبوونت).

(جافر سان)یش بەم شێوەیە وەڵامیداوەتەوە: (دەست و خوتی پیرۆزتم زیارەتکرد کەسەراپای ئامۆژگاری باوکانە بوو، بۆ (مەحموود خانی دزڵی) بە قورئان سوێبدیانخوارد کەچی کوڕەکەیان برد بەناوی پلەو پایەوە دەربەدەریانکرد، من بێجگە لە کۆچکردن بۆ خاکی ئێراق هیچ چارەیەکم نییە، چوونکە دوای سوێندی قورئان بەدرۆخواردن ئیتر بەچی بڕوابکەم).

## 20ـ مەحموود خانی دزڵی

ناوی (مەحموود کوڕی عەزیز خان کوڕی بارام بەگ کوڕی محەممەد سانی یەکەم)، دایکی خاتوو (پیرۆزە کچی هەسەن سان) بووە، ساڵی (1870ز) لە (دزڵی) لە دایکبووە، باوکی کەسێتییەکی دیار و بەرجەستەی هەورامان و لە دەرەوەی هەورامانیشدا ناودار بووە، پاش کۆچی دوایی (عەزیز خان) بۆ ماوەیەك (ئەحمەدخان) حوکمڕانی قەڵەمڕەوەکەی باوکی لە ئەستۆدابووە، پاشان (مەحموودخان) دەسەڵاتی پەیداکردووە، وەك سەردارێگی گەورەی سەردەمی خۆی ناوبانگیدەرکردووە و بووە بە خانی دزڵی.

لە ماوەی ژیانیدا شەش ژنی هێناون، بەرهەمی ئەو ژنهێنانەکانیشی (15) کوڕ و (6) کچ بوون، سەربارەت بە سیما و کەسێتی ناوبراو (د. موکەڕەم تاڵەبانی) نووسیویەتی: پیاوێکی باڵابەرزی چوارشانەی دەم وچاوپان و سوور و سپیبوو، سمێڵێکی درێژی هەبوو، کەمدو و بە ویقار بوو[92].

(مەحوود خانی دزڵی) بە پێی نەریتی حوکمڕانی خێڵەکی سەردەمی خۆی، حوکمی ناوچەیەکی بەرفراوانی کردووە، ئەو ناوچەیەش بێجگە لە دزڵی و گوندەکانی دەورووبەری لە هەورامانی ئەودیو= دیوی خۆرهەڵاتی کوردستان، لە هەورامانی ئەمدیویش= دیوی باشووری کوردستان، گوندەکانی: (نەوێ، بەردە بەل، تووتاقاچ، زێڕۆن، بانیشار، عاموورە، ئێڵاَنپێ، هانەی قوڵ) لە ژێردەسەڵاتیدا بوون، خۆی لە (دزڵی) نیشتەجێبووە، (ئۆڵاَخانی کوڕی) ئەرکان حەربی بووە و براکانی و ژمارەیەك لە کوڕەکانسشی، هەریەکە شوێنێك لەژێردەستیاندا بووە[93].

---

[92] (د. موکەڕەم تاڵەبانی)ـ گۆڤاری رەنگینـ ژمارە (53)ی ساڵی 1993.

[93] (محەممەد ئەمین هەورامانی)ـ مێژووی هەورامانـ لاپەڕە (899).

(مەحموود حان) پیاوێکی ئازا و لێهاتوو، خەباتگێڕ و تێکۆشەرێکی کەمنوونەی گەلی کوردە، هاوڕێی خەباتی بێوچانی (شێخ مەحموودی نەمری مەلیکی کوردستان) و پاڵەوانی شۆڕشەکانی بووە، لە سەر داوای (شێخی نەمر) پاش ئەوەی بە فەرماندەیی (500) جەنگاوەری هەورامیی لە دزڵییەوە هاتووەتە (حاجی مامەند)، بەرەبەیانی ڕۆژی (21 /5/ 1919) هەڵمەتێکی قارەمانانەی کردووەتە سەر ئەو هێزەی سوپای ئینگلیز کە بەسە گۆیژەوە بوون، لە نەبەردییەکی گەورەدا شەپرزەیکردوون و فەرماندەکەیان کە ناوی (کابتن دانلیس)بووە دەستگیرکردووە، ئەو شوێنە تا ئێستاش (قوتەی مەحموود خانی) پێدەوترێت، پاشان لە گەڵ جەنگاوەرەکانی بەرەو سلێمانی هاتوون، ئەو ڕێگایەی کە لە گۆیژەوە پیایدا هاتوونەتە ناوشار، (مەحمووده ڕێی) پێدەوترێت، هەر کە گەیشوونەتە سلێمانی (کابتن دانلیس)ی ڕادەستی شێخی نەمر کردووە.

بە درێژایی زنجیرە شۆڕشەکانی (شێخ مەحموودی مەلیك)، هەر لە (1919ز)ەوە، هەتاکو (ئاوباریك)، هاوڕاز و هاوسەنگەری بووە، سەبارەت بە ڕۆڵی گەورەی (مەحموودخانی دزڵی) و جەنگاوەرانی هەورامی لەو شۆڕشانەدا، هەردوو بەیاننامەی ژمارە (3) و (4) کە لەلایەن (شێخ مەحموودی نەمر)ەوە دەرکراون شایەحاڵن، وەك لە خوارەوە هاتووە:

لە بەیاننامەی ژمارە (3) کە مێژووی بەسەروە نییە، هاتووە: هێزی پیادەی هەورامی بە فەرماندەیی (عەبدوڵابەگی دزڵی)، لە (بانی مەقان) بەرەنگاری دوژمن بوونەوە، دوژمن پەرێشانکراو ئێمەش یەکێکمان بریندارە.

لە بەیاننامەی ژمارە (4)یشدا هاتووە: دوو شەوە هەورامی دزڵی و دوژمن لە قەرەهەنجیر لە جەنگدان، ئەمڕۆ سوارەی (مەنمی و هەوەند)یش ئاوێتەیان بوون، لە دوژمن کوشتار زۆرە و تاڵان زۆر گیراوە، پێنج لە هەورامی و دوو لە مەنمی و بیست ودوو بریندار هاتووەتەوە[94].

لە سەردەمی دەسەڵاتیدا (مەحموودخان) گوندی دزڵی و گوندەکانی دەوروبەری، نەوای دڵنیایی تێکۆشەران بوون، کاتێك کە شێخ مەحموودی مەلیك، هەروەها شێخەکانی عەبابەیلێ، لە ستەمی دەسەڵاتدارانی ئینگلیز هەڵهاتوون، لە دزڵی ماونەتەوە و خانی دزڵی بەوپەڕی

---

[94] ئەحمەد خواجە چیم دی بەرگی یەکەم لاپەڕە (47-46).

دڵسۆزی و بەئەمەکییەوە خزمەتیکردوون، ناوبراو دۆست و هاوڕێی وەفاداری چەندین کەسێتی دیاری سەردەمی ژیانی خۆی بووە، لەوانە: (سەردار ڕەشیدی ئەردەلانی، سمکۆی شکاك، حەمەڕەشید خانی بانە، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند، شێخەکانی تاڵەبانی، سەیدەکانی جەباری، شێخەکانی کەسنەزان....هتد)، لە ڕووی ڕۆحیشەوە بە (شێخ نەجموددینی بیارە)وە پەیوەستبووە و دوو خوشکی خۆی یەك لە دوای یەك لەو زاتە مارەکردووە. (یەکەمیان کۆچی دواییکردووە و پاشان دووەمی لێمارەکردووە).

(مەحموودخانی دزڵی) زۆر نەفسبەررز و بێتەماعبووە، (ئەحمەد خواجە) وتوویەتی ساڵی (1924) وەك نێردراوی (شێخ مەحموود) چووم بۆ لای (مەحموودخانی دزڵی)، نامەیەك و بڕی صەد لیرەم بۆیبردبوو، بەهیچ شێوەیەك قایلنەبوو لیرەکانم لێوەرگرێت، وتی: لە بری ئەوەی ئێمە بەبار پارە بۆ شێخ مەحموود بنێرین، ئەو لیرەمان بۆ دەنێرێت، تەنها یەك دانەیانی هەڵگرت، ماچی کردوو خستیە سەرچاوی وەك موفەڕك، ئەوانی تری پێدامەوە.

(مەحموودخان) لە ئەنجامی خەبات و تێکۆشانی بێوچانی ساڵانێکی زۆر لە زیندانەکانی: (قەصری قاجار، سنە، سلێمانی، کەرکووك، بەغداد، هنێدی، رومادی) زیندانیکراوە، تەنها لە زیندانی کەرکووك ماوەی (2808) ڕۆژ ماوەتەوە، چەندین جاریش وەك دوورخراوەیەك لە شارەکانی (ئێران و ئێراق) دەستبەسەرکراوە، لە (هیندستان)یش هاوڕێی زیندانی شێخی نەمر بووە،

ڕۆڵی گەورەی (مەحموود خانی دزڵی) بە پەنای شێخ مەحموودەوە لە شەڕ و ئاشتیدا کاریگەربووە، ڕۆژی (14 /10 /1926ز) بەشداری وتووێژی ئاشتی لە نێوان شێخ مەحموود و دەسەڵاتدارانی ئینگلیزی کردووە، شوێنی وتووێژەکەش کە گوندی (ئێلانیێ) بووە، بە ڕاسپاردەی (مەحموود خان) دیاریکراوە.

(مەحموودخانی دزڵی) وەك تێکۆشەرێکی کارامە لە هەموو ڕووداوە سیاسی و سەربازی و کۆمەڵایەتییەکاندا ڕۆڵیگێڕاوە، پاش دامەزراندنی (حیزبی هیوا) بە سەرۆکایەتی (ڕەفیق حیلمی)، لە سەر داوای ژمارەیەك لە تێکۆشەران و ڕووناکبیرانی کورد، پەیوەندی بەو حیزبەوە کردووە،

شایانی وتنە ئەم قارەمانە لە بەرامبەر هیچ شتێك و لە هیچ دۆخێکدا ملی بەرزی بۆ دوژمنان کەچنەکردووە و هەمیشە سەری هێندەی بەرزی چیا سەرکەشەکانی هەورامان بڵندبووە، لە لایەکەوە دژی حکومەتی پەهلەوی جەنگاوە، لە لایەکی تریشەوە چقڵی چاوی

داگیراکارانی ئینگلیز و ملهوڕانی حکومەتی مەلیکی ئێراق بووە، سەرەڕای هەوڵی بەردەوامیان بۆ رامکردنی، بەڵام هەمیشە مەرد و رەند ماوەتەوە. هەر ئەوەش وایکردووە بە درێژایی ژیانی وەك قارەمانێکی کورد سەیرکراوە، هەر بۆ نموونە (شێخ لەتیفی حەفید) بە میر مەحموودخانی دزڵی ناویبردووە،ساڵی (1943ز) کە وەك دوورخراوە و دەستبەسەرێك لە سلێمانی ژیاوە، رۆژی (15 /7 /1943) بە هاوکاری (شێخ بابا عەلی شێخ مەحموود) گەڕاوەتەوە (دزڵی) و بۆ جارێکی تریش کوورەی خەباتی جۆشداوەتەوە.

پاش بەرگرییەکی قارەمانانەی درێژخایەن دژی سیاسەتی ستەمکارانەی حکومەتی (حەمەڕەزاشا) و دەستوپێوەندەکانی لە ناوچەکەدا، سەرەتای ساڵی (1946ز) بۆ گوندی (هانەی قول) کە دەکەوێتە پشت شارۆچکەی خورماڵ گەڕاوەتەوە و ماوەیەك لە ئەشکەوتی (وشکەناو) کە لای خەڵکی ناوچەکە ئەشکەوتی (مەحمودخانی)شی پێدەوترێت، لە گەڵ چەند هاوڕێیەکیدا ماوەنەتەوە، حکومەتی (حەمەڕەزاشا) بە مەبەستی وتووێژ نوێنەریان ناردووەتە لای، بەڵام وەك پیشەی هەمیشەیی دوژمنان، بە پلانێکی گڵاو و بەدەستکیسەی ئەفسەرێکی ئێرانی لە (ملەخورد) دەرمانخواردکراوە[95]، پاش ماوەی (9) رۆژ گیانی پاکی بە گەل و نیشتمانەکەی بەخشیوە و بە سەر لووتکەیەکی بەرز بەپشتی کۆنە (گوندی هانەی قوڵ)ەوە بەخاکسپێردراوە.

جێی داخ و کەسەرێکی گەورەیە، پاش ئەم هەموو ساڵانە لە ئازادی کوردستان و حوکمی خۆماڵی، تا ئێستا ئاوڕێك لە ئارامگەکەی نەدراوەتەوە و لە ناو وشکەکەڵێکدایە، کە هیچ کەس باوەڕناکات ئەو شوێنە و بەو پشتگوێخراویە، هێلانەی هەڵۆیەك بێت کە پەیمانی ئەوەی بە گەلەکەی دابوو، هەر دەبێت بە لووتکەوە بمرێت.

### 21- حەمەئەمین سان

بەر لەوەی بچینە سەر کورتەیەك لە مێژووی ژیانی (حەمەمین سان) پێویستە باس لەوە بکەین (کەریم سان) پاش وەسیەتەکەی باوکی گەڕاوەتەوە بۆ هەورامان و وەك (سانی

[95] (عومەر مەعرووف بەرزنجی)، مەحمود خانی دزڵی، لاپەرە (36)





لهۆن) دەستبەکاربووە، مەڵبەندی حوکمڕانییەکەی لە (نەوسوود)وە بۆ (گوندی خانەگا)ی نزیك بە (شاری پاوە) گواستۆتەوە، شەم سانە لەسەردەمی حوکمڕانی (جافرسانی باوکی) ودوای ئەوەی ساڵی (1911ز) لە گۆڕپانی (شەڕی باخی شا)دا دەستگیرکراوە، ماوەی دەساڵ زیندانی لە (قەسری قەجەر) بەسەربردووە، (کەریم سان) خوێندەوار و ئەدەبدۆست بووە و سەلیقەیەکی باشی لە هۆنینەوەی شیعردا هەبووە، شیعری بە هەردوو زمانی (کوردی و فارسی) هۆنیەوەتەوە، ساڵی (1945ز) کۆچی دواییکردووە.

پاش کۆچی دوایی (کەریم سان) لەسەر سانیەتی (هەورامانی لهۆن) جۆرێك لە کێشمە کێش و ناکۆکی لە نێوان (عیزەت بەگ زڕەتەن لهۆنی کوڕی کەریم سان) و یەکێك لەمامەکانی بەناوی (حەمەمین بەگ) درووستبووە، بۆ نەهێشتنی ئەو ناکۆکییە ژمارەیەك لە سەرۆك خێڵەکان لە ماڵی (غولامعەلی خان ناسراو بە سالار مەنسووری گۆران) کۆبوونەتەوە، لەو کۆبوونەوەدا و پاش گفتو گۆیەکی دوورو درێژ (عیزەت بەگ زڕەتەن لهۆنی) پێشنیارێکی خستۆتە بەردەم ئامادەبووان، پێشنیارەکەش بەم شێوەیە بووە:

(لەبەر ئەوەی حەمەمین بەگ هەم مامەمەو هەم لە من گەورەترە، من قایلم بەوەی ئەو ببێت بە سانی هەورامانی لهۆن، منیش لە جێبەجێکردنی کارەکانیدا هاوکاریدەکەم)، لە سەر بنەمای پێشنیارەکە ئیتر (حەمەمین بەگ) لە ساڵی (1945ز) بووە بە سانی هەورامان.

(حەمەمین سان) پیاوێکی بەهەڵوێست و نیشتمانپەروەر بووە، کاتێك (دکتۆر موصەدیق) دژی رژێمی (حەمەڕەزا شای پەهلەوی) شۆڕشی بەرپاکردووە و لە (1951/4/29) بووە بە سەرۆك وەزیری ئێران، هەریەك لە (حەمەمین سان و حسێن بەگی وەکیل) لایەنگری ئەو شۆڕشە و کابینەی حکومەتەکەی (دکتۆر موصەدیق) بوون، پاش سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلولی ساڵی (1961ز) لە کوردستانی ئێراقدا، (حەمەمین سان) هاتۆتە ناوچە رزگارکراوەکانی ژێر دەستی شۆڕش، دەسەڵاتدارانی رژێمی پەهلەوی زۆر هەوڵیانداوە بگەڕێتەوە بۆ ئێران و بەڵێنیاداوە ئەگەر بگەڕێتەوە ئەو پلە سەربازییەی

(سەرگوردی فەخری) کە هەیبووە بەرزتریدەکەنەوە، بەلام (حەمەمین سان) قایلنەبووە بگەڕێتەوە و هەتا رووخانی رژێمی (عەبدولکەریم قاسم) لە ئەنجامی کودەتا شوومەکەی ساڵی (1963ز) لە ئێراقدا ماوەتەوە، هەمان ساڵ لەرێی بالیۆزخانەی ئێرانەوە لە (بەغداد) پەیوەندی پێوەکراوە و لەئەنجامی ئەو پەیوەندییەدا لەلایەن (حەمەڕەزا شا)وە بڕیاری لێبوردنی تایبەت و بەرزکردنەوەی پلەی سەربازی بۆدەرکراوە و بۆ (ئێران) گەڕاوەتەوە.

**کاتێك (قادری نامدار[ترشم]) لە ساڵی (1963ز) لە ناوچەی (هەورامانی لهۆن) دژی رژێمی پەهلەوی دەستیداوەتە چەك (حەمەمین سان) پەیوەندی لەگەڵ دامەزراندووە، لەو ساڵانەشدا لە ئێراق بووە، پەیوەندی بە (تەیموری بەختیار)وە بووە، کە یەکێکبووە لە نەیارانی (شای ئێران)، قسەش لەوەدەکرێ گوایا جۆرە پەیوەندییەکیشی لەگەڵ (حکومەتی میسر)دا هەبووبێت، ئاشکرایە حکومەتی میسر لەوکاتانەدا زۆر دژی رژێمی پەهلەوی ئێران بووە.**

**لە ژێر کاریگەری ئەوپەیوەندییانانەدا ئاماژەمانپێدان، (حەمەمین سان) کەوتۆتە هەوڵی درووستکردنی رێکخستنێك دژی رژێمی (حەمەڕەزا شای پەهلەوی) و شانەیەکی نهێنی پێکهێناوە، لە رێی (قادری نامدار)وە پەیوەندی لەگەڵ (پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێراق) دامەزراندووە، (ساڵی 1968ز) لە رێی نامەیەکی نهێنییەوە کە (تەیموری بەختیار) لە بەغدادەوە بۆ (حەمەمین سان) ناردوویەتی و پێش ئەوەی بگاتە دەست ناوبراو، بە دەستی (ساڤاك) گەیشتوە، ئەندامانی ئەو شانە نهێنییە ئاشکرابوون و لە پەلامارکێدا لەلایەن (ساڤاك)ەوە دەستگیرکراون، پاش دەستگیرکردنیان بۆ(بەندیخانەی جلدیان) لە نزیك (شاری رەزایە) نێردراون و لەلایەن دەزگای ساڤاکەوە دادگایکراون، پاشان نێردراون بۆ بەندیخانەی (قزل قەڵای تاران)، لەئەنجامی دادگایکردنی (حەمەمین سان و هاوڕێکانی) ئەم سزایانە بە سەریاندا دراون:**

| | | |
|---|---|---|
| **داریوش نیکگو** | **مامۆستا** | **تیر باران** |
| **کەریمیان** | **مامۆستا** | = |
| **حاجی نیازی لهۆنی** | **جووتیار** | = |
| **بەهمەن بەگی لهۆنی** | **جووتیار** | = |
| **مەجیدی مەجیدی** | **جووتیار** | = |
| **عەتاولای پیاب** | **جووتیار** | = |

---

**[ترشم](قادری نامدار) یەکێکبووە لە پیاوە ناسراوەکانی (تیرەی ئێناخی) و هەر لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە پەیوەندیکردووە بە هێزی پێشمەرگەوە و فەرماندەیەکی ئازا بووە،چالاکییە پێشمەرگایەتییەکانی ناوبراو لە هەورامانی لهۆن دژی رژێمی پەهلەوی، (دکتۆر محەممە عەلی سوڵتانی) لە کتێبی (ایلات و طوائف کرماشاهان) لاپەڕە (279) بە شۆڕش ناویهێناون.**

**(هادی بەهمەنی)ش لە کتێبی (پەیامی هەورامان) لاپەڕە (166)دا بە سەرهەڵدان و پێکدادان ناویهێناون.**





هەریەك لە (حەمەمین سان، زۆراب بەگی لهۆنی، ئـەمین بـەگی لهۆنی) بـە لەسـێدارەدان حوکمدراون، بەڵام لەبەر گەورەیی تەمەنیان حوکمەکانیان بۆ دەساڵ زیندانیکردن لەگـەڵ کـاری گراندا کەمکراوەتەوە.

(ئەحمـەد بـەگی لهۆنی) بـە لـە سـێدارەدان حوکمـدراوە، پاشـان بـۆ زینـدانیکردنی هـەتا هەتایی کەمکراوەتەوە.

(عیزەت بەگ زڕەتەن لهۆنی) چـوار سـاڵ زینـدانیکردن و لێسەندنەوەی پلـەی سـەربازی لێی.

هەریـەك لـە (وریـا بـەگی لهۆنی، داود بـەگی ئێراندۆسـت)یـش بـە نـۆ مـانگ بەنـدکردن حوکمدراون.

لێرەدا پێویستە قسە لەسەر ئەوە بکەین پاش پێنج مانگ لە دەستگیرکردنی (حەمـەمین سـان و هاوڕێکـانی)، رژێمـی شـای ئێـران گـشت بـەگزادەکانی هـەورامان و جـوانڕۆی دەسـتگیر کردووە، پاش دادگایکردنیان، هەر لە زیندایکردنی هەتا هەتاییەوە هـەتا (دەسـاڵ) زینـدانیکردن حوکمدراون.

زۆربەی ئـەو بەگزادانـە هـەتا سـاڵی (1979ز) لـە زیندانەکانـدا ماونەتـەوە، بـەڵام پـاش بەرپابوونی شۆڕشی ئیسلامی ئازادکراون.

ساڵی (1983ز) (حەمەمین سـان) کۆچی دواییکـردووە و(عیـزەت بـەگ زڕەتـەن لهۆنی) بووە بە سانی (هەورامانی لهۆن).

لەبـەر ئـەوەی هـەر لـە سـەرەتایی مێـژووی ژیـانی مرۆڤایەتییـەوە و هـەتا ژیـانیش بـەردەوامبێت، هـەردوو رەگەزەکـەی مـرۆڤ لـە هـەموو وردەکارییـەکانی ژیانـدا بەشـدارن، پێمانباشبوو لە کۆتایی ئەم بابەتەدا بە کورتی لایەك لە مێژووی ژیـانی هەنـدێك لـە ژنـانی هـەورامانیش بکەیینـەوە و لـەوەوە دەسـتپێدەکەین کـە ژن لـە هەورامانـدا هـەر لەسـەردەمە کۆنەکانـەوە شـوێنێکی دیـاری لـە ژیـانی کۆمەڵایـەتی خـەڵکی ناوچـەکەدا بـووە، هەنـدێك لـە سەرچاوە مێژوویـەکان باسـیان لـەوە کـردووە لەسـەردەمی حـوکمڕانی ئەشکانییەکاندا، ژنێـك بـەناوی (ئـەداد) حـوکمڕانی هـەورامانی کـردووە، (مامۆسـتا محەممـەد ئـەمین هـەورامانی)ش دەڵێت: وشەی (ئـەدا) کـە لەهەورامانـدا لـەبری وشـەی (دایـك) بـەکاردەهێنرێت لەبنەڕەتـدا بـۆ نـاوی ئـەو حوکمڕانـە دەگەڕێتـەوە، پاشـان گـۆڕانی هـاتووە بەسـەردا و لـە (ئـەداد)ەوە بـووە بـە (ئەدا).

لەســەردەمی حــوکمڕانی (مــەئموونی کــوڕی هــارون ئەلڕەشــیدی عەباســی)دا ژنێــك حوکمڕانی هەورامانی کردووە و سکەیەك لە ناوچەکەدا لەلایەن (مەلا فەحتانی بێسارانی)یـەوە دۆزراوەتـەوە وێنـەی ئـەو ژنـەی پێوەیـە، لەبـەر ئـەوەی نووسـینی سـەر سـکەکە کـوێر بۆتـەوە نەتوانراوە بخوێنرێتەوە، بەلاَم ساڵی دەرچوونەکەی بە (230ك= 844ز) دیاریکراوە[یرشم].

لـــە درێـــژەی حـــوکمڕان ســـانەکانی هەورامانـــدا چـــەندجارێك ڕێککـــەوتووە ژن حوکمڕانیکردووە، هەریەك لەم خانمانەی ناویاندەهێنیین لە هەوراماندا سانییەتیانکردووە:

1ٲ خاتوو هۆریزاد سان: ئەم خانمە یەکێکبووە لەشێرە ژنەکانی هەورامان، پاش کـوژرانی (ئەسـکەندەر سـان)ی هاوسـەری لـە سـاڵی (1225كٲ1810ز) بـووە بـە سـان و نزیکـەی سـاڵێك حـوکمڕانی هـەورامانی گرتۆتــە دەسـت، پاشـان شـوویکردووە بـە (محەممـەد بـەگ) و دەسـتی لەســانیەتی کێـشاوەتەوە بــۆ مێردەکــەی، بــەلاَم وەك ڕاوێــژپێکراوێکی (محەممــەد بــەگ) لەکارەکانیدا هاوکاریکردووە[سمشم].

2ٲ خاتوو مونیرە سان: ناوی ئەم خانمـە لـە هەنـدێك سەرچاوەدا بـە (مەنیجـە سـان[شمشم]) هـاتووە، پـاش کـوژرانی (حەیدەرسـان)ی هاوسـەری بەدەسـتی لەشـکری (خەسـرەوخانی ناکـام)، زیـاتر لـە سـاڵێك لەهـەورامانی لهـۆن حـوکمڕانیکردووە، پـاش ئـەو ماوەیـە شـوویکردووە بـە (قادربەگی عومەربەگ) و وازی لەسانییەتی هێناوە بۆ ناوبراو.

3ٲ خــاتوو مینــای کــچی ڕۆســتەم ســان: ئــەم خانمــە یــەکێکبووە لــە ژنــە زۆر ژیــرو هۆشـیارەکانی هـەورامان، بـەردەوام (جافرسـان) ڕاوێــژیپێکردووە و زۆریـش حیـسابی بـۆ ڕاو بۆچوونەکانی کردووە.

---

[یرشم] (محەممەد ئەمین هەورامانی)ٲ دەستنووسی مێژووی هەورامانٲبەشی پێنجەمٲ بابەتی هەورامانی ژاوەرۆٲ باسی (بێساران)ٲ لاپەڕە (2) .

پێویـستە لێـرەدا ئاماژەبـدەین بـەوەی هـەر لەهـەمان لاپـەڕەی سەرچـاوەی نـاوبراودا نووسـراوە،(مـەئموون) لەساڵەکانی نێوان (813ٲ 833ز) حوکمڕانیکردووە،بەو پێیە دەبێت ئەو ژنە هەر لەسەردەمی مەئموونەوە هەتاکو ئەو کاتانـەی دراوەکـە لێدراوە کەسـاڵی (844زایینـی) بـووە ،یـاخود دواتـریش حـوکمڕانی هـەورامانی کردبێـت و تـەنها لەرووی باجدانی سالاَنەوە ملکەچی دەوڵەتی عەباسی بووبێت. (ئەیوب)

[سمشم] (مونەفەرخانی ڕەزاو)ٲ دەستنووسی پاسداران مرز اییان= تاریخ اورامانٲ لاپەڕە (246).

[شمشم] (محەممەد عەلی سوڵتانی)ٲ ایلات وطوایف کرمانشاهانٲ بەرگی یەکەمٲ لاپەڕە (46).





4 ئافتاوخـانی کـچی غەفاربـەگ: ئـەم خانمـە هاوسـەری (عێـزەت بـەگ) بـووە، پـاش دەسـتگیرکردنی هاوسـەرەکەی لـە لایـەن دەسـەڵاتدارانی رژێمـی حەمەڕەزاشـای پەهلەوییـەوە، رۆڵێکی زۆر دیاری گێڕاوە لە حـوکمڕانی هـەورامانی لهۆنـدا و وایکـردووە خـەڵکی ناوچـەکە رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر خۆشیانبوێت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن، ئەم خانمە (قورئـانخوێن، دینـدار، بەتـەدبیر) بـووە، بەدرێـژایی ساڵەکانی زینـدانیکردنی هاوسـەرەکەی سەرپەرشـتی باخـەکانیان کـردووە و تەنانـەت باخـە وێرانەکانیـشی ئاوەدانکردوونەتـەوە، ئەوەنـدە ژنێکـی میهرەبـان و سەلارە بووە، بە (خانمی هەورامان) ناویدەرکردووە،، لەسەردەمی حوکمڕانییەکەیدا توانیویـەتی چارەسەری هـەموو ئـەو کێشانە بکات کە لـەناو خـەڵکی ناوچـەکەدا لـە سـەر (زەوی، بـاخ، ئـاو، خانوو)، یاخود لەسەر هەر شتێکی تر درووستبووبن.

5 عاسـێ خـانمی کـچی مـەحموودخانی دزڵـی: هاوسـەری (هەسـەن خـان) بـووە، لـە هەڵسووڕانی کاروبـاری (کۆمەڵایـەتی، ئـابووری، ئیـداری) ناوچـەکەدا توانایـەکی باشـی هـەبووە، هەمیشە پرس و راوێژیپێکراوە و خەڵکی ناوچەکە زۆر حیسابیان بۆ قسەیکردووە.

6 خالێ خاتوونی کچی پیرجارولاً، یەکێکبووە لە پیرەکانی هـەورامان و پایەیـەکی دیینـی گـەورەی بـووە، بـەپێی هەنـدێك سەرچـاوەی مێـژوویی ئـەم خانمـە چـەندین کـرداری سـەیر وسەمەرەی نواندووە، خەڵکی ناوچەکە سەرچاوەی ئەو کردارانەیان گێڕاوەتەوە بۆ پایەی دیینی ناوبراو[*].

7 خـاتوو لـەیلێ: خـەڵکی شارەدێی تەوێڵـە و دایکـی (مـام ئەولعـەزیزی شـاعیری میللـی) بووە، ژنێکی خوێندەوار و دەسـتێکی باڵاشـی لـە هۆنینـەوەی شـیعری میللیـدا بـووە، لەسـەرەتای سەدەی بیستەمەوە لە تەوێڵەدا قوتلابخانەیەکی تایبەتی کردۆتەوە و بـە شـێوەیەکی خۆبـەخش (42) قوتابی فێری خوێندن کردوون، قوتابییەکانی لە (کوڕ و کچ) تێکەڵاوبوون.

9 سـۆفی مـروەت: یـەکێکبووە لـە خەلیفـەکانی (شـێخ عومـەری بیـارە)و پـاش لـە دونیادەرچوونی ئـەو زاتـە خەلیفـەی (شـیخ عـەلائوددین) بـووە، ئـەم خانمـە بـەجۆرێك لـە نـاو سـۆفیگەری و ئـەوینی خواییـدا تواوەتـەوە، هـەموو هەفتەیـەك کـۆڕی زیکـری گـەرمکردووە و ژمارەیـەکی زۆر دەروێـشی ژن لـەدەوری کۆبوونەتـەوە و بـوون بـە موریـدی (رێوڕەچـەی نەقشبەندی).

---

[*] بروانە دەستنووسی (پاسداران مرز ایران= تاریخ اورامان) لاپەڕە (46) نووسینی (موزەفەرخانی رەزاو).

10[1] **کەلسووم خان: خانمێکی خوێندەوار و رۆشنبیرە و ماوەیەك لە رادیۆ و تەلەفزیۆنی سنەدا کاریکردووە، ئێستا مامۆستایە و دەستی شیعر هۆنینەوەشی بەهەردوو شێوەزمانی هەورامی و کرمانجی خواروو هەیە.**

11[1] **بەدری خان: یەکێکی ترە لەو خانمە هەورامییانەی لە رادیۆ و تەلەفزیۆنی سنەدا کاریکردووە، ئێستا سەرقاڵی ئامادەکردنی رشتەی دوکتۆرایە لە وڵاتی بەریتانیاو دەنگێکی خۆش و بەسۆزی هەیە**

12[1] **کەوکەب هەورامانی: ژنە شاعرێکی هەورامی و خەڵکی شارەدێی بیارەیە، ئێستا لە هەندەران دەژی.**

**ئەمانەی ناومانهێنان کورد واتەنی تەنها مشتێکن لە خەروارێك، ناوهێنانیشیان بەو مەبەستەیە کە خوێنەرانی ئەم کتێبە بەگشی و ئەوانەیان کە لە نزیکەوە بە هەورامان و خەڵکەکەی ئاشنانین، لەوە ئاگاداربن ژنانی هەورامان لە هەموو بوارەکانی ژیانـدا دیار و دەستکراوەبوون.**

O

# دیین لە هەوراماندا

**بەرلەوەی بچینە ناوەرۆکی ئەم باسەوە بەپێویستی دەزانین ئاوڕێکی خێرا و سەرپێیی لە مەسەلەی گەشەکردن بدەینەوە و بڵێین گەشەکردن بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆری هەن بەم ناوانە:**





1ـ گەشـەکردنی بایـەلۆژیی: ئـەم جۆرەیـان هـەموو گیانلەبـەر و زینـدەوەرەکان بـە (مرۆڤ،ئاژەڵ،درندە،باڵنـدە،رووەك و شـینایی) هـەر لەوانەیانـەوە لەشـیان لـە تـەنها خانەیـەك پێکهاتووە،هەتاکو ئەوانـەیان کـە گـەورەترین لـەش و قـەوارەیان هەیـە تێیـدا بەشدارن،چونکە لەشیان لە (مادەی زیندەڵ) پێکهاتووە.

2ـ گەشەکردنی کۆمەڵایەتیی: ئەم جۆرەشیان تەنها و تەنها تایبەتە بـە مرۆڤەوە،چونکە زادەی (ئیرادە،هۆش،ئـەقڵ)ی مرۆڤـە و بوونـەوەرەکانی تـر ئـەم گەشـەکردنە نایانگرێتەوە،هـەر چـەندە پێویـستە بڵـێین چـەند خاسـییەتێك هـەن کـە مـرۆڤ و گیانلەبـەرەکانی تـر تیایانـدا بەشـدارن،بەڵام ئـەو خاسـییەتانە لای هیـچکام لـەو گیانلەبەرانـە هـەرگیز نەبوونەتـە بنـەمای درووسـتبوونی ژیـانی کۆمەڵایەتیی،چـونکە تێکـڕای ئـەو خاسـییەتانە بـەبێ (هـۆش) نـاتوانن مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتیبوونەوە درووستبکەن[*].

هەر لەم ڕوانگەوە دەبینین کە (دین)یش تایبەتە بە مرۆڤـەوە و لـە نـاو بوونـەوەرەکانی تـردا شـتێك نییـە نـاوی (دیـن) بێت،لەگـەڵ ئەوەشـدا تێڕوانینـەکان بـۆ دیـن لـە یـەکتری جیاوازن،هەیانـە وەك دیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتیی[**] لێیدەڕوانێت،هەشـیانە سەرچـاوەکەی بـۆ (سروش و ئیلهام[***]) دەگێڕێتەوە،کەچی دەبینین هەر لەکۆنـەوە تـا ئێـستا ڕۆڵـی گـەورەی لـە ژیانی کۆمەڵایەتیدا گێڕاوە.

پـاش ئـەم چـەند دێـڕە دینەسـەر کرۆکـی باسـەکەمان و سـەرەتا لـە پێناسـەی دینـەوە دەستپێدەکەین بەم شێوەیە:

1ـ دین لەڕووی زمانەوانییەوە بە وشەیەکی عەرەبی لەقەڵەمدراوە و لەهەنـدێك شـوێندا بەمەبەسـتی جیاجیـا بەکارهێنراوە،هـەر بۆنموونـە لـەقورئانی پـیرۆزدا بـۆ دەلالـەتی

---

[*] (مەسعوود محەممەد) مرۆڤ و دەورووبەر/بەرگی دووەم/ لاپەڕە (19).

[**] وەك شـوێنکەوتووەکانی بـیری ماتریالیـستی و فەلـسەفەی زانـستی و ژمارەیـەك لـە فەیلەسـووفە وجودییەکانی وەك (سارتەر،هایدگەر،ئەلبێرکامۆ).

[***] وەك شوێنکەوتووەکانی بیری ئایدیالیستی ولاهوتییەت.

(لێپرسینەوە،دادگاییکردن،سزاوپاداشتدانەوە) بەکارهێنراوە وەك دەفەرمێ: (مالك یوم الدین[1])،لەهەندێك شوێنی تریشدا بەواتای (گوێڕایەڵی و شوێنکەوتوویی‌یەوە) بەکارهێنراوە.

2 دین لای زەردەشتییەکان بە (دئنا[2]) و بەواتای (ویژدانپاکی)یەوە ناویهێنراوە.

3 لەڕوانگەی زاناو فەیلەسووفە خواناسەکانەوە کە باوەڕییان بە (یەکتاپەرستی= وەحدانییەت) هەیە،دین بریتیە لەو یاساو ڕێسا خواییانەی کە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ مرۆڤەکان هاتوونەتە خوارەوە و پێویستە پێیانەوە پابەندبن.

4 دین لەڕوانگەی ئیسلامەوە بەچەندجۆرێك پێناسەکراوە هەموو پێناسەکانیش لەیەك ناوەرۆکدا کۆدەبنەوە کە بریتیە لە (باوەڕبوون بە خوایەکی تاك‌وتەنها،باوەڕبوون بەوەی حەزرەتی محەممەدی کوڕی عەبدوڵا (د.خ) نێردراو و پەیامهێنەری خوایە بۆ سەر بەندەکانی،باوەڕبوون بەڕۆژی کۆتایی،باوەڕبوون بە قورئانی پیرۆز و سوننەت،باوەڕبوون بە بەهەشت‌ودۆزەخ وەك پاداشت‌وسزای خوایی بۆ بەندەکانی).

دین لەشێوە گشتییەکەیدا بریتییە لەو پەیوەندییە رۆحییەی لەنێوان مرۆڤ و ئەو هێزانەدا درووستدەبێت کە بەباڵادەست و شاردراوە دەزانرێن. ئەو هێزانە لای ئیمانداراەکان خوایەکی تاك‌وتەنهایە،لای کەسانی تریش ئەو هێزە شاردراوە و غەیبی و ئەفسوناویانەن لە (جیهانی نموونە بەرزەکاندان= عالم المیل[3]) و هەموو راستیەکانیش لای ئەوانە.

بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو هێزانە نەتەوە کۆنەکانی وەك: (یۆنانی ،ئەغریقی،رۆمانی،فیرعەونی،ئەکەدی،سۆمەری،ئاشووری،بابلی) و نەتەوە ئارییەکانی وەك (گۆتی،لۆلۆ،کاسی،خالدی= گاڵدی،میتانی،سۆباری) و کۆمەڵگەی جاهیلی لە نیوەدوورگەی عەرەبدا پەنایانبردۆتەبەر (بتپەرستی)،هەربۆ نموونە قوڕەیشییەکان وتوویانە (نعبد الاصنام لنقترب من الله زُلفی).

---

[1] بڕوانە قورئانی پیرۆز سورەتی فاتیحە ئایەتی 4،لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەین سوورەتی فاتیحە بە (بسم الله) وە (7) ئایەتە،(بسم الله) لای (ئیمای شافیعی) ئایەتێکی جیاواز نییە،بەلاّم لای (ئیمامی حەنەفی) بە ئایەتێکی جیاواز لەقەڵەمدەدرێت.

[2] هادی بەهمەنی لەکتێبی پەیامی هەوراماندا نووسیویەتی. (دین) وشەیەکی کوردی ئاوێستاییە. بڕوانە پەیامی هەورامان بەرگی یەکەم پەراوێزی لاپەڕە 332.

[3] (د.کامیل حەسەن عەزیز ئەلبەصیر) رەخنەسازی مێژوو و پەیڕەویکردن لاپەڕە (16).





لەگەڵ ئەو هەموو گرنگییەی (دین) لە سەردەمە جیاوازەکاندا لای کۆمەڵ هەیبوە و تا ئێستاش هەیەتی،کەچی هەندێك لە (بیریاران،نووسەران،فەیلەسووفان،لێکۆڵەران)،چ لە ولأتانی خۆرئاوا و چ لە ولأتانی خۆرهەلأتدا،تێڕوانینی نێگەتێفانەیان بۆ دین هەبووە،هەر بۆ نموونە لێرەدا رای یەکێك لە فەیلەسووفە گەورەکانی دنیای ئیسلام دەخەینەڕوو،ئەویش (ئەبوعەلای مەعەری)یە،ناوبراو سەبارەت بە دین وتوویەتی: مرۆڤ ئەگەر ئەقڵی هەبوو دینی نییە و ئەگەر دینیشی هەبوو ئەوە ئەقڵی نییە،هەروەها لە تێڕوانین و شیعرەکانیدا بۆچوونی نێگەتیفانەی خۆی سەبارەت بە دین خستووەتەڕوو،وەك لەم دێڕانەدا دەردەکەوێت:

**فی اللاذقية ضجة مابين احمد والمسيح**

**هذا بناقوس يدق وذا بماذنة يصيح**

**كل يمجد دينة يا ليت شعری ما الصحيح**[1]

بۆ قسەکردن لەسەر دین لای خەڵکی هەورامان،پێویستە کەمێك بەلاپەڕەکانی مێژووی دین لەناو نەتەوە ئارییەکاندا شۆڕببینەوە،لەم بوارەدا (موشیر ئەلدەولە حەسەنی پیرنیا) لەکتێبی (تأریخ ایران باستان جلد اول) نووسیویەتی؛ دین لای ئارییەکان و هیندییەکان لەسەرەتاوە هەتاکو سەدەی چواردەمی پێش زایین یەك بووە و ئەم راستییەش لەکتێبی (ڤیدا = ویدا = Vedas) کە کتێبی پیرۆزی هیندۆسیەکانە و بەزمانی (سانسکریتی) نووسراوە،ئاشکراکراوە،هەر لەدرێژەی ئەم نووسینەدا هاتووە ئارییەکانی ئێرانی لەڕووی دینییەوە باوەڕیان وابووە (رووناکی،باران،رزق و ڕۆزی) سەرچاوەی خێروخۆشین بۆ مرۆڤ،بەرامبەر بەمانەش (تاریکی،مردن،وشکەساڵی،نەخۆشی) سەرچاوەی (بەد)ن و هەمیشە دژی خۆشگوزەرانی مرۆڤن،لەوەوە ئیتر سەرچاوەکانی خێروخۆشیان پەرستووە،کڕنووشیان بۆبردوون و قوربانیان بۆکردوون،لەسەرچاوە بەدەکانیش ترساون و بەدوژمنی خۆیانیان لەقەڵەمداوون[2].

لەهەندێك سەرچاوەی تردا باس لەوە کراوە ژمارەیەك لەو نەتەوە ئارییانەی بەکۆمەڵەی زاگرۆس ناسراوون وەك (گۆتی،لۆلۆ،کاسی) لەڕووی دینییەوە زیاتر لەژێر کاریگەری

---

[1] (الدكتور زكی نجيب محمود) مجتمع جديد او الكارثة ص (26) دار الشروق بيروت 1978.

[2] (موشیر ئەلدەولە حەسەن پیرنیا) تأريخ ايران باستان جلد اول لاپەڕەکانی (163-164).

دینــی نەتــەوەکانی (ســۆمەری،ئەکەدی،بابلی)دا بوون،چــونکە هەرلــە ســەرەتاوە لەگەڵیانــدا تێکەڵاوبوون[شملحلج].

بەڵام سەبارەت بـە نەتـەوە ئارییـەکانی تـری وەك (ماد،پـارس)،هـەر لەسـەرتاوە لـەرووی دینییەوە باوەڕییان بەدوو بنەمای دینی هەبووە،ئەوانـەش بریتیبـوون لـە: (خێـرو ڕووناکی) و (شــەڕ و تــاریکی)،هــەموو ئــەو شــتانەی کــە مــرۆڤ ســوودی لێوەرگرتــوون وەك: (رزق و ڕۆزی،رووناکی،باران) بەسەرچاوەی خێرو رووناکیـان لەقەڵەمـداوون و ئەوشـتانەش کـە زیانیـان بــەمرۆڤ گەیانــدووە وەك: (نەخۆشــی،مردن،ترس،گرانی،بەڵای رۆژگــار) سەرچــاوەکانیان گەڕاندوونەوتەوە بۆ شەڕو تاریکی و لێیانترساون[لحلجلج].

لەکتێبی (تـأریخ دەهـزار سـالە ایـران – جلـد اول)دا نووسـراوە: ئارییـەکان لـە سـەرەتاوە سەرچاوە سرووشتییەکانی وەك (خۆر،مانگ،ئاسمان)یان پەرستووە و قوربانیان بۆ کردوون،ناوی خواوەندە گەورەکانیشیان بەم شێوەیە بوون:

1ـ ئیندرا = خواوەندی هەورەبروسکە و جەنگ.
2ـ وارونا = خواوەندی ئاسمانی پڕئەستێرە.
3ـ میترا = خواوەندی خۆر.
4ـ ئاگنی = خواوەندی ئاگر[لجلجلج].

هەرلـە هـەمان سەرچـاوەدا هـاتووە: بـەر لەدەرکـەوتنی زەردەشـت ئێرانییـەکان لـەڕووی دینییەوە لەژێر کاریگەری سەرچاوە سروشتییەکاندا بوون،بەڵام بەدەرکەوتنی زەردەشت زۆریان رووبانکردۆتە (یەکتاپەرستی[لجلجلج]).

پاش ئەم چەند دێڕە دینـە سـەر باسـی دوودیـن لـە دینـە کۆنـەکانی ئێرانـی کـە هـەتاکو دەرکـەوتنی ئیـسلام و گەیـشتنی بـە ناوچـەکە خـەڵکی هـەورامان پـەیڕەیانکردوون،ئیتر ئـەو گەیـشتنە لـەرێی بانگهێـشتەوە بووبێت،یـاخود شەڕوشـۆڕ و گرتنـی خاکـەوە بووبێت،ئـەوانیش

---

[شملحلج] (محممەد ئەمین زەکی بەگ)، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، بەرگی یەکەم–لاپـەڕە 149، چاپی نوێ،سلێمانی 2000.

[لحلجلج] سەرچاوەی پێشو و هەمان لاپەڕە.

[لجلجلج] (عەبدولعەزیمی رەزائیی)، تأریخ دەهزار سالە ایران – جلد اول، لاپەڕە 67.

[لجلجلج] سەرچاوەی پێشوو هەمان لاپەڕە.





**بریتیبوون له (دینی میترائیزم،دینی زەردەشتی)،بۆ ئـەوەی بتـوانین کاریگـەری ئـەو دوودینـە و چـۆنیەتی وابوسـتەبوونی هەورامییـەکان پێیانەوە،هـەروەها رەنگدانـەوەیان لـەناو کولتووریانـدا بخەینەروو،پێویستە قسەوباسێك لەسەریان بکەین[لحلجلج].**

**دینی میترائیزم= میهرپەرستی**

**میترائیزم= میهرپەرستی: لە سەردەمی زۆر کۆنـەوە و لـەتاریکترین رۆژانـی مێژوودا،لـەو سـەردەمەوە کـە ئارییـەکان هاتوونەتـە سـەر زەمینـی ئێـران، ئێرانییـەکان ستایـشی (میهـر و ناهید)یان کردووە و شوێنکەوتووی دینی (میهر)بوون[لخلجلج].**

**لەسەرچـاوە مێژووییەکانـدا هـاتووە،دینی میترائیـزم زیـاتر لـە دووهەزارسـاڵ بەسـەر هەموودینـەکانی تـردا باڵادەسـتبووە و کاریگـەری زۆریـشی لەسـەر دینـەکانی (زەردەشتی،مەسـیحی،یەهودی) درووسـتکردووە،بنەمای سـەرەکی ئـەم دینـە لەسـەر پەرسـتنی (ئاگر،هێزەکانی سروشت،ئەفسانە) دامەزراوە[برلجلج].**

**(پرۆفیسۆر ارثر کریستنسن) نووسیویەتی: (مـیترا) لای بابلییـەکان خواوەنـدی رووناکی بەرەبەیان بووە،ئەوانەیش لەسەر دینی میترائیزم بوون پێیـانوتووە (ئـەو خـۆرەی کـە هـەرگیز نابـەزێت)[ترلجلج]،(مـیترا) سـەرەڕای ئـەوەی لـە نێـوان ئێرانییـەکان و هیندییەکانـدا خوایـەکی**

---

[لحلمجلمج] پەرسـتنی خواوەنـدی (مـیترا) لـە نێـو (بەڵگەنامـەکانی هـەورامان= قەواڵـەکانی هـەورامان)دا دیارە،ئـەو بەڵگەنامانـە جـۆری بینـای هۆشـی،ئایینی و زمانەوانی،هـەروەها شـێوەی نووسـین لـە ناوچـەیەکی کوردەواریـدا ڕووندەکەنەوە.

لەم بارەیەوە بڕوانە کتێبی (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی وڵاتی کوردەواری) نووسینی (د.جەمال رەشید ئەحمەد) لاپەڕە (442-443) لە بڵاوکراوەکانی (دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی) 1988.

[لخلمجلمج] ایرج بهرامی، اسطوره اهل حق، لاپەڕە (60).

[برلمجلمج] (عەبدوڵا مبلغی ئابادانی) مێژووی ئایینی زەردەشت، وەرگێڕانی، وریاقانیع، لاپەڕە (22).

[ترلمجلمج] (ارثرکریستنسن) ایـران فـی عهـد الـساسانیین، ترجمـة یحیـی الخـشاب،مراجعة عبـدالوهاب عـزام، لاپـەڕە (133).

هاوبەشبووە،بە خوای (ژیان و زانست و پەیمان و بەڵێن)یش لەقەڵەمدراوە[يرلمجلج]،پەرستنیشی سەرانسەری ئیمپراتۆریەتی (رۆمی کۆن)ی گرتووەتەوە.

(میترائیزم) پڕە لەنهێنی مەزهەبی و میترائیییەکان پێیانوایە لە ڕێگەی عیبادەت و هەندێك ڕێوڕەسمی دینی ئاڵۆزەوە دەکەونەسەر ڕێگەی رزگاری و سەرفرازی،دەربارەی پەیدابوونی (میترا)ش ئەفسانەیەکیان هەیە بەم شێوەیە:

(میترا) سەرەتا لەبەردێك و لەناو ئەشکەوتێك شەوی شەممە ڕێکەوتی 12/24 ساڵی 272پ.ز لە درێژترین شەوی ساڵدا لەدایکبووە[سملجلج]،شەوی لەدایکبوونی (میترا) پێیدەوترێت (شەوی یەڵدا)،پاش لەدایکبوونی شوان و بەرغەلەوانەکان پەرستوویانە و ئینجا بووە بە هاوئاهەنگی خۆر،رۆژێك گاکێوییەکی کێشاوەتە ناو ئەشکەوتەکەوە و زنجیریکردووە،بەفەرمانی خۆر (کولاغ= قەلەرەشکە) گاکەی کوشتووە،لەهەناوی (گا)کەوە (گوڵەگەنم و داری مێو) سەوزبوون، ئینجا (مار و مێروو) ئەندامی نێرینەی گاگەیان خواردووە،پاشان (میترا) چووە بۆ ئاسمان و جارێکی تر گەڕاوەتەوە بۆسەرزەوی،بەگەڕانەوەی بۆسەر زەوی هێزێکی وەهای بەخشیوە بە مردووەکان هەتاکو هەموویان هەستنەوە،سنوورێکیشی لەنێوان چاکە و خراپە داناوە و بەو شێوەیە چاکەکارانی لە خراپەکاران جیاکردووەتەوە،دواجار گایەکی سەربڕیوە لەگەڵ شیلەی پیرۆزدا خۆشاوێکی لێدرووستکردووە،هەرکەسێك لەو خۆشاوەی خواردووەتەوە چووەتە ژیانی نەمرییەوە.

کاریگەری دینی میهر لەسەرزۆربەی دینەکانی پاش خۆی بەرچاودەکەوێت، بۆنموونە کاریگەری لەسەر مەسیحییەت بەتایبەت لەناو (کارە هونەرییەکان، پەرستاگان، دامەزراوەدینییەکان)دا شتێکی دیار و ئاشکرایە،هەر لەم بوارەدا ئاماژەدەکەین بەوە کە (میهر) لە باوەڕی دینی زەردەشتییەکاندا یەکێکە لە (یەزد=یەزت= ئێزد)ەکان،لە باوەڕی هەلگرانی دینی (مانی[شملجلج])یشدا پەیامبەرە[لحلجلج].

---

[يرلمجلمج] الدکتور جمال رشید امین، دراسات کردیه فی بلاد سوبارتو، بغداد 1984.

[سملمجلمج] ئیرەجی بەهرامی، اسطوره اهل حق، لاپەڕە (68).

[شملمجلمج] لێرەدا پێویستە باس لەوە بکەین (مانی کوڕی فاتك) لە نەوەی یەکێك لە بنەماڵە گەورەکانی ئەشکانی بووە لە هەمەدان،باوکی لە هەمەدانەوە کۆچیکردووە بۆ وڵاتی (بین النهرین=عێراقی ئێستا)،(مانی) ساڵی (215ز) لە (بابل) لە دایکبووە،هەر لە منداڵییەوە خراوەتە بەرخوێندن،پاشان لە فەلسەفە و عیرفاندا قووڵبووەتەوە،لە رووی

لەسرووده کۆنەکانی ئاوێستادا سروودێك هەیە پێیدەوترێت (میهریەشت)،لەم سرووده‌دا هـەموو سـیفەتەکانی میهـر و ئـەو کارانـەی ئەنجامیـداون باسـیان لێوەکراوە،هاوکـات پەیوەنـدی میهـر بـه‌(خـۆر)ەوە خراوەتـەڕوو[لجلجلج]،بـۆ نموونـە ئەمانـەی خـوارەوە چـەند سـیفەتێکن لەسیفەتەکانی میهر کە لەسروودی (میهر یەشت)دا خراونەتەڕوو:

1 له ستایش و پەرستندا پایەی ئاهورامەزدای هەیە[لحلجلج].

2 بەخشندەی گەورەیە[لحلجلج].

3 هەزار گوێ و دەهەزار چاوی هەیە[لخلجلج].

4 چاودێریکاری هەموو سەرزەوی ئارییەکانە[برلجلج].

5 ئاشتەوایی و جەنگی کیشوەرەکانی بەدەستە[ترلجلج].

6 بەخشندەی بەرەکەتە[یرلجلج].

میهر لەئەدەبیاتی (ودائی = ویدا =vedas)دا خاوەنی دووئەرکی بنەڕەتییە:

1 حوکمڕانیی رۆحانی.

---

دینییـەوە لـە دینـەکانی (زەردەشتی،بودایی،مەسـیحی،یۆنانی) بەهرەمەندبووە،لـە تەمـەنی (24) سـاڵیدا پێغەمبـەری خۆی راگەیاندووە،هاوکات لەگەڵ چوونەسەرتەختی (شاپووری یەکەم) دەستیداوەتە بانگهێشتکردنی خـەڵك بـۆ سـەر دینەکەی،بەهاوکاری و یارمەتی (پەروێز)ی برای شاپوور گەیشتووەتە بارەگای شا و یـەکێك لـە کتێبـەکانی خـۆی بـە ناوی (شاپوورگان)پێشکەش بە ناوبراو کردووە،لـە ئەنجامـدا (شاپوور) دینـی مـانی پەسـەندکردووە و فەرمانیـداوە خـەڵکی قەڵەمڕەوەکـەی بچنەسەر ئـەو دینە،لەسـەردەمی حوکمڕانی (بـارامی یەکـەم)دا رۆحانییە زەڕدەشـتییەکان لـە تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی دینی مانی) بێزاربوون،داوایان لە (بارامی یەکەم) کردووە رووبەڕووبوونەوەیەکی دینـی لـە نێوان ئـەوان و (مـانی)دا سازبدرێت بۆ ئـەوەی بەڵگـەی پێغەمبەرایـەتی خۆی بخاتـەڕوو، لـەو رووبەڕووبوونـەوەدا (مـانی) شکستیهێناوە و بـە فـەرمانی (بـارامی یەکـەم) خراوەتـە زیندانەوە،سەرچـاوەکان وا دەگێڕنـەوە گوایـا سـاڵی (276ز) لە ناو زینداندا بە زیندوویی کەوڵکراوە.

(تاریخ ده هزار ساڵه ایران)جلد دوم لاپەڕە (105 106) نووسینی (عەبدولعەزیمی رەزائی).

[لمحلجلمج] (ابو القاسم پرتو) اندیشەهای فلسفی در ایران لاپەڕە (24) انتشارات اساطیر چاپ اول تهران.

[لمجلجلمج] (ئیرەجی بەهرامی) اسطوره اهل حق لاپەڕە (62).

[لجلجلمج] بروانە کتێبی (ئاوێستا – میهریەشت بەندی یەکەم) ل353،تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی د.جەلیل دۆستخواە.

[لحلجلمج] هەمان سەرچاوە (میهریەشت بەندی شانزەیەم) ل357.

[لخلجلمج] هەمان سەرچاوە (میهریەشت بەندی حەوت) ل355.

[برلجلمج] هەمان سەرچاوە (میهریەشت بەندی سیانزە) ل 356.

[ترلجلمج] هەمان سەرچاوە (میهریەشت بەندی بیستونۆ) ل360.

[یرلجلمج] هەمان سەرچاوە (میهریەشت بەندی چوار،بەندی سی) ل 360،354.

2ـ بەخشندەی بەرەکەت.

ئـــەم دینـــە چـــەند ســـەدەیەك دینـــی نەتـــەوە ئێرانییـــەکان بووە،بـــۆ نموونـــە (ئەشکانییەکان[1]) بە (خۆر)یان وتووە (میهر) کڕنووشیان بـۆ بـردووە و پەرستوویانە و لـە پەرستگەکانیاندا قوربانییـان بـۆکردووە،لای ئـەوان خـوای خـۆر پـارێزەری خێزانـی حـوکمڕان و هاوکـات پـارێزەری پەیکـەری بـاو باپیرانییـان بـووە[2]، هەرلـە سـاڵی یەکـەمی زاینیـشەوە میهرپەرستەکان دەستیانداوەتە بڵاوکردنـەوەی دینەکـەی خۆیـان و لـەم بـوارەدا برەوێکـی زۆری پەیداکردووە،سـاڵی (68ز) میهرپەرسـتی گەیـشتووەتە ئـەوروپای ناوەند،سـاڵی (107ز) هـەتاکو باکووری باڵکان چووە،ساڵی (148ز) لە (ڕۆما) لایەنگری زۆری پەیداکردوە،هەروەها لەهەریـەك لەوڵاتانی (ئیتالیا،ئەڵمانیا،فەرەنسا) شوێنەواری میهرپەرستی بەرچاودەکەون.

دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دینی (میترائیزم)یان پەسەندکردووە و بووە بـەدینی ڕەسمی دەوڵەتەکەیان،هەروەها لەناو سوپای یۆنانیدا بە ئاستێکی بەرچاو بڵاوبووەتەوە،سـەربازە یۆنانییەکان (میترا)یان بەسیمای خوای جەنگاوەران لەقەڵەمداوە[3].

میترابیەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە (مـیترا) خـوای گەورەیـە و خواکـانی تـریش لـەخوار ئەوەوەن،هاوکات پێیانوایە (خۆر) خودی خوا نییە،بەڵکو خوایەك لەناو خۆردا هەیە[4].

پـــەیڕەوکارانی دینـــی میترائیـــزم باوەڕیـــان هەیـــە بـــەوەی ڕوح هەمیـــشەییە و دەمێنێتـــەوە،هاوکات باوەڕیـــان بـــە کاریگـــەری ئەســـتێرەی (خۆشـــبەختی،نەگبەتی) لەســـەر

---

[1] (ئەشکانی) لـە هەنـدێك سەرچاوەی مێژوویـدا بـە (پـارتی) ناویانهاتووە،دەربارەی ڕەچەڵەکیان جـاوازی لەسەرچـاوە مێژووییەکانـدا هەن،هەنـدێکیان وتوویانـە: (ئـاری نـەژاد)ن و سـەرەتا لـە (خۆراسـان)ی ئـەمڕۆدا ژیاون،هەندێکی تریـان بـە (چینی و مـەغۆلی) نـەژادیان لـە قەڵەمداون،هەنـدێکی تـریش وتوویانـە تێکـەڵاون لـەو دوو ڕەچەڵەکە،پاشان خۆرهەڵاتناسان دڵنیاییانداوە کە ئاری نەژادن،سەبارەت بـە ناوەکەیان هەنـدێك وتوویانـە: باپیرە گەورەکانیان لە سەرەتاوە لـە (ئاساك) ژیاون،پاشان پادشاکانیان زنجیرەی بنەماڵەکەی خۆیـان گێڕاوەتـەوە بـۆ سـەر ئەوان،هەندێکی تریش وتوویانە: لەبەر ئەوەی خۆیان بە نەوەی (ئەردەشیری دووەم= ئەرشك) زانیوە،نـاوی خۆیـان ناوە (ئەشکانی).

بڕوانە (تاریخ دەهزار ساڵە ایران) –جلد اول، لاپەڕە (272)،نووسینی (عەبدولعەزیمی ڕەزائی)،چاپی دەهەم، 1978.

[2] (موشیر ئەلدەولە حەسەنی پیرنیا)، تاریخ ایران باستان، جلد (3)، لاپەڕە 2348 .

[3] (عەبدولا موبلغی ئابادانی)، مێژووی ژیانی زەردەشت، وەرگێڕانی، بورهان قانیع، لاپەڕە (25).

[4] (د. عەلی شەریعەتی)، تاریخ و شناخت ادیان، جلد( 2)، لاپەڕە (198 ،199).





چارەنووسی مرۆڤ هەیە،هەروەها باوەڕیان بەکاریگەری خەو لەسەر ژیانی مرۆڤ هەیە،لەم بوارەدا دەستیانداوەتە لێکدانەوەی خەونەکانیان.

هەرچەندە تا ئەمڕۆژانەش هیچ نووسنێك،یان کتێبێك سەبارەت بە دینی میترائیزم لەبەردەست لێکۆڵەراندا نییە،بەڵام ئەم سەرچاوانەی خوارەوە چەندشتێکن بۆ تێگەیشتن لەم دینە:

1ـ شوێنەوارە بەردینەکانی ئەفغانستان و خۆراسان هەتاکو ئینگلستان.

2ـ هەندێك کتێبی ئیسلامی دەربارەی (مێژوو،تەفسیر).

3ـ کتێبە مێژووییەکانی (یۆنانی کۆن،ڕۆمانی کۆن) بەشێوەیەکی گشتی.

4ـ ئەوشتانەی کە مەسیحی و بودائییەکان لەمیترائیزمەوە وەریانگرتوون و تا ئێستاش لاساییاندەکەنەوە.

5ـ ئەو شوێنەوارانەی کە لەوڵاتی (چین)دا دۆزراونەتەوە.

6ـمەزهەبی میترائیەکان لە (وێژەوانی عاریفانە)ی موغە فارسەکاندا.

ئەم دینە پێشتر هەردوو لایەنی کۆمەڵایەتی و ڕەوشتپاکی گرتووەتەوە،هاوکات سیاسەتمەدرارنی ئەو سەردەمانە لەخۆرهەڵات و خۆرئاوای جیهاندا،بەهیچ شێوەیەك بە لە قاڵبدانی دینەکە قایلنەبوون.

پێویستە باس لەوە بکەین،سوننەتی ڕێزلێنان لە ڕووناکی یەکێکبووە لەو سوننەتانەی لەئێرانەوە بۆ هەموو وڵاتانی تر گوێزراوەتەوە،لەم بوارەدا داگیرساندنی (مۆم،چرا) لەسەر ڕێگاکان و شوێنە پیرۆزەکان و گۆڕستانەکان بە تایبەت لەناو مەزارگەی پیاوە پیرۆزەکاندا،داگیرساندنی مۆم لەناو کلێساکانی مەسیحییەکاندا،سەرچاوەکەیان بۆ دینی میترائیزم دەگەڕێتەوە.

بەپیرۆز زانینی خۆر لای میترائییەکان بە ڕادەیەکە ڕۆژانە دووجار کڕنووشی بۆدەبەن و سوپاسگوزاری خۆیان بۆ میترا دەردەبڕن،کاتەکانی کڕنووشبردنیش ئەمانەن:

1ـ بەیانیان بەرلە هەڵهاتنی خۆر 2ـ ئێواران پێش ئاوابوونی خۆر.

یەکەمین ڕێنمایی دینی میترائیزم بۆ پەیڕەوکارانی لەسەردەمی خۆیدا،ئاشناکردنیانبووە بە جۆرەکانی چەك و چۆنیەتی سوودوەرگرتن لێیان،لەوچەکانەش (شمشێر،تیر،گورز)،هەروەها سوودوەرگرتن لە قەڵغان بۆ بەرگریکردن لەخۆیان دژی ئەو نەیارانەی کە چەکیان بەرامبەریان بەکارهێناوە.

لەسەر رۆشنایی نووسینێکی (مانەوی[لجلحلج]) کە لە تورکمانستاندا دۆزراوەتـەوە دەوترێـت: بەرامبەر بە (میترا)ی راستەقینە (میترا)ی درۆزن هەبووە،گوایا سواری گایەك بـووە و خـۆی بـە کـوڕی راسـتەقینەی خـوا ناسـاندووە و هاوکـات فەرمانیـداوە بەخـەڵك کـە بیپەرسـتن،هەمان (مـیترا)ی درۆزن لـە رازە دینییـەکانی مەسـیحییەکاندا دووبارەبووەتەوە،بـەوەی کەسـێیەیەتێك هـەبووە بـەناوی (عیـسای ناصـری) لەشـوێنی (میهـر مەسـیحا) خـۆی نمایـشکردووە،بەڵام (میهـر مەسیحا = میهر سۆشیانس) هەمان (حەزرەتی عیسای کوڕی مریەم)ە خوای لێڕازیبێت.

هـەڵگرانی دینـی میترائیـزم لەسـەردەمی خۆیانـدا هـەموو رێوڕەسمـە دینییـەکانیان لـە ئەشـکەوتەکاندا جێبەجێکردووە،پەرسـتگاکانیان لـەنزیك سەرچـاوەکانی ئـاو و رووبارەکانــدا دروستکردووە،یەکێك لە شاهیدەکانی سەردەمی کۆن کـە هەشـتا سـاڵ بەرلـە حـەزرەتی مەسـیح (خ.ل) ژیاوە دەربارەی (میترا) بەم شێوەیە دواوە:

(خوایــەك لــەژێر بــەردی ئەشـکەوتەکانی ئێرانـدا دانیـشتووە،هەردوو ئـەژنۆی خـۆی گرتووەتە باوەش،شاخەکانی سەری هەڵدەسوڕاند و دەیسوڕاندنەوە[لجلحلج]).

زۆربــەی ئــەو سەرچـاوانەی باسـیان لـە(میترائیـزم) کـردووە لەسـەر ئـەوە کۆکن،کـە پێشکەوتن و گەشەکردنی خێرای لەرۆژگاری خۆیدا دەگەڕێتەوە بۆ رەوشتپاکی و کرداری چاکی شوێنکەوتووەکانی[لخلحلج].

## دینی زەردەشتی

دەربارەی زەردەشت و دینی زەردەشتی جیاوازیی زۆر لەسەرچاوە مێژووییەکانـدا هـەن و تـا ئێـستا بەتـەواوی ئاشـکرا نییـە (زەردەشـت) کـەی هاتۆتـە دنیـاوە؟ لـەچ سـەردەمێکدا ژیـاوە؟

---

[لجلحلمج] (ئیرەجی بەهرامی) اسطورە اهل حق لاپەڕە (83).

33 (عەبدوڵا موبلغی ئابادانی) مێژووی ئاینی زەردەشت وەرگێڕانی بورهان قانیع لاپەڕە (21).

[لخلحلمج] سەرچاوەی پێشوو ل29.





**خـەڵکی کویێ بـووە؟ بـە چ زمانێـك دواوە؟...هتد،هـەر بـۆ نموونـە لـەخوارەوە دەمەتەقێیـەکی ژمارەیەك لەو سەرچاوانە دەخەینەڕوو:**

**1ـ لــە سەرچــاوە و رازە زەردەشــتییەکاندا هــاتووە گوایــا (300) ســاڵ بــەر لــەژیانی (ئەسـکەندەری مەکـدۆنی) ژیاوە،بـەواتا لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی حەوتـەمی پـێش زایـین بـۆ نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمی پێش زایین لەساڵەکانی (660ـ583 پ.ز)[1].**

**2ـ گزانتویس،کۆنترین نووسەری یۆنانییە کە ناوی زەردەشتی هێناوە و سـەردەمی ژیـانی ئەوی بۆ شەش هەزارساڵ بەرلە لەشکرکێشییەکەی (خشیارشا[2]) بۆسەر یۆنان گێڕاوەتەوە.**

**3ـ ئیفلاتوون لەکتێبی (Alkibiadas) نـاوی زەردەشـتی هێنـاوە و پاشـان قوتابیـەکانی وەك (ئەرەسـتۆ،هۆمیرۆس) مێـژووی ژیـانی ناوبراویـان بـۆ شـەش هـەزار سـاڵ بەرلـە مردنـی ئیفلاتوون گێڕاوەتەوە.**

**4ـ پلینی = پلینۆس[3] لەکتێبەکەیـدا بـەناوی (مێـژووی سروشـتی)یـەوە نووسـیویەتی: زەردەشت شەش هەزار ساڵ بەرلە ئیفلاتوون ژیاوە.**

**5ـ هەریەك لە دانشمەندی فارسی (ئەردەشیر خەبـەردار) و دانـشمەندی ئـەڵمانی (بـارول بۆن سن) سەردەمی لەدایکبوونی (زەردەشت)یان بۆ (شەش هەزار و پێنج سەد ساڵ) بەرلەزایین گێڕاوەتەوە.**

---

**[1] ئاوێستاـ بـەرگی یەکـەمـ لاپـەڕە (11) تۆێژینـەوە و لێکۆڵینـەوەی (د.جلیـل دوسـتخواە) لـە بلاۆکراوەکـانی مروارید.**

**[2] (خـشیارشا کـوڕی داریوشـی یەکـەم ) و دایکـی نـاوی (ئاتـسی سـا) کـچی کۆرشـی گـەورە بووە،سـاڵی 35سلوکی بەرامبەر بە 486ی پێش زایین،چووەتەسەر تەختی پادشایی،ناوی ناوبراو لەنووسراوە هـەڵکۆڵراوەکانی سەردەمی هەخامەنشیدا بـە (خشەیارشا) و بـەزمانی شوشـی (خشەرشا) هاتووە،بـەزمانی میسری (خشی یـەرش) و لەتەوراتـدا بـە (ئـەخس ویـروش) نـاوی هـاتووە،هیرۆدۆت و کۆنـە مێژوونووسـەکانی تـری یۆنـانی بـە (کسرك سـس) ناویانهێناوە و لەناو زنجیرەی ناوی شاکانی کلدانیشدا بە (ئەحشیرۆش) ناویهاتووە،مێژوونووسە ئەوروپاییـەکانیش بە (گزرك سس) ناویانهێناوە.**

**بڕوانە (تأریخ ایران باستان ـ جلد اول) لاپەڕە 638ـ نووسینی (موشیر ئەلدەولە حەسەن پیرنیا).**

**[3] (پلینـی=پلینـۆس) زانایـەکی گـەورەی رۆمـانی و نووسـەرێکی نـاودار بووە،سـاڵی (23) زایینـی لـە دایکبووە،ژمارەیەك کتێبی نووسیون تیایاندا هەواڵی تیرە جیاجیاکانی ئەوروپای خستوونەتەڕوو،بەلاّم کتێبەکەی بە ناوی (مێژووی سروشتی= (naturalis historiae) کە لە (37) بەرگدایە گرنگترین کتێبیەتی،ساڵی (79 زایینی) کۆچی دوایی کردووە.**

**بڕوانە کتێبی (دراسات کردیە فی بلاد سوبارتو)ـ ص (119)ـ تالیف (د.جمال رشید احمەد)ـبغداد 1984.**

6/ فەیلەسووفی فەرەنسی (والتەر) لەنووسینەکانیدا زۆربە گەورەیی ناوی زەردەشتی هێناوە و مێژووی ژیانی بۆ (شەشە هەزار سال) بەرلە کۆرشی گەورە[سملحلج] گێڕاوەتەوە.

7/ (مستەر جاکسۆن) کە یەکێکە لە لێکۆڵەرەوانی بواری دینی زەردەشتی و پسپۆرێکی شارەزایە وتوویەتی: زەردەشت لەنیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پێش زایین لەدایکبووە و لەنیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمی پێش زاییندا کۆچی دوایی کردووە[شملحلج].

8/ (مستەر هۆڵ) لەکتێبی (مێژووی کۆنی خۆرهەڵاتی نزیک)دا نووسیویەتی: بەپێی سەرگوزەشتە کۆنەکان زەردەشت ساڵی (599 پ.ز) لەدایکبووە[لمحلخلج].

9/ هەریەك لە (مەسعوودی،حەمزەی ئەسفەهانی،یاقووتی حەمەوی،حەمدوڵای مستەوفی قەزوینی) لەسەر ئەوە کۆکن گوایا زەردەشت لەسەردەمی حوکمڕانیی (گوشتاسب) لەناوچەی (ورمێ)دا ژیاوە[لمجلخلج].

10/ (د. جەلیلی دۆستخواە) لەبەرگی یەکەمی کتێبی ئاوێستادا نووسیویەتی: دەربارەی شوێنی هاتنەدنیای (زەردەشت) جیاوازیی بەرچاو لەسەرچاوەکاندا هەن،هەندێك بە (باختەر= بەڵخ) و هەندێك بە خۆرهەڵاتی ئێرانیان لەقەڵەمداوە،هەندێکیش دەڵێن ئەو شوێنە (ورمێ)یە،هەروەها بەپێی بۆچوونێکی تر لە کۆنەشاری (رگا=رغا) بەواتا شاری (رەی) ئەمڕۆدا لەدایکبووە[لجلخلج].

11/ (د.موحەممەدی موعین) لە لێکۆڵینەوەیەکدا لەسەر مێژووی ژیانی زەردەشت نووسیویەتی: زەردەشت ساڵی (660پ.ز) لەدایکبووە و لەتەمەنی بیست ساڵیدا گۆشەگیربووە،لە سی ساڵیدا (سروش)ی بۆ هاتووە و بووە بە پێغەمبەر،لەتەمەنی چلودوو ساڵیدا چووەتە

---

[سملحلج] (عەبدولعەزیمی رەزائیی)/ تأریخ دەهزار ساله ایران – جلد اول/ لاپەڕە 59/60.

[شملحلج] (محەممەد ئەمین زەکی بەگ)/ خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان–بەرگی یەکەم–ل195/ چاپی نوێ،سلێمانی 2000.

[لمحلخلج] سەرچاوەوی پێشوو،هەمان لاپەڕە.

[لمجلخلج] (محەممەد بەهائوددین مەلا صاحب= دانای هەورامی)/ پیشالیاری زەردەشتی/ لاپەڕە (10).

[لجلخلج] ئاوێستا/ بەرگی یەکەم/ لاپەڕە (12) تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی (د.جلیل دوستخواە) لە بلاوکراوەکانی مروارید.





(بەڵخ)،پاشای ئەوێ بەناوی (گوشتاسب[لحلخلج]) هاتۆتەسەر دینەکەی،ساڵی (583 پ.ز) لەشەڕێکدا لەگەڵ سوپای تووران بەفەرماندەیی (ئەرجاسب)ی توورانی لە(ئاتەشگەی بەڵخ)دا کوژراوە[لخلخلج].

12، (آرثـر کریستنسن) لەکتێبی (ایـران فـی عهـد الساسانیین)دا نووسیویەتی: ساسانییەکان هەر لەسەرەتای دەسەڵاتیانەوە لەگەڵ پیاوە دینییەکانی زەردەشتیدا یەکیانگرتووە و بەدرێژایی ساڵەکانی حوکمڕانیشیان پەیوەندیی پتەویان پێکەوە هەبووە،هەر لەدرێژەی نووسینەکانیدا دەڵێت: بەپێی داستانە پارسییەکان (ئەردەشیری یەکەم) پاش ئەوەی دەسەڵاتی گرتووەتە دەست فەرمانیداوە هەموو وێنە پەرشو بڵاوەکانی (ئاوێستا)ی سەردەمی ئەشکانییەکان کۆکراونەتەوەو کراون بەکتێبێکی گەورە و پیرۆز[برلخلج].

13، عەلائوددینی سەجادی لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا نووسیویەتی: چ فارس چ کورد ئایینیان هەر ئەو ئایینە کۆنە بووە هیندییە کۆنەکان هەیانبووە،لەپاشان جیابوونەتەوە و کەوتوونەتە سەر بتپەرستی،هەتاکو زەردەشت بەخۆی و ئایینەکەیەوە پەیدا بووە،هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن لەباکووری ئەفغانستان پەیدابووە و بەشێکیش لەسەر ئەو باوەڕەن لەبناری ورمێ و ئازربایجاندا سەریهەڵداوە،بۆ سەردەمی پەیدابوونیشی دەڵێن لە نێوان سەدەی بیستەم هەتاکو سەدەی پێنجەمی پێش زایین بووە،بەڵام قسە و بەڵگە و بنەوانی زەردەشتی دەڵێت لەسەدەی حەوتەمی پێش زایین پەیدابووە ولەدەوروبەری ساڵی (620) پێش زاییندا کوژراوە[ترلخلج].

14، هادی بەهمەنی لەکتێبی (پەیامی هەورامان،بەرگی یەکەم)دا نووسیویەتی: لەکوردستانی مەزندا کۆنترین دین بەئاگرپەرستی ناویهاتووە،دووەم دینیش

---

[لحلخلج]، ناوی ئەم پادشایە لە (زمانی پەهلەوی)دا بە (کەی وشتاسپ=kai veshtaspa ) و لە زمانی فارسیدا بە (کەی گشتاسپ) هاتووە،لە کتێبی پیرۆزی (ئاوێستا)شدا چەندین جار ناویهاتووە،بۆنموونە لە سروودی یەکەمی (گاتاکان) و لە (هات)ی ژمارە (28)دا هاتووە:

ئەی ئەرمیتی ئارەزووی (گشتاسپ) و پەیرەوکارانی بەجێبهێنە.

(ئاوێستا)،بەرگی یەکەم،دەفتەری یەکەم، گاتاکان،لاپەڕە (8)،نووسینی (د.جلیل دوستخواه)،لە بڵاوکراوەکانی مروارید.

[لخلخلج]، (د. صدیقی بۆرەکەیی)، مێژووی وێژەی کوردی، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (8).

[برلخلج]، (رثر کریستنسن)، ایران فی عهد الساسانین، ترجمة یحیی الخشاب،مراجعة عبدالوهاب عزام، ل (130)، 1957 القاهیرة.

[ترلخلج]، (عەلائودینی سەجادی)، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، لاپەڕە 641.

(مەزدیسنا)یە،رابەرەکەی لەلایەن ئەورپاییەکانەوە ناوی بە(تزار ئەهوسترا)،یان (زارا هوسترا) هاتووە،نەتەوە ئارییەکانیش بە (زەردەشت) ناویدەبەن،لەهەمان سەرچاوەدا ناوی چواردە پشتی زەردەشت بەم شێوەیە هاتوون:

زەردەشت – پوروشئەسپ – پایتیر ئەسپ – ئوروگە ئەسپ – چخش نوس – پیتەر ئەسپ – ئەرجەزەرشن – هەردار – سپتاما – ڤیداشت – نیازیین – ئیرچ – دۆراسرۆپ – مەنوچەر[یرلخلمج].

15، موشیر ئەلدەولە حەسەن پیرنیا لەکتێبی (تأریخ ایران باستان، جلد اول)دا نووسیویەتی: ئارییە ئێرانییەکان لەڕووی باوەڕی دینیانەوە خۆریان بەچاوی ئاسمان زانیوە و هەورەبروسکەشیان بە کوڕی ئەو داوەتە قەڵەم و چەندین قەناعەتی تری ئەفسانەییان هەبووە،بەڵام زەردەشت کە هاتووە دژی ئەو قەناعەتە ئەفسانەیی و جادووگەرییانە ڕاپەڕیوە و ئەوانی بەرەو یەکتاپەرستی بردووە[سملخلمج]،هەرلە درێژەی نووسینەکانیدا وتوویەتی: هەرگیز ناتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین دینی زەردەشتی لەسەردەمی حوکمڕانیی ماددەکاندا بڵاوبووەتەوە و دینی دەوڵەتەکەیان بووە،یان نا،چونکە ئارییەکان لەسەردەمی کۆندا سەرچاوە سروشتیەکان بەتایبەت لەناویاندا،(خۆر)یان پەرستووە،بۆیە پێدەچێت میهرپەرستیش لەناویاندا پەیڕوکرابێت[شملخلمج].

16، هەریەك لە مێژوونووسان (رۆدۆلف،دۆنکێر،ئێدوارد مایەر) هەزارساڵ پێش زایینیان بەسەردەمی دەرکەوتنی زەردەشت داناوە[لمحبرلمج].

17، لەکتێبی (مێژووی ئاایینی زەردەشت)دا نووسراوە،ئاایینی زەردەشت یەکەم مەزهەبە[لمجبرلمج] کە لەم جیهانەدا دەربارەی ژیانی جیهانی دووەم و مەسەلەی (قیامەت) دەدوێت،لەم ئاایینەدا چمکێکی گەورە هەیە کە نە لە ئاایینی میسری کۆن و نە لە ئەندێشە زۆر

---

[یرلخلمج] (هادی بەهمەنی)، پەیامی هەورامان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (333).

[سملخلمج] (موشیر ئەلدەولە حەسەن پیرنیا)، تأریخ ایران باستان، جلد اول، لاپەڕە (164)

[شملخلمج] سەرچاوەی پێشوو، جلد اول، لاپەڕە (220)

[لمحبرلمج] (جەلالودینی ئەشتیانی)،زرتشت، مزدیسناو حکومەت،لاپەڕە (86)، چاپی حەوتەم.

[لمجبرلمج] پێویستە لێرەدا ئەوە بڵێین (زەردەشتییەت) دینە نەوەك مەزهەب. (ئەیوب)

قووڵەکانی هیندییەکانـدا دەبینرێت،دەقەکەشـی ئەمەیـە: (جیهـان مێـژووی هەیـە وپـەیڕەوی یاسای گۆڕانکارییەکان دەکات و دۆخی ئێستای جیهان بۆ قۆناغی کۆتایی رابەریدەکات)لخبرلمج.

18ا لـە کتێبـی (دینکـەرد لخبرلمج)دا چـیرۆکێك دەربـارەی لـە دایکبـوونی (زەردەشـت) خراوەتەڕوو ئەمەی خوارەوە چەند دێڕێکییەتی،رۆحی زەردەشت لە سەرەتاوە لە جیهانی بـالآدا ژیاوە،کاتێك لە دایکبوونی ئەو هاتۆتـە پـێش (بەهمـەن و ئۆردیبهێـشت) کـە دوو (یـەزد)ی پایـە بـەرزن لاسکی گیایـەکی پیرۆزیـان هێنـاوە بـەناوی (هـوم=Hauma) و رۆحـی زەردەشـتیان تێـدا جێگیرکردووە،کاتێـك (پوروشەسـپ)ی بـاوکی چـووەتە دەشـت سـەرنجی بـۆ لای ئـەو گیایـە راکێشراوە و لێیبردۆتەوە بۆ ماڵەوە،بەم شێوەیە رۆحی (زەردەشت) لـە ئاسمانـەوە گوێزراوەتـەوە بۆ سەر زەوی.

پاشان کاری خوڵقاندنی تـەنی (زەردەشـت) بـە دوو (یـەزد)ی تـر سـپێردراوە بـەناوەکانی (ئەمرداد= یەزدی ئاو) و (خورداد= یەزدی گیاکان)،ئەم دوو یەزدە پاش ئـەوەی کـاری خۆیـان لـە ئاسمانـدا تـەواوکردووە باریونەتـە سـەرزەوی،(تـەنی زەردەشـت) یـان لـەناو رەگـی گیـادا چەقاندووە،پاش  ئەوەی ئەو گیایە رواوە (پوروشەسپ)ی باوکی زەردەشت بـەرێنمایی (ئـەمرداد و خورداد) شەش مانگـای خـۆی بردۆتـە دەشـت بەمەبەسـتی لەوەڕانـدنیان،کاتێك مانگاکـان لـەو گیایەیان خواردووە گوانەکانیان لە (شیر) پڕبوون،(دەغدۆ)ی هاوسەری (پوروشەسـپ) مانگاکـانی دۆشیون و هاوسەرەکەشی لەو گیای (هوم=Hauma)ەی کەپێـشتر بردوویەتییـە ماڵـەوە و رۆحـی زەردەشـتی تێـداجێگیرکراوە وشـکیکردۆتەوە،وەراندویەتیە نـاو شـیرەکەوە و لەگـەڵ (دەغـدۆ) لێانخواردۆتەوە،پاش ماوەیەك (زەردەشت) لە دایکبووەلخبرلمج.

---

لخبرلمج (عەبدولاَ موبلغی ئابادانی)ا مێژووی ئایینی زەردەشتا وەرگێڕانی (وریاقانیع)اچاپی دووەما لاپەڕە (59).

لخبرلمج (دینکـەرد) نـاوی ئـەو کتێبەیـە کـە بەفـەرمانی (ئەردەشـێری بابکـان)ی یەکـەم پادشـای ساسـانی لەرێگـەی رۆحانییـە زەردەشـتییەکانەوە لەهـەموو وێنـە پەڕاگەنـدەکانی (ئاوێـستا) کۆکراوەتـەوە و بـە سەرپەرشـتی (مووبـدان مووبد)ی ئەو سەردەمە نووسراوەتەوە،ئەردەشێری بابکان لەنێوان ساڵەکانی (241ا 226پ .ز) حوکمڕانیی دەوڵـەتی ساسانی کردووە و بەبنیاتگوزاری ئەو دەوڵەتە دەدرێتە قەڵەم.

بڕوانە کتێبی ئاوێستاابەرگی یەکەمالاپەڕە (15) تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی (د.جلیل دوستخواە) لـە بلآوکراوەکـانی مرواريد.

لخبرلمج (عەبدولعەزیمی رەزائیی)ا تأریخ دەهزار سالە ایران – جلد اولا لاپەڕە (70).

19، یۆنانییەکان بە (زەردەشت)یان وتووە (زوروئاسترس)،رۆمییەکان بە (زوروئاستر) و ئەوروپاییەکانیش هەر بە (زوروئاست) ناویانهێناوە[ببرلمج].

20، (هەرتل) پێیوایە (زەردەشت) لە سەردەمی (گوشتاسپی هەخامەنشی)دا ژیاوە،دەربارەی ئەم زاتە نووسیویەتی: زەردەشت بەهیچ شێوەیەك كاهن و رۆحانی نەبووە،بەدڵنیایەوە لە چینی جووتیارە و بەچینەکانی (ئەشراف،جەنگاوەر،رۆحانی)ییەوە پەیوەستنەبووە[تبرلمج].

21، ئەندازیار ئەنداز حەوێزی لەکتێبی (ئاوێستا، نامەی مەنەڤی ئایینی زەردەشت)دا نووسیویەتی: مێژوونووسی یۆنانی (کسانتۆس) ساڵی (450پ.ز) وتوویەتی: زەردەشت (شەش سەد ساڵ) پێش جەنگی (خشیارشا) دژ بە یۆنانییەکان لەدایکبووە،بەوپێیەی ئەو شەڕە (480ساڵ) بەرلەزایین روویداوە بەواتا زەردەشت (600 + 480 = 1080 ) ساڵ بەرلەزایین ژیاوە. هەر لەدرێژەی ئەم نووسینەدا هاتووە: باوکی زەردەشت ناوی (پوروش ئەسپ Pourshaspa) و دایکی ناوی (دوغدۆڤا Daghdova) بووە و لەگوندی (هەردشنە)ی نزیك بە (ورمێ) لەدایکبووە[یبرلمج].

22، جۆزێف طایر نووسیویەتی: مێژووی لە دایکبوون و مردنی (زەردەشت) بە شێوەیەکی گشتی بە (660 و 583پ.ز) دیاریکراوە،هەرچەند هەندێك لە زانایان دەڵێن پێیدەچێت بەچەند سەدەیەك پێش ئەم مێژووە ژیابێت و بۆی هەیە ماوەی ژیانی هەزار ساڵ پێش زایین بووبێت[سمبرلمج].

---

[ببرلمج] (عەبدولاّ موبلغی ئابادانی)، مێژووی ئایینی زەردەشت، وەرگێڕانی (وریاقانیع)، چاپی دووەم، لاپەڕە (55).

[تبرلمج] لێکۆڵینەوەی (ئایازەردەشت کاهنێك بووە)، نووسینی (کەمال نووری مەعرووف) گۆڤاری (بانە رۆژ) ژمارە (5) ل32.

[یبرلمج] (ئەندازیار ئەنداز حەوێزی)، ئاڤێستا، نامەی مەنەڤی ئایینی زەردەشت، لاپەڕە 12.

[سمبرلمج] (جوزیف طایر)، حكمة الادیان الحیة ، ترجمة (المحامی حسین الکیلانی)، مراجعة الاستاذ محمود الملاح)، منشورات (دار مكتبة الحیاة)بیروت.

23 ئەحمـــەدی کـوڕی ئەبوبـەکر نووســیویەتی: زەردەشــت بــە (وەخــسوورسیماری) ناویدەرکردووە[شمبرلمج]،لە تێکستەکانی (ڕێوڕەچەی یارسان= کاکەیی)دا نـاوی ((وەخسوورسیماری) هاتووە،هەروەها هەمان ناو لەفەرموودەیەکی (پیشالیاری زەردەشتی)دا هاتووە بەم شێوەیە:

هۆشت جەواتەی پیشالیار بۆ   گۆشت جە کیاستەی زانای سیمار بۆ

پاش دەرخستنی دەمەتەقێی ژمارەیەك لەسەرچاوەکان دینەسەر ئەوەی (زەردەشت) هەر لەتەمــەنی منداڵییــەوە لـەڕووی ژیـری و ســەلیقە و تێگەیــشتنەوە لەگــەڵ هاوتەمەنەکانیــدا جیاوازبووە،لەم بوارەدا هەندێك کرداری سەیروسەمەرەی نواندوون[لمحترلمج].

لەتەمەنی حەوت ساڵییەوە هەتاوەکو پانزە ساڵان لەلای بیریارێکی گەورە و پـیرۆزی ئـەو ســەردەمە فێــری هەنــدێك (بنــەمای مەزهــەبی،کاروباری کشتیاری،پیــشەی دەرمانگــەری) بووە،کاتێك تووەرانییەکان هێرشیانبردۆتە سەر ئێران،زەردەشت کە لە هەرەتی گەنجیەتیدا بـووە چووەتە گۆڕەپانی جەنگەوە و دژی سوپای تـووران قارەمانانـە جـەنگاوە[لمجترلمج]،لەتەمـەنی بیـست ساڵیدا دنیای گۆشەگیریی هەڵبژاردووە و دەستیداوەتە تێڕامان و تێفکرین،لەتەمەنی سی سـاڵیدا نیشتمانەکەی خۆی بەجێهێشتووە و ڕوویکردووەتە چۆڵایی و کێوەکان،چووەتە کەناری ڕووباری (دائیتا) کە ڕووباری (ئاراکس)یشی پێدەڵێن،لـەو شـوێنەدا داوای لـە خـەڵك کـردووە دەستبدەنە خواپەرستی و خواناسی[لجترلمج].

بەرامبـــەر بـــە بانگهێـــشتەکەی زەردەشـــت (مـــوغ[لجترلمج])ەکـــان سەرســـەختانە بەرپەرچیانداوەتەوە و دژی وەستاون،بۆیە ناچار بووە لەگەڵ ژمارەیەك لە دەستوپێوەندەکانیدا کۆچیکردووە و هاتۆتە (بەڵخ)،لەوێ کوڵەباڵێکی سپیی لەبەرکردووە و بەدەستێکی بڕێك ئاگر و

---

[شمبرلمج] (ئەحمەدی کوڕی ئەبووبەکر) دبستان المذاهب لاپەڕە (10).

[لمحترلمج] (محەممەد ئەمین زەکی بەگ) خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان بەرگی یەکەم ل195،نووسینی چاپی نوێ 2000.

[لمجترلمج] (عەبدولعەزیمی ڕەزائیی) تأریخ دەهزار ساله ایران – جلد اول لاپەڕە (71).

[لجترلمج] (محەممەد ڕەسووڵ هاوار) کورد و باکووری کوردستان لەسەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان بەرگی یەکەم ل (83).

[لجترلمج] (موغ) ئەم وشەیە بەزمانی ئاشووری بە (مج،ماج) هاتووە کە واتای گەورە و گران دەگەیەنێت،لەسەردەمی کۆندا بە جادووگەر وتراوە (موغ)،موغەکانی زەردەشتیش هەر لەسەردەمی ژیانی زەردەشتەوە تائێستا  پێشەوایی دینی زەردەشتییان لە ئەستۆدایە.

بەدەستەکەی تری (گالۆك = گۆچان)ێکی لەداری سەروو گرتووە بەدەستیەوە و چووە بۆلای (گوشتاسپ)ی پاشای مەملەکەتی بەلَخ و داوای لێکردووە بێتەسەر دینەکەی[لخترلمج].

زەردەشت ماوەی دووسالْ هەوڵی بەردەوامیداوە هەتاوەکو گوشتاسپ باوەڕپێبهێنێت،بەلاّم چونکە پاشا لەژێرکاریگەریی قسەی (موغەکان = رۆحانیەکان)دا بووە،ئەوانیش بەهەنگاوی ئەهریمەنانەی خۆیان سەرسەختانە دژایەتیانکردووە و دژی دینەکەی راپەڕیون،دواجار بوون بەهۆی ئەوەی بیگرێت و بیخاتە زیندانەوە،بەلاّم پاش دووسالْ (پەرجوویەکی= موعجیزەیەکی) لێدەرکەوتووە،ئیتر گوشتاسپ باوەڕپێهێناوە و تەواوی هێزی خۆی بۆ بلاّوکردنەوەی دینەکەی بەکارهێناوە،پاش گوشتاسپی پاشا هەموو دەستوپێوەندەکان و فەرمانبەرەکانیشی چوونەتەسەر دینی زەردەشتی[برترلمج]،پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە دانایی (جاماسپ)ی وەزیر کاریگەری زۆری هەبووە بۆ ئەوەی گوشتاسپ باوەڕ بەدینی زەردەشتی بهێنێت،زۆربەی سەرچاوەکانیش باسی ئەوەدەکەن گوایا (زەردەشت و جاماسپ) ژنبەژنیانکردووە.

هەر لەم بوارەدا دەوترێت بەبۆنەی باوەڕهێنانی (گوشتاسپ و دەستوپێوەندەکانی) زەردەشت دارێکی سەرووی ناشتووە،ئەو دارە هەتاکو سالْی (861ز) ماوە،بەلاّم لەو سالّەدا خەلیفەی عەباسی (المتوکل علی الله[ترترلمج]) فەرمانیداوە بڕیویانە و هێناویانەتە (سامەڕا) و لەدرووستکردنی سەراکەیدا بەکاریانهێناوە[يرترلمج].

بەپێی هەندێك سەرچاوە،زەردەشت لەماوەی بیست سالْی پاشماوەی تەمەنیدا دوو نەبەردیی لەگەلْ دوژمنانی دینەکەیدا بەرپاکردووە،جەنگی دووەمیان لە سەردەمێکدا بووە کە

---

[لخترلمج] عەلائوددینی سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، لاپەڕە (642 ).

[برترلمج] (عەبدولاّ موبلغی ئابادانی)، مێژووی ئایینی زەردەشت، وەرگێڕانی (وریاقانیع)، چاپی دووەم، لاپەڕە (54).

[ترترلمج] (متوکل علی الله) بەدناوترین خەلیفەی عەباسی بووە،سالْی (232ك=846ز) پاش کۆچی دوایی خەلیفە (الواثق)ی برای بە یارمەتی سەردارانی تورك بووە بە خەلیفە،بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە ژێر کاریگەری راسپاردە و رێنمایی ئەواندا بووە،ئازاردانی وەحشیانەی نەوەکانی حەزرەتی (عەلی کوڕی ئەبی طالب) و هەلّدانەوەی گۆڕی شەهیدەکانی (کەربەلا) لە کارە هەرە دزێوەکانی ناوبراون،سالْی (247ك= 861ز) کە هەمان سالْی درووستکردنی سەراکەیەتی،بەدەستی یەکێك لە کوڕەکانی بە ناوی (موعتەمید) کوژراوە.

بڕوانە (تاریخ دە هزار سالّە ایران)، جلد دوم، لاپەڕە (211، 212) نووسینی (عەبدولعەزیزی رەزائیی).

[يرترلمج] (محەممەد ئەمین زەکی بەگ)، خولاّصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، بەرگی یەکەم لاپەڕە (196).





نـــاوبراو تەمـــەنی گەیـــشتۆتە حەفتاوحـــەوت ساڵ،هەرچـــەند لـــەو جەنگـــەدا ســـەرەتا سـەرکەوتووە،بەڵام لەدواییـدا کـوژراوە و دەربـارەی کوشتنەکەشـی رازی جۆراوجـۆر هـەن بـەم شێوەیە:

1- (محەممەد ئەمین زەکی بـەگ) بەپـشتبەست بـە کتێبـی (مێـژووی کـۆنی خۆرهـەڵاتی نزیك) نووسیویەتی: زەردەشت لەجەنگێکدا بـۆ بڵاوکردنـەوەی دینەکـەی کـە لەگـەڵ نەتـەوەی (هیون)دا بەرپاکراوە کوژراوە،سەرداری لەشکری هیون لەو شەڕەدا ناوی (ئێرجاسپ) بووە[سمترلج].

2- (ئەنـدازیار ئەنـداز حـەوێزی) نووسـیویەتی: زەردەشـت لەشـەڕی توورانییەکانـدا بەسەرکردایەتیی (تۆربراتۆر) کوژراوە[شمترلج].

3- (مەحەممەد رەسووڵ هاوار) نووسیویەتی: (زرادەشـت) لەتەمـەنی پـیری و لەشـەڕێکدا لەگەڵ (شەعبی هیونی) کە سەرکردەکەیان (ئاجاسپ) بووە،کوژراوە[لحیرلج].

4- نووسـەرەکانی ئاوێـستا پـاش نزیکـەی هـەزار سـاڵێك لـە کـوژرانی زەردەشـت وتویانـە توورانییـەکان بـەزۆر شـاری (بـەڵخ)یـان داگیرکـردووە و توورانییـەك لـەناکاو پـەلاماری ئـەو پێغەمبەرەی خوای داوە لە کاتێکدا کە خەریکی خواپەرستی بـووە و لەبـەردەم میحرابـی ئـاگردا کوشتوویەتی[لجیرلج].

### بنەماکانی دینی زەردەشتی

1- فەلسەفەی دروسـتبوونی دنیـا: لەسـەر رۆشـنایی کتێبـی ئاوێـستا کـە کتێبـی پـیرۆزی زەردەشتییەکانە و هەندێك سەرچاوەی تری پەهلەوی،دنیا لەدوو هێز پەیدابووە،بەم شێوەیە:

ا- هێزی رووناکی

ب- هێزی تاریکی

---

[سمترلج] سەرچاوەی پێشوو- بەرگی یەکەم لاپەڕە 197.

[شمترلج] (ئەندازیار ئەنداز حەوێزی)- ئاوێستا- نامەی مەنەڤی ئایینی زەردەشت)- بەشی یەکەم.

[لمحیرلج] (محەممەد رەسووڵ هاوار)- کورد و باکووری کوردستان لەسەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان – بەرگی یەکەم- ل (83).

[لمجیرلج] (د.عەلی شەریعەتی) - تأریخ و شناخت ادیان- ل 249-251.

هەر لەسەر ئەو بنەمایەش جیهان بووە بە دوو لەشکرەوە بە ناوی (لەشکری رووناکی) و (لەشکری تاریکی)،سەرداری لەشکری رووناکی پێیدەوترێت (ئاهورامەزدا = هرمز = سپنتامینۆ)،سەرداری لەشکری تاریکیش پێیدەوترێت (ئەهریمەن = ئەنگرمینۆ).

ئاهورامەزدا: ناوەکەی لەدوو بەش پێکهاتووە کە بریتین لە (ئاهورا[*]) و (مەزدا)،ئاهورا لە بڕوای دینی ئارییەکاندا قووڵایی و ریشەی دێرینی هەیە چونکە ناوی (خوا)کەیان بووە و بەواتای (سەروەر) دێت. (مەزد)یش بەواتای (زانا،ژیر) دێت،هەردوو بەشەکە بەسەریەکەوە دەبن بە (سەروەری زانا،سەروەری ژیر). کە دەقاودەق بەرامبەر (العلی العلیم)ی عەرەبیە،زەردەشتییەکان دەڵێن (ئاهورامەزدا) لەسەر هەموو شتێکەوەیە و ئاگای لەهەمووشتێکە،هیچ شتێك وەك ئەو نییە.

ئەهریمەن = ئەنگریمنۆ: هێمایەکە بۆ (رۆحی تێکدەر،مردن، تاریکی،پیسی، خراپی، درۆ) بەردەوام لەگەڵ ئاهورامەزدادا لەجەنگ و ململانێدایە.

(ئاهورامەزدا) کە خوای خێرە شەش یاریدەدەری هەن،پێیاندەوترێت (ئەمشەسپنتان = ئامشاسپندانە = رۆحی نەمر و ئەزەلی) و ئەمانەش ناوەکانیانە:

1 زەند هومەن= وەهومەن=بەهمەن: بە واتای (فریشتەی رەوشتباش،فریشتەی خێر و چاکە)،هێمای ژیری و زانایی و زانستی خوداییە.

2 ئەشەڤەهێشتە= ئۆردیبەهێشت: بەواتای (فریشتەی راستی و دادوەری)،خاوەنی هەمووئاگر و ئاگردانەکانی سەر رووی زەوییە.

3 هەورڤەتات= شەهریوەر: بەواتای (فریشتەی توانا) کە رزق و رۆزی هەموو بەندەکانی خوای بەدەستە.

4 ئەناهیتا= سپەندارمەز: بەواتای فریشتەی (بەرەکەت و خۆشەویستی)،کاری ئەم فریشتەیە ئاوەدانکردنەوە و سەوزکردنی زەوییە.

---

[*] دەربارەی ناوی (ئاهورا) دکتۆر جەمال رەشید نووسیویەتی: لە راستیدا (ئاهورا) هەر دەبێت (وارونا) بێت کە زۆربەی گەلانی هیندوئەوروپایی پەرستوویانە،لە نێو ئەو داستانەشیاندا باسیانکردووە کە پێش سەرهەڵدانی ئایینەکانی هاوچەرخدا هەبوون.

بڕوانە کتێبی (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری).

5ـ هوروتـات=خـورداد: بـەواتای (فریـشتەی سوودمەندی،کامەرانی،سـەرکەوتن) ئـەمیش شادی و خۆشی بەرۆحی شادان دەبەخشێت.

6ـ هڤەرخشەیتە= مورداد: بە واتای فریشتەی نەمری و هەمیشەییی[1].

ئەمـــشەسپەنتان هەمیـــشە لەخزمـــەتی (ئاهورامـــەزدا) دان و چـــاوەڕوانی فەرمانـــەکانی دەکـــەن و لەرێگـــەی ئەمانـــەوە دنیـــا بـــەرێوەدەبات،هاوکات بەرامبـــەر بـــە (ئاهورامـــەزدا و ئەمـــشەسپەنتان)یـــش،(ئەهریمـــەن) و شـــەش یاریـــدەدەری وەســـتاون،یاریدەدەرەکانی ئەهریمـــەن (دەئو= دێو)ن و ئەرکیان تێکدانی کارەکانی (ئاهورامەزدا و ئەمشەسپەنتان)ە.

بەپێی باوەڕی زەردەشتییەکان وەك لە ئاوێستادا هـاتووە (ئاهورامـەزدا) سـەرەتا جیهـانی رۆحەکانی درووستکردووە و ماوەی سێ هەزار ساڵ حوکمی بەسەرداکردوون،ئینجا ئەهریمەن لە جیهـانی تاریکییـەوە هاتۆتـە نـاو جیهـانی رووناکی،پاشـان ئاهورامـەزدا جیهـانی مادی،بەشـەش قۆناغ،لەماوەی سێ هەزار ساڵدا درووستکردووە،ئەمانەش ناوی قۆناغەکانن:

1ـ میـــــدیۆزرم = Maidyuzarm: لـــــەم قۆناغـــــەدا (ئاسمان،ئەســـــتێرەکان،رێگەی کاکێشان=(درب التبانە)ی دروستکردوون.

2ـ میدیۆشم = Mdidushem: لەم قۆناغەدا ئاوەکانی درووستکردوون.

3ـ پیتی شهیم = Paityshahim: لەم قۆناغەدا زەوی دروستکردووە.

4ـ ئەیاترم Ayatherm: لەم قۆناغەدا (دار،گژوگیا،شینایی) درووستکردوون.

5ـ میـــدیارم Maidyarem: لـــەم قۆناغـــەدا بێجگـــە لـــەمرۆڤ هـــەموو گیانلەبـــەرەکانی درووستکردووە.

6ـ هەمسپدمدم Hamaspathmadm: لەم قۆناغەدا (مرۆڤ)ی درووستکردووە.

بـــەم پێیـــە مـــرۆڤ لـــەقۆناغی شەشـــەمدا درووســـتکراوە،بەهاتنەدنیای (زەردەشـــت)یـــش ئەهریمـــەن بێهێزبـــووە و لـــەو رۆژەشـــەوە تـــا ئێـــستا ســـەرکەوتنی ئاهورامـــەزدا بەســـەریدا بەردەوامە،هەتاوەکو جارێکی تر دەچێتەوە ناو دنیای تاریکییەوە[2].

---

[1] بڕوانە ئەم کتێبانە:

1ـ تاریخ و شناخت ادیان – بەرگی دووەم ـ لاپەڕە (204، 205) نووسینی د. عەلی شەریعەتی.

2ـ مێژووی ئایینی زەردەشت ـ لاپەڕە (47،48) نووسینی عەبدولا موبلغی ئابادانی ـ وەرگێڕانی وریا قانیع.

3ـ مێژووی وێژەی کوردی بەرگی یەکەم ـ لاپەڕە (64،65) نووسینی د. صدیقی بۆرەکەیی.

[2] (محەممەد ئەمین زەکی بەگ) ـ خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان ـ بەرگی یەکەم ـ لاپەڕە 194.

هەرلەم بوارەدا (پرۆفیسۆر کریستنسن) نووسیویوتی: بەپێی یەشتە کۆنەکان دەورەی ژیان دوانزەهەزارساڵ بەردەوامدەبێت،لەسێ هەزار ساڵی یەکەمیاندا هەردوو جیهانی (ئاهورامەزدا و ئەهریمەن) لەبێدەنگیدا بوون،پاش ئەوە ئەهریمەن لەجیهانی تاریکییەوە هاتۆتە دەرەوە ویستوویەتی جیهانی رووناکی لەناوببات،ئاهورامەزدا جەنگێکی نۆ هەزارساڵی دژی راگەیاندووە،لەبەرئەوەی ئاهورامەزدا ئاگاداری هەموو شتەکانە و زانیویەتی ئەو جەنگە بەشکستی جیهانی تاریکی کۆتاییدێت،ئەهریمەن لە ترساندا ماوەی سێ هەزار ساڵ بەئیفلیجی لە تاریکیدا ماوەتەوە،لەو ماوەیەدا ئاهورامەزدا دەستیکردووە بەدرووستکردنی دنیا،پاش ئەوەی لەکارەکەی بووەتەوە ئەو (گا)یەی دروستکردووە کە بە(گای یەکەم) ناسراوە و ئینجا مرۆڤی یەکەمی بەناوی (گیومرد = گیامەرەتەن)ی درووستکردووە.

لەوکاتەدا ئەهریمەن بەهەموو هێزێکیەوە کەوتۆتە دژایەتی ئاهورامەزدا،ئەوەش بەپیسکردنی سەرچاوە سروشتییەکان و درووستکردنی زیندەوەر و مێرووی زیانبەخش،هەربۆیە ئاهورامەزدا خەندەقێکی لەبەردەم ئاسماندا درووستکردووە،بەڵام ئەهریمەن لەئەنجامی هێرشە بەردەوامەکانیدا دواجار توانیویەتی (گای یەکەم و گیومەرد) بکوژێت،لەبەر ئەوەی تۆوی (گیومەرد) دارێکی لێرواوە و دوو مرۆڤ لەنەوەی ئادەم بەناوی (مشیگ،شیانگ)ی لێدرووستبوون. لەو کاتەوە ئیتر تێکەڵاوی لەنێوان چاکەوخراپەدا دەستیپێکردووە[*]. رۆڵی مرۆڤەکانیش لەو شەڕەدا بەتەنیشت چاکە،یان خراپە بەپێی کردارەکانیان کاریگەربووە،پاش سێ هەزار ساڵی تر لەدرووستبوونی جیهان زەردەشت وەك رێپیشاندەرێك بۆ بانگهێشتکردنی خەڵك بۆسەر دینی راست سەریهەڵداوە،پاش ئەم ماوەیە لە تەمەنی دنیا تەنها سێ هەزار ساڵ دەمێنێت،پاش هەر هەزار ساڵێکیش (رزگارکارێك = سۆشیانس) لەتۆوی زەردەشت لەدایکدەبێت،ئەو تۆوەش لەیەکێك لەدەریاچەکاندا شاردراوەتەوە.

لەو چرکەیەدا کە دوا ( سۆشیانس) لەدایکدەبێت،ئیتر دواجەنگ لەنێوان هێزی رووناکی و هێزی تاریکیدا دەسپێدەکات،دواجار هەموو مردووەکانیش زیندوو دەبنەوە و ئەستێرەی کلکداری (جوتچهر= جۆپیتەر) دەکەوێتەسەر زەوی و یەکسەر گڕدەگرێت،لەئەنجامدا هەموو

[*] (آرثر كريستنسن)، ايران فى عهد الساسانيين، ترجمة (يحيى الخشاب)، مراجعة (عبدالوهاب عزام)،ص (136، 137)، القاهره 1957.

میتاڵـەکان دەتوێنــەوە و بەســەر زەویــدا و وەك لافــاوێکی ئــاگرین دەکەونەڕێ،هەمووخــەڵك بەزینــدووەکان و مــردووە زیندووبووەکانیــشەوە پێویــستە بــەناو ئــەو لافــاوەدا بڕۆن،لەدرێــژەی نووسینەکەدا هاتووە ئەو لافاوە بۆ چاکەخوازان دەبێت بەشیرێکی گەرم و پاکیاندەکاتەوە و ئیتر دەچنە بەهەشت.

پاش ئەم دواجەنگە بۆ یەکجارەکی هێزی تاریکی و خراپەکار لەناودەچن و دەچنەوە ناو تاریکییەوە،زەوی تەختوپانوپۆڕ دەبێت،دنیا بۆ هەتاهەتایی بەپاکی و ئارامی دەمێنێتەوە[تريلمج].

2ـ تێڕوانین بۆ رۆح: بەباوەڕی زەردەشتییەکان رۆح نەمرە،هەموو مرۆڤێك پاش مردنــی بەسێ ڕۆژ رۆحەکەی دێتەوە ناو ژیان و تامی ژیــان دەچێژێت،ئینجا بــا هەڵێــدەگرێت و دەیبــات بۆ (پــردی جینــوەت) لــەوێ لــە بــەردەم سێ دادوەردا دادگاییــدەکرێت و گــەورەی دادوەرەکــانیش (میهر)ە،لەو دادگاییکردنەدا هەموو کردەوەکـانی لەچاکە و خراپــە بەتــەرازوو دەکێشرێن،ئینجا پێویــستە لــەو پــردە بپەڕێتــەوە کــە هــەر لــە قولــەی (ئــەلبورز)ەوە،هــەتاوەکو ئــاوی (دائیتیــا) درێژدەبێتەوە،ئەگەر ئەو رۆحــە چاکەکاربێت پردەکە پانــدەبێت بەسـەریدا دەپەڕێتەوە،ئەگــەر خراپەکاریـــــشبێت پردەکـــــە زۆر تیژوتەنکـــــدەبێت و دەکەوێتـــــە نـــــاو تاریکـــــستانێکی ئەنگوستەچاوەوە[يريلمج].

رۆح ئەگــەر خــاوەنی ســێ ســیفەت بێــت کــە لەڕاســتیدا کرۆکــی دروشمــە دینییــەکانی زەردەشت پێکدەهێنن دەچێتە بەهەشت و ئەو دروشمانە بریتین لە:

1ـ هۆمیتە = نییەتی چاك = ئەندێشەی چاك.

2ـ هۆدارشتە = کرداری چاك.

3ـ هۆمواختە = گوفتاری چاك = قسەی چاك.

ئەم دروشمانە لەهەندێك سەرچاوەدا بەم ناوانە هاتوون (هومنگا،هوختگا،هورشگا[سميرلمج]).

بەهەشـــــت لای زەردەشــــــتییەکان بــــــە (ئەنهوەهیــــــشت = ئەنگوەهێــــــشت ANGUVAHISHTA=) ناویدەهێنرێت و بەواتای باشترین ژیان،یان چاکترین دنیا دێت.

---

[تريلمج] هەمان سەرچاوەـ ل137.

[يريلمج] (محەممەد ئەمین زەکی بەگ)ـ خوڵاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستانـ بەرگی یەکەم لاپەڕە (198).

[سميرلمج] (عەبدولعەزیمی رەزائی)ـ تاریخ دەهزار ساڵە ایرانـ ل(74).

رۆح ئەگەر خراپەکاربێت ئەوە دەچێتەناو دۆزەخەوە کەبە (دژانگهە) ناویدەهێنرێت[شمیرلمج].

ئەو رۆحانەی کرداری چاکە و خراپەیان بەرامبەرن دەچنە شوێنێکەوە پێیدەوترێت (هەمشتگان = هەمەستەکان)،لەو شوێنەدا سزاو پاداشت نین[لمحسملمج]. (لێرەدا دەڵێین ئەم شوێنە لە قورئانی پیرۆزدا پێیدەوترێت الاعراف).

3- بەپیرۆز زانینی ئاگر و ئاتەشگە: ئاگرپەرستی لەدوای داستانەکەی حەزرەتی ئیبراهیمەوە دەستیپێکردووە،لە ئاوێستادا باسی ئاگر بەپێنج جۆرکراوە،ناوەکانیشیان لە (یەسناکانی ژمارە 11 و ژمارە 17[لمجسملمج])دا بەم شێوەیە باسیان لێوەکراوە:

1- ئاگری وەهرام = ئاگری پەرستگە.

2- ئاگر لە نێو لەشی مرۆڤ و زیندەوەراندا.

3- ئاگری شاردراوەی ناو رووەك.

4- ئاگری نادیار کە لەناو هەوروبروسکەدایە.

5- ئەو ئاگرەی لە بەهەشتدا لەبەردەم ئاهورامەزدادایە،ئەمجۆرەیان وەك لەکتێبی مێژووی ژیانی زەردەشتدا باسی لێوەکراوە،ناوی (خورنە)یە و پەیوەندی بەبارەگای شکۆدار و گەورەی پادشاکانەوە هەیە،لەزمانی پەهلەویدا بە (خۆر) و لەزمانی فارسیشدا بە (خورشید) بەناوبانگە.

ئاگر لە ئاوێستادا پێیدەوترێت (ئاتر) بەڵام لەزمانی فارسیدا هەرلە سەدەکانی ناوەڕاستەوە ناوەکە بووە بە (ئازەر) و بەکوڕی ئاهورامەزدا ناوبراوە،هەندێك لە عیسایییەکان ئاگری پیرۆزی زەردەشتییەکانیان بەکچی ئاهورامەزدا لەقەڵەمداوە،بەڵام ژمارەیەك لە کەشیشەکانیان دژایەتیی ئەم بۆچوونەیان کردووە،هەروەك (هوئونام) کە یەکێکبووە لە کەشیشە ناودارەکانی عیسایییەکان لەرووی رقەوە ئاگری ئاتەشگەیەکی کوژاندووەتەوە و وتوویەتی: (نە ئەم خانووە پەرستگەی خوایە،نە ئەم ئاگرەش کچی خوایە).

---

[شمیرلمج] سەرچاوەی پێشوو ل74-78.

[لمدسملمج] سەرچاوەی پێشوو ل137.

[لمجسملمج] بڕوانە کتێبی (ئاوێستا،کتاب دوم،یسنە،ل151،168) نووسینی جلیل دوستخواه.





لە ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکاندا گەلێك شت دەربارەی (پیرۆزی ئاگر،هەروەها سوود و دەسـکەوتەکانی) بـۆ پێـشەوا ئایینیـەکان و ئەنجامـدانی ئەرکـەکانی مـرۆڤ لەبەرانبـەر ئـاگردا قسەیان لەسەرکراوە[لجسملج].

(پرۆفیـسۆر کریستنـسن) دەربـارەی ئـاگر و ئاتەشـگە لای زەردەشـتییەکان نووسـیویەتی (ئاتەشـگە = مـاڵی ئـاگر) بەشـێوەیەکی گـشتی هەشـت دەرگـای هەبووە،نموونـەی ئـەم جـۆرە ئاتەشگەیە،ئاتەشـگەکەی (شـاری یـەزد)ە کـە لەسـەردەمی لەشکرکێـشی ئیـسلامدا کـراوە بـە مزگەوتێکی گەورە[لحسملج].

(مەسعوودی)یش دەربـارەی داروپـەردووەی ئاتەشـگە کۆنەکـەی (اسـطخر) نووسـیویەتی: ئـەو شـوێنە لەکۆنـدا جێگـای بتـەکان بـووە،(کچی بەهمـەنی[لخسملج] کوڕی ئەسـفەندیار) بتـەکانی لابردوون و کردوویەتی بـە ئاتەشـگە،لەم ساڵەدا کـە (934ز)یـە خـەڵك بـە مزگـەوتی (سـلێمان کـوڕی داود) ناویدەبەن،بیناکـە بریتیـە لەبینایـەکی سەرسـوڕهێنەر و چوارچـێوەیەکی گـەورەی هەیە،بەهەرچـواردەورەکەیدا شـوورایەکی گـەورەی بـەردین کێـشراوە،چەندین وێنــە لەسـەر بەردەکان درووستکراون و جوانترین شێوە دەنوێنن،ئەوەی بێتـە ئـەم شـوێنە وای بۆدەچێت کـە وێنەکان هی پێغەمبەرانبن[برسملج].

هەنـدێك لەمێژوونووسـان وتوویانــە ئــەو ئاتەشـگەیەی لەبــەردەم گـۆڕی شـاکاندا لــە بالاخانەکەی (نەقشی رۆستەم)دا دروستکراوە و مێژووەکـەی بـۆ سـەردەمی (هەخامەنـشییەکان) دەگەڕێتەوە،نموونەیەکە لەو ئاتەشگەیانەی کە پارێزەری ئاگری سەرمەدی بوون،ئەو ئاتەشـگەیە پێیدەوترێت (کەعبەی زەردەشت)[ترسملج].

ئەو ئاتەشـگایانەی ئـاگری پیرۆزیـان تێداکراوەتـەوە پێویـستبووە رەچـاوی ئـەوەیان تێـدا بکرێت بەهیچ شێوەیەك خۆر لەئاگرەکە نەدات،بۆیە لەناویاندا ژوورێکی تاریك درووسـتکراوە و

[لجسملج] (عەبدوڵا موبلیغی ئابادانی) ، مێژووی ژیانی زەردەشت، وەرگێڕانی وریا قانیع، چاپی دووەم، لاپەڕە (116).

[لحسملج] (آرثر کریستنسن)، ایران فی عهد الساسانیین، ترجمة (یحیی الخشاب)، مراجعة (عبدالوهاب عزام)،ص (150)، القاهره 1957.

[لخسملج] (بەهمەن کوڕی ئەسفەندیار)،یان بەپێی هەندێك لەسەرچاوەکان کوڕی (بەهلو) باپیرە گەورەی سانەکانی هەورامان بووە.

[برسملج] (ابوالحسن علی بن حسین المسعودی)، مروج الذهب ومعادن الجوهر، جلد (4) – ص (76 ، 77).

[ترسملج] (آرثر کریستنسن)، ایران فی عهد الساسانیین، ترجمة (یحیی الخشاب)، مراجعة (عبدالوهاب عزام)،ص (150)، القاهره 1957

**ئــــاگری تێداکراوەتەوە،وێنـــەی ئـــەوجۆرە ئاتەشـــگەیانەش لـــە دراوی حوکمڕانـــەکانی فارسدا،هەرلەپێش (سلوکی)یەکانەوە و هەتاکو دواتریش بەرچاودەکەوێت.**

**دراوەکانی سەردەمی حوکمڕانیی ئەردەشیر کە لەمۆزەخانـەی (کۆبنهاگن)دا پـارێزراون وێنەی ئاتەشگەیەکی زەردەشتی پیشانەدەدەن[یرسملج].**

**وێنەی ئاتەشگە لەسـەر دراوی هـەموو شـاکانی دەوڵـەتی ساسـانی دەبینرێت،لـەدراوی شـا کۆنەکانـدا هـەتا سـەردەمی (یـەزدەگوردی دووەم)،وشـەی ئـاگر بـەدوای نـاوی ئـەو پاشـاوە کـە فەرمانی لێدانی دراوەکەی داوە نووسراوە.**

**ئاگر لەناو خێزانە ئێرانیەکاندا پلەی جۆراوجۆری هەبووە وەك:**

**1 وەجاخ[سمسملج] = ئاگری ماڵ.**

**2 ئاگری عەشیرەت.**

**3 ئاگری گوند کەپێیوتراوە (ئازران).**

**4 ئاگری ناوچە و هەرێم کەپێیوتراوە (وەهرام)،یان (وەرهران).**

**ئـــاگری مـــاڵ ئـــەرکی نێرینـــەی خێـــزان بووە،بـــەڵام ئـــاگری گونـــد لەلایـــەن دوو لـــە (هەربەد=هەربەرز[شمسملج])ەکانەوە سەرپەرشتیکراوە،لەکاتێکدا ئاگری (وەرهران = ئاگری ناوچـە و**

---

[یرسملج] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[سمسملج] وەجـاخ لـە کولتـووری دینـی ئێمـەی کـورددا قووڵاییـەکی دێرینـی هەیە،کردنـەوەی ئـاگری ناومـاڵ لای زەردەشـتییەکان ئـەرکی نێرینـە بووە،هـەرماڵێك نێرینـەیان نـەبووبێت ئـیتر ئاگرەکـەیان کوژاوەتـەوە و وەجاخیـان کوێربووەتـەوە،تا ئێـستاش لـەناو کۆمـەڵی کوردەواریـدا ئـەو خێزانانـەی منـداڵی نێرینـەیان نییە،ئەگـەر منـداڵی مێینەشـیان هـەبێت هـەر پێیانـدەوترێت وەجاخکوێر،هەرچـۆن ئەوانـەش کـە هـیچ منـداڵیان نییـە بـەوەجاخکوێر لەقەڵەمدەدرێن.

[شمسملج] هەربـەد=هەربـەرز: لـە دینـی زەردەشـتیدا پێیانـدەوترێت (ئەشـتراپایتی)،خـوارەزمی وتوویـەتی: وشـەی هەربـد بـەواتای خزمـەتکاری ئـاگر دێـت،(تەبـەری)ش وتوویـەتی: (کیـسرای دووەم) فەرمانیـداوە بەدرووسـتکردنی ئاتەشـگەکان و دوانـزە هـەزار هەربـدی بەسـەرەوە داناون،سـەرداری هەربـدەکانیش بـەواتای گـەورەی هەربـدەکان پێیدەوترێت (هەربدان هەربد).

بڕوانە کتێبی (ایران فی عهد الساسانیین) لاپەڕە (106،107) نووسینی (آرثر کریستنسن) وەرگێڕانی یحیی الخشاب،پێداچوونەوەی عبدالوهاب عزام القاهرە 1957





هەرێم) پێویستبووە لەلایەن ئەنجومەنێکی هەڵبژاردەوە لە (هەربەد=هەربەرز)ەکان و لەلایەن (مووبد)ێکەوە سەرپەرشتیبکرێت[لحشملج].

(کیریتر هێربد)ی گەورە مووبد کە لەسەردەمی حوکمڕانیی (شاپووری یەکەم،هورمزی یەکەم،بەهرامی یەکەم،بەهرامی دووەم)دا ماوەی سی ساڵ رابەرایەتی رۆحانییەکانی دیینی زەردەشتی کردووە وتوویەتی: ئایینی مەزدایی بەدەستی من بەهێزبوو،زاناکان من پەروەردەمکردن،هەربەدەستی منیشبوو ئاتەشگەکان کرانەوە و (موغ)یان لەسەر دانرا،سوپای پادشا بۆهەر جێگایەك دەڕۆیشت لەو شوێنەدا ئاتەشگە دەکرایەوە،هەر بۆ نموونە لە (ئەنتاکیە) چەندین ئاتەشگە کرانەوە[لحشملج].

ئاگر لای زەردەشتییەکان نیشانەی گیانی نوورانی خوای گەورەیە و هەر ئاگردانێکیش جێگە و رێگەی تایبەتی خۆی هەیە،لەوێشەوە ئاگری هەمیشەیی دەسووتێت و نابێت بەدەستلێدان و هەناسە هەڵکێشان لەبەرانبەریدا پیسبکرێت،مووبدەکان کەخزمەتی ئاگر دەکەن پێویستە لەسەریان دەستکێش لەدەستبکەن و دەمیشیان هەڵبەستن.

هەروەك لە سەرچاوە مێژووییەکاندا باسکراوە چەند ئاتەشگەیەکی گەورە و بەناوبانگ لەئێراندا هەبوون،وەك:

1 ئاتەشگەی ئازەرگوشەسپ: ئەم ئاتەشگەیە لەباکووری (شیز)دا بووە لەهەرێمی ئازەربایجان،تایبەتبووە بە پادشاکان و شوێنەکەشی وادیاریکراوە گوایا دەکەوێتە ناوشوێنەوارەکانی (تەختی سلێمان)،لەناوەڕاستی رێگەی نێوان (ورمێ = ئورمیە و هەمەدان)دایە.

پادشاکانی دەوڵەتی ساسانی بەردەوام (زیڕ،پارە،زەوی،کۆیلە) و شتی گرانبەهایان وەك دیاری پێشکەشکردووە بەم ئاتەشگەیە،لەکاتی دەسبەکاربوونیشیاندا لەسەر تەختی پاشایەتی بەپێ رۆیشتوون بۆ زیارەتی (ئازەرگوشەسپ) و قوربانیی گەورەیان بۆکردووە،ئەم ئاتەشگەیە لەسەردەمی ساسانیەکاندا،هێمای یەکگرتنی دین و دەوڵەت بووە.

---

[لمحشملج] (آرثر کریستنسن) ایران فی عهد الساسانیین ترجمه یحیی الخشاب مراجعه (عبدلوهاب عزام) ص151 القاهره 1957.

[لمجشملج] (عەبدولا موبلیغی ئابادانی) مێژووی ئاینی زەردەشت وەرگێڕانی وریا قانیع چاپی دووەم ل113.

2 ئاتەشگەی فریغ: بەپێی چەند گێڕانەوەیەك ئەم ئاتەشگەیە لەسەر (كێوی رۆشن) بووە لەهەرێمی كابلستان و ئاتەشگەی (مووبد،پیشەوەر)ەكان بووە،هەندێكیش پێیانوایە لە (اصطخر)دا بووە،مەسعوودی بەناوی (ئازەر جۆی= ئاگری جۆی) ناویهێناوە[لچشملج].

3 ئاتەشگەی ئازەر بەرزین میهر: كەوتۆتە خۆرهەلاتی ئێرانەوە ولە چیاكانی (رێوەند)دا بووە لە باكووری خۆرهەلاتی (نەیساپوور)،ئاتەشگەی جووتیارەكان بووە.

بێجگە لەمانەی ناومانهێنان،لە ئێراندا چەند ئاتەشگەیەكی تر هەبوون،هەرچەند لە رووی گرنگییەوە بەپلەی دوو هاتوون،بەلأم شوین بایەخپێدانی گەورە بوون،لەوانە: (ئاتەشگەی نەیساپوور،ئاتەشگەی ئەرجان لە هەرێمی فارس،ئاتەشگەی كركرا،ئاتەشگەی شیروان لەنزیك (رەی)،ئاتەشگەی قەزوین،ئاتەشگەی قووش،ئاتەشگەی طوس)[لچشملج].

ئاگری ئاتەشكە هەمیشە لەلایەن پیاوە دینییەكانەوە چاودێری و سەرپەرشتیكراوە و بەداریكی تایبەت ئەمەدیو و ئەودیوكراوە،ئەو دارە داری رووەكێكە پێیدەوترێت (بەرسم)،بەپێی نەریتێكی تایبەت بڕاوەتەوە[لخشملج].

هەر لەم بوارەدا پێویستە باس لەوە بكەین بۆنی ئاتشگەكان بەردەوام بە (بوخورد، سووتەمەنییە بۆندارەكانی تر) خۆشكراوە،رۆژانەش پێنج جار لەلایەن پیاوە دینییەكانەوە نزای تایبەت خوێنراوە و پاشان ئەركی دینی و مەزهەبی خۆیان ئەنجامداوە،لەسەر هەموو زەردەشتییەكیش پێویستە بڕوات بۆ ئاتەشگە و نزای (ستایشی ئاگر) بخوێنێت كەپێیدەوترێت (ئاتەش نیایشین)،بە بڕوای زەردەشتییەكان هەر كەسێك رۆژانە سێ جار بڕواتە ئاتەشگەو نزای

---

[لچشملج] (ابو الحسن علی بن حسین المسعودی) مروج الذهب ومعادن الجوهر – جلد (4) ص (75).

[لچشملج] شتێكی سەیرە لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ناوی (ئاتەشگەی پاوە) نەهاتووە،لەكاتێكدا دوای ئاتەشگەی (ئازەرگوشەسپ) بەدووەمین ئاتەشگەی زەردەشتی لە قەڵەمدەدرێت،پێدەچێت ئەمەش هەر بۆ سڕینەوەی تایبەتمەندییە مێژوویی و كولتوورییەكانی گەلی كورد بێت،ئەگینا چ پاساوێكی هەیە؟،بۆ سەلماندنی ئەم راستییەش كە ئاتەشگەی پاوە دووەم ئاتەشگەی زەردەشتی بووە لە ئێراندا،تكایە بڕوانە: (دلیل راهنمائی سیاحی شهرستان پاوە)،لە بلأوكراوەكانی فرهنگ و ارشادات اسلامی پاوە.

85 (عەبدولا موبلغی ئابادانی) مێژووی ئایینی زەردەشت – وەرگێڕانی (وریا قانیع ) چاپی دوەم لاپەڕە (121،122).

(ئاتــەش نيايـــشين) بخوێنێت،خوشـــگوزەران و بەختـــەوەر دەبێـــت و لـــەرووی رۆحيـــشەوە ئاسوودەيە[٭].

لـەكۆتايى ئـەم خالّـەدا دەلّـێين زەردەشـتييەكان ئـاگر بـە نـووری خـوادەزانن و ئـاگر پەرسـتنين،(مەجوسـييەت[٭٭]) و ئـاگر پەرسـتى تـاوانێكى ناڕەوايە،دوژمنـەكانيان داويانەتـە پالّيان.

4 بـاوەڕبوون بـە (يـەزد= يـەزت = ئێـزد)ەكـان ،بـەپێى بـاوەڕى زەردەشـتييەكان ئەمانـە بوونەوەرى موجەڕەدن و ژمارەيان (30) يەزدە،دەبن بەدوو كۆمەلّەوە بەناوى (يـەزدى ئاسمـانى و يـەزدى زەمينـى)،هـەر يەكێكيشان تايبەتـە بـە يـەكێك لـە ڕۆژەكـانى مانگەوە،هـەرە چـاكترين يـەزدى زەمينـى (زەردەشـت)ە كـە خـەلّك بـۆ خواپەرسـتى و دينـى راسـتى بانگدەكات،لـە ڕۆژى دەركەوتنيـشيەوە سـەركەوتنى هێـزى چـاكە و روونـاكى بەسـەر هێـزى خراپـە و تاريكـدا بەردەوامە.

---

[٭] (آرثر كريستنسن) ايران فى عهد الساسانيين ترجمة يحيى الخشاب مراجعة (عبدلوهاب عزام) ص 159 القاهرة 1957.

[٭٭] واژەى مـــەجووس بەچـــەند مانايـــەك هاتووە،لەوانـــە: (ئاگرپەرست،راهيب،خومار،ســـەرخۆش،خاوەنى مەيخانە،شـاخى گـا،رەگى دارخورمـا) و هەنـدێك جـاريش بـە مانـاى (كـافر و بتپەرست) هاتووە،لەچەند شـوێنێكى (تـەورات)دا نـاوى مـەجووس هێنراوە،لـە (ئينجيل)دا زيـاتر لـە تـەورات باسـى مـەجووس كراوە،لـە بەنـدى دووەمـى (ئينجيلى مـەتى)دا هـاتووە: مەجووسييەكان لـە سـەرەتاوە كەسـانێك بـوون بـە هـۆى ئەسـتێرەيەكەوە لـە خۆرهەلاّتـدا ئاگادارى لە دايكبوونى (مەسيح) بوون،لەم بارەوە نووسراوە: (كە (يەسووع لە دايكبوو لە بيت لەحمى يەهودا لە ڕۆژانى شا هيرۆديسدا ئەوەتا ئاگرپەرستان لە خۆرهەلاّتەوە بۆ ئۆرشەليم هاتن،ئەيان وت لە ئەو لە كوێيە ئەو شاى جوەى كە لە دايك بووە ؟ ئەستێرەى ئەومان ديوە لە خۆرهەلاّتدا و هاتووين كڕنوشى بۆ ببەين).

تێبينى: ئەمەى لە كەوانەكەدا نووسراوە دەقى نووسينەكەى ناو (ئينجيلى مـەتى=ئينجيلى مـەتتا)يـە هـەروەك خۆى و بە بێدەستكارى روونووسەكەى نووسيمانەوە.

بڕوانە (ئينجيلى مەتى= ئينجيلى مەتتا) بەندى دووەم ئايەتى (1 2) بەرچڤەى (قەشە يووسف پەرى و كەريم زەند) چاپخانەى راپەڕين سلێمانى 1872 .

(قـاموس كتـاب مقـدس)دا كـە روونكردنـەوەى زۆربـەى وشـە و ناوەكـانى نـاو (تـەورات و ئينجيلـە)ە هـاتووە: (مـەجووس) لـە بنەڕەتـدا زاراوەيـەكى كلدانييـە و واتـاى (كەهەنـە) دەگەيـەنێت كـە پلـەى كۆمەلاّيـەتيان لـە نێـوان حوكمڕانەكان و خەلّكدا بووە.

بڕوانــە كتێبـــى (مێـــژووى ئـــايينى زەردەشـــت) چـــاپى دووەم لاپـــەڕە (91)،نووســـينى (عەبـــدولاّ مـــوبلغى ئابادانى)،وەرگێڕانى (درياقانيع).

5ـ نوێژ: هەموو زەردەشتییەك لەسەری پێویستە رۆژانە پێنج جار نوێژ بكات،لە كاتی نوێژكردندا رووەدەكەنە رووناكی وەك: (تیشكی خۆر،رووناكی مانگ،رووناكی چرا)،ناوی نوێژەكانیشیان و كاتەكانیان بەم شێوەیەی لای خوارەوە دیاریكراوە:

هاون گا= HAVANGAH: لە هەڵهاتنی خۆرەوە هەتاكو نیوەڕۆ.

رپیت وین گا= REPITHWINGAH:لە نیوەڕۆوە هەتاكو سێ سەعات پاش نیوەڕۆ،لەسەردەمی كۆنیشدا كەسەعات نەبووە،ئەم نوێژە لەماوەی نێوان نیوەڕۆ بۆ كاتی گەیشتنی خۆر بە ¾ ئاسمان ئەنجامدراوە.

ئەزیرین گا= OZIRINGAH: لەسەعات سێی پاش نیوەڕۆ وە هەتاكو دەركەوتنی ئەستێرەكان.

ئەیویس رۆتریم گا= AIWISRATHRIMGAH:لەسەرەتای شەوەوە هەتاكو نیوە شەو.

ئوشهین گا= USHAHINVAH:لەنیوە شەوەوە هەتاكو هەڵهاتنی خۆر[41].

مەرجەكانی نوێژكردنیش بریتین لە:

1ـ پاكیی لەش لەهەموو پیسی و پۆخڵییەك.

2ـ پاكیی جلوبەرگ لەچەپەڵی:خوێن،موو،نینۆك و هەموو شتە هاوشێوەكانی تر.

3ـ شتنی دەمو چاو و دەست و قاچ.

4ـ داكەندنی چۆغە و كوشتی زەردەشتی لەكاتی نوێژكردندا[42].

5ـ شوێنی نوێژكردن نابێت بەپارەی دزیكردن كڕدرابێت،یاخود بەزۆر لەكەسێك داگیركرابێت،ئەو شوێنە پێویستە دووربێت لەهەموو پیسو پۆخڵییەكەوە و بەلای كەمە وە سێ هەنگاو بەدەورووبەریدا پاك و خاوێنبێت.

---

[41] (عەبدولعەزیمی رەزائی) تاریخ دەهزار سالە ایران،لاپەرە (79).

[42] چۆغەی زەردەشتی، لەهەندێك سەرچاوەدا بە ( بەروانكە) ناویهێنراوە،بریتییە لە چۆغەیەكی كەمێك درێژ كە لە كەتان،یان دەزووی سپی دروستدەكرێت و بەسەر شەرواڵدا بەردەدرێتەوە.

سەبارەت بە كوشتی زەردەشتیش بریتییە لە پشتوێنێك لە (72) تاڵ بەنی رێسراو دروستدەكرێت،هەر لەتەمەنی پانزە ساڵییەوە دەكرێتە پشت و چەند گرێیەكی لێدەدرێت،تا ئێستاش لەهەندێك ناوچەی كوردستاندا ئەم شێوازەی پشتوێنبەستنە بەردەوامە.





ســەبارەت بــە رۆژووش،لەبــەر ئــەوەی  رۆژوو دەبــووە هــۆی لاوازبــوون و بێتوانــایی جووتیارەكـان كـە هێـزی بەرهەمهێنـەی ئـەو سـەردەمانە بوون،بۆیـە (زەردەشـت) رۆژووگرتنـی لێقەدەغەكردوون.

6 بەپیرۆز زانینی سەرچاوە سروشتییەكان وەك:( ئاگر، ئاو، هەوا، خاك)،سەبارەت بە ئاگر لە خاڵی پێشوتردا لەبارەیەوە قسەمانكرد كە هێمای دینی زەردەشتییە، بەلاَم سەرچاوەكانی تری وەك: (ئاو، هەوا، خاك)یش بەلایانەوە پیرۆزن و هەرگیز نابێت پیسبكرێن[شمشملج]،هەر لەم بوارەدا زەردەشتییە كۆنەكان مردووەكانیان بردوونەتە سەر لوتكەی چیایەكی بەرز و لەوێ دایاننـاون بۆ ئەوەی دڕندە و باڵندەی كێوی و گۆشتەكەیان بخۆن، بڕوایان وابووە ناشتنی مردوو لەناو زەویدا دەبێت بەهۆی پیسكردنی زەوییەكە و سووتاندنیشی ئاگر و هەوا پیسدەكەن، بەلاَم پاشان ئەم بڕوایەیان پاشان گۆڕانی بەسەردا هاتووە،لەم بوارەدا گەشتیارێكی بوودایی بەناوی (هیون تسانگ) وتوویەتی: ئێرانییەكان بەزۆری لاشەی مردووەكانیان لە چۆلاَییدا فڕێدەدان، بەلاَم (سیاوەش) نەیویستووە لەسەر ئەونەریتە بڕوات،بۆیە كاتێك هاوسەرەكەی مردووە،گۆڕی بۆ هەڵكەندووە و شاردوویەتییەوە.

لەچوار چێوەی ئەو گۆڕانەی  لەرووی تێڕوانییانەوە بـۆ لاشـەی مـردوو بەسـەر بڕوایانـدا هــاتووە، زەردەشــتییەكان بــە تێپــەڕبوونی رۆژگــار لــەم بــوارەدا هەڵــسوكەوتیان گۆڕیــوە و (دخمە[لحلحلج])یان درووستكردووە بۆ ئەوەی لاشەی مردووكانیانی تێدا بشارنەوە.

لـە كتێبـی (وەندیـداد)دا، كـە یەكێكـە لەبەشـەكانی كتێبـی پـیرۆزی ئاوێـستا،هاتووە: زەردەشـت پـاش پاڕانــەوە لـە ئاهورامــەزدا فەرموویــەتی: ئـەی خـوای تـاك و تـەنها پێمنـاڵێی خۆشـترین شـوێنی زەوی لەكوێدایـە؟ ئاهورامـەزداش لەوەلاَمـدا فەرموویـەتی: ئـەی زەردەشـتی ئەسپیتمان خۆشترین شوێنی زەوی ئەوشوێنەیە كە مـاڵێكی تێدا درووسـتبكرێت و ئـاگردانێكی تێـدابێت،(ژن و منـداڵ،گا و مـەر)ی زۆری تێـدا بێت،خـەڵك دانەوێڵـە و داری میـوە و  ئـالیكی

---

[شمشملج] (محەممەد ئەمین زەكی بەگ)، خولاَصەیەكی تاریخی كورد و كوردستان، بەرگی یەكەم،لاپەرە (199)، چاپی نوێ ساڵی 2000.

[لحلحلج] (دخمە) بریتییە لە بینایەك لەشێوە گشتییەكەیدا بازنەییە و بەدیوارێكی بەردین دەوریدراوە،پێویستە لە (10-12كم) لەنزیكترین ئاوەدانییەوە دووربێت،زۆرتر بەسەر لوتكەی چیا بەرزەكانەوە درووستدەكرێت،لە ئێراندا تا ئەم رۆژانەش (دخمە)ی زەردەشتی هەیە.

زۆریـان هەبێت،لـەو شـوێنەدا کـشتوکاڵی زۆربکـەن و زەوی تێرئاوبکەن،چـونکە زەویـەك کـە کشتوکاڵی تێدانەکرێت وەك ژنێکی نەزۆك وایە کەمنداڵی نەبێت[1].

هـەر لـەم بـوارەدا (زەردەشـت) فەرمانیـداوە بـە شـوێنکەوتووەکانی،بۆ ئـەوەی بـەردەوام دانەوێڵە و میوە بهێنرێنەبەرهەم،پێویستە کشتوکاڵبکرێت،شوێنە وشك و بەیارەکان پـاراوبکرێن و زۆنگاو لەزەویدا نەمێنێت،وەك پێویستی و ئەرکێکی دینی،دەبێ هەموو زەردەشـتییەك دارێـك بروێنێت.

7- تێـڕوانین بـۆ تـاوان: تـاوان لای زەردەشـتییەکان شـتێکی خـۆکردە و هـەموو مرۆڤێـك دەتوانێـت بەویـستی خـۆی لـەتاوان دوورەپـەرێزبێت،یاخود بەپێـچەوانەوە دەتوانێـت خـۆی بـە تاوانکاری بسپێرێت،لەم بـوارەدا ئـیتر بەدبـەختی، یـان خۆشـبەختی مرۆڤ،تاوانکـاری و بێتـاوانی راستە و راست پەیوەستن بەئازادی ئیرادەی خۆیەوە[2]،هـەر لێرەشـەوە دەتوانێـت ژیـانی خـۆی بکـات بـە ئاهـەنگێکی خـۆش و دڵگیر،یـاخود بـە ئـاوازێکی شـووم و خەماوی،گـەورەترین تاوانەکانیش لای زەردەشتییەکان ئەمانەن:

بتپەرستی، زی ا،نێربازی، خەڵککوشتن، خۆکوژی، داوێنپیـسی،سۆزانیەتی، سـوودخواردن، جادووگـەری، بـاوەڕبوون بەئەفسانە، درۆ و دەلەسـە، دزی،پەیمانـشکێنی، بێئەمـەکی، تەمـەڵی و تـــەوەزەلی، کینـــەبازی، لووتبـــەرزی و لـــەخۆ بـــایبوون، خۆپەرســـتی، ناهەقی،چاوچـــنۆکی، دەمەدەمێ،بـەخیلی، بوختانکردن،تووڕەیی،شـیوەن و زاریکـردن بـۆ مـردوو، خـەڵك فریـودان، بایەخنەدان بە رێنمایی تەندرووستی، بەزەیی نەهاتنەوە بە ئاژەڵدا و چلەکێشی[3].

8- ژن و مێـردی و هاوسـەری: لـە زۆر شـوێنی ئاوێـستادا نـاوی ژن لەگـەڵ نـاوی پیـاودا هاتووە،بە پێی تێڕوانینی زەردەشتییەکان ژن پێویستە ویـژدان ئازادبێـت هـەتا کـاری ویـستراوی لێبوەشێتەوە،چـونکە پـەروەردە و پێگەیانـدن و پارێزگـاری وەچـەی مـرۆڤ لـە باشـترین شـێوەدا لەلایەن ژنەوە بەرهەمدەهێنرێت،لەم بوارەدا (زەردەشت) فەرموویەتی:

ئەی کیژانی شـووکردوو،ئەی ئـەو لاوانـەی تـازە ژیـانی هاوسـەریتان پێکەناوە،لـە رێگـەی ویژدانی خۆتانەوە هەر یەکێکتان پێشبڕکێی ئەوی ترتان بکەن بۆ ئەوەی نەفستان پاکبێت.

---

[1] (د.صدیقی بۆرەکەیی) مێژووی وێژەی کوردی،بەرگی یەکەم، لاپەرە (10،9).

[2] بڕوانـە کتێبـی ئاوێـستا،بـەرگی یەکـەم،لاپـەرە (43) تۆژینـەوە ولێکۆڵینـەوەی (د.جلیـل دوسـتخواە) لـە بلاوکراوەکانی مروارید.

[3] عەبدولعەزیمی رەزائی، تاریخ دەهزار سالە ایران،لاپەرە (79،78).

**ئەمانــەی خــوارەوەش هەنــدێك وردەكــارین لــە بــواری ژیــانی (ژن و مێردیــی) زەردەشتییەكاندا:**

**1ـ كـچ كـە تەمـەنی گەیـشتە (9) سـاڵ دەكرێـت نـاوی بەشـوودانی لێبهێنرێت،بـەڵام گواستنەوەی بۆ ماڵی مێرد دەبێت تەمەنی لە دوانزە ساڵ كەمتر نەبێت.**

**2ـ كچ كە بۆ یەكەمجار تێكەوت= سەر و عـوزری شت و هێشتا بەشوو نەدرابوو،ئـەوە بـاوكی تاوانبـارە و بەچـەند بارەبوونـەوەی تێكەوتنەكـەی ئەوەنـدەجار تـاوانی باوكەكـەی زیاددەكات،رادەی تاوانی هەر جارێكیشیان (1500) درهەمـە و بەرامبـەر بـە و تاوانە،لـەو دنیـا لەسەر (پردی جینوەت) سزای باوكەكەی دەدرێت.**

**3ـ باشترین شت بۆ كچان پاش تەمەنی (15) ساڵ شووكردنە.**

**4ـ نیشانەكانی ژنی باش بریتین لە: (داوێنپاكی،ئازارنەدانی مێـرد بـە زمانی،پارێزگاریی ئابووریی ماڵ،رێكوپێكی لەگەڵ مێردا،پارێزگاریی كەلوپەلی ناوماڵ)[1].**

**5ـ كۆمەككردن بەو كەسانەی گەیشتوونەتە تەمـەنی (باڵقبوون) و هێشتا ژن و ماڵیـان پێكەوە نەناوە،لەكردارە زۆر چاكەكانە و پاداشتی خاوەنەكەی دەدرێتەوە.**

**6ـ هەمووكەسـێك لەسـەری پێویـستە هاوكاریی هاوتەمـەنی خـۆی بكات لـە پێكـەوەنانی خێزان و دابینكردنی بژێویدا.**

**لێرەدا ئاماژە بـۆ یـەكێك لـە فـەرموودەكانی (ئاهورامـەزدا) دەكەین،كە بـە (زەردەشـت) دەڵێت،ئەی زەردەشـتی ئەسـپیتمان لای مـن پیـاوی خـاوەن ژن لـە پیـاوی بێـژن و پیـاوی خـاوەن خێزان لە پیاوی بێخێزان لە پێشترن[2].**

**هەر لەدرێژەی ئەم باسەدا قسە لەسەر ئەوەدەكەین،لای زەردەشتییەكان فرەژنـی كـارێكی خراپ و ناڕەوایە، جۆری (ژن و مێرد)ی بە پێنج ناو و بەم شێوەیە دیاریكراوە:**

**1ـ پاشاژن: بەو ژن و مێردییـە دەوترێـت كـە كـچێكی بـاڵق بەرەزامەنـدی دایـك و بـاوكی بدرێت بەشوو بەكوڕێك و بە بووكی بۆی ببرێت.**

**2ـ چـاكزژن: بـەو ژن و مێردییـە دەوترێـت كاتێـك بێوەژنێـك پـاش مردنـی مێردەكـەی لەكەسێكی تر مارەبكرێت.**

---

[1] **(هادی بەهمەنی)ـ پەیامی هەورامان)ـ بەرگی یەكەم‌ـلاپەڕە** (396).

[2] **(عەبدولعەزیمی رەزائی)ـ تاریخ دەهزارساڵ ایرانـ لاپەڕە** (83).

3 ئەیوك ژن= یەكانەژن: بریتییە لەو ژن و مێردییەی كە كەسێك كچێك بهێنێت تەنها كچی ماڵبێت،كاتێك مێردەكەی یەكەم منداڵی دەبێت،دەكرێت بەكوڕی باوكی ژنەكە و ئیتر هەرچییەك لەباوكی ژنەكەوە بەمیرات بمێنێتەوە بۆ ئەو كوڕە دەبێت.

4 سترژن: ئەم جۆرەیان بریتییە لەوەی كاتێك كوڕێكی باڵق،یاخود پیاوێكی بێژن دەمرن،كەسوكاری مردووەكە لەسەر خەرجیی خۆیان كچێك لە لاوێك مارەدەكەن،بەلاَم بەمەرجێك ژن و پیاوەكە پەیمانبدەن یەكێك لە كوڕەكانیان بە كوڕی كابرای مردوو بدەنەقەڵەم.

5 خودسەرژنی:= ژنی خاوەنڕا: كاتێك كوڕ و كچێكی باڵق بە ویستی خۆیان بیانەوێ خێزان پێكەوەبنێن، بەلاَم بەهەر هۆیەكەوە بێت كەسوكاری كچە ناڕازیبن،خۆیان دەتوانن ببن بەهاوسەری یەكتری و كەس ناتوانێت ڕێگە لە كارەیان بگرێت،بەلاَم كچەكە لە میراتی باوكی بێبەبەشدەبێت،تەنها لە حاڵەتێدا نەبێت دایك و باوكەكەی بەشێوەی نووسین ئەو مافەی بۆ بسەلمێنن[ترلمحلج].

سەبارەت بە تەلاَقدانیش ڕەویەی تایبەت بە خۆی هەیە،تەلاَق لای زەردەشتییەكان ئازاد نییە تەنها لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا نەبێت:

ئەگەر ژن لەسەرنوێنی نووستنی مێردەكەی ناشایستەییكرد.

هەركاتێك بەبێڕەزامەندیی مێردەكەی دوژمنیك بشارێتەوە.

ئەگەر فێری جادووگەری بوو یاخود باوەڕی پێیبوو.

لەكاتی نەزۆكی و منداڵنەبووندا، چ بۆژن، چ بۆ پیاو.

لەكاتێكدا مێردەكەی بۆ ماوەی پێنج ساڵ هیچ هەواڵێكی نەبێت.

لەكاتی دەستدرێژیكردنی سێكسیدا چ بۆژن، چ بۆ پیاو.

ئەوگەر یەكێكیان ئەقڵیان لەدەستدا و شێتبوون[یرلمحلج].

لێرەدا پێویستە ئاماژەبكەین بەوەی لە دینی زەردەشتیدا كچ وەكو كوڕ لە میراتی ماڵە باوانی دەبات.

---

[ترلمحلج] (عەبدولاَ موبلغی ئابادانی)،مێژووی ژیانی زەردەشت، وەرگێڕانی (وریاقانیع)، چاپی دووەم، لاپەڕە (172،170،171).

[یرلمحلج] (ئەردەشیر ئازەرگوشەسپ)، ائین زناشوئی زردشتی، لاپەڕە (22).

9 پابەندبوون بەجەژنە زەردەشتییەکانەوە و گێڕانی ئاهەنگ بە بۆنەیانەوە،جەژنە گرنگەکانیشیان ئەمانەن:

1 جەژنی نەورۆز، ئەم جەژنە لای زەردەشتییەکان جەژنی ئافەریدەبوونی مرۆڤە، چونکە یەکەم مرۆڤ لەم رۆژەدا ئافەریدەکراوە.

2 جەژنی لەدایکبوونی زەردەشت لە رۆژی شەشەمی مانگی فەروەردینـدا= رۆژی شەشەمی مانگی خاکەلێوەی کوردی.

3 جەژنی گاهانبار.

4 جەژنی تیرگان= رۆژی سەرکەوتنی ئێرانییەکان بەسەر توورانییەکاندا.

5 جەژنی میهرگان= رۆژی دانیشتنی فەرەیدوون لەسەر تەختی پادشایەتی.

6 جەژنی سەدە= رۆژی (میهر)یشی پێدەوترێت.

7 جەژنی مانگەکان: وەك (فەروەردینگان، ئۆردیبەهێشتگان، خوردادگان[سملحلج]).

10 پابەندبوون بە پۆشینی بەروانکە و پشتێنی زەردوشتییەوە= کوشتی زەردەشتی.

### ئاوێستا کتێبی پیرۆزی زەردەشتییەکان

هەر چۆن دەربارەی مێژووی ژیانی زەردەشت جیاوازیی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەن،بەهەمان شێوە دەربارەی ( کتێبی ئاوێستا) و ئەو زمانەی پێینووسراوە جیاوازیی هەن،لەم باسەدا بۆچوون و تێڕوانینی هەندێك لەسەرچاوەکان دەخەینەڕوو:

1 (پلۆنیۆس)ی یۆنانی کە لەسەدەی یەکەمی زاییندا ژیاوە نووسیویەتی: ئاوێستا (2) ملیۆن سروود بووە،زەردەشت خۆی ئەو کتێبەی نووسیوە و ئێستا نەماوە.

2 (د. جەلیل دۆستخواە) نووسیویەتی: یەکەم کەس لە ئەوروپا لێکۆڵینەوەی لەسەر (ئاوێستا) کردووە،(بریسۆن) بووە و لێکۆڵینەوەکەشی سالّی (1590 ز) لە پاریس بلاّوکراوەتەوە،دواتر خۆرهەلاّتناسی ئینگلیزی بەناوبانگ (تۆماس هاید) بەهەمان رێچکەدا چووە و سالّی (1700 ز) کتێبێکی بەزمانی لاتینی لەسەر ئاوێستا نووسیوە،زانیارییەکانیشی لە نووسینە (یۆنانی،رۆمانی،ئێرانی،،عەرەبی)یەکانەوە وەرگرتوون،هەر لەدرێژەی نووسینەکەدا هاتووە (ئیبراهیم پورداود) سالّی (1925 ز) لەسەر بانگهێشت و داواکاری فارسەکانی

---

[سملحلج] ناوی جەژنە زەردوەشتییەکان بەپێی سەرچاوەکان جیاوازن،بۆ نموونە لە ئاوێستادا ناوەکانیان بەم شێوەیەن: میزیۆی زرمیە،میزیۆی شام،میزیای ریە،همس پتمائیدە،پایتسش هیمە،ئەیاسریمە.

**هیندسـتان،لەوێ لەئـەنجامی بـیر و را گۆڕینـەوە لەگـەڵ (ئاوێـستاناسان و زانایـان)دا لێکۆڵینـەوەکانی خـۆی کەپێـشتر لـە (ئـەوروپا) دەسـتپێکردوون تـەواویکردوون و هـەر لـەوێش کتێبی (ئەدەبی مەزدیسنا)ی بەچاپگەیاندووە[شملحلج].**

3ٔ **(عەبدولعـەزیمی رەزائـی) نووسـیویەتی: چـەندین وشـەی ئینگلیـزی ریـشەیەکی ئاوێـستاییان هەیە،هەربۆنموونـە وشـەی (best ) کـە لای ئینگلیزەکـان بـە واتـای چاکترین دێـت هەمان وشەی (بەهەشت)ە،وشەی ( right )یش کە بەواتای راسـت دێت،لەهـەمان وشـەی (رات)ی ئاوێـستاییەوە وەرگیراوە،هـەروەها کاریگـەری ئاوێـستا و فەلـسەفەی زەردەشـت لـە نووسـینەکانی ژمارەیـەك لـە فەیلەسـووفە گـەورەکانی وەك: (کانت،هێگڵ،نیتـشە)دا بەرچـاودەکەوێت،زۆر لـە بیریـارانیش لەسـەر ئـەو بڕوایـەن فەلـسەفەی (هێگـڵ) لـەژێر کاریگـەری بـیری زەردەشـتدا دارێژراوە[لحلجلج].**

4ٔ **(پرۆفیـسۆر ارثـر کریستنـسن) نووسـیویەتی: لەسـەر رۆشـنایی داسـتانە پارسـییەکان (ئەردەشێری یەکـەم= ئەردەشـێری بابکـان)،پـاش ئـەوەی لەسـەر تـەختی حوکمڕانیی (دەوڵـەتی ساسـانی) دانیـشتووە،فەرمانیداوە بـە پیـاوە رۆحانییـەکانی زەردەشـتی هـەموو دەقـە پـەرت و بلاّوەکـانی سـەردەمی ئەشـکانییەکان کۆکراونەتـەوە،ئینجا کـراون بـە کتێبێـك و ئـەو کتێبـەش پیرۆزییەکی گەورەی دراوەتێ،پاشان بـە فـەرمانی(شـاپووری یەکـەم) کـوڕی ئەردەشـێر کـە دوای باوکی حوکمڕانیگرتووەتە دەست کۆمەڵێك زانیـاری دەربـارەی (ئەستێرەناسی،پزیـشکی) کـە لـە (هیندی،یۆنانی)یەکۆنەکانەوە وەرگێراون خراونەتە دووتوێی ئەو کتێبەوە،وێنەیەك لـەو کتێبـە نوێیەی (ئاوێستا) لە ئاتەشگەی (ئازەر گوشەسپ) دانراوە[لجلجلج].**

5ٔ **(ڤلادیمێـر مینۆرسـکی) نووسـیویەتی: بـەپێی ئـەو بەڵگانـەی کەوتوونەتەدەسـت بۆماندەردەکەوێت،زمانی کوردی بەسـتراوە بـەزمانی (ئاوێـستا)وە کـە کتێبـی پـیرۆزی ئاوێـستای**

---

[شملحلج] بڕوانە کتێبی (ئاوێستا)ٔ بەرگی یەکەمٔ لاپەڕە (49) تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی (د. جلیل دوستخواه).

[لحلجلج] (عەبدولعەزیمی رەزائی)ٔ تاریخ دەهزار سالە ایرانٔ بەرگی یەکەمٔ لاپەڕە (87).

[لجلجلج] (آرثر کریستنسن)ٔ ایران فی عهد الساسانیینٔ ترجمة یحیی الخشابٔ مراجعة (عبدلوهاب عزام)ٔ ص 130ٔ القاهرة 1957..





پێنووسراوە،بیرو ڕایەكیش هەیە كە (زمانی كوردی) وەكو بەشی زۆری شێوەزمانەكانی تری ئێران،زۆربەی كۆڵەكەكانی  درووستبوونی لە زمانی میدی كۆنەوە وەرگرتووە[لجلجلج].

6 (دكتۆر عەلی شەریعەتی) نووسیویەتی: كتێبی پیرۆزی ئایینی (مەزدا) ئاوێستایە،ئەم كتێبە  لەسەدەی سێیەمی زاینیدا كۆكراوەتەوە و لەسەدەی چوارەمی زایینیدا بەناوی كتێبی شەریعەتی دینی زەردەشت راگەیەنراوە،پێنج سروودی كتێبەكەش (زەردەشت) خۆی دانەریانە[لحلجلج].

7 (هاشم رضی) نووسیویەتی: كتێبی ئاوێستا بریتییە لە (161) هەزار وشە،(39) هەزاریان لەبەشی (یەسنە) و (38) هەزاریان لەبەشی (ڤەندیدات= وەندیداد)دان،ئەوانی تریش بەسەر بەشەكانی تردا دابەشبوون[لخلجلج].

8 (د. صدیقی بۆرەكەیی) نووسیویەتی: زۆربەی (زانایان،خۆرهەڵاتناسان،لێكۆڵەران) پێیانوایە (زەردەشت) كتێبی ئاوێستای بە(زمانی مادی) نووسیوە،لەم بوارەدا (مێجەر سۆن) وتوویەتی: سەرچاوەی زمانی كوردی (زمانی مادی)یە و بەپێی هەندێك بەڵگە ئاوێستای زەردەشت بەم زمانە نووسراوەتەوە[برلجلج].

9 ئەندازیار (ئەنداز حەوێزی) نووسیویەتی: ئاوێستای ئەم رۆژانە لە شەش بەشی سەرەكی پێكهاتووە بەم ناوانە: (گاتاكان،یەسنا،یەشتەكان،خوردەئاوێستا،ویسپەرد،وەندیداد= ماڤەندادی=Vidaevata)،هەرلە درێژەی نووسینەكەیدا هاتووە: ئاوێستا لەیەك سەردەمدا و بەدەستی یەك كەس نەنووسراوەتەوە،گاتاكان كە كۆنترین بەشی ئاوێستان سروودبێژەكەیان خودی زەردەشت بووە،سەردەمەكەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دەیەمی پێش زایین،بەڵام بەشەكانی تر لەدواییدا و بەدەستی چەندكەسێك نووسراونەتەوە،ئەو زمانەی ئاوێستای پێنووسراوە پێیدەوترێت (زمانی ئاوێستایی)[ترلجلج].

---

[لجلمجلج] (ڤلادیمێر مینۆرسكی) –كورد، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی د.مارف خەزنەدار،وەرگێڕانی بۆ كوردی حەمەسەعید حەمەكەریم ) ل (83)، 1984.

[لحلمجلج] (د. عەلی شەریعەتی)، تاریخ و شناخت ادیان، جلد دوم)، ص(233).

[لخلمجلج] بڕوانە كتێبی (وەندیداد، جلد اول، چاپ اول) ل (124)،نووسینی (هاشم رضی).

[برلمجلج] (د.صدیقی بۆرەكەیی)، مێژووی وێژەی كوردی، بەرگی یەكەم، لاپەڕە (22).

[ترلمجلج] (ئەنداز حەوێزی) ،ئاوێستا،نامەی مەنەڤی ئایینی زەردەشت،لاپەڕە (20).

10 (عەبدولڵا موبلغی ئابادانی) نووسیویەتی: ناوی ئاوێستا هەروەکو ناوی زەردەشت لەمێژوودا بەچەند جۆرێك نووسراوە وەك: (ئەوستا، ئەویستا، بستاق، ئیساق، ئیتیساع، ئیستا، ئابستا، ئاڤستا، ئەبستا، ئاوێستا)، لەسەرچاوە ئیسلامییەکانیشدا بە (بستاە،ئەبستاق،ئەفستاق) نووسراوە،دەربارەی ئەم وشەیەش لەنێوان زاناکاندا جۆرە هاودەنگیەك هەیە،هەندێك بەواتای (پەنا)ی لێکدەدەنەوە،هەندێکی تریش بەواتای (زانست و زانیاری) دادەنێن،ژمارەیەکی دیکەش بەواتای (دەقی بنچینەیی) دادەنێن[1].

ئەوەی کە سەلمێنراوە ئەوەیە کە ئاوێستا بەواتای (بنچینە) و دەقی ئەسڵی هاتووە،وشەی ئاوێستاش هەمیشە لەگەڵ وشەکانی (زەند و پازەند[2])دایە.

11 (جوزیف طایر) نووسیویەتی: کتێبی پیرۆزی زەردەشتییەکان (ئاڤستا=avesta)یە بە مانای (شەریعە)،ئەم کتێبە کۆمەڵێك ئادابی بەنرخی تیدان و دەبێت بە پێنج بەشەوە،(ئەسکەندەر) لە هێرشەکەیدا بۆ سەر (فارس) هەموو کتیبە زەردەشتییەکانی لە ناو بردوون،بەلاّم پاشان فارسەکان توانیویانە سەربەخۆیی خۆیان بە دەستبهێننەوە و چەند هەوڵێکی رێك و پێکیان داوە بۆ نووسینەوەی (ئاوێستا)،لە ئەنجامی ئەو هەولاّنەدا توانیویانە لە چوارچێوەی رازی دەماودەمی پەرت و بلاّو دەریبهێنن[3].

12 (عەلائوددینی سەجادی) نووسیویەتی: لەبندەست تەعالیمی ئاوێستاوە سۆراخی هەندێك لەپادشاکانی کۆنی فارس وەکو (دارا)،لەسەر تەختەبەردەکانی (ئەستەخەر) ماوەتەوە،ئەدەبەکەی ئەویش هەرتێکڕای ئەدەبی ئایینییە و هەموو رووڵە (ئاهورامەزدا) دەکاتەوە[4].

13 (محەممەد بەهائوددین مەلا صاحب) نووسیویەتی: ئاوێستای کۆن بەشێوەی هەورامی نووسراوەتەوە،لەنامەخانەی گشتی تارانـدا چەند لاپەڕەیەك لەئاوێستا تائێستاش

---

[1] (عەبدولڵا موبلیغی ئابادانی)، مێژووی ئاینی زەردەشت، وەرگێڕانی وریا قانیع لاپەڕە (66).

[2] لێرەدا پێویستە باس لەوە بکەین (زەند) بریتیە لە کتێبی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی ئاوێستا،لەسەردەمی ساسانییەکاندا بەزمانی پەهلەوی نووسراوە،(پازەند)یش لێکۆڵینەوەی کتێبی (زەند)ە بەزمانی پارسی نووسراوە.

[3] (جوزیف طایر)، حكمة الاديان الحية، ترجمة (المحامی حسين الكيلانی)،مراجعة (الاستاذ محمود الملاح).

[4] (عەلائوددینی سەجادی)، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، لاپەڕە (649).





ماون،هەرلە درێژەوی نووسینەکەیدا لیستێکی بەراوردکاری لەنێوان زمانی ئاوێستا و هەردوو شێوەزمانی هەورامی و سۆرانی خستووەتەڕوو،ئاماژەشی بەوەکردووە ئەو لیستەی بەدەستکارییەوە لە (کتێبی زەردەشت)ی مامۆستا شاکر فەتاح وەرگرتووە[لمجلج].

14 (ئیرەجی بەهرامی) نووسیویەتی: لەسروودە کۆنەکانی ئەو ئاوێستایەی لەبەردەستدایە،سروودێك هەیە کە ستایشی (میهر) دەکات و کۆمەڵێك سیفەتی گەورەی داوەتەپاڵی،لەستایش و پەرستندا لەپایەی (ئاهورامەزدا)دایە[لجلجلج].

15 (محەممەد رەسوڵ هاوار) نووسیویەتی: دەربارەی پەیوەندی زمانی ئاوێستا لە گەڵ هەردوو زمانی (سانسکریتی و پارسی)،خوالێخۆشبوو (تۆفیق وەهبی) جارێك بۆی باسکردم: ئەوانەی لەو سەردەمەدا بەسانسکرسیتی و پارسی کۆن دواون زمانەکانیان زۆر لەیەکەوە نزیکبووە،بەڵام سەیر ئەوەیە هەر پاش شەشسەد بۆ حەوتسەد ساڵ،ئەو سێ زمانە لەیەتری دوور کەوتوونەتەوە،لەکاتێکدا پێشتر زۆر لەیەکترەوە نزیك بوون،هەرچۆن ئەمڕۆ (رووسەکان و پۆڵۆنییەکان) لەیەکتری دەگەن،ئەوسا ئەوانیش وابوون[لحلجلج].

16 (هادی بەهمەنی) نووسیویەتی: ئاوێستا بەیەك زمان نووسراوە،بەڵام ئەو زمانە سی چوار زاراوەی هەیە[لخلجلج].

17 (قانیعی شاعیر) پێیوابووە ئاوێستا کتێبی یەزدانییە و بۆ زەردەشتی پێغەمبەر بە هەورامی نێردراوە،لەم بوارەدا فەرموویەتی:

کتێبی زەردەشت کە ئاوێستایە ... وەك باقی کتێب خەڵاتی خوایە
بەزمان هەورامی هاتەسەر بەشەر ... یانی های زەردەشت بووبە پێغەمبەر[برلجلج]

شایەنی باسکردنە لێکۆڵینەوەکانی بواری (ئاوێستا ناسی) هەر لەسەرەتای سەدەی بیستەمی زایینییەوە گەرم و گوڕییەکی بەرچاویان بەخۆوە بینیوە،ژمارەیەکی زۆر لە

[لمجلج] (محەممەد بەهائوددین مەلا صاحب) پیرشالیاری زەردەشتی لاپەڕە (13).

[لجلجلج] (ئیرەجی بەهرامی) اسطورة اهل حق ل (62 63).

[لحلجلج] (محەممەد رەسوڵ هاوار) کورد و باکووری کوردستان لەسەرتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان ل (81).

[لخلجلج] (هادی بەهمەنی) پەیامی هەورامان بەرگی یەکەم ل (347).

[برلجلج] بڕوانە (دیوانی قانیع) شیعری لەگەڵ شاخی هەوراماندا ل (348) کۆکردنەوەی (بورهان قانیع).

(زمانناسان،بیریاران،خۆرهەڵاتناسان) بەو بوارەدا شۆڕبوونەتەوە،بۆنموونە ناوی ئەمانەی خوارەوەیان دەهێنین:

(هەرتل،یونکر،هۆساخ) لە ئەڵەمانیا.

(بیلی،گرۆشیج) لە بەریتانیا.

(دۆزیل،بنۆنیست) لە فەرەنسا.

(کۆریلویچ) لە هەنگاریا.

(کریستنسن،بار،مۆرنگشترین) لە وڵاتانی ئەسکەندناڤی.

(ئەنکساریا،تاوادیا،تاراپۆرید،کەنگا،دەهابر) و چەند بیریارێکی تری فارس لە هیندوستان.

(سمیث) لە ئەمەریکا.

(فریمان،ئابایف) لە یەکێتی سۆڤێتی پێشوو.

لە کاتێکدا ئەم بیریارانەی ناومانهێنان لە دەرەوەی ئێراندا دەربارەی ئاوێستا سەرقاڵی لێکۆڵینەوەکانیان بوون،کەچی لە وڵاتی ئێران هەتاکو دەرکەوتنی لێکۆڵینەوەکەی (ئیبراهیم پورداود) بەناوی (ئەدەبیانی مەزدەیسنا)کە لەوڵاتی (هیندوستان)دا بۆ یەکەمجار بڵاویکردۆتەوە لەم بارەوە شتێك ئەنجامنەدراوە.[*]

(ئاوێستا) دەکرێت بەچەند بەشێکەوە یان بەمانایەکی تر دەکرێت بەچەند کتێبێکەوە،سەبارەت بە ژمارەی بەشەکانەوە جیاوازیی لەنێوان (لێکۆڵەران،ئاوێستاناسان،زمانناسان)دا هەیە،لەم بوارەدا هەندێك سەرچاوە باس لەوەدەکەن کە (ئاوێستا) پێنج بەشە بەم ناوانە:

1- یەسناکان: بەپێی ئەو سەرچاوانە ئەم کتێبە (72) بەندە،کۆنترین بەشی ئاوێستایە و سروودەکانی زەردەشتی تێدا تۆمارکراون کە بریتین لە (17) سروودی رێك و پێك،هەم لەرووی زمان و هەم لە رووی هۆنینەوەوە.

2- یەشتەکان: بریتییە لە (21) بەند، باس لەستایشکردن و پێشکەشکردنی قوربانی دەکات.

---

[*] بڕوانە کتێبی (ئاوێستا) بەرگی یەکەم- لاپەڕە (51) تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی (د. جلیل دوستخواه).

3 ویــسپەڕد= ڤیــسپەڕد: بریتییــە لــە (24) بەنــد و بــاس لــە گــەورە پیــاوانی دینــی زەردەشتی دەكات.

4 وەندیداد= ڤەندیدات: بریتییە لە (2) بەند و باس لە یاساكانی دژی (دێو) دەكات.

5 وردە ئاوێستا: هەموو نزا و پاڕانەوەكانی ڕۆژانەی زەردەشتییەكانی تێدایە[یرلجلج].

لـە هەنـدێك سەرچاوەی تریـشدا هـاتووە،كتێبی (ئاوێـستا) شـەش بەشـە بـەواتای شـەش كتێبە بەم ناوانە:

1 یەسنا: بەمانای نیایش دێت و (72) بەشە.

2 گاتاكان: بەشیعر هۆنراونەتەو و وتە فەلسەفییەكانی زەردەشتییان لە خۆگرتووە .

3 یەشـتەكان: سـتایش و نیـازە و بریتییـە لـە (21) بـەش ،وادێتـە پێشـچاو بەشـێكیان پەیوەندییان بە پێش زەردەشتەوە بێت.

4 ویسپەڕد: بریتییە لە (24) بەش و (وێردی گشتیاران)ی پێدەوترێت.

5 وەندیداد: بەواتای (یاسای دژی دێو= دێوبەند)،ئەم كتێبـەیان پەیوەنـدی بەسـەدەكانی پێش زەردەشتەوە هەیە.

6 خوردە ئاوێستا: بریتییە لە دۆعای ڕۆژانە،زۆربەیان لەلایەن (مووبد)ەكانی سـەردەمی ساسانیدا كۆكراونەتەوە و ئەندێشەكانی ئەو سەردەمە و پێشتریشیان لە خۆگرتووە[سملجلج].

لـە هەنـدێك سەرچاوەدا هـاتووە ئـەو (ئاوێـستا)یـەی ئێـستا هەیـە ئاوێـستای سـەردەمی ساسانییەكانە كە كۆكراوەتەوە و زۆر بیری پڕوپووچی تیكەڵبووە،بریتییە لە شـەش بـەش بـەم ناوانە:

1 گات 2 یەسنە 3 یەشت 4 ویسپەڕد 5 ڤەندیدات 6 گچكە= خوردە ئاوێستا.

وەك باویشە گاتـەكان بەبەشـێك لـە (یەسـنە) دادەنرێن،پاشـان ئاوێـستاناسان گاتـەكانیان لەناو (یەسنە) دەرهێناون[شملجلج].

لەسەر ڕۆشنایی كتێبی (ئاوێستا)ش بەشەكانی ئەم كتێبە بەم شێوەیەن:

---

[یرلجلج] (عباسی قدیانی) تاریخ ومذاهب در ایران).

نووسـەری ئـەم كتێبـە بەهەڵـەدا چـووە چـونكە (هـات)ەكـانی ئاوێـستای بـە(بەنـد) لەقەڵەمـداوە لەكاتێكـدا هـەر (هات)ێكی ناو سروودەكان خۆی لە خۆیدا چەند بەندێكە. (ئەیوب)

[سملجلج] (عەبدولاَ موبلغی ئابادانی) مێژووی ژیانی زەردەشت وەرگێڕانی (وریا قانیع) چاپی دووەم لاپەڕە (69).

[شملجلج] (هادی بەهمەنی) پەیامی هەورامان بەرگی یەكەم لاپەڕە (347،346).

کتێبی یەکەم گاتاکان: بریتییە لە 17 (هات[*]) و لەدوو توێی پێنج سروودان بەم ناوانە:

سروودی یەکەم بەناوی (ئەهونودگا=ئەهونەڤەدگا):

بریتییە لە (7) هات، (لە هات)ی 28–34.

سروودی دووەم بەناوی (ئوشتەوەدگا= ئوشتەڤەدگا):

بریتییە لە (4) هات ،لە (هات)ی 43–46.

سروودی سێیەم بەناوی (سپیەتمەندگا= سپەنتەمەیمۆ)

بریتییە لە (4) هات،لە (هات)ی 47–50.

سروودی چوارەم بەناوی (وهوخشتەرگا=ڤەهوخشتەر):

بریتییە لە (1) هات کە (هات)ی (51)یەمینــە.

سروودی پێنجەم بەناوی (وەهیشوایشت گا=ڤەهیشتۆیەشت):

بریتییە لە (1) هات کە (هات)ی (53)یەمینە.

کەواتە کۆی هاتەکان= 7+ 4+ 4 +1 +1= 17هات[**].

لە خوارەوە دەقی بەندی یەکەم لە (هات)ی ژمارە (28) بە زمانی ئێستامان دەخەینە ڕوو:

(ئەی ئاهورامەزدا،ئەی سپەندمینۆ،لە کاتێکدا دەستەکانم بەرە و تۆ بەرزدەکەمەوە،داواکارم ئەم دنیایە پڕبکەیت لە خۆشی و شادی).

کتێبی دووەم یەسناکان: ناوی یەسنا لە ریشەی (یەزد= یەزت)ەوە وەرگیراوە،ئەم کتێبە بریتییە لە (72 هات) بەڵام (17هات)ی بەناوی گاتاکانەوە لێدەرهێنراوە و (55) هاتی ماوەتەوە،لەناو کتێبی (یەسنا)کاندا گەلێك بنەمای گرنگی دینی زەردەشتی بەرچاودەکەون،یەکێك لەوانە شایەتومانی زەردەشتییە.

---

[*] (هات= هائیتی) وەك لەهەندێك بەشی ئاوێستادا ئاماژەیپێکراوە بە واتای (پەیوەند)ەوە هاتووە. (ئەیوب)

[**] بڕوانە کتێبی ئاوێستا بەرگی یەکەم (دفتر یکم –گاهان لاپەڕە (8 بۆ 87) تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی (د. جلیل دوستخوا).





کتێبی سێیەم/ یەشتەکان: یەشتەکانیش لەبەشە گرنگەکانی (ئاوێستا)ن،ژمارەیان (21) یەشتە،بە شێوەیەکی گشتی بریتین لە (931) بەند،وشەی (یەشت) بە واتای (قوربانی،یاخود خێر) دێت،یەشتەکان دەربارەی ستایشی فریشتەکان دەدوێن و هەر یەکێکیشیان لە کاتێکی تایبەتدا دەخوێنرێتەوە،هەر بۆ نموونە (فەروەردین یەشت)،لە رۆژی نۆزدەی مانگی فەروەردین بەرامبەر بە نۆزدەی مانگی خاکەلێوەی کوردی دەخوێنرێتەوە،هەروەها (میهر یەشت)،لە رۆژی شانزەی مانگی میهر بەرامبەر بە رۆژی شانزەی مانگی رەزبەری کوردی دەخوێنرێتەوە،یەشتەکان بەشێوەیەکی گشتی ئەمە ناوەکانیانن:

(هورمزد یەشت، خورداد یەشت، ماە یەشت، میهر یەشت، فەروەردین یەشت، زامیاد یەشت، حەوت ئەمشاسپندان، ئابان یەشت، تیر یەشت، سروش یەشت، بەهرام یەشت،ئوردیبەهێشت یەشت،خورشید یەشت،گوش یەشت،ئەشن یەشت،رام یەشت،ئەشناد یەشت، وەندید یەشت)[ﻟﺢﻟﺢﻟﺢ].

کتێبی چوارەم/ وەندیداد= ڤەندیدات: ئەم کتێبە (22) بەشە و (846) بەندە،ناوەکەی بەئاوێستایی (ڤیدە ئەیوەدان)ە بە واتای یاسای دژی دێو،باس لە دنیای (ترس،شەیتان، جنۆکە، دێو ودرنج، جادووگەری) دەکات کەئەمانە هەموویان لای زەردەشتییەکان کرداری خراپە پیادە دەکەن و سەربە لەشکری تاریکین،هەر کارێك بەرێکوپێکی ئەنجامنەدرێت یاخود بەدڵی پیاوە رۆحانییەکانی زەردەشتی نەبێت، ئەوە دێو و شەیتان لەوێ خۆیان مەڵاسداوە و ئامادەی هێرشهێنانن،بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی لەو هێرشانە بپارێزێت، پێویستە لەسەری (وێرد)بخوێنێت، هەروەها گیانلەبەری زەرەرمەند بکوژێت[ﻟﺢﻟﺢﻟﺢ].

کتێبی پێنجەم/ ویسپەرد= ڤیسپەرد: بریتییە لە (24) کردە و (62) بەندە،لەم کتێبەدا سنووری خواپەرستی بۆ مرۆڤێکی سادە دیاریکراوە،هەر بۆنموونە لە (بەندی یەکەم/ کردەی چوارەم)دا باس لەچۆنییەتی پاداشتدانەوەی چاکەکاران دەکات، بەوەی ئاهورامەزدا بەرامبەر چاکەکانیان پاداشتی گەورەیان دەداتەوە[ﻟﺦﻟﺢﻟﺢ].

---

[ﻟﺢﻟﺢﻟﺢ] (عەبدوڵا موبلغی ئابادانی)/ مێژووی ژیانی زەردەشت/ وەرگێڕانی وریا قانیع/ چاپی دووەم/ لاپەڕە (67،77).
[ﻟﺢﻟﺢﻟﺢ] (هادی بەهمەنی)/ پەیامی هەورامان /بەرگی یەکەم/ لاپەڕە (383).
[ﻟﺦﻟﺢﻟﺢ] بڕوانە کتێبی (ئاوێستا)/ بەرگی دووەم/ لاپەڕە (531) تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی (د.جلیل دوستخواە).

کتێبی شەشەم‌ ورده ئاوێستا=گچکه ئاوێستا: ئەم بەشەیان لە لایەن (مووبد)ی بەناوبانگ (ئازەر پادمازاسپند)ەوە کۆکراوەتەوە،بریتییە لەباسوخواسی (نزا و پاڕانەوە،نوێژ،جەژنە دینییەکانی زەردەشتی،ڕێوڕەسمی ژنهێنان،مردن،ڕۆژانی خۆشی و ناخۆشی،کەفارەتی تاوان).

## ئاوێستا چۆن کۆکراوەتەوە

هەندێك لە بۆچوونەکان لەسەرئەوەیەکدەنگن کە (ئاوێستا) هەتاکو سەدەی شەشەمی زایینی وەچە پاش وەچە گوێزراوەتەوە،مێژوونووسە ئیسلامەکانیش باسی ئەوەیان کردووە کە (ئاوێستا) لەسەر (12 هەزار پێستەگا[*]) بەئاوی ئاڵتوون بەچوار (وێنە= نوسخە) نووسراوەتەوە،یەکێك لەو وێنانە لە (ئاتەشگەی ئازەرگوشەسپ) و دووەمیان لە (تەختی جەمشید) و یەکێکیشیان لە (ئاتەشگەی بەڵخ)دا بووە،ئەو وێنەیان لە (ئاتەشگەی بەڵخ)دا بووە لەکاتی هێرشی توورانییەکان بۆسەر ئەوێ و کوشتنی زەردەشت لەهەمان شوێندا،بەدەستی توورانییەکان لەناوچووە،وێنەکەی (تەختی جەمشید)یش بەدەستی لەشکری ئەسکەندەری مەکدۆنی= ئەسکەندەری فەیلەقووس) سووتێنراوە. ئاشکرایە یۆنانییەکان بەدرێژایی دەسەڵاتیان لەوڵاتی (ماد)دا دینێکی بتپەرستیان سەپاندووە،بەڵام کە ساسانییەکان دەسەڵاتیان گرتووەتەدەست و لەنێوان ساڵەکانی (226ز – 636ز) حکومڕانییانکردووە،دینی زەردەشتیان بووژاندووەتەوە و ڕۆحانییە زەردەشتییەکانیش کەوتوونەتە هەوڵی کۆکردنەوەی ئاوێستا،بەپێی هەندێك بۆچوون ئەو هەوڵانە ماوەی شەش سەدساڵ لەچەند قۆناغێکدا بەردەوامبوون،بەم شێوەیە:

1 حەسەنی پیرنیا نووسیویەتی: (بلاش)ی پاشای ئەشکانی هەوڵی کۆکردنەوەی ئاوێستای داوە،بەڵام ئاشکرا نییە لەو هەوڵەدا سەرکەوتوو بووبێت،یان نا،لەدرێژەی

---

[*] لە نووسینە زەردەشتییەکاندا هاتووە،ئاوێستا لەسەر پێستی (دەهەزار گا) بەئاوی ئاڵتوون نووسراوەتەوە. بڕوانە کتێبی ئاوێستا بەرگی یەکەم،لاپەڕە 14،تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی (د.جەلیل دۆستخواە).





نووسینەکەدا هاتووە پێدەچێت ئەو پاشا ئەشکانییە (بلاشی یەکەم) بووبێت[1]،هەرلەم بوارەدا (عەلائوددینی سەجادی)ش هەمان دەربڕینی دووبارە کردووەتەوە.

هەندێك لەسەرچاوە مێژووییەکان قسەیان لەسەر ئەوە کردووە گوایا (بلاشی پێنجەم) کە لەساڵی 208ز پاش مردنی باوکی حوکمڕانیی دەوڵەتی ئەشکانی گرتووەتە دەست[2]،هەوڵی کۆکردنەوەی ئاوێستای داوە و یەکێك لە موغەکانی بەناوی (zadspiam)[3]راسپاردووە بۆ ئەوەی بەو ئەرکە هەڵبسێت.

2. ئەردەشێری بابکان = ئەردەشێری یەکەم کە دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانییە،هەر لەسەرەتای دەستبەکاربوونییەوە لەسەر تەختی حوکمڕانیی هەوڵی کۆکردنەوەی ئاوێستای داوە،ئەو ئەرکەشی سپاردووە بە ئەنجومەنێکی گەورە لەرۆحانییە زەردەشتییەکان لەژێر سەرپەرشتی (تەنسر = تەنەسور)ی موبدان موبد[4] = گەورەی موبدەکان،لەو بوارەدا تەنسر سەفەری یۆنانی کردووە و ئەو ئاوێستایەی گوایا (ئەسکەندەری مەکدۆنی) لەکاتی هێرشەکانیدا بۆ سەر ئێران ناردوویەتی بۆ یۆنان،لەگەڵ خۆیدا هێناویەتییەوە بۆ ئێران[5].

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین ئەردەشیری بابکان ساڵی (220ز) لە ئەشکانییەکان یاخیبووە،بەپێی زۆربەی سەرچاوەکان ساڵی 226ز توانیویەتی بەسەر (ئەردەوان)ی پادشای ئەشکانیدا سەربکەوێت[6].

3. شاپووری یەکەم کوڕی ئەردەشێر،کە لەساڵەکانی 242-272ز حوکمڕانیکردووە،فەرمایداوە کۆمەڵێك بابەت کە پەیوەندییان بەدینەوە نەبووە و باسیان لە

---

[1] (موشیر ئەلدەولە حەسەنی پیرنیا)، تاریخ ایران باستان – جلد 3، ص (2351).

[2] (عەبدولعەزیمی رەزائی)، تاریخ دەهزار سالە ایران –جلد ( 1)ص (298).

[3] (هادی بەهمەنی)، پەیامی هەورامان – بەرگی یەکەم،ل 352.

[4] موبدان موبد: سەردار و رێپیشاندەری دینی و ئاراستەکاری رۆحی پادشاکان بوە،هاوکات راوێژکاربووە لەهەموو کاروبارە دینییەکاندا و دامەزراندن و وەلاخستنی هەموو کارمەندە دینییەکانی لەئەستۆدا بووە،بەشداری هەموو ئەو ئەنجومەنانەی کردووە کە وەك دادگای پشکنین بۆچارەسەرکردنی کێشە دینییەکان لەهەموو هەرێمەکانی حوکمڕانیی دەوڵەتدا دروستکراوون.

[5] (عەبدولاّ موبلغی ئابادانی)، مێژووی ئاینی زەردەشت، وەرگێڕانی (وریا قانیع)، چاپی دووەم، ل72.

[6] (موشیر ئەلدەولە حەسەنی پیرنیا)، تاریخ ایران باستان – جلد ( 3)، ص (2218).

زانستەکانی (پزیشکی،ئەستێرەناسی،لاهوت) کردووە بخرێنە ناو ئاوێستاوە و بکرێن بەپاشکۆیەك بۆی[لجلخلج].

4ٌ شاپووری دووەمی کوڕی هورمز لەسەردەمی حوکمڕانیی خۆیدا و بەمەبەستی ڕێگەگرتن لەناکۆکییە دینییانەی هەتا ئەو سەردەمەش بنەبڕ نەکراوون،فەرمانیداوە سەرلەنوێ بۆجارێکی تر ئاوێستا نووسراوەتەوە و نوێکراوەتەوە،ئەو ئەرکەشی سپاردووە بە ئەنجومەنێکی ڕۆحانی بەسەرپەرشتی موبەدان موبد (ئازەر میهر ئیسپەندان)[لخلخلج].

لەهەندێك سەرچاوەدا هاتووە گوایا عەباسییەکان لەسەردەمی حوکمڕانیی (مەئموونی کوڕی هارون ئەلڕەشید)دا و بەفەرمانی خودی مەئموون،کەسێکیان بەناوی (ئازەر فرەنبەغ) ڕاسپاردووە بۆ کۆکردنەوەی ئاوێستا،(ئیبن نەدیم) باسی گرنگی ئەو کتێبەی کردووە کەلەو سەردەمەدا کۆکراوەتەوە و وتوویەتی: ناوی (ژیاننامە) بووە،لە دەبەرگ پێکهاتووە[لخلخلج].

یەکێك لە پیاوەدینییەکانی مەسیحی بەناوی (فرانس نۆ= francois nau)،لە گۆڤاری (مێژووی ئایینەکان= revue de Ihistoire religions) بەرگیٌ95ٌلاپەڕە (149ٌ199) سالّی (1927ز)دا،وتارێکی دەربارەی دەستاودەستکردنی (ئاوێستا) بە پشتبەستن بە سەرچاوە نەصرانییەکان بلاّوکردووەتەوە و نووسیویەتی:

دەقە پیرۆزەکانی (مەزدی) هەر لەسەرەتاوە هەتاکو سەدەی حەوتەمی زایینی تەنها لە ڕێگەی دەماو دەمەوە بۆ نەوەکان گوێزراونەتەوە و زەردەشتییەکان تا دوارۆژەکانی حوکمڕانی (دەولّەتی ساسانی) کتێبی دینی نووسراویان نەبووە،لەو سەردەمەدا پیاوە ڕۆحانییەکانی زەردەشتی ترسی ئەوەیان لێنیشتووە راز و سەرگوزەشتە دینییەکانیان بفەوتێن،بۆیە (ئاوێستای ساسانی)یان نووسیوەتەوە،وشەی (ئاوێستا)ش کە پێشتر لەسەدەکانی پێنجەم و شەشەمی

---

[لجلخلج] (آرثر كريستنسن)ٌ ايران فی عهد الساسانينٌ ترجمة يحيى الخشابٌ مراجعة عبدالوهاب عزامٌ ص (130).

[لجلخلج]هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل131.

[لخلخلج] بڕوانە کتێبی (پەیامی هەورامان – بەرگی یەکەم)ٌ ل 352و پەراوێزی هەمان لاپەڕە،نووسینی (هادی بەهمەنی).





زایینیدا بەکارهێنراوە لەو سەردەمەدا مانای کتێبی دینی نەگەیاندووە و بە مانای (یاسا) بەکارهێنراوە[1].

لەسەر رۆشنایی هەندێك لەسەرچاوەکان،کتێبی ئاوێستای سەردەمی حوکمڕانیی هەخامەنشییەکان زۆر گەورە بووە و لەهەزار بەش پێکهاتووە،فیردەوسی لەشانامەکەیدا باسی ئەوەیکردووە کە ئاوێستا لە (1200) بەش پێکهاتووە،لەرۆژگاری ساسانییەکاندا تەنها (348) بەشی ماوەنەتەوە،لەم بوارەدا پرۆفیسۆر کریستنسن نووسیویەتی: ئاوێستا لەم رۆژانەدا تەنها کەمێکی ماوە ئەوەی لەبەردەستدایە کورتەیەکە لە کتێبی حەوتەم و هەشتەمی (دینکەرد) کە لەدەقە پەهلەوییەکانە و لەسەدەی نۆیەمی زایینیدا کۆکراوەتەوە،ناوەرۆکەکەشی تەنها باسی خواپەرستی ناکات،بەڵکو بریتییە لە (ئەنسکلۆپیدیا)یەك هەموو زانستەکانی تێدان[2].

کتێبی (دینکەرد) هەروەك ئاوێستا پیرۆزە و لەسەردەمی ساسانییەکاندا کۆکراوەتەوە،لەلایەن یەکێك لە رۆحانییە گەورەکانی زەردەشتییەوە نووسراوەتەوە،هەرلەم بوارەدا دەوترێت دەستنووسێکی کۆنی ئەم کتێبە کە مێژووەکەی بۆ زیاتر لە (600) ساڵ دەگەڕێتەوە و ناوی (بەهمەن یەشت)ە،ئێستا لەکتێبخانەی شاری (کۆپنهاگن)دا پارێزراوە،ئەو دەستنووسە بەدەستی خانمێك نووسراوەتەوە بەناوی (میهرەبان خان)[3].

بۆ کۆتاییهێنان بەم باسە پرسیارێك خۆی قوتدەکاتەوە بەم شێوەیە:

---

[1] (کریستنسن) لە کتێبی (ایران فی عهد الساسانیین)، لاپەڕە (496)دا دەربارەی ئەم بۆچوونەی (فرانسوا نۆ) نووسیویەتی: تیورەکەی (نۆ) دەبارەی (ئاوێستا) نەگونجاوە و دیارە ناوبراو زۆر بێئاگابووە لەو هەموو باسوخواسانەی پێش ساڵی (1927ز) دەربارەی ئاوێستا بڵاوکراونەتەوە،هیچ هۆیەکی وانییە بمانباتە سەر ئەو بڕوایەی واتێبگەین گوایا ئەوانەی مێژووی دینی زەردەشتیان نووسیوەتە لە سەردەمی ساسانییەکاندا لە دینەکەی خۆیان بێئاگابوون، ئەگەر دەقی نووسراوەی ئەم دینە پێش سەردەمی حوکمڕانی (یەزدەگوردی سێیەم) بڵاونەبونایەتەوە و مەسەلەکە لای زەردەشتییەکان تەنها ئەوە بوایە کە موسڵمانەکان بزانن ئەوان خاوەن کتێبی پیرۆزن،دەبوایە (مووبدەکان) تەنها ئەو شتانەیان بنووسیایەتەو پەیوەستبوون بە خوداپەرستییەوە و خۆیان بە نووسینمەوەی ئەو هەموو زانیاریانەوە سەرقاڵنەکردایە کە باس لە (سروشت و جوگرافیا و مەسەلە یاسییەکان) دەکەن.

بڕوانە کتێبی (ایران فی عهد الساسانیین)، لاپەڕە (495، 496)، تالیف (ارثر کریستنسن)،ترجمة یحیی الخشاب،مراجعة عبدالوهاب عزام.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل131.

[3] (محەممەد ئەمین هەورامانی)، مێژووی رێبازی زمانی کوردی ل (184) لەبلاوکراوەکانی مەڵبەندی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی زانکۆی سەلاحەدین 1990.

**ئایا ئاوێستا کتێبێکی ئاسمانییە یان نا؟**

وەڵامدانەوەی پرسیارێکی لەم چەشنە قسەی زۆر هەڵدەگرێت،بەڵام لێرەدا ئێمە تەنها ئاماژە بەهەندێك دەربڕین و بە تایبەت لەناویاندا بەدەربڕینە ئیسلامییەکان دەکەین،بەم شێوەیە:

سەرچاوە سەرەتاییەکانی ئیسلام جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە زەردەشتییەکان خاوەنی کتێبی پیرۆزن،لە فیقهی ئیسلامیدا زەردەشتییەکان لەریزی یەهودی و مەسیحییەکاندا دانراون،لەرەوشت و سوننەتەکانی پێغەمبەری ئیسلامیشدا (د.خ) چەندین رێنمایی سەبارەت بە زەردەشتییەکان هەن.

هەندێك لە پێشەوایان و کارناسانی (شیعە) لەسەر بنچینەی روونکردنەوەیەکی قورئانی پیرۆز زەردەشتییەکان بەخاوەن کتێب دادەنێن،لەم بارەیەوە ئیمامی شەشەم (جەعفەری صادق) فەرموویەتی: زەردەشتییەکان پێغەمبەرێکیان هەبوو کوشتیان،کتێبێکیشیان هەبوو سووتاندیان.

(ئەصبغی کوڕی بناتە) هاوڕێی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیب (خ.ل) گێڕاویەتیەوە گوایا حەزرەتی عەلی فەرموویەتی: (زەردەشتییەکانە کتێبیان هەبوو پێغەمبەریان بۆ رەوانەکرابوو،من خۆم ئەو کتێبەم خوێدووەتەوە).

(شێخی طوسی) فەرموویەتی: (المجوس کان لهم کتاب ثم رفع عنهم،دلیلنا اجماع الفرقة و اخبارهم).

(ئیبن عەباس)یش فەرموویەتی: پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) فەرمانیداوە (جزیە = سەرانە) لەزەردەشتییەکانی دانیشتووی یەمەن وەربگرن،شتێکی ئاشکرایە (جزیە) لەوانە وەرگیراوە کە خاوەنی کتێبی ئاسمانی بوون وەك یەهود و مەسیحی[سملخلج].

لە کتێبی (تاریخی دەهزار سالە ایران)دا هاتووە: زەردەشت پێغەمبەرێك بووە هەروەکو پێغەمبەرانی تر لەلایەن خواوە بۆسەر بەندەکانی نێردراوە،مەلەکوتی خوایی لەسەر زەوی جێگیر کردووە.

---

[سملخلج] (عەبدوڵا موبلغی ئابادانی) مێژووی ئایینی زەردەشت چاپی دووەم وەرگێڕانی (وریا قانیع) ل (89-90).

هـەروەها پرۆفیـسۆر (رضـوی) لـەکتێبی (پارسـیان اهـل کتابنـد) نووسـیویەتی: (زەنـد ئاوێستا لەرووی راستی و پارێزگاری لەبنەما جێگیرەکانی هەموو دینە ئاسمانییەکان دەسـتوور و یاسای توونـدی هەیە[شملخلج].

## رێورەچەی یارسان لەهەورامانـدا

لەباسـکردنی هـەورامی و هەورامانـدا هـەرگیز ناکرێـت باسـی رێورەچـەی یارسـان فەرامۆشبکەین،چونکە هەم وەك ناوچە و هەم وەك دیالێکت پەیوەندییەکی پتەویان هەیە،بۆیە بـە پێویـستی دەزانـین تیـشکێکبخەینەسەر ئـەم بابەتـە وسـەرەتا لـەوەوە دەستپێدەکەین،ساسـانییەکان هـەر لەسـەرەتاوە لەگـەڵ پیـاوە دیینییـەکانی زەردەشـتیدا یەکیانگرتووە و ئەو یەکگرتنەشیان بووە بە هۆی لەناوچوونی هەموو شوێنەوارەکانی (دەوڵەتی ئەشـکانی) و هـەتاکو کۆتـایی حـوکمڕانی ساسـانییەکان بـەردەوامبووە[لحبرلج]،بـەوەش دیینـی (میترائیزم= مهر پەرستی) کە دیینی رەسمی (دەوڵەتی ئەشکانی) بووە لـە ژێـر فشاری دەوڵەتی ساسانیدا پووکاوەتەوە[لحبرلج]،بەلاَم ژمارەیەك لە پەیڕەوکارانی ئەو دیینە لەناوچـە دوورەدەسـت و شاخاوییەکانی خۆرئاوای ئێران و بەتایبەت (هەورامانی ئێستا)دا توانیویانە لەسەر دیینەکـەیان بمێننەوە،هاوکات هەندێك لەپیاوە دیینییەکانی میترائـی لـە شـوێنەکانی تـرەوە هاتوونەتـە ئـەم ناوچانە و درێژەیان بە دیینەکەیان داوە،لەو سەردەمانەدا ئەگەرچی دیینـی (میترائیـزم) وەچـە پاش وەچـە گوێزراوەتـەوە،هاوکات کەوتۆتـە ژێـر کاریگـەری هەنـدێك لـە دیینـە کۆنـەکانی ئـەو سەردەمانەوە،بە تایبەت (دیینی زەردەشتی،دیینی یەهودی)،لەگەڵ ئەو کاریگەریەشدا کەچی بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان هـەتاکو گەیـشتنی دیینـی ئیـسلام بەوناوچـانە لـە نـاو خەڵکەکـەدا ماوەتەوە،پاش ئەوەی دیینی زەردەشتیش لە ژێر فشاری لەشکرکێشی (ئەسکەندەری مەکـدۆنی) بەهەمان چارەنووسی میترائیـزم چـووە،ئەو کتێبـی (ئاوێـستا)یـەی لـە هەورامانـدا بـووە لـە نـاو خەڵکدا ماوەتەوە و پەیڕەویکراوە،چونکە ئەسکەندەر لە گەڵ هەموو ئەو هەولاَنەی کە داویەتی نـەیتوانیوە بگاتـە شـوێنە سـەختەکانی هـەورامان هـەتا لەوێـشەوە بگاتـە خـودای خۆر،شـتێکی

---

[شملخلج] (عەبدولعەزیمی ڕەزائی)، تاریخ دەهزار سالە ایران – جلد (1)، ص (298).

[لحبرلج] (ارثـر کرستنـسین) ، ایـران فـی عهـد الـساسانیین، ترجمـة (یحیـی الخـشاب)، مراجعـة (عبـدالوهاب عـزام)، ص (130).

[لمجبرلج] (ئیرەجی بەهرامی)، اسطورة اهل حق، لاپەڕە (80).

ئاشکرایە بڕوای دیینی یۆنانییەکان وابووە،کە تەنها لە سەر شاخی هەورامانەوە دەتوانن بە خودای خۆر بگەن.

ستەم و داگیرکارییەکانی ئەسکەندەر و هەوڵدانی بۆ جێگیرکردنی دیینەکەی خۆی لە ناو خەڵکی ئێراندا،بوونەتە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە موغەکانی زەردەشتی رووبکەنە ئەو ناوچانەی کە تا ئەو دەمانەش هەر لەسەر دیینی (میهر پەرستی) بوون،یاخود زەردەشتی بوون و پەیڕەوی ئاوێستای هەورامانیان کردووە،ئەوەش بووەتە هۆی درووستبوونی تێکەڵاوییەکی تەواو لە ناو خەڵکە نیشتەجێکەی هەورامان و ئەوانەی لە ناوچەکانی ترەوە هاتوونەتە ناویانەوە،لە رووی دینیشەوە چەند خاڵێکی هاوبەشیان لە نێو خۆیاندا دۆزیونەتەوە،وەك ئەوەی هەردوو لایان رووناکیان بە پیرۆز زانیوە و بە نووری خودایان لە قەڵەمداوە،لەوەشەوە کە (میترا) لای زەردەشتییەکان سەرداری ئەو فریشتانەیە کە لە سەر پردی (جینوەت) دادگایی رۆحەکان دەکەن،لێکچوونێکیشیان لە نێوان (میترا و زەردەشت)دا دۆزیوەتەوە. ئیتر رۆژ لە دوای رۆژ دینێکی هەمۆجین لە پێکهاتەیەکی زۆری زەردەشتی و کەمی میترایی لە هەوراماندا درووستبووە،لەسەردەمی لەشکرکێشییەکانی دەوڵەتی ئیسلامیشدا بۆ سەر قەڵەمڕەوی (ساسانییەکان[لجبرلج])،جارێکی تر لێشاوی پەنابردنی موغەکانی زەردەشتی بۆ هەورامان

---

[لجبرلج] ساسانییەکان: لە ساڵەکانی دوادوای سەدەی دووەمی زایینیدا (ساسان) کە یەکێکبووە لە رۆحانییە نەجیبزادەکانی (فارس) و لە شاری (اسطخر)دا ژیاوە،لە بواری پارێزگاریکردن لە دابونەریتە دینییەکاندا ناوبانگییەکی زۆری پەیداکردووە،هەر ئەو ناوبانگی پەیداکردنەش بووە بەهۆی ئەوەی رۆژ لە دوای رۆژ دەسەڵاتی زیادیکردووە و خەڵکێکی زۆر گوێڕایەڵیبوون،پاش کۆچی دوایی (ساسان) کوڕێکی بە ناوی (بابەك) بووە بە جێنشینی و توانیویەتی لە رێی کوودەتایەکەوە دەسەڵات لە دەستی (گوتچهیر)ی میری (بەرزنگیان) دەربهێنێت.

کوڕی دووەمی (بابەك) بە ناوی (ئەردەشێر) ساڵی (226ز) توانیویەتی (ئەردەوانی پێنجەم)ی پادشای (پورث=پارت= ئەشکانی) بکوژێت و کۆتایی بەحوکمڕانی ئەشکانییەکان بهێنێت،لەوێوە ئیتر لەسەر تەختی حوکمڕانی دانیشتووە و بووە بەسەر دەستەی پادشایانی دەوڵەتی ساسانی،پاش ئەردەشێری بابکان کوڕەکەی بەناوی (شاپوور) لەسەر تەختی حوکمڕانی دانیشتووە،پادشای ناوبراو زۆر هەڵیداوە هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتەکەی ئاوەدانبکاتەوە ،بەشێوەیەکی گشتی زنجیرەی پادشایانی ساسانی بەم شێوەیە بووە:

(ئەردەشێری بابکان،شاپووری یەکەم،هۆرمزدی یەکەم،بارامی یەکەم،بارامی دووەم،بارامی سێیەم،هۆرمزدی دووەم،ئازەرنەرسی،شاپووری دووەم،ئەردەشێری دووەم،نەرسی،شاپووری سێیەم،بارامی چوارەم، یەزدەگوڕدی یەکەم،بارامی پێنجەم،یەزدەگوڕدی دووەم،هۆرمزدی سێیەم،فەیرۆز،بلاش= وڵخش،قوبادی یەکەم،خەسرەوی یەکەم= ئەنۆشیروان،هۆرمزدی چوارەم،خوسرەوی پەروێز،قوبادی دووەم،ئەردەشێری سێیەم،یەزدەگوڕدی سێیەم).

**دەستپێکردووەتەوە،خەڵکی ئەو ناوچەیەش لەلایەکەوە بەهۆی کاریگەری دیینی زەردەشتی لەسەریان و لەلایەکی تریشەوە بەهۆی ترسیان لە بڵاوبوونەوەی دیینی ئیسلام باوەشیان بۆ کردوونەتەوە،هەورامان هەرێمێك بووە بە ئازادی (دینی زەردەشتی) تێدا پەیڕەویکراوە. کە دیینی ئیسلامیش باڵی بەسەر زۆربەی ناوچەکاندا کێشاوە،خەڵکی ئەو ناوچانەی پەیڕەوکاری دینە هەمۆجینەکە بوون کە پێشتر ئاماژەمانپێدا،هەوڵیانداوە جۆرە پێکهاتنێك لە ناو دیینی کۆنیان و دیینی تازەدا بکەن[لخبرلج]،ئیتر بەو شێوەیە بتوانن دیینی کۆنیان بژیێننەوە،لە چوارچێوەی ئەو هەوڵانەدا کەسێتی (حەزرەتی عەلی) بووە بە جێنشینی (میترا= میهر[لخبرلج])،ئەو**

---

دەوڵەتی ساسانی یەکێکبووە لە دەوڵەتە هەرە بەهێزەکانی خۆرهەڵات و خاوەنی ژیار و شارستانێتێکی پێشکەوتوو بووە،چەندین شوێنەواری سەردەمی ساسانی گەواهی ئەم راستیە دەدەن،هەر بۆ نموونە نەوەك سەرژمێر ناوی ئەمانەیان دەهێنین:

1ـ دیواری ساسانی،فەرهاد تراش،پردی خوسرەو لە بێستوون.

2ـ پەیکەری تاج لەسەرنانی خوسرەوی پەروێز،پەیکەری تاج لەسەرنانی ئەردەشێری دووەم،دیواری خوسرەو لە تاقەوسان.

3ـ تەلاری خوسرەوی لە قەسری شیرین.

4ـ قەڵای سەرماج 5ـ کۆشکی باتاق لە دەربەندی باتاق 6ـ پەرستگەی ئەناهیتا.

ساسانییەکان بە درێژایی (428) ساڵ حوکمڕانییانکردووە،زمان و نووسینی رەسمی دەوڵەتەکەیان (پەهلەوی فارسی )بووە،نازناوی حوکمڕانی پاشاکانیشیان (کیسرا)بووە،شکستە یەك لە دوای یەکەکانی لەشکری ساسانییەکان لەبەردەم لەشکری ئیسلامدا لە جەنگی گەورەی (قادسیە) لە ساڵی (14ك=635ز) و دواتر لە جەنگی (جەلەولا) و (حەلوان) لە ساڵی (16ك=637ز) و دواجار لە جەنگی نەهاوەند لە ساڵی (21ك=641ز)دا بووە بە هۆی هەرەسهێنانی دەوڵەتەکەیان و بڕانەوەی زنجیرەی حوکمڕانییان.

[لخبرلج] لەم بوارەدا (محەممەد ئەمین زەکی بەگ) نووسیویەتی: خەڵکی کوردستانی خۆرلاهەڵات لە خۆرئاوای (هەرات)ەوە لە پێش سەرهەڵدانی ئیسلامدا بیروباوەڕەی سەیریان هەبووە،پاش ئەوەی دیینی ئیسلامیان وەرگرتووە وازیان لە باوەڕی کۆنیان نەهێناوە،بەڵام هەندێك گۆڕانیان تێداکردووە،خەڵکی (ئەرنیل) لە کوردستانی خۆرهەڵاتدا کاتێك کە بوون بە موسڵمان بە (ئالوهییەتی حەزرەتی عەلی) ویستوویانە عەقیدەی پێشوویان زیندووبکەنەوە.

بڕوانە کتێبی (خولاصیەکی تاریخی کورد و کوردستان) –بەرگی دووەم –لاپەڕە (201) نووسینی (محەممەد ئەمین زەکی بەگ)،لە بڵاوکراوەکانی ساڵی 2000 دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

[لخبرلج] دەربارەی پیرۆزی (مهر) لای یارسانەکان چەندین بەڵگە لەبەردەستدان و ئەم شیعرەش کە لە کتێبی (سەرەنجام)دا نووسراوەتەوە یەکێکە لەو بەڵگانە:

نامێما میهرە نامێما میهرە نە قولەی ئەلەست نامێما میهرە

بڕوانە ((ئیرەجی بەهرامی)ـ اسطورة اهل حقـ لاپەڕە (57).

هەولانەش هەر لەسەدەی دووەمی کۆچییەوە لەسەر دەستی (بالوولی ماهی) دەستیانپێکردووە و بنەما سەرەتاییەکانی (ڕێوڕەچەی یارسان) دارێژراون،پاشان لەسەر دەستی (سان سەهاکی بەرزنجی)دا ڕێکخراونەتەوە و بە تەواوی ئاشکراکراون،پاش ئەم پێشەکییە کورتە دەچینە ناو ناوەرۆکی بابەتەکەمانەوە.

(ڕێوڕەچەی یارسان= ئەهلی هەق= کاکەیی= عەلی ئیلاهی) ڕێوڕەچەیەکی دینییەو پەیڕەوکارانی لە کوردستاندا زۆرن،کەچی تائێستا بێجگە لە خۆیان خەڵکی تر ئەوەندە لێی شارەزانین. ئەو ناشارەزاییەش چەند هۆکارێکی هەیە و ئەمانەی خوارەوەش گرنگترین هۆکارەکانییەتی:

1ـ لە چەند هەولێکی کەم نەبێت کە لەلایەن ژمارەیەك لە ڕۆشنبیرانییانەوە بۆ تیشکخستنە سەر چەند لایەنێکی ڕێوڕەچەکەیان دراون،ئیتر یارسانەکان بەشێوەیەکی گشتی لە رووی دینییەوە زۆر گۆشەگیرن و زۆربەی هەرە زۆریان درکاندنی بچووکترین زانیاری دینی بە گوناهێکی گەورە لە قەڵەمدەدەن[*].

2ـ دابڕانێکی جوگرافی گەورە لە نێوانیاندا هەیە،هەڵگرانی ئەم ڕێوڕەچەیە لە (هەرێمی ئیلیزابث پۆل،چەند ناوچەیەکی کافکاس،تورکیا،سووریا،لوبنان) هەروەها لە ئێراق و ئێراندا دەژین،ئەوانەیان لە ئێراقدان لە لە ناوچەکانی (کەڕەکی قەڵم حاجی و گوندی دووشێخ) لەمەندەلی،گوندەکانی ( زەنقەڕ،تۆبزاوا،عەلی سەرای،ناوەندی ناحیەی داقوق) و ناو شاری کەرکووك لە پارێزگای کەرکووك،لەسنووری قەزای خانەقین،لە گوندە شەبەك نشینەکانی سەر بە پارێزگای (موصڵ)[**]،لەهەر سێ گوندی (هاوار،هاوارەکۆن،دەرەتوێ) و کۆمەڵگەی زۆرە ملێی

---

[*] لەم بوارەدا پێویستە ئاماژەبدرێت بە هەوڵەکانی هەریەك لە (سەی قاسمی ئەفزەلی شائیبراهیمی،ماشەڵاّ سووری،حاجی نیعمەتولاّی جەیحون ئاوایی،حاجی نوور عەلی ئیلاهی).

[**] (ئێدمۆندز) ناوی هەژدە گوندی هێناوە لە ناوچەی تاوغ کە کاکەییەکانیان تێدا نیشتەجێن،لەوانە: (ئەلبو سەراج،عەلی سەرای،بنشاخ،دایسی بچووك،تۆبزاوە،محەممەد خاجك،زەنقەڕ،زوغلاّوە...هتد)،هاوکات نووسیویەتی (شەبەکەکان) کاکەیی نیین و قزڵباشی کوردن،بەلاّم ناوی حەوت گوندی هێناوە لەو شوێنەی کە (خازەر) دەڕژێتە (زێی گەورە)ەوە،چواریان لە کەناری لای ڕاست و سیانیشیان لە کەناری لای چەپی زێکەوەن و دەڵێت هەموویان کاکەیین.

بڕوانە سیسڵ جۆن ئێدمۆندزـ (کرد،ترك،عرب) ـ وەرگێڕانی بۆ زمانی عەرەبی (جەرجیس فەتحولاّ)ـ لاپەڕە (178،179).





عەنــەب)ی ســەربە قــەزای (هەڵەبجــە) و لــە قــەزاکانی (شــارەزوور،کەلار) و لــە نــاو شــارەکانی (سلێمانی،بەغداد) نیشتەجێن.

لە ئێرانیشدا لـە (سـنووری پارێزگـای کرماشـان، هەمـەدان، قـەزوین، ئازەربایجـان، کرنـد، دەماوەند)دا دەژین،ئەم دابڕانە جوگرافییـە وایکـردووە لـە سـەردەمە جیاجیاکانـدا بکەونـە ژێـر هەندێك لە بیروباوەڕە دینییەکانی دەوروبەریانەوە[*].

3ٔ ئەو سەرچاوانەی باسیان لە ڕێوڕەچەی یارسان کردووە،جیـاوازی لەنێوانیانـدا هـەن و یەکدەنگییـەك لـە باسـەکانیاندا نییە،کتێبـە پیرۆزەکـانی یارسـان بـۆ نموونـە (سـەرەنجام) بـە هەرشــەش بەشــەکەیەوە وەك (دەورەی حەوتــە وانــە،دەورەی چــل تەن،بارگــە بارگــە،گڵێم و کۆڵ،دەورەی عابدینی جاف،وردە سەرەنجام) و دەفتەرەکانیان وەك (دەفتەری پەردیوەر،دەفتەری سـاوا،دەفتەری دیـوان گـۆرە) و کەلاٚمـەکانیان وەك (کـەلاٚمی سـەی خامۆش،کـەلاٚمی ئێلبـەگی جاف،کـەلاٚمی خـان ئەڵماس،کـەلاٚمی شـاتەیموری بانیارانی،کـەلاٚمی قاصید،کەلاٚمی زولافـەقاری گۆران،کــەلاٚمی حەیدەری،کــەلاٚمی جەناب،کــەلاٚمی موجرم،کــەلاٚمی دەروێــش ئاجاق،کــەلاٚمی دەروێـــش نــــەورۆزی ســــۆرانی) و دەورەکانیـــان وەك (دەورەی بـــالوولی مـــاهی،دەورەی شاخۆشـــێن،دەورەی بـــاوا ســـەرهەنگ،دەورەی باوانـــاوس،دەورەی بـــاوا جـــەلیل،دەورەی شـندروێ،دەورەی پـیر عـالی،دەورەی دامیـار،دەورەی شاوەیسقولی)،هـەروەها ئـەو کتێبانـەی کەلـە لایەن ژمارەیەك لە رۆشنبیرانیانەوە بلاٚوکراونەتـەوە وەك: (دەفتـەری رمـووزی یارسـان)ی سـەی قـاسمی ئـەفزەلی شـائیبراهیمی،(سـروود دینیـی یارسـان)ی ماشـەلاٚ سووری،(اصـل الحـق و برهـان الحـق)ی حـاجی نـوور عـەلی ئیلاهـی،(شـەهنامەی حەقیقـەت)ی حـاجی نیعمـەتولاٚی جـەیحوون ئاوایی،بـە گـشتی جیـاوازی لـە نێوانیانـدا هـەن و نـەیانتوانیوە بەرچـاوروونییەکی تـەواو بـۆ تێگەیـشتن لـەم ڕێوڕەچـەیە بدەنبەدەسـتەوە،تەنانەت لـە مەسـەلەیکی گرنگـی وەك بەسـەرهاتی ژیـانی (سـان سـەهاکی بـەرزنجی= سـوڵتان ئیـسحاقی بـەرزنجی)دا کـە هەنـدێك بـە بنیاتنـەر و هەندێکی تریش بە ڕێکخەرەوەی ڕێوڕەچەکەی دەزانن،جیاوازی بەرچاو هەن.

---

[*] لـەم بـوارەدا (مامۆسـتا محەممـەد ئـەمین هـەورامانی) دەڵێـت: لەسـەردەمی عەباسـییەکاندا سـەر بـە (بابـە خوڕەمەددین) بوون و یارمەتی (حەسەن سەباح)یان داوە،پاشانیش بوون بە یاریدەدەری صەفەوییەکان و بە رواڵـەتی (عەلی ئیلاهی) خۆیان دەرخستووە.

بڕوانە (محەممەد ئەمین هەورامانی)ٔ کاکەییٔ لاپەڕە (32).

هەڵگرانی ئەم ڕێوڕەچەیە سەرەڕای ئەوەی بە (یارسان) ناودەبرێن چەند ناوێکی تریشیان هەیە و بەجیاوازی ناوچکانی نیشتەجێبوونیان بە (ئەهلی هەق،کاکەیی،عەلی ئیلاهی) ناودەبرێن،هەریەك لەم ناوانەش ڕەگوڕیشەی قووڵیان هەیە،لەم بابەتەدا بەکورتی تیشکدەخەینە سەر ئەو ڕەگو ریشانە بەم شێوەی خوارەوە:

1ـ یارسان: سەرەتا پێویستە باس لەوە بکەین ئەم ناوە لە بنەڕەتدا (یاریسان)ە،بەلاَم شتێکی ئاشکرایە لە هەندێك ناوچەی کوردەوارریدا پیتی (ی) کاتێك ئەرکی ئامرازی پەیوەندی هەبێت قووتدەدرێت،هەر بۆنموونە خەڵکی گەرمیان دەڵێن (ماڵ باوکم،کوڕمامم) ناڵێن (ماڵی باوکم،کوڕی مامم)،لێرەوە بۆماندەردەکەوێت (ی) نێوان (یار) و (سان) قووتدراوە و ناوەکە بووە بە (یارسان)،زۆربەی یارسانەکان لەسەر ئەو بڕوایەن ناوی (یارسان) لەوە هاتووە هەرکەسێك لەسەر ئەم ڕێوڕەچەیە بێت (یار) بەمانای (یاوەر)ی سانە،ئاشکرایە (سان[258]) سەردەمێکی دوورودرێژ نازناوی حوکمڕانەکانی هەورامان بووە،هەڵگرانی ئەم ڕێوڕەچەیەش بۆ ڕێزگرتن لەپایەی ڕۆحی (سوڵتان ئیسحاق) پێیانوتووە (سان سەهاك) و خۆشیان ناوی (یارسان) یان بەسەردابڕوە[259].

2ـ کاکەیی: دەربارەی ناوی کاکەیی چەند بۆچوون هەن بەم شێوەیە:

أـ دەوترێت (شێخ موسا و شێخ عیسای بەرزنجی) کە هەردووکیان کوڕی (بابا عەلی هەمەدانی) بوون پاش ئەوەی هاتوونەتە (بەرزنجە) و تێیدا نبشتەجێبوون،ویستوویانە مزگەوتی بەرزنجە نوێبکەنەوە،لەکاتی دارەڕاکردندا یەکێك لە ڕایەڵەکان کورت بووە و نەگەیشتۆتە ئەمسەر و ئەوسەری دیوارەکە، (شێخ عیسا) بە (شێخ مووسا)ی وتووە کاکە

---

[258] دەربارەی بنەڕەتی وشەی سان و بۆچوونەکان لەم بارەوە لە باسی سانەکانی هەورامانـدا قسەی لێوەدەکەین. (ئەیوب)

[259] بەوردبوونەوە لە تێکستە دینییەکانی هەڵگرانی ئەم ڕێوڕەچەیە و هەندێك لە سروودە دینییەکانیان،بەئاسانی بۆماندەردەکەوێت کە ناوی یارسان بە چوار سەدە پێش دەرکەوتنی (سان سەهاك) لەناو شیعرەکانیاندا هەیە،هەر بۆنموونە با لەم دوو دێڕە شیعرەی (موبارە شا= شاخۆشێنی لوڕستانی) کە لە نێوان ساڵەکانی (406ـ 467ك)دا ژیاوەوردببینەوە:

یارسان وەڕا یارسان وەڕا رای هەق راسییەن بڕانان وەڕا
پاکی و راستی و نیکی و ڕەدا قەدەم وەقەدەم تا وەمەنزڵگا

بڕوانە (ئەیوب ڕۆستەم) – یارسان، چاپی یەکەم، لاپەڕە (53).





**موریـدێکی دەسـتکورتبووبێت یارمەتیـداوە، هەرلـەم بـارەوە (مامۆسـتا مـەلا عەبدولکـەریمی مودەڕیس) لە کتێبی (بنەماڵەی زانیاران)دا نووسیویەتی:**

**(شێخ عـەلی حسامووددین دیارترین نـەوەی شـێخ محەممـەد بەهائوددینــــە، لای هـەموو موریدەکانی بـاوکی خۆشەویـستبووە و بـەدڵ ودەروون پێیقـایلبوون، لـە رووی کۆمەڵایەتیـشەوە کەموێنـە و زۆر قـسەزان و زمانپـاراو بـووە، ئەگـەر کتێبێکیش لەسـەرژیانی بنووسـرێت هێـشتا هەرکەمە[ترلحلح]).**

**ئەگـەر بمانـەوێت زیـاتر لەکەسـێتی ئـەم زاتـە ئاگـاداربین، بـا تـەنها لـە زمـانی زانـا و ئەدیبانی کوردەوە سەیرینەکەین، بۆیە لێرەدا پێویستە باس لـەوە بکـەین (ئیدمۆنـدز)ی گـەورە ئەفسەری سیاسی بەریتانی لە ئێراق، کەماوەیەکی زۆریش راوێژکاری وەزارەتـی نـاوخۆی عێـراق بـووە، لـە سـەردەمی حـوکمی مـەلیکی نەخـشێکی دیـاری بـە زۆربـەی رووداوە سیاسـی و سەربازییەکانی ئەو سەردەمەوە هەیە، لە کتێبی (کورد، تورك، عەرەب)دا وتوویەتی:**

**شێخ عەلی حسامووددین کـە لەخانـەقای تەوێڵەدا بـوو، کەسـێکی ژیـر و پاکوتـەمیز، زۆر قورسـو بەشەخـسییەت بـوو، بەدرێـژای تەمـەنی قایلنـەبوو تـەنها یـەك روپیـە لـە حکومـەتی بەریتانیا وەربگرێت[يرلحلح].**

**(شـێخ عـەلی حسامووددین) لەتەمـەنی هـەژدە سـاڵیدا مۆڵـەتی ئیرشـادکردنی لـە (شـێخ محەممەد بەهائوددین) وەرگرتووە، پاش کۆچی دواییی بـاوکی سـاڵی (1298ك= 1880ز) بـووە بەجێنشینی ئـەو، هـەموو خەلیفـە و موریدەگەورەکان کـە زۆربـەیان زانـای پایەبـەرزی ئـایینی بوون و ژمارەیەك لە خەلیفەکانی (حەزرەتی شێخ عوسمـانی تەوێڵـە) کـە هێـشتا لەژیانـدابوون، بەپیری رێوڕەچەی نەقشبەندیان پەسەندکردووە و لەخزمەتیدا پەیمانیان نوێکردۆتەوە[سملحلح].**

---

[ترلحلح] **(مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس)، بنەماڵەی زانیاران، لاپەڕە (412).**

[يرلحلح] **(سیسل جۆن ئیدمۆندن)، کورد، تورك، عـەرەب، لاپـەڕە (143)، وەرگێڕانـی بۆسـەرزمانی عـەرەبی (جـرجیس فەتحولا).**

[سملحلح] **یـەکێك لـەو خەلیفانـە (شـێخ سمـایلی هـەجیج) بـووە، نـاوبراو یـەکێکبووە لـە خەلیفـە گـەورەکانی (شـێخ عوسمـانی سـراجوددین)، پاشـئەوەی لـە خزمـەتی (شـێخ عـەلی حوسـامووددین) دا پـەیمانی نوێکردۆتـەوە، هەنـدێك لەخەڵکانی بێئاگا پێیانوتووە ئەو کە ئەو کە لەبواری سۆفیگەریدا پایەیەکی گەورەی هەیە گوایا چۆن لەسـەر دەسـتی گەنجێکدا پـەیمانی نوێکردۆتـەوە، لـە وەڵامـدا پێیوتـوون کەسێکی تـرم نـەدیوە لـە (شـێخ حوسـامووددین) شیاوتربێت هەتاکو خۆمی تەسلیمبکەم.**

ئـەم زاتـە لـە باوکییـەوە باخـات و زەوی و زارێکـی زۆری بۆماوەتـەوە، وەك: (باخـەکانی شێخ لە تەوێڵە، زەوییەکانی پـشت دەلـێن و سـەرگەتەجۆ وڵەوسـێنان لـەنزیك خورمـاڵ، زەوی و زاری گوڵپ و هانە نەوتی، هەروەها زەوی و زاری نوێن و کراویەدۆڵ).

سـەرەتای ئیرشـادکردنی لـە (تەوێڵـە)دا بـووە بـەلاَم پاشـان لەگـەڵ (قـادر بـەگی جافرسـان)جـۆرە ناکۆکییـەك کەوتۆتـە نێوانیانـەوە، بۆیـە هـەر ئـەوەی بەباشـترزانیوە بێتـە (باخەکۆن) و لەوی خانەقا و تەکیەی کردۆتەوە و ماڵێکیشی بـۆ خـۆی درووسـتکردووە، پارچـە زەویەکیـشی لـە شـاخەکە دابڕیـوە و کردوویـەتی بـە مزگـەوت، کاتێـك مـەلای گـەورەی بیـارە بەسەردان رۆیشتووە بۆ خزمەتی شێخ، چووتە نـاو مزگەوتەکـە و فەرموویـەتی: بەڕاسـتی لـەم وڵاتەی ئێمەدا ئەم مزگەوتـەی جـەنابت زۆر شـەرعییە، چوونکە لەسـەربنەمای (أحيـاء المـوات)، بەمانای ئاوەدانکردنەوەی وێرانە درووستکراوە، بۆ بەجێگەیاندنی (ئادابی ئیعتیکاف) هـەر زۆر گونجـاوە، دیـارە زۆربـەی مزگەوتـەکانی (سـواد العـراق) لەسـەر زەوی وەقـف درووسـتکراوە، هەرچەندە درووستکردنی مزگـەوت لـەم جـۆرە زەویانـەدا گونجـاوە، بـەلاَم وەك ئـەو مزگەوتانـە نییە لەسەر زەوی وێرانە درووستدەکرێن.

شێخ عەلی حسامووددین چوار کوڕ و پێنج کچی هەبووە بەم ناوانە:

1ـ (شـێخ محەممـەد بـەهائووددین) سـاڵی 1892ز لـەدایکبووە، سـاڵی 1972ز کۆچـی دواییکردوە.

2ـ (حاجی شێخ عوسمان) ساڵی 1894ز لەدایکبووە، ساڵی 1938ز کۆچی دواییکردوە.

3ـ(حـاجی شـێخ موعتەصـەم) سـاڵی 1910ز لـەدایکبووە، سـاڵی 1986ز کۆچـی دواییکردووە.

4ـ (شێخ راغب) ساڵی 1932ز لەدایکبووە، ساڵی1949ز کۆچی دواییکردووە.

5ـ (حەمیدەخان) ساڵی 1967ز کۆچی دواییکردوە.

6ـ (سوەیبە خان) ساڵی 1929ز کۆچی دواییکردوە.

7ـ (فاتمەخان) ساڵی 1930ز کۆچی دواییکردوە.

8ـ (عائیشەخان) ساڵی1935ز کۆچی دواییکردووە.

9ـ (ئامینەخان) ساڵی 1995ز کۆچی دواییکردوە.





(شێخ عەلی حساموددین) سەرەڕای کوردستان لە وڵاتانی (ئێراق، ئێران، تورکیا، میسر، شام، ئەفغانستان) موریدو شوێنکەوتووی هەبوون، ئەو موریدانە پۆل پۆل بۆ بەخزمەتگەیشتنی شێخ سەردانی هەورامانیان کردووە، هەروەها ژمارەیەك خەلیفەی هەبووە بەم شێوەیە:

(66) خەلیفە لە ئێران، (37) خەلیفە لە عێراق (8) خەلیفە لە تورکیا.

لەناو خەلیفەکانیدا ژمارەیەکیان زۆرناسراوبوون لەوانە:

1ـ حاجی شێخ ئەمینی خاڵ
2ـ خەلیفە شێخ محەممەدی موفتی هەولێر
3ـ خەلیفە شێخ مەعروفی قەرەداخی
4 ـ خەلیفە عەلی ئەفەنی ئەڕبیللی
5ـ خەلیفە مەلا ساڵحی تریفە
6ـ خەلیفە شێخ بورهانی جەزیری
7ـ خەلیفە شێخ سەعیدی دیاربەکری
8ـ خەلیفە شێخ عەبدولواحیدی وان
9ـ خەلیفە مەلا محەممەدی میروەیسی
10ـ خەلیفە سەعیدی بێڵەواری
10ـ خەلیفە تۆفیقی پاوەیی
12ـ خەلیفە شێخ حەبیبولای کاشتەر
13ـ خەلیفە شێخ محەممەدی سوەیە
14ـ خەلیفە سەی تەهای لهۆنی
15ـ خەلیفە مەلا ئەحمەدی کەیمنە
16ـ خەلیفە شێخ مستەفای جوانڕۆ
17ـ خەلیفە حاجی عەبدولای شەهبازی
18ـ خەلیفە سەی حوسێنی قوڕەیشی
19ـ خەلیفە مەلا عەبدولای لەنری
20ـ شێخ ئەحمەد ئەلئەقرەعی لە میسر
21ـ شێخ عەبدولعەزیزی میسری.

(شێخ عەلی حساموددین) لەماوەی ژیانیدا هیچ مەبەستێکی بەدەسەڵاتداران نەبووە و بەهیچ شێوەیەك تێکەڵاوینەکردوون، بۆنموونە لەکاتی سەردانی (مەلیك فەیصەڵی یەکەم) بۆ سلێمانی و هەڵەبجە ساڵی (1925ز)، شێخ قایلنەبووە بچێت بۆ چاوپێکەوتنی، (مەلیك فەیصەڵ) جارێك لە سلێمانی و جارێکی تر لە هەڵەبجەوە، ئەفسەرێکی پایەبەرزی خۆی ناردۆتە لای بۆئەوەی شێخ سەردانیبکات، بەڵام هەرنەچووە و بەئەفسەرەکەی راگەیاندووە گوایا پیرە و تاقەتی سەفەری نییە، (مەلیك فەیصەڵ) هەرسووربووە لەسەرئەوەی پێویستە چاوی بە شێخ بکەوێت، بۆیە بۆ ئەومەبەستە وتوویەتی کەواتە من بۆ نیوەڕۆ میوانی ئەوم، بەوەش( شێخ عەلی حساموددین) بەناچاری لە باخەکۆنەوە هاتووە بۆ خورماڵ بۆ خانەقاکەی (مەولاناخالید[شملحلح])، هەرچەندە ژمارەیەك لە خاو وخێزان و مورید ەکانی پێیانوتووە بچێت بەپیری مەلیکەوە، نەچووە و لە هەیوانی بەردەم ژوورەکەی خۆیدا لە خانەقا پێشوازی لێکردووە، کاتێك (مەلیك فەیصەڵ) ویستوویەتی بڕێك پارەیبداتی قایلنەبووە و پێیوتووە موسڵمانان پێویستی خۆیان دەهێنن بۆ خانەقا، بۆیە پێویستمان بەهیچ نییە.

ئەم زاتە لەگەڵ ئەوەی شێخی تەریقەت بووە، نووسەرو زاناش بووە، وێڕای زمانی دایکزادی خۆی، زمانەکانی (تورکی، فارسی، عەرەبی) زانیون و بەباشی قسەیپێکردوون، ژمارەیەك لەخەڵکانی دیاری سەردەمی خۆی نامەیان بۆ نووسیوە و دڵسۆزی و وەفاداری خۆیان بۆیدەربڕیوە، وەك: (سوڵتانی عوسمانی، هەندێك لەدەسەڵاتدارانی بابانی، مەلیك فەیصەڵی یەکەم، رەزاشای پەهلەوی)، چەندین ئەدیب و شاعیری گەورەش لەدیوانەکانیاندا ستایشی گەورەیی و کەراماتی ئەم زاتەیان کردووە، وەك: (مەحوی، نالی، سالم، شێخ رەزای تاڵەبانی، پیرەمێرد).

(شێخ عەلی حوساموددین) پێشبینی زۆرشتیکردووە، لەم بوارەدا (عەبدولحسەین ئاوڕنگ) کە یەکێکبووە لە ئەندامانی ئەنجومەنی شورای ئێران، ساڵی (1966ز)، لەساڵنامەی (دونیا) ژمارە (18) لە لاپەڕەکانی (170ـ171)دا نووسیویەتی:

---

[شملحلح](حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی) ماوەیەك لە خورماڵ بووە، یەکێك لە حوجرەکانی (خانەقای مەولانا) پاش خۆی پارێزراوە و بەردەوام دەرگاکەی داخراوە، (شێخ عەلی حوساموددین)یش لەهەمان شوێندا خانوویەکی هەبووە، بەیناوبەین هاتووە بۆ خورماڵ و لەوێ ماوەیەك ماوەتەوە.

مالّمان له شاری (تاران) لـه شارێی (ئـەمیری) و کۆڵانی (شـەیبانی) بـوو، مـاوەی بیـست ڕۆژبوو لەماڵەوە لەبەر نەخۆشی کەوتبووم، شەوێکیان (جەنابی حـاجی عـەلی ڕەزمـارا) سـەرۆك وەزیـری ئێـران هاتـە ماڵمـان، پـاش ماوەیـەك دانیـشتن و قـسەگۆڕینەوە چـاخواردنەوە، ئـاهێکی هەڵکێشا و وتی: (خواوەندی گەورە چیبوێت هەر ئەوە دەبێت، منیش وتم ئەو ئاهەی تـۆ مانـای زۆری هـەن، حەزدەکـەم زیـاتر قـسەمان بۆبکـەیت، (سـپەهبود= فـەریق روکـن ڕەزمـارا) لەسـەر قـسەکانی بـەردەوامبوو وتـی: سـاڵی (1309ك=1891ز) پلـەی (مـولازم)م هـەبوو، بەفـەرمانی حکومەتی ئێران چوومە ناوچەی هەورامان، لەوێوە بەشێوەیەکی نهێنی ڕۆیـشتمە (تەوێڵـە) کـە شارۆچکەیەکی سنووری کوردسـتانی عێراقـە، چـوومە (خانـەقای حـەزرەتی شـێخ حوسـامووددین نەقشبەندی) بـەڵام بـەناوێکی تـر و بەشـێوەیەکی تـرەوە، دوو ڕۆژ لـەوێ مامـەوە، پـاش نوێـژی شێوان چوومە خزمەتی شـێخ، پـاش ئـەوەی دەربـارەی کەشـو هـەوا چـەند پرسـیارێکی لێکـردم، هەموو جارێك بەناوی (حاجی عەلی ڕەزمارا) ناویدەهێنام، هەرچەند من خۆم بـەناوێکی تـرەوە ناسـاندبوو، منـیش هـەمووجارێك دەمـوت قوربـان ئەمـە نـاوی مـن نییـە، بـەڵام ئـەو هـیچ گوێینەدەدا بە قسەکانم و فەرمووی: بیست سـاڵێکی تـر تـۆ دەبیـت بـە سـەرۆك وەزیـری ئێـران، هەرچەندم دەکرد نەمدەتوانی بڕوابکـەم بـەوەی پـاش بیـست سـاڵی تـر ببـم بـە (عەقیـد) نـەك سەرۆك وەزیر.

لەبەرئەوەی ترسی ئاشکرابوونم هەبوو، پاش دوو ڕۆژ خانـەقام بەجێهێـشت و نـەمتوانی کارەکەم تەواو بکەم، بۆیە بۆ (هەورامانی ئێـران) گەڕامـەوە، پـاش چـەند مـانگێکیش گەڕامـەوە تـاران، سـاڵی (1329ك=1911ز) پـاش تـەواوبوونی بیـست ساڵەکە بـووم بـە سـەرۆك وەزیـری ئێران.

(شێخ عەلی حساموددین) لەهەموو تەمەنیدا سێ سـەفەریکردووە، سـەفەری یەکـەمی بـۆ ناوچـەی میانـدواو بـووە بـۆ بـەرگرتن لـە لەشـکری رووسـیای قەیـصەری، سـەفەری دووەمـی بـۆ (کەربەلا و نەجەف) بەمەبەستی زیارەتی مەرقەدی ئیمامـەکان بـووە، سـەفەری سێیەمیـشی بـۆ شاری هەولێر بووە ، دەڵێن لـەم سـەفەرەیدا زۆربـەی دانیـشتوانی شـارەکە هـاتوون بەپیرییـەوە، لەوانە پیاوماقووڵانی وەك: (خدرپاشای دزەیی، مەلائەفەنی).

**شەوی (سێشەممە 27مانگی ذی الحجەی ساڵی 1358ك=1939ز) کۆچی دواییکردوە ومەزاری پیرۆزی لە باخەکۆندایە، ئەم زاتە شوێنێکی دیاری لەناو (گۆرانییە شێخانەکان[لحلخلح])ی هەوراماندا هەیە، تا ئێستاش ژمارەیەك لە گۆرانیبێژان، زۆربەی مورید و سۆفیەکان سەدان دێڕە شیعر و دەیان گۆرانی بەباڵایدا هەڵدەدەن، گۆرانییەکانیش باس لە پیاوەتی و شەهامەت و گەورەیی پایەی دینی (شێخ حوسامووددین) دەکەن، لە دووتوێی ئەو شیعر و گۆرانیانەدا سۆزێکی راستەقینەو پەیوەندییەکی پتەوی نێوان پیرو مورید دەردەکەون.**

---

**[لحلخلح] گۆرانی شێخانی جۆرێکە لە گۆرانی ناوچەی هەورامان، لەم کتێبەدا و لەباسوخواسی گۆرانی هەورامیدا تیشکێك دەخەینە سەریان.**

0

# هەورامییەکان و ئەقلگەرایی

بۆ قسەکردن دەربارەی ئەم بابەتە پێویستە لەسەرتاوە پێناسەیەکی (بیر) بکەین و بزانین بیریار کێیە؟، ئینجا بزانین سەرەتای سەرهەڵدانی (تیۆری ئەقلگەرایی) لە بیری مرۆڤدا بۆ چ سەردەمێك دەگەڕێتەوە؟.

لە سەر رۆشنایی زۆربەی ئەو سەرچاوانەی پێناسەی (بیر)یان کردووە، بۆماندەردەکەوێت (بیر) کۆمەڵە چالاکییەکی هزرە لە (تێڕامان، رۆشنکردنەوە، ئیرادە، سۆز و وێژدان)، بیریارەکانیش ئەو کەسانەن بە تێڕوانینەکانیان بۆ (گەردوون، کۆمەڵ، مرۆڤ)، لە بازنەی باو دەردەچن و بابەتی نوێ دەبینن کە خەڵکانی تر نایانبینن، هاوکات لە هۆشیارکردنەوەی هاوسەردەمەکانیان بەرپرسیارن.

شتێکی ئاشکرایە هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی بیری مرۆڤەوە، چەند تیۆرێك لە بواری (کارکردن، داهێنان و ئەفراندنی) مرۆڤدا سەریانهەڵداوە[341]، موریدەکانی دوان لەم تیۆران بەردەوام لە پێشبڕکێ و ململانێدان، ئەوانەش هەردوو تیۆری (سروش و بلیمەتی) و (ئەقلگەرایی)ن، سەرەتای ململانێکەشیان لە دوو تابلۆی (رافائێل)ی گەورە وێنەکێشی یۆنانیدا بەرجەستەکراوە، کاتێك کە لەبەردەم (قوتابخانەی فیکری ئەثینا)دا ئەو دوو تابلۆیەی داناوە.

---

[341] لە بابەتی هونەری ژیان لە هەوراماندا بەکورتی باسمان لە تیۆرەکان کردووە (ئەیوب)

تـابلۆی یەکـەمیان وێنـەی (ئیفلاتـوون) بـووە کـە سـەیری ئاسمـانی کـردووە و هـەردوو دەستی بەرزکردوونەتەوە، وەك بیەوێت بڵێت (ئێمە لەوێوە هاتووینەتە خوارەوە).

تـابلۆی دووەمیـشیان وێنـەی (ئەرسـتۆ) بـووە کـە هـەردوو چـاوی بڕیونەتـە زەوی، وەك بیەوێت بڵێت (ئێمە لێرەوە دەرهاتووین).

سـەبارەت بـە تیـۆری (سـروش و بلیمـەتی)، ئـەم تیـورە وای لەقەڵەمـدەدات مـرۆڤ بوونـەوەرێکی بێدەسـەڵاتە، هەرچـی دێـت بەسـەریدا فـەرمانێکی ئاسمانییـە و دەبێـت بـۆی ملکەچبێت، ئەم تیورە لەهەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤدا رەگـی داکوتـاوە و کاریگـەریی گـەورەی درووستکردووە، رەگەکانی ئەم تیورە لە نووسینەکانی (هـۆمیرۆس و هیراقـایطس)دا دەبینـرێن، بەڵام لەڕووی مێژووییەوە (ئیفلاتوون) بە داهێنەری لەقەڵەمدەدرێت[لحلخلح].

(تیـــۆری ئەقڵگـــەرایی)ش پێیوایـــە ئـــەقڵی مـــرۆڤ سەرچـــاوەی هـــەمووداهێنان و ئەفراندنێکیـەتی، ئـەم تیـۆرە هـزری مـرۆڤ لـە هـەموو بیرکردنەوەیـەکی ئەفسانەیی و غـەیبی رزگاردەکات و دەڵێت: مرۆڤ خۆی سەرپشکە بـەوەی چۆن چارەنووسـی دیاریـدەکات، ئـەوەش لـە رێگەی بەکارهێنانی ئەقڵ و ئیرادەیەوە، لەم بوارەدا فەیلەسووفی فەڕەنسی (باسکاڵ) وتوویـەتی: هەرگیز ناتوانم بیر لەوەبکەمەوە مرۆڤێك هەبێت خـاوەنی (بـیر) نـەبێت، چـونکە ئەگـەر وابـوو ئەوە دەبێت بە بوونەوەرێکی بێجووڵە و وەك بەردێك وایە[لحلخلح].

ململانێـی نێـوان ئـەم دوو تیـۆرە بـە پێـی سـەردەمە جیاوازەکـان گەشـەیکردووە و خوێندنەوەی نوێی بۆکراوە، لە سەدەکانی ناوەڕاست و راسـتە و راسـت لـە سـەدەی دوانزەیـەمی زایینیدا، هەندیك لە (زانا، بیریار، نووسەر)ەکان هەوڵیانداوە چەمکی نـوێ بـۆ پەیوەنـدی نێـوان مرۆڤەکان بێننەئاراوە، لە ئەنجامی بایەخدان بە هونەر و ئەدەب و مێژوو، ئاستی بیرکردنەوەی مـرۆڤ گەشـەیکردووە، هـەر لـەم بـوارەدا فەیلەسـووفی گـەورەی ئیتـالی (دانتـی) لـە سـەدەی چواردەیەمی زایینیـدا، رەخنـەی زۆری لـە (پاپـا و کەنیـسە) گرتـووە کـە چارەنووسـی مـرۆڤ بـە ئاسمانـەوە دەبەسـتنەوە، لـە یـەکێك لـە شـیعرە دووورودرێژەکانیـدا بـە نـاو نیـشانی (الکومیـدیا

---

[لحلخلح] برِوانة: (فلسفة الفن) رؤية جديدة، ص(24)، الدكتور على عبدالمعطى محمد، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت 1985.

[لحلخلح] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (39).

الالهية)، وتوويەتی: هەندێك لە پاپاكان دەچنە دۆزەخ و ئەوانەی ئەوان پێیانـدەڵێن (گومڕا و لادەر لە دین) دەچنە بەهەشت[لخلخلح].

لـە سـەدەكانی دواتریـشدا چـەندین فەیلەسـووف و بیریـاری ئـازادیخواز، باسـی ئـەوەیان كردووە، مرۆڤ لە ژیانیدا لـە ڕێی بـەكارهێنانی (ئـەقڵ و ئـیرادە)یـەوە كارەكانی خـوای مـەزن و دروستكار تەواودەكات، هاوكات وتوویانە (شارستانییەتی مرۆڤایەتی) تەنها لـە دۆخێكی تـەواو لـە سەربەسـتیدا گەشـەدەكات، هەریـەك لـە فەیلەسـووفی فەڕەنـسی (مـۆنتین)، فەیلەسـووفی بەریتانی (هۆبس)، فەیلەسووفی هۆڵەندی (سپینۆزا) بەهەمان ڕێچكەدا چوون.

(دیكارت) لە سەدەی حەڤدەیەمی زایینیدا، فەلسەفەكانی سەدەكانی ناوەڕاستی داونەتـە داوە و وتوویــەتی: مــرۆڤ دەبێــت ملكەچــی دەســەڵاتی ئــەقڵی بێــت و بــوونی مرۆڤــی بــە بیركردنەوەیەوە بەستووە، لێرەدا وتە بەناوبانگەكەی دەهێنینەوە یاد كە وتوویـەتی: (مـن هـەم مادام بیر دەكەمەوە)، هەر بۆیە كەنیسە كتێبەكانی ئەم فەیلەسووفەی قەدەغەكردوون[برلخلح].

(ڤۆڵتێر) لەسـەدەی هەژدەیـەمی زایینیـدا داوای ئـازادكردنی ئـەقڵی مرۆڤـی كـردووە لـە هــەموو فــشارێك و وتوویــەتی: خــودای گــەورە خــۆی دروســتكار و ئەنــدازیارە، دنیــای دروسـتكردووە وەك شـانۆیەك بـۆ ئـەوەی هـەموو كەسـێك لـە ڕێـی ئەقڵیـەوە ڕۆڵـی خـۆی تێدابگێڕێت[ترلخلح].

(هێگڵ) وتوویـەتی: دروسـتكاری ئـەم گەردوونـە خـۆی كـەماڵی ڕەهایـە، مـرۆڤ هـەرگیز ناتوانێــت لــە ڕێــی ئــەقڵی و هەســتەكانییەوە راســتەخۆ پێیبزانێــت و سۆســەیبكات، بۆیــە گەردوونیشی دروستكردوە، هەتاكو مرۆڤ لە ڕێی تێگەیشتن لـە دەورووبـەرە مادییەكەیـەوە بـە ئەقڵی پەی بە خودی دروستكارەكەی ببات[یرلخلح].

سەبارەت بە كاریگەری ئەقڵ لەسەر مرۆڤ چەندین (بیریار، فەیلەسووف، زانـا، ئـەدیب و شـاعیر)ی موسـڵمانیش بۆچـوون و تێڕوانینـی خۆیـان خـستووەتەڕوو، بـە شـێوەیەك مـشتومڕ و هەندێكجاریش ململانێی خوێنـاوی لێكەوتووەتـەوە، لـەم بـوارەدا فەیلەسـووفەكانی (موعتـەزلـە)

---

[لخلخلح] (ادیب صعب)، الدین والمجتمع، لاپەڕە (94)، دار النهار بیروت، 1983

[برلخلح] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (100).

[ترلخلح] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (106).

[یرلخلح] (د.نوری جعفر)، فلسفة التربیة، لاپەڕە (28)، مطبعة الزهراء، بغداد، 1959.

باشترین نموونەن، لای موعتەزلەکان (ئەقڵ) تـەنها وەکیلـی خـودای گەورەیـە لای مـرۆڤ و تـەنها ڕێگەیە بۆ گەیشتن بە (کەماڵ)[سملخلج].

(ئیمـامی غـەزالی) یـەکێکبووە لـەو فەیلەسـووفانەی کـە بـوونی مرۆڤـی بەسـتووە بـە ئیرادەیـەوە، لـەم بـوارەدا وتوویـەتی (مـن هـەم مـادام ئـیرادەم هەیـە)، ژمارەیـەك لـە بیریـاران وتوویانە (غەزالی و دیکارت) سـەبارەت بـە مـرۆڤ یـەك بۆچوونیان هـەبووە، تـەنها جیـاوازی لـە نێوانیاندا ئەوەیە کە (غەزالی) ئیرادە و (دیکارت)یش ئەقڵی بەکاریگەر زانیوە.

(جـاحـظ) وتوویـوتی: ئـەقڵ وەکیلـی خـودای گەورەیـە لـە مرۆڤـدا و پێویـستە لەسـەری هەموو شتەکان لە ڕێگەی ئەقڵیەوە ڕاڤەبکات[شملخلج].

یەکێکی تر لەو فەیلەسووف و بیریارە موسڵمانانەی باسـی کارگـەری ئـەقڵیان کـردووە لـە سـەر مـرۆڤ (ئـیبن ڕوشـد)ە، هەنـدێك لـە بیریـارانی ئـەورووپایی پێیـانوابووە، هـەر ڕووناکبیرێك ئاگـاداری فەلـسەفەی ئـەم فەیلەسـووفە نـەبووبێت، نابێـت پێیبوترێـت ڕوونـاکبیر، نـاوبراو وتوویـەتی: ئـەقڵ تـەنها پێوانەیـە بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ لـە ژیانیـدا بـە هـەموو ڕاسـت و هەڵەیـەك پەیببات، هەروەها وتوویـوتی: پێویـستە مـرۆڤ هـەموو شـتێك بگەڕێنێتـەوە بـۆ هۆکارەکـەی کـە تەنها بە ئەقڵی لێیتێدەگات.

شتێکی ئاشکرایە هەموو مرۆڤێك بـەش بـە حـاڵی خـۆی خـاوەنی ئەقڵـە و ئـەقڵیش لای مرۆڤ دوو جۆری هەن بەم ناوانە:

1 ئەقڵی غەریزی= ئەقڵی سروشتی: ئەم جـۆرە ئەقڵـە هـەر تایبـەت نییـە بـە مرۆڤـەوە، بەڵکو زۆربەی گیاندارەکانی تریش خاوەنی ئەقڵی غەریزین و لە ڕێی ئەو ئەقڵەیانەوە پـەی بـە شـتەکانی دەوروبـەریان دەبـەن، بـۆ نموونـە (مریـشك) لـە ڕێـی ئـەقڵی غەریزییـەوە لـە کـاتی کڕکەوتنیـدا بەدرێـژایی (21) ڕۆژ لەسـەر هێلکـە دەنیـشێت، پـاش ئـەوەی جووجکەکانیـشی هەڵدەهێنێت، تا ماوەی چەند مانگێك خواردنیان بۆ پەیدادەکات، دەیانپارێزێت، قرتەقرتیان بۆ

[سملخلج] (د. محمد عمارة) الخلافة ونشاة الاحزاب الاسلامية لاپەڕە (206 207) المؤسسة العربية للدراسات والنشر بيروت 1977.

[شملخلج] (رسائل الجاحظ) لاپەڕە (92) تحقيق عبد السلام هارون –القاهرة 1964.





دەکات و لـە سەرپـشتی و لـە بـن باڵیـدا دەیانحەوێنێتـەوە، کـاتێکیش دەگەنـە ئـەو تەمەنـەی بەجێیاندەهێڵێت، تەنها لەسەر دەنکە گەنمێك لەگەڵیان بەشەڕدێت و دەنووکیان لێدەگرێت.

2ـ ئەقڵی دەستهاوەردە= موکتەسەب: ئەم جۆرەشیان تایبەتە بە مرۆڤەوە و بەدەر لەوەی ئاستەکەی لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تـر جیـاوازە، چـەندین هۆکـاریش هـەن کاردەکەنـە سـەر گەشەکردن و باڵاکردنی، موریـدەکانی ئەقڵگـەرایی زۆربـەیان لەسـەر ئـەوە یەکـدەنگن کـە مـرۆڤ پێویستە ئەقڵی سروشتی خۆی بە ئەقڵی دەستهاوەردەی موتوربەبکات و هـەر لێرەشـەوە دەگاتـە کەماڵ[1].

پـاش ئـەم پێـشەکییە کـە بــە پێویـستمانزانی، دەچـینە نـاو کرۆکـی بابەتەکەمانــەوە دەربـارەی ئەقڵگـەرایی لای هەورامییـەکان و لـەوێوە دەسـتپێدەکەین، کـە چـەند هۆکارێـك هـەن کاریگەری گەورەیان هەبووە بۆ ئەوەی هەورامییەکان مرۆڤگەلێکی ئەقڵگەرا بن، بـەرای ئێمـەش دیارترینی ئەو هۆکارانە ئەمانەن:

1ـ هۆکـاری دینـی: وەك پێـشتر لـە بابـەتی (دیـین لای هەورامییـەکان)دا باسمـانکردووە، خــەڵکی هــەورامان ســەردەمانێکی دوور و درێــژ لەســەر دینــی زەردەشــتی بــوون و پێیــەوە پابەنـدبوون، لـە هەنـدێك شـوێنی ناوچـەکەدا ئـەو پابەندبوونـەیان هـەتاکو سـەدەی هەشـتەمی کۆچی بەردەوامبووە، شتێکی ئاشکرایە دینـی زەردەشـتی تێڕوانێکـی ئـەقڵانی هەیـە بـۆ هـەموو چەمکەکانی ژیان، دروشمە سەرەکییەکانی بریتین لە: (نیەتی چاك= ئەندێشەی چاك، کـرداری چاك، گۆفتاری چاك)، ئەم سێ دروشمە  لای هەڵگرانی ئەم دینە پیرۆزییەکی وەهایان هەیە، کـە هــەموو یــەکێکیان پێویــستە لەســەری لــە چوارچــێوەیاندا بجووڵێتــەوە و بەهــەموو بوونیــەوە پێیانەوە پابەندبێت.

هەر لـەم بـوارەدا بـاس لـەوە دەکـەین، یـەکێك لـە تاوانـە گـەورەکان لای زەردەشـتییەکان باوەڕبوونە بە ئەفسانە و جادووگەری، شتێکی ئاشکرایە ئەفسانە و جادووگەری مرۆڤ دەبەسـتن بە شتی شاردراوە و نادیارەوە و ڕۆڵی ئەقڵی دەخەنەپەراوێزەوە، بەلاّم زەردەشـتییەکان کـە دژی ئەم شتانە دەوەستن، دەبن بە خاوەن ئیرادەیەکی ئازاد.

---

[1] (د. محمد عمارة)ـ الخلافة ونشاة الاحزاب الاسلامیةـ لاپـەڕە (206ـ المؤسسة العربیة للدراسات والنشرـ بیروت 1977.

دیاره پابەند بوون بە دروشمەکانی دینی زەردەشتییەوە و ئازادی ئیرادە، هەر لە دێر زەمانەوە هەورامییەکانیان والێکردووە هەمیشە بەرووی یەکتریدا خەڵکێکی کراوە بن، گەشبینبن و باوەڕی پتەویان بە خۆیان هەبێت و بەسەر خۆیاندا نەشکێنەوە، لە ڕێی هەستەکانیانەوە دنیای دەرەوە بۆ ناو دنیای ناوەوەیان بگوێزنەوە، کە بریتییە لە (بیرکردنەوە، ئاوەز، ئیرادە، گومان)، لێرەشەوە ئیتر (ئەقڵی غەریزی و ئەقڵی دەستهاوەردە)یان پێکەوە موتوربە کردووە و جڵەوی خۆیان بە ئەقڵیان سپاردووە، هەر مرۆڤیش کە جڵەوی خۆی بە ئەقڵی سپارد، هەموو کردار و دیاردە و کەسێتییەکانی دەوروبەری لە ڕێی ئەقڵییەوە هەڵدەسەنگێنێت و هەڵوێستی خۆی بەرامبەریان دیاریدەکات، خۆی ناداتە دەست (حەز و هەوا و هەوەس) و نەستی بەسەر هەستیدا زاڵناکات.

2/ هۆکاری ئابووری: شتیکی ئاشکرایە هەورامان لە رووی ئابوورییەوە هەرێمێکی نموونەییە و خەڵکەکەی دەتوانن جۆرە خودکەفاییەك بۆ خۆیان فەراهەمبکەن، لەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەم بوارەدا شۆڕبووینەتەوە و لێرەدا پێویستناکات جارێکی تر بچینەوەسەری، بەلاٚم ئەوەی پێویستە باسیبکەین ئەمەیە کە سەرچاوەکانی بەرهەمهێنان لە هەوراماندا هەر لە (باخداری و پیشە دەستییەکانەوە بیگرە، هەتاکو دەگاتە کشتیاری و ئاژەڵداری) و سەرچاوەکانی تریش، هەموویان موڵکی خەڵکەکەین، هیچ دەسەلاٚتدارێکی ناوچەکە و لە هیچ سەردەمێکدا نەیتوانیوە ئەو مافە بە خۆی بدات ئەم سەرچاوانەیان لێزەوتبکات، ئەو شتانەش کە لە ژێر ناوی سەرانە، یان هەر ناوێکی تردا لێیانسەندرابێت، بە شێوەیەك نەبوون هەورامییەکان واهەستبکەن لە خەصڵەتە مرۆڤایەتییەکانیان نامۆکراون و بوون بە ئامێرێك بەدەست فلاٚن بەگ، یان فلاٚن خان، یان فلاٚن کوێخا و سەرکارەوە.

بۆزیاتر قووڵبوونەوە بەم باسەدا دەڵێین: باخداری و پیشە دەستییەکان کە دوو سەرچاوەی گەورە و دیاری بەرهەمهێنان و دابینکردنی بژێوی هەورامییەکان بوون، یەکەمیان بەرهەمی هەزاران سەعات کارکردن و نیشتەجێبوون بووە لە زێد و ماوای ژیان و گوزەراندا، سەبارەت بە دووەمیشیان بەرهەمی کارکردنی بەردەوام و ژیری و سەلیقەی خودی پیشەوەرەکان بووە، ئەمانەی باسمانکردن شتێك نەبوون کە (بەگ)، یان (خان) لە باوباپیریانەوە بۆیان مابێتنەوە، یاخود لە دەسەلاٚتدارانی سەردەمەکانیان وەریانگرتبێت،

ئـەوانیش لـە لایـەن خۆیانـەوە و بـە پێـی بەرژەوەنـدییان دابێتیـانن بـە خەڵکە رەمەکییەکـە ولێیانسەندبێتنەوە.

لێرەوە دەگەینە ئـەوە ئەنجامـە کـە ژێرخـانی ئـابووری هـەورامان هـی خەڵکەکـە خۆیـان بـووە، هــەر کۆمــەڵێکیش ژێرخــانی ئابووریــان مــوڵکی خۆیــان بێــت، لــە رووی فکرییــەوە پیــشکەوتووترن لەوانــەی ژێرخــانی ئابوویــان مــوڵکی خۆیــان نییــە، لــەم بــوارەدا (مــارکس) وتوویەتی: (بیر) رەنگدانەوەی دەورووبەری مادییە، دیارە دەورووبەری مادی لە هەوراماندا بـەم شـێوەیەیە کـە باسمـانکرد، بۆیـە کاریگـەری گـەورەی لەسـەر گەشـەکردنی ئاسـتی بیرکردنـەوە و خۆسپاردن بە ئەقڵگەرایی لای خەڵکەکەی درووستکردووە.

3 هۆکـاری کۆمەڵایـەتی: بـۆ روونکردنــەوەی کاریگـەری ئـەم خاڵـە لـە سـەر خـەڵکی هـەورامان، سـەرەتا لـەوەوە دەسـتپێدەکەین کـە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکانی هـەر کۆمـەڵێك، رەنگدانەوەی ئاستی رۆشنبیری ئەو کۆمەڵەن و گەشەکردنیان بۆ پەیوەندی بـاڵاتر بەشـێوەیەکی سـەرەکی پەیوەسـتە بەگەشـەکردنی ئاسـتی فیکـری و رۆشـنبیریی تاکەکانییـەوە، هەرچـەندە پێــشکەوتنی زانــستی و تــەکنۆلۆژی کاریگــەری گــەورەیان لەســەر پێــشکەوتنی ژیــار و خۆشـگوزەرانکردنی مرۆڤـەکان هەیـە، بـەڵام ئـەم جـۆرە پێشکەوتنە هـەرگیز ناتوانێـت گرنتـی پێشکەوتنی فیکـری و رۆشـنبیری کۆمـەڵ بـدات و گۆڕانکـاری لـە (چـەمکە کۆمەڵایەتییـەکان)دا بکـات، هـەر بـۆ نموونـە کۆمەڵگـەی یابـانی لـە رووی پێشکەوتنی زانـستی و تەکنۆلۆژییـەوە لـە ترۆپکـدان و هـەمووومان دەزانـین کـاڵا یابانییـە جۆراوجۆرەکـان چ رەواجێکیـان هەیـە و چـۆن زۆربەی بازاڕەکانی جیهانیان داگیرکردووە، کەچی خەڵکی ئەو وڵاتە لە رووی رۆشنبیرییەوە بەو شێوەیە نین و تا ئێستاش چەندین قەناعـەتی رۆحـی و کۆمەڵایـەتی دواکـەوتوویان هەیـە، وەك ئەوەی (ئیمپراتۆر) بەنەوەی خودا دەزانن و جیاوازی بەرچاو لەنێوان (نێر و مێ)دا دەکـەن، ژن بەئامرازێکی خزمەتکردنی پیاو دەزانن و لە زۆربواری ژیاندا رێگەی کارکردنی لێدەگرن.

کۆمەڵی کوردەواری یەکێکە لەو کۆمەڵانەی تا ئەم رۆژانـەش پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـە دواکـەوتووەکان کاریگـەری خراپیـان لەسـەری هەیـە، خـەڵکی زۆربـەی ناوچـەکانی کـوردەواری وابەسـتەبوونێکی پتـەویان بــە ئەقڵیــەتی خێڵــەوە هەیــە، بڕیــارە کۆمەڵایەتییــەکانیش کــە دەرهاوێشتەی ئەو ئەقڵەن، لە ناویاندا هێزی یاسایان هەیە و زۆرجاریش هێزی یاسا دەبەزێنن.

بەڵام ئەگەر لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییـەکانی خـەڵکی هـەورامان وردببینـەوە، دەبیـنین بـەو شـێوەیە نـین و جیاوازیـەکی تـەواو گـەورەیان هەیـە، تائاسـتێکی بـاش ئەقڵییـەتی خێڵیـان

**تێپەڕانــدووە و لــە سروشــت و ســونەت دەرچــوون، دیــارە نیــشتەجێبوونی خەڵکەکــە هــەر لەدێرزەمانــەوە لــە ناوچــەکەیاندا و درووســتبوونی پێکهاتەیــەکی کۆمەڵایــەتی (هــەمۆجین= متجــانس) کاریگەرییــەکی گــەورەیان لەگەشــەکردنی پەیوەندییــە کۆمەڵایەتییەکانــدا هەیــە، گەشەکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش بۆ پەیوەندی باڵاتر، زیاتر مرۆڤەکان بـە ئـەقلیان دەسپێرێت و بەردەوام ئەو شتانە رەتدەکەنەوە کە لەگەڵ لۆژیکی ئەقڵیدا نایەنەوە.**

**4 هۆکاری رۆشنبیریی: ئەگەر بە ویژدانەوە و دوور لە هەموو سۆزێك بـەراوردی ئاسـتی رۆشــنبیریی خــەڵکی هــەورامان لــە گــەڵ خــەڵکانی ناوچــەکانی تــر بکــەین، بــە ئاشــکرایی بۆماندەردەکەوێت کەخەڵکی هەورامان لـەم رووەوە لـە پێـشترن و دیـارە ئەمـەش هۆکـاری خـۆی هەیە، پیاهەڵدان نییـە ئەگـەر بڵـێن هـەورامان هـەر لەسـەردەمی بـاوبرەوی دینـی میترائیـزم و زەردەشـتی و پاشـان دینـی ئیـسلامەوە، زێـدی ژیـان و گـوزەرانی هـەزاران (عـاریف، زانـای دینـی، ئــەدیب وشــاعیر) بــووە، پیــاوە دینییــەکانی هــەر ســێ دینــی (میترائــی، زەردەشــتی، ئیــسلام)، هەرچەندە زۆربەیان کاری جیدیان کـردووە بـۆ برەوپێـدان بەدینەکـەیان و باڵادەسـتبوونی ئـەو قەناعەتانەی کە خۆیـان پێیانـەوە وابەسـتەبوون، لـە بـواری خوێندەواریـدا، هاوکـات مامۆسـتا و رێنماییکاری خەڵك بوون، هەروەها بەرهەمەکانیان چ ئەوانەیان نووسـراونەتەوە و چ ئەوانـەیان دەما و دەم بۆ وەچەکانی یەك لە دوای یەك گوێزراونەتەوە، لە هۆشیارکردنەوەی خەڵکدا رۆڵـی گەورەیان گێڕاوە.**

**لـەم بـوارەدا پێویـست ئاماژەبکـەین بـە رۆڵـی (پیرەکـانی هـەورامان و شـاهۆ، شـاعیر و عاریفەکانی رێورەچـەی یارسـان، شـێخەکانی نەقـشبەندی هـەورامان[لمجبرلح]، شـاعیر و عاریفـەکانی**

---

**[لمجبرلح] لـە باسوخواسـی رێوڕەچـەی نەقـشبەندی هەورامانـدا شـتێمان لـەم بـارەوە وتـووە، لێرەشـدا نموونویـەك سـەبارەت بـە رۆڵـی (حـەزرەتی شـێخ حوسـامودینی نەقـشبەندی) دەخەینـەڕوو، ئـەم زاتـە بـەردەوام بـە تـەنگ پـەروەردەکردن و پێگەیانـدنی خـەڵکی ناوچـەکەوە بـووە، مامۆسـتای شـەهید (شـاکر فـەتاح) وەك شـایەتحاڵێك وتوویـەتی: سـاڵی (1940ز) وەك بەڕێوەبـەری ناحیـە لـە خورماڵـدا ئیشوکاری میرم دەکـرد، لـەو کاتـەدا (خورمـاڵ) گوندێکی بچووکبوو، هەر پەنجا شەست ماڵێکی تێدابوو، بەڵام گوندەکانی زۆر بوون و زیاتر لە (15000) کەسیان تێدا دەژیان، لە هەموو ناوچەکەدا تەنها سێ قوتابخانە و دوو بنکـەی تەندرووسـتی هـەبوون، رێگـەی قیرتـاوکراو هـەر نـەبوو، کەمتەرخـەمی حوکمڕانـەکان و خراپـی زۆربـەی کاربەدەسـتان وایـانکردبوو، هـەر سـێ دەردی کوشـندەی (هەژاری، نەخۆشی، نەخوێندەواری) بڵاوببنەوە، بەڵام گوندەکانی هەورامان بە تایبەت (تەوێڵـە و بیـارە و باخـەکۆن)، لەچاو گوندەکانی زۆربەی ناوچەکانی تری کوردستان پێشکەوتووتربوون، دیارە ژمارەیـەك لـە شـێخەکان و بەگـەکانی**

**هەڵگری ڕێوڕەچەی نەقشبەندی، مەلا و زانا و شاعیرەکانی تر)ی ناوچەکە، لە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی خەڵکدا و ئاشناکردنیان بە خوێندەواری، بوونی ئەم زاتانە وایکردووە هەورامان لە سەردەمە جیاجیاکاندا چەندین قوتبخانە و حوجرەی تێدا بێت، ئەو قوتابخانە و حوجرانە بە گتی مەڵبەندی گرنگی خوێندن و پەروەردەکردن بوون و لە ڕێیانەوە ئاستی هۆشیاری خەڵکەکە گەشەیکردووە، گەشەکردنی ئاستی هۆشیاریش یەکێکبووە لە گرنتییەکانی خۆ ئەسپاردن بە ئەقڵگەرایی.**

**بۆ کۆتایهێنان بەم بابەتە دەمانەوێت بڵێین: ئەقڵگەرایی لای هەورامییەکان بە ئاستێك بووە لە هەموو بوارەکانی ژیانیاندا توانیویانە داهێنەر بن و ئەفراندنیانکردووە.**

---

**ناوچەکە دەستیان لە پێشکەوتنی ناوچەکەیاندا هەبوو، لە درێژەی قسەکانی (مامۆستا شاکر فەتاح)دا هاتووە: زۆر هەوڵمدا لە خورماڵدا قوتابخانەیەك بکەمەوە، بەلاّم حکومەت نەیکردەوە، ئیتر ناچاربووم بە یارمەتی خەڵکەکە قوتابخانەی شەو بکەمەوە، لێرەدا زۆر بە پێویستی دەزانم سوپاسێکی زۆری (شێخ حیسامەددین) بکەم کە لە ناو خانەقاکەیدا ژوورێکی پێدام، هاوکات چەند دارێك و چەردەیەکیش پارەی دامیٚ بۆ ئەوەی کورسی مێز و تەختە ڕەشە درووستبکەم، کە گەیشتینە هاوین باخچەیەکی بچووك و جوانیشم درووستکرد، لەو کاتەدا (شێخ حیسامەددین) وەفاتی کردبوو، بەلاّم بە سوپاسەوە دەڵێم کوڕەکەی بەناوی (شێخ مەحەممەد) زۆر یارمەتیدام، بەوەی پارچەیەك زەوی و ئاوی پێویستی بۆ تەرخانکردم و ژمارەیەکی زۆریش نەمامی پێدام و داریشی دامیٚ بۆ درووستکردنی پەرژینی باخچەکە.**

# ٥

## هونەری ژیان لەهەوراماندا

شتێکی ئاشکرایە هونەر هەر لە سەرەتاوەو تا ئێستا چەندین پێناسەی بۆ کراون، لە سەر بنەمای جیاوازی تیۆرەکانی بواری ئەفراندنی هونەری پێناسەکانیش جیاوازیان هەیە، بە گەڕانەوەیەکی خێرا بۆ هەندێك لەو سەرچاوانەی باسیان لە ئەفراندنی هونەری کردوە، بۆماندەردەکەوێت گرنگترین تیۆرەکانی ئەو بوارە بریتین لە:

1. تیۆری سرۆش‌و بلیمەتی: ریشاڵە سەرەتاییەکانی ئەم تیۆرە لای هەر یەك لە (هۆمیرۆس‌و هراقلیتس) دەردەکەون، بەلاّم لە رووی تیۆرییەوە (ئیفلاتوون) بە خاوەنی دەزانرێت‌و بۆ ئەو دەگەڕێنرێتەوە، شوێنکەوتوانی ئەم تیۆرە بە گشی پێیانوایە (ئەفراندنی هونەری) تەنها بەرهەمی سرۆش‌و بلیمەتییە، دەڵێن: هونەرمەند بێجگە لەوەی مرۆڤێکی خاوەن بەهرەیە خواوەند لە خۆی نزیدەخاتەوەو بلیمەتی پێدەبەخشێت، شتێکی تر نییە[1].
ئەو نزیکخسنەوەیەش بەم شێوەیە باسدەکەن: چۆن هێزێکی موگناتیسی پارچە ئاسنێك لە خۆی نزیکدەخاتەوە بەوەی شتێك لە هێزی خۆی پێدەبەخشێت، بەهەمانشێوە خواوەندو هێزە

---

[1] د. على عبد المعطى محمد، فلسفة الفن، ص 24، دار النهظة العربية للطباعة والنشر 1985.

ئاسمانییــە باڵادەســتەکان هونەرمەنــدان لــە خۆیــان نزیدەخەنــەوەو توانــای ئەفرانــدنیان پێدەبەخشن.

2. تیۆری ئەقلگەرایی: ئەقلگەراکان پێیانوایە ئەفراندنی هونەری هەمیشەو لە هەموو دۆخێکدا کردارێکی هۆشیارو بەرهەمی ئەقڵێکی پێگەیشتووەو لە دایکبووی بیری مرۆڤە، لەم بوارەدا کەسێکی وەك (باسکال) وتویەتی: ئەگەرچی مرۆڤی بێدەستو قاچ هەن، بەلاّم هەرگیز ناتوانم بیر لەوە بکەمەوە کە مرۆڤی بێ (بیرو هزر) هەبن[2].

3. تیـۆری کۆمەلاّیـەتی: لـە سـەر رۆشـنایی ئـەم تیـورە (ئـەزێتی) مـرۆڤ تـەنها لـە نـاو کۆمەڵدا بـوونو مانـای هـەن، شـوێنکەوتووەکانی دەڵێن: هـەموو (مـن)ێـك لـە نـاو (ئێمـە)دا بـە ئامانجەکانی خۆی دەگات، هاوکات پێیانوایـە هونـەر ئەگـەر هاوتەمـەنی ژیـانی مـرۆڤ بێـت، یـان دواتر (دین) هێنابێتییە گۆڕێ، هەر دیاردەیـەکی کۆمەلاّیەتییـە، لـەم بـوارەدا (ئارنـست فیـشەر) نووسیویەتی: (من)و (ئێمە) لەرێی هونەرەوە ئاوێزانی یەکتردەبنو هونـەر هۆکـارێکی پێویـستە بۆ ئەم ئاوێزانبوونە[3].

4. تیـۆری سـایکۆلۆژی: زانـاو فەیلەسـووفەکانی ئـەم بـوارە هـەرگیز ئـەوە ناسـەلمێنن کـە ئەفراندنی هونەری پڕشنگێکی ئاسمانی بێت، هەروەها لەگەڵ ئـەوەدا نـین هـۆشو ئـەقڵی مـرۆڤ بنەمای ئەفراندنی هونەری بنو دژی ئەوەشن لە ژێر گاریگەرییە سۆسیۆلۆژییەکاندا بێت، هـەر بۆیە هۆکاری تری وەك: (ناهۆشمەندی تاكو کۆمـەڵ) بـە بنـەماو گەوهـەری ئەفرانـدن دەزانـن، رێبـەرە گـەورەکانی ئـەم تیـۆرەش هەریـەك لـە (فرۆیـد)و شـاگردەکانیو (سـریالییەکان) وەك شـوێنپێهەڵگرانی نـاوبراوو (کـارڵ یـۆنج)ن، پێویـستە ئـەوە بڵـێین (کـارڵ یـۆنج) ناهۆشمەنـدی کۆمەڵ بە کاریگەر دەزانێت[4].

پاش ئەم چەند دێڕە سەبارەت بە تیۆرەکانی بواری ئەفراندنی هونەری ، جێی خۆیـەتی چەند پێناسەیەکی هونەر، بە تایبەت ئەوانەیان کە مانایەکی فراوانیان هەیە بخەینەڕوو:

1ـ هونەر دیادەیەکی کۆمەلاّیەتییەو بەشداری لە درووستبوونی مێژوودا دەکات.

---

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (39).

[3] ارنست فیشر، ضرورة الفن، ص 9، ترجمة اسعد حليم، الهيئة المصرية العامة للتاليف والنشر، القاهرة، 1971.

[4] د. على عبدالمعطى محمد، فلسفة الفن، ص 82، دار النهظة العربية للطباعة والنشر، 1985.

2ـ هونەر هەوڵدانی مرۆڤە بۆ خوڵقاندنی ئەو جیهانەی تێیدا خەونەکانی بە واقعێکی پرشنگدار دەبینێت.

3ـ هونەر ساباتێکە لە سایەیدا مرۆڤەکان هەست بە ئاسوودەیی و چێژی رۆحی دەکەن، هاوکات مانای بوونی خۆیان لە ناو ژیانی مرۆڤایەتیدا دەزانن.

پاش ئەم چەند پێناسەیەش دەڵێن: هونەر هاوتەمەنی ژیانی مرۆڤە، مرۆڤە سەرەتاییەکان لەناو ئەو ئەشکەوتانەی تییاندا ژیاون، وێنەی ئەو گیاندارو باڵندانەیان کێشاوە کە راویانکردوون، هەروەها وێنەی ئەوانەشیان کێشاوە لێیان ترساونو لەبەریان هەڵهاتوون، دیارە ئەم وێنانە دەکرێت بە پرسیارە مەعریفییەکانی سەرەتای ژیانی مرۆڤ بدرێنەقەڵەم، یەکەم مرۆڤ ئامێرێکی بەردینی دروستکردووەو بەو ئامێرەی خزمەتی مرۆڤایەتی کردووە، هونەرمەندێکی گەورە بووە، هەروەها ئەو کەسەی بۆ یەکەمجار ناوی شتێکی ناوەو ئەوەش لە سەر چەکە بەردینەکەی دەستی هەر هێمایەکی دانابێت، بە هەمانشێوە هونەرمەندی گەورەبوون[5].

هونەر رۆڵێکی گەورەی لە گەشەکردنی ژیانی مرۆڤایەتیدا گێراوەو لە هەر قۆناغێکیشدا خوێندنەوەی نوێی بەخۆوە گرتووە، هەر لێرەشەوە دەبینین بە تێپەڕبوونی سەردەمەکان چەندین رێبازی هونەری سەریانهەڵداوە لەوانە:

1. رێبازی کلاسیزم: لێرەدا پێویستە تیشکێك بخەینە سەر زاراوەی (کلاسیزم)، ئەم زاراوەیە لە وشەی (کلاس)ی لاتینییەوە وەرگیراوە، (کلاس)یش لەو زمانەدا لە سەرەتاوە بۆ واتای کۆمەڵە کەشتی بەکارهێنراوەو پاشان بووە بە واتا بۆ پۆلی خوێندن، دواجاریش بووە بە زاراوەیەکی بواری رەخنەسازی بۆ شانۆگەرییە (تراژیدیو کۆمیدی)یەکان[6].

2. رێبازی رۆمانیزم: زاراوەی رۆمانیزم لە بنەڕەتدا لە وشەی (رۆمانیۆس Romanius)وە وەرگیراوە، وشەکەش لە فەرهەنگدا ناوێکە بۆ ئەو زمانە ئەوروپییانەی لە سەرەتاوە لە زمانی لاتینی جیابوونەتەوە، پاشان پەرەیانسەندووەو بوون بە زمانی نەتەوەیی چەند نەتەوەیەك، ئەگەرچی لە چاو زمانی لاتیندا بە پلەیەکی کەم تەماشاکراون، بەڵام هەر

---

[5] هەمان سەرچاوەی پێشووٞ لاپەڕە (62).

[6] د. کامل حەسەن ئەلبەصیرٞ رەخنەسازیٞ مێژووو پەیڕەویکردنٞ لاپەڕە (52).

**له سەرەتای چەرخی راپەڕینەوە توانیویانە جێگە بە زمانی لاتینی لەقبکەنو دواتریش جێی ئەو زمانەیان گرتووەتەوەو بوون بە زمانی (هونەرو وێژەو زانیاری)، لەو زمانانەش (فەڕەنسی، ئیتالی، ئیسپانی، پورتوگالی، ڕۆمانی، برۆڤانیالی).**

**هونەرمەندانی بواری (ڕۆمانیزم) شۆڕشێکی گەورەیان دژ بە بنەماو دەستوورەکانی هونەری (کلاسیزم) بەرپاکردوە، سەبارەت بە (ڕۆمانیزم) کەسێکی وەك (ستاندال) نووسیویەتی: ئەو هونەرەیە بە هۆیەوە دەتوانین تەوژمێکی قووڵو بە هێز لە چێژو خۆشی پێشکەش بە خەڵك بکەین[7].**

3. **ریالیزم: ئەم زاراوەیە لە فەرهەنگی زمانە ئەوروپییەکاندا لە وشەی (ریەڵ)ەوە وەرگیراوە، وشەی (ریەڵ)یش بە واتای راستو راستەقینەوە دێت، ئینجا بووە بە زاراوەیەکی وێژەیی بۆ جیاکردنەوەی بزووتنەوەیەکی هونەریو ئایدۆلۆژی کە هەم لە رووی فۆرمو هەم لە رووی ناوەرۆکەوە خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکە، ئەو تایبەتمەندییانەش لە بزووتنەوەکانی (کلاسیزم، ڕۆمانیزم) جیایدەکەنەوە، ئەم رێبازە لە سێ شێوازو رووگەی جیاوازدا خۆی أ ریالیزمی فۆتۆگراف: ئەم رووگەیە لە ریالیزم مەبەستی رەنگدانەوەی بوونو واقعە بەبێ هیچ جۆرە گۆڕینو دەستکارییەك، شوێنکەوتووەکانی دەڵێن: پێویستە بەو پەڕی دەستپاکییەوە (ژیانو سروشتو کارەساتەکانی چینەکانی کۆمەڵ) لە بەرهەمە وێژەییو هونەرییەکاندا بخرێنەڕوو.**

**أ- ریالیزمی رەخنەگر: لە سەر رۆشنایی ئەم رووگەیە پێویستە لایەنێکی هەڵبژێردراو لە ژیانی واقیعی بکرێت بە ماکی رەخنەگرتن لە رەوشتی ناپەسەندو دیاردەو خووی خراپ، ئەمەش بە نیازی سەرزەنشتکردن.**

**ب-ریالیزمی سۆسیالیست = ریالیزمی شۆڕشگێڕ: ئەم رووگەیە رووداوەکانی ژیانو باری کۆمەڵایەتی لە بەر رۆشنایی تیۆرە ئابووریو سیاسییە پێشکەوتووخوازەکاندا شیدەکاتەوەو بەرەو مەبەستێکی تایبەت دەیانبات، هاوکات کوێرەوەریو ئێشو ئازاری چینە زەحمەتکێشەکانو ستەمو زۆرداری چینە چەوسێنەرەکان رووتدەکاتەوە، لێرەشەوە هەوڵدەدات چینە زەحمەتکێشەکان وریابکاتەوەو هۆشیارییان زیادبکات، هەتاکو لە ژێر باری ستەمو**

---

[7] فريد انطونيو، المذاهب الادبية الكبرى في فرنسا، ص(153)، الطبعة الثانيية = 1975، بيروت، لبنان.

چەوساندنەوە رزگاریانبێت، بە مەبەستی ئەوەی رووەو ژیانی ئاسوودەو خۆشگوزەران هەنگاو هەڵبگرن[8].

4. رێبازی بەرنانسی: (بەرنانس) لە بنەڕەتدا ناوی چیایەکە لە وڵاتی یۆنان، داستانەکانی ئەو وڵاتە باسیان لەوە کردووە، چیای (بەرنانس) مەڵبەندی خواوەندەکانی شیعر بووە، گوایا هەستیارەکانیش بە هۆی ئەو خورپەو ئیلهامەوە کە لەوێوە وەریانگرتووە شیعرەکانی خۆیان هۆنیوەتەوە، لە سییەکانی سەدەی نۆزدەمیشەوە وشەی (بەرنانس) بووە بە زاراوەیەکی رەخنەسازیو نازناوێکی شیعری کە لە ژێر ئاڵاکەیدا کۆمەڵە رووگەیەکی شیعری لە رێی جێبەجێکردنی ئامانجێکی هونەریدا کۆبوونەتەوە، بەلام وشەکە بە شێوەیەکی زانستی ساڵی (1861ز) پاش بڵاوکردنەوەی کۆمەڵە بەرهەمێکی چل هەستیار لە ژێر ناوونیشانی (بەرنانسی هاوچەرخ)دا بە تەواوی چەسپاوە.

ئاشکرایە بەدەر لەم رێبازو رووگانەی ناومانهێنان چەندین رێبازو رووگەی تری هونەریو وێژەیی هەن، هەر بۆ نموونە نەوەك سەرژمێر ناوی ئەمانەیان دەهێنین: (هێمایی، سریالی، دادایی)، ئەم رێبازو رووگانەش هەر یەکەو بە پێی قورسایی خۆیان جێی خۆیان کردوەتەوەو سەرنجیان راکێشاوە.

پاش ئەم چەند دێڕەی سەرەوە ئەو دەستەواژەیە دەهێنمەوە یاد کە دەڵێت (ژیان لە هەوراماندا خۆی لە خۆیدا هونەرە)، ئەگەر بە وردی بڕوانینە سروشتی هەورامان لەلایەك و باری کۆمەڵایەتی و هەندێك بواری کارکردنی خەڵکی ناوچەکە بۆ دابینکردنی بەشێك لە پێداویستییەکانی ژیان و گوزەرانیان لەلایەکی ترەوە، بۆمان ئاشکرا دەبێت ئەم دەربڕینە پڕبەپڕ مەبەستیپێکاوە، ئاشکرایە سروشتی هەورامان تا بڵێیت قەشەنگ و دڵڕفێنە و هیچ قسەیەك لەم رووەوە بە پێویست نازانین، بەڵام بابچنەسەر بواری کارکردنی خەڵکی ناوچەکە بۆ دابینکردنی بەشێك لە پێداویستییەکانی ژیان و گوزەرانیان، سەرەتا سەرنجێك لەباخداری بە گشتی و رێکخستنی (تەلانلجبرلح، جۆگە، کووزلجبرلح، بەنگالخبرلح، قەڵوەز و ئاژینبربرلح، کەڵەك،

---

[8] د. کامل حەسەن عەزیز ئەلبەصیر رەخنەسازی مێژووو پەیڕەویکردن –لاپەڕە (68 69).

لجبرلح تەلان: ئەو زەوییانەی لە قەدپاڵی شاخ و کێوەکاندا لەخوارەوە بۆ سەرەوە تەختکراون و بەدرووستکردنی کەلەکە بەرد بەبەرزایی (1 3مەتر) کە هەورامییەکان پێیاندەڵێن (کەل) لە یەکتر جیاکراونەتەوە، پێیاندەوترێت (تەلان)، مەرجیش نییە لە هەموو باخەکاندا بەرزایی کەڵەکە بەردەکان وەك یەکبێت، پانی تەلانەکانیش بەپێی

بارووم، ڕاگا=ڕێڕەو)کان بەتایبەتی بدەین، بزانین ئەگەر درووستکردن و ڕێکخستنی ئەمانە هونەر نەبێت ئەی چی هونەرە؟.

ئایا ئەگەر کەسێك بڕوانامەیەکی زانستی بەرزیشی لەبواری باخداریدا هەبێت، دەتوانێت باشتر لە هەورامییەکان باخ دروستبکات؟ با سەیری شوێنی ناشتنی درەختەکان بکەین هەتا بۆماندەرکەوێت چۆن باخدارەکان بەبێ هیچ ئاشنایەتییەکی زانستی لە تۆپۆگرافییەتدا بەڵام بە هونەرێکی بەرز و سەلیقەیەکی ورد تۆپۆگرافییەتیان خستۆتە ژێر ڕکێفی ژیرییانەوە و لەباخداریدا حسابیانبۆکردووە.

دەبا سەرنجێکی خێرای کارکردنی خەڵکی هەورامان بدەین لەدرووستکردنی خانووەکانیاندا کە لەدامێنی چیا و کێوەکان، یاخود لەناو دۆڵ و نشێوەکاندا درووستکراون، هەتا بزانین چۆن لە درووستکردنیاندا بەشێوەیەکی ڕێکوپێك حیساب بۆ (خۆرەتاو، ڕەشەبا، سەیل و باران) کراوە، کوچە و ڕێڕەو بۆ هاتووچۆ درووستکراون، زۆرجار دووگەڕەك بە (مارڕ)ێك بەستراونبەیەکەوە، کاتێك خەڵکی هەورامان حسابیان بۆ ئەم لایەنە کردووە لەکەم شوێنی تردا بایەخ بە (مارڕ) دراوە، با سەیری ئەوە بکەین چۆن حسابیان بۆ (یاسای هاوکێشە قانون التوازن) کردووە کە یاسایەکی فیزیاوییە، بۆ ئەم مەبەستەش (دیمەك)یان بەکارهێناوە بۆ بەستنەوە و شەتەکدانیی دیوارەکان بەیەکەوە و دابەشبوونی هێز بەسەریاندا، چۆن بەردی زلزلیان خستۆتە بناغەی خانووەکان بۆ ئەوەی زۆر پتەو وتۆکمەبن، چۆن لەو

---

تەختی شوێنەکەیان جیاوازە، هەندێکیان زۆر تەسکن پێیاندەوترێت (وەچەکڵە)، تەلاّنەکانیش چەندە پان و پۆڕبن زیاتر ریزە دار و نەمامیان تێدادەڕوێنرێت، ئەوکەڵکە بەردانەی بۆجیاکردنەوەی تەلاّنەکان درووستدەکرێن سالاّنە لەئەنجامی بارینی بەفر و باران لێیاندەروخێت، لەوەرزی بەهاردا دووبارە هەڵدەچنرێنەوە و بەم کارەش دەوترێت (کەلۆنیای).

کوز: ئەو جۆگەلە بچوکەیە کە لەناو تەلاّنەکاندا دروستدەکرێت و دارونەمامەکان لەلێواریدا دەڕوێنرێن.

بەنگا: تاڤگەیەکی بچوکە کە ئاو لە تەلانێکەوە دەڕژێنێتە تەلاّنەکەی خوارەوەی.

قەڵوەز و ئاژین: بریتین لە بەربەستێك و حەوزێکی بچکۆلە بەدەوری دارونەمامەکاندا درووستدەکرێن بۆ ئەوەی ئاوەکە پەنگبخواتەوە و بەخێرایی بەناو کوزەکاندا نەڕوات.

باروم: ئەو کەڵکە بەردانەن کەلەنێوان باخەکاندا بۆ جیاکردنەوەیان لەیەکتری درووستدەکرێن.

مارڕ: ڕێڕەوێکە بۆ بەستنەوەی دوو کوچە بەیەکەوە، سەری دەگیرێت و لەسەریەوە خانوو درووستدەکرێت.

دیمەك: تەختەدارێکە لەسەر شێوەیەکی لاکێشەی شەشپاڵوو، درێژی لەمەترێك کەمتر نییە و پانیشی لە نێوان (20 30) سانتیمەترداپەو ئەستووریەکەشی لە نێوان (10 15) سانتیمەتردایە بەشێوەیەکی سەرەکی لەداری توو درووستدەکرێت.

شوێنە ساردو سڕانەدا حسابیان بۆ ئەوەکردووە رادەی شێ لەناو خانووەکانیانـدا زۆر نزمبێت و بەشێوەیەك نەبێت مەترسی لەسەر تەندروستیان دروستبکات، باسـەیرێکی هونـەری سـواقدانی زەوی و دیوارەکــان بکــەین، کــە تــەنها بــەخۆڵی ناوچــەکە و بەبــەردێك کەپێیــدەوترێت (سیرەکۆڵی=هێڵەساو) سواقدراون بەجۆرێك کە بریقەیان لێوەدێت.

دەبـا سـەرنجێکی بەرهـەمی پیـشە دەسـتییەکان وەك: (کـلاش، پـالأ= پـێڵاو، رانکوچـۆغە، مـەوج، جـاجم، بـەرماڵ، جـەرە، گـۆزە، کـەنوو، گلێنـە[1]، بـادی، مـەن، دنـگ، کەشکەسـاو[2]، هاڵوە[3]، کەوجێز، کەوگیر، کەوچك، شانە، چەقۆ، قەڵەمبڕ، یەخدان، هەزارپێشە[4]، بێشکە و لانکـی منـدال، گـۆزە و بلـوێری ناوبێـشکەکەڵ ... هتـد) بـدەین، بەوردبوونـەوە لـەم بەرهەمانـە بۆماندەردەکــەوێ ژیــری و دەســتڕەنگینی لەڕاددەبــەدەر بــۆ بەرهــەمهێنانیان خراونەتــەکار، هەرلێرەوە ئیتر هونەری خۆڕسك سـەراپای جومگـەکانی ژیـانی خـەڵکی هـەورامانی گرتۆتـەوە و لەگەڵ هەموو قۆناغەکانی تەمەنیاندا تێکەڵبووە.

پاش ئەم پێشەکییە دەچینەسەر باسکردنی چەند لایـەنێك لەلایەنـەکانی ژیـانی خـەڵکی هەورامان بۆ دابینکردنی ژیان و گوزەرانیان بەم شێوەیەی خوارەوە:

### باخداری

هەر کەسێك بەهەوراماندا گوزەربکات یەکسەر سـەرنجی بـۆ باخـەکان رادەکێـشرێت کـە بــەرزایی و لێــرەوار و دۆڵ و نــشێوەکانیان داپۆشــیوە و گــەواهی رەنــج و مانــدووبوونێکی درێژخایەنن، باخـداری لەهەورامانـدا بـوارێکی گـەورەی بەرهـەمهێنان و سەرچاوەیەکی دیـاری دابینکردنـی بەشـێك لـەژیان و گـوزەرانی هەورامییـەکان و هێمـای ئامـادەیی هەمیـشەیی رۆحـی پێشینەکان و رەسـەنایەتی لەرادەبەدەریانـە، هەورامییـەکان خۆشەویـستییەکی سـەرمەدییان لـە

---

[1] گلێنە: جۆرێکە لە دەفر لەقوڕی سووری سوورەوکراوە دروستدەکرێت بۆ مەبەستی خواردن لەناویدا.

[2] کەشکەسـاو: جۆرێکـە لـە دەفـر لـەقوڕی سـووری سـوورەوکراوە دروسـتدەکرێت بـۆ سـاوینەوەی کەشـك بەمەبەستی دروستکردنی دۆخەوا.

[3] هاڵوە: دەفرێکە لە دار درووستدەکرێت و شیری کوڵاوی تێدەکرێت بەمەبەستی درووستکردنی ماست.

[4] هەزارپێشە: سـندوقێکە لـەدار دروسـتدەکرێت، خانەخانـە دەکرێـت بەمەبەسـتی هـەڵگرتنی قـۆری و پیاڵـە و ژێرپیاڵە تیایدا.





گەڵ باخدا هەیە، ئەو خۆشەویستییە زۆربەی سووچەکانی ژیانیانی گرتۆتەوە، تەنانەت لەناو گۆرانییەکانیشیاندا جۆرێکی تایبەتیان بەناوی (گۆرانی دەرەیی) هەیە، هەر ئەو خۆشەویستییەش وایکردووە بە سەلیقەیەکی ورد تواناو وزەی لەش و شێلەی گیانیان بە باخەکانیان ببەخشن، بەرۆحێکی سووك و بەشێوەیەکی ماندوونەناسانە تەنانەت شوێنە رژد و یاخییەکانی ناوچەکەشیان بە تەلاّن و باخی رەنگین برازێننەوە، لەم بوارەدا بەردەوام لەگەڵ سرووشتدا دەست و پەنجەیان نەرمدەکەن، رۆژ و مانگ و ساڵ بەکارکردن پێکەوە گرێدەدەن بۆ:

(نەوەکان، کێلاّن، پەینکردن، ئاودان، ناشتنی نەمام، هەڵپاچینی دار، کۆکردنەوەی بەرهەم......هتد)، بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانەش چەند ئامێرێك بەکاردەهێنن وەك: (پاچ، خاکەناز، بێڵ، تەور تەورزین، تەورداس، داس، پیك، نوێل).

ئیرادەی هەورامییەکان لە بواری باخداریدا ئیرادەیەکی کەمنموونەیە، زۆرجار بۆناشتنی چەند نەمامێك، یاخود دروستکردنی تەلاّنێك لەو زەوییە رژدو بەردەلاّنانەدا و لەو شوێنە سەخت و هەورازانەدا، دوور لە سستی و تەمەڵی ئارەقەی ماندووبوون دەرژێنن و بەکۆڵ خۆڵ دەگوێزنەوە، بە سەرنجدانێکی خێرا لەو هەموو (تەلاّن، کەڵەك، بارووم، راگا=رێرەو)انە لە هەورامانـدا هەن گەورەیی ئەو ئیرادەیە دەسەلمێنرێت. ئەگەر هەموو کەڵەکی باخەکان بخرێنەوەسەر یەکتر، بەدڵنیاییەوە هێندەی شووره بەناوبانگەکەی (چین) درێژن.

بەرهەمی باخەکانی هەورامان بە شێوەیەکی سەرەکی بریتییە لە: (گوێز، توو، ترێ، هەنار، هەنجیر، هەرمێ، هەڵووژە، قەیسی، قۆخ، بەهێ، گێلاس)، ئەم بەرهەمانە بە تە ڕی و وشکەوکراوەیی وەك سەرچاوەی خۆراکی بەکاردەهێنرێن و ئەوانەشیان لە پێویستی خێزان زیاتربن دەفرۆشرێن وەك سەرچاوەیەکی داهات، زۆربەی ئەو خێزانانەی باخی گەورە و چاکیان هەیە ساڵانە داهاتێکی باشیان لە بەرهەمی باخەکانیان دەستدەکەوێت.

بێجگە لە باخەکان رووبەرێکی زۆر لەقەد پاڵی کێو و بەرزاییەکانی هەورامان بە (رەزەدێم) داپۆشراون، (رەزەدێم)ەکان بە شێوەیەکی سەرەکی تایبەتن بە بەرهەمهێنانی(ترێی رەش)، دار و دەوەنە خۆرسکە سروشتییەکانیش بایەخی خۆیان هەیە، بێجگە لەوەی چەندین بەرهەمی وەك: (قەزوان، بنێشت، گۆێژ، بەرو، بەلاّلووك، کەتیرە....هتد)یان هەیە، سەرچاوەیەکی سەرەکین بۆ خۆگەرمکردنەوە و گوزەراندنی وەرزی سەرما و سۆڵە.

دوای ئـەم پێـشەکییە کورتـە دێینـە سـەر باسـکردنی هەنـدێك لـەو کارانـەی لـە بـواری باخداری هەوراماندا بایەخیانپێدەدرێت بەم شێوەیە:

### 1/ نەوەکان= هەڵکەنـدن وچاککردن و تەختکردنـی زەوی:

شتێکی ئاشکرایە زۆربـەی باخـەکانی هـەورامان لـە نـاو زەوی سـەخت و رژد، بەقـەدپاڵی شاخ و کێوەکانەوە، یاخود لەناو دۆڵەکانـدان، کـرداری چاکردن و تـەختکردنی ئـەو زەویانـە لای هەورامییـــەکان (نـــەوەکان)ی پێیـــدەوترێت، کـــاری نـــەوەکانکردن زۆرگرانـــە و پێویـــستی بەجەستەیەکی ساخ و بەهێز هەیە، بۆیە زۆرجار باخدارەکان خۆیان ئەم کارەناکەن و کرێکاری بـۆدەگرن، لـەکاتی نەوەکانکردنـدا پێویـستە ئـەو زەوییـەی کـە دەکرێـت بـەباخ بـەقوولایی(1- 5،1 مـــەتر) هەڵبکـــەنرێت، هەرچـــی بـــەردی تێدایـــە دەربهێنـــرێن وبکـــرێن بـــە کەڵـــەك بۆدرووسـتکردنی تەلانـەکان، هەنـدێکجار وارێکدەکـەوێت خـۆڵی ئـەو زەوییـە ئەوەنـدە کەمـە پێویستدەکات لە شوێنێکی ترەوە خۆڵی بۆ بهێنرێـت و تـەختبکرێت، ئـەو بەردەزلانـەی لـەکاتی نەوەکانکردنـدا دەردەکـەون، بـە نوێـڵ دەردەهێنـرێن و بـە پیـك ورددەکـرێن بـۆ سـوودوەرگرتن لێیـــان لـــەناو کەڵەکەکانـــدا، هەنـــدێك لەباخـــدارەکان پـــاش نـــەوەکانکردن پەیندەکەنـــە نـــاو زەوییەکەوە و پاشان (کووز، قەڵوەز، ئاژین)ی تێدا درووستدەکەن ونەمامی تێدا دەرووێنن، زەوی نـەوەکانکراو باشـترین زەوییـە بـۆ چـاندنی هەنـدێك لـە بەربوومـەکان، وەك: (تەماتـە، بـامێ، باینجان، بیبەر، پیاز، پەتاتـە، شـێلم، سـڵق، سـەوزەواتی تـر)، هەنـدیکجار ئـەو باخانـەی کـە زۆر زوودانـــراون، وەیـــاخود باخـــدار دەیـــەوێت گۆڕانکـــاری لـــە جـــۆری دارەکانیانـــدا بکـــات، نەوەکاندەکرێنەوە، ئەمـە کـارەش زامنـە بـۆ ئـەوەی ئـەو نەمامانـەی تـازە دەڕوێنـرێن بـەهێز و بەرهەمـداربن، زۆربـەی باخـدارەکان لەزەوییـە نەوەکانکراوەکانیانـدا (چـنار) دەڕوێـنن و پـاش چەند ساڵێك دەیانبڕن بۆ فرۆشتن، یاخود بۆ پێویستی خۆیان.

### 2/ پەینکردن:

**شـتێکی ئاشـکرایە مـرۆڤ چـۆن پێویـستی بـەخۆراك هەیـە و یەکێکـە لـە هۆکـارە هەرەگرنگەکانی بەردەوامبوونی ژیانی، دار و درەختیش بەهەمان شێوە پێویستییان بـە خـۆراك هەیە، بەڵام خۆراکی دار و درەخت لە هینـی مـرۆڤ جیـاوازە و بەشـێوەیەکی سـەرەکی لـەو مـادە ئەندامییانـە پێکـدێت کـە لـە نـاو زەوی دان، یـاخود لـەرێی پەینکردنـەوە دابینـدەکرێن، پـەین بەشێوەیەکی سەرەکی دوو جۆرە بەم ناوانە:**

**1ـ پەینی ئاژەڵ**

**2ـ پەینی کیمیاوی بەهەموو جۆرەکانییەوە وەك (یۆریا، نتراتی ئامۆنیۆم، پـەینی N.P ، پەینی N.. P.K، سۆپەرفۆسفات) ... هتد**

**هەورامییـەکان هەرلەدێرزەمانـەوە دەرکیـانکردووە بـەگرنگی پـەین بـۆ باخـچە و باخەکانیان و بۆ پەینکردنیان پاشـەرۆی ئاژەڵیـان بـەکارهێناوە، ئـەم جـۆرە پەینـە لەبەرئـەوەی رێژەیـەکی بـاش لـە مـادە ئەندامییـەکانی تێدایـە کـە (موادعـضوية)یـان پێـدەوترێت، بەئاسـانی قەرەبووی ئـەو رێـژە خۆراکـەی کردۆتـەوە کـە سـاڵانە نـەمام و دارەکـان لـە رێـی رەگەکانیانـەوە هەڵیانمژیوە، هەر لەم بوارەدا زۆرباش دەرکیانکردووە بەوەی کە پەینی ئـاژەڵ سـەرەرای ئـەوەی کەرەسـەی خـۆراکی زۆری تێدایـە، کاریگـەری زۆریـشی لەسـەر چاککردنی خەصڵەتەکانی زەوی هەیـە، هەرچـەندە ئـەوان بایـەخی زانـستی ئـەوەیان نـەزانیوە پـەینی ئـاژەڵ دەبێتـە هـۆی فـشبوونەوەی زەویـی دەوری دار و نەمامـەکان، ئـیتر لـەوەوە هـەم رێژەیـەکی زۆر لـە ئۆکـسجین لەناو ئەو بۆشاییانەدا دەمێنێتـەوە کـە پەینەکـە درووسـتیاندەکات، هـەم دارو نەمامـەکان باشـتر سوود لە ئاودانیان وەردەگرن، بەڵام لە رووی ئەزموونی کەڵەکـەبووی چـەندین سـاڵەیانەوە ئـەم سوودانەیان بۆ سەلماوە.**

**باخـدارەکانی هـەورامان هـەر لـە زسـتانەوە هـەوڵی ئـەوەدەدەن پـەینی پێویـست بـۆ باخەکانیان دابینبکەن، لەم بوارەدا ئەوانەی خاوەنی (ئاژەل و رەشـە وڵاخ)ن پـەینی ئاژەڵکانیـان لەناو گەورِەکاندا هەتا وەرزی بەهار دەهێڵنەوە، ئەو باخدارانەش خۆیان ئاژەڵ و رەشە وڵاخیـان نییە، سوود لە پەینی ئاژەڵدارەکان وەردەگرن، زۆرجار باخـدارێك چـەند گـەورێك پاکدەکاتـەوە و پەینەکەیان بۆ باخەکەی دەبات، پەینکردن لـەوەرزی بـەهاردا و پـاش خۆشـکردنی کەشـوهەوا دەستپێدەکات، بەتایبـەت لـە مـانگی ئـازارەوە بـۆ ناوەراسـتی مـانگی نیـسان، پـەینیش بـە بـەرزە وڵاخ، یاخود بە کۆڵ بۆ ناو باخەکان دەگوێزررێتەوە، لە وێش بەچواردەوری دار و نەمامەکانـدا رۆدەکرێـت، زۆرجـار هەنـدێك باخـدار پـاش ئـەوەی پەینەکـە کـەمێك وشـکدەبێتەوە لەگـەڵ**

خۆڵەکـەی ژێـرەوەی تێکەڵیدەکـەن، ئـەو تێکەڵکردنــەش پەینکردنەکـە زیـاتر بەسـوودەکات و زامنێکی باشیشە بۆئەوەی دار و نەمامەکان هەم نەشونمایان باشتر بێت، هـەم بەرهەمەکـەیان زۆر و جۆرەکەشی چاکتر بێت.

### 3/ کووزەماڵ

کووزەمـاڵ یەکێکـە لـە کارەکـانی بـواری خزمـەتکردنی باخـەکان، هـەموو باخـدارەکانی هـەورامان بایـەخی تـەواوی پێـدەدەن و لـە کـاتی گونجـاوی خۆیـدا باخـەکانیان کووزەماڵدەکـەن، کوزەمـاڵ کـاری پاککردنـەوەی (کووزەکانـە= ئەوجۆگەلانـەی لـەناو تەلآنەکانـدان) و ڕێکخسـتنی قەڵوەز و ئاژینەکانە، مەبەستیش لەم کارە ئەوەیە کاتی ئاودان دار و نەمامـەکان بـە باشـی ئـاو بخۆنــەوە و ئاوەکـە بـە تەلآنەکانـدا بلآونەبێتــەوە، چـونکە ئەگـەر هـەموو سـاڵێك کووزەکـان پاکنەکرێنەوە، ئەو قوور و لیتەیەی کاتی ئاودان دێتـە ناویانـەوە تەسك و بـچووکیاندەکاتەوە و بـەرە بـەرە پڕدەبنــەوە، ئـیتر ئـاو بـە باشـی بەناویانـدا نـاڕوات وبـەناو تەلآنەکانـدا و بەسـەر کەڵەکەکانـد بلاودەبێتــەوە، هەورامییــەکان زۆر بــە وریاییــەوە کووزەمــاڵی باخەکانیاندەکـەن، هەموو کوزێك بەپێی گەورەیی و بچووکی چەندە پێویستە هەر ئەوەندەی هەڵدەکەنن، لەگەڵ پاککردنەوە و هەڵکەنـدنی کووزەکـانیش قـەڵوەز و ئاژینـەکانیش ڕێکدەخەنـەوە، کووزەمـاڵکردن بەبێ ڕێکخستەوەی قەڵوەزەکان مانایەکی نابێت، لەبەر ئەوەی قەڵوەزەکان لـە نزیـك دارەکانـەوە درووسـتکراون و مەبەسـتیش لــە درووسـتکردنیان ئەوەیــە ئــاو لەناویانــدا پەنگبخواتــەوە و بەخێرایی نەڕوات، هەتاکو بەتەواوەتی زەوی دەورووبەری نەمام و درەختـەکان بخوسـێنێتەوە و ڕەگـەکانیان تێرئـاوببن، باخـدارەکانی هـەورامان لـە کـاتی کووزەمـاڵکردن زۆر ئاگـاداری نەمامـە بچووك و تازە پێگەیشتووەکان دەکەن و هەوڵدەدەن ڕەگەکانیان بریندارنەکەن، چونکە نـەمامی ناسـك ڕەگـــەکانیان زۆر ناچـــن بـــە قووڵآیـــدا وئەگـــەر دەورووبەرەکـــەیان زۆر هەڵبدرێتـــەوە بریندارەبن و زیانیانپێدەگات.

پـێش ئەنجامـدانی کووزەمـاڵ و بەتایبـەتی لـەو سـاڵآنەدا کـەمبارانیبێت، باخـدارەکان باخەکانیان ئاودەدەن هەتاکو کوزەکان بخوسێنەوە و کارەکەیان بـۆ ئاسـانبێت، پـاش کوزەمـاڵیش ئاوی باخەکان دەدەن بەوەش نەمام و درەختەکان بەیەکەم ئاودانی ساڵی نوێ تێرئاودەبن.

**4/ ئاودان= نۆباو:**

**ئـاودان لەهەورامانـدا پێیـدەوترێت (نۆبـاو) کـە وەك عـورفێکی کۆمەلایـەتی دامـەزراوە لەگەڵ ئەوەدا ملکەچنییە بۆ هیچ یاسایەك، کەچی بـەرێکوپێکترین شـێوە بەرێوەدەچێت، ئـەم عورفــە ئەوەنــدە کاریگــەرە نزیکــەی ســەدەیەکە کــەس ناتوانێــت بیبــەزێنێت و زیــادەڕەوی بکاتەسەری، لەبەرئەوە دەبینین ئەو کێشە و ناکۆکیانـەی لـە سـەر ئـاودانی زەوی و باخـەکان لـە شـوێنەکانی تـر درووسـتدەبن، لەهەورامانـدا هـەرنین، یـاخود زۆر کـەمن و هـەرگیز رووداوی ناخۆشیان لێنەکەوتۆتەوە، ئاو لەهەوراماندا بەم دووشێوازەی خوارەوە دابەشکراوە :**

**1/ دابەشکردن بەپێی سەعات:**

**لەسەر بنەمای ئەم شێوازە لە زۆر شوێنی ناوچەکەدا ئاو بـەپێی سـەعات بەسـەر خـاوەن باخ و خاوەن زەوییەکاندا دابەشکراوە، هەموو باخدارێك بەپێی زۆر و کـەمی باخەکـەی، یـاخود نزیکـی و دووری لـە سەرچـاوەی ئاوەکـەوە چـەند سـەعاتێك ئـاوی بـۆ دیـاریکراوە، ئـەو چـەند سەعاتە بووە بە مافێکیّ تایبەت وەچە بۆ وەچە دەگوێزرێتەوە و کرین و فرۆشتنی پێـدەکرێت، باخدارەکان لەوکاتەی بۆیان دیاریکراوە، سوود لە ئاوەکە وەردەگرن و کەس ناتوانێت زیـادەڕەوی بکات، هەموو باخدارێك دەزانێت کاتی ئاودانەکەی کەیە و چەند سـەعات ئـاوی هەیـە، ئایـا لـەو کاتەدا بۆی هەیە هـەمووئاوی ئـەو سەرچـاوە بـەکاربێنیّ کـە باخەکـەی دەکەوێتـە بەردەمیـەوە، یاخود باخداری تری دراوسێی لەگەڵیەتی.**

**2/ دابەشکردن بەپێی شەو و رۆژ و جووڵەی خۆر:**

**لەسەر بنەمای ئەم شێوازەشیان لەهەندێك شـوێندا ئـاو بـەپێی جووڵـەی خـۆر و شـەو و رۆژ دیاریکراوە، لەم شێوازەشیاندا هەر وەك شێوازی یەکەم هەموو باخدارێك چوارچێوەی مافی خـۆی لەئاودانـدا بـۆ دیـاریکراوە، ئـەم شـێوازە زیـاتر لـەو چـەمانەدا پـەیڕەودەکرێت کـە ئاویـان زۆرتـرە تەنانـەت لـە سـاڵەکانی کەمبارانیـشدا ئەوەنـدە کـەمئاوییان پێوەدیـار نییـە، بـۆ نموونـە (چەمی خوارەوەی تەوێڵە کەبەزمانی خەڵکی ناوچەکە پێیدەوترێت دەرەی وارین).**

**هەندێك ساڵ لەئەنجامی کەمی باران و بەفر ماوەی ئاودان درێژدەکرێتەوە، چـونکە ئـەو چەمانەی ئاوەکەیان بەسەر دووجۆگەدا دابەشبووە دەکرێتەوە بە یەك جۆگە و ئیتر وای لێدێت**

ئەو باخدارانەی پێشتر هەفتەی جارێك سەرەی ئاودانیانبووە، بەدووهەفتە جارێك بتوانن باخەكانیان ئاوبدەن[1].

ئاوی (نۆباو) كەدێتە ناو باخەوە بەهەموو ئەو تەلآنانەدا دەڕوات دار و نەمامیان تێدا روێنراوە، هەموو تەلآنێكیش بەپێی گەورە و بچووكی (كووز)ی تێدا دروستكراوە، تەلآنی واهەیە تەنها كوزێكی تێدایە چونكە هەر یەك ریز دار و نەمامی تێدایە، تەلآنیش هەیە هەتاكو دە (كووز)ی تێدایە بە تایبەت ئە و تەلآنە پان و پۆڕانەی پێیانـدەوترێت (تەختە) یاخود (ماوەزا[2]).

(كووز)ی ناو تەلآنەكان بە جۆرێكی زۆر رێك و پێك دروستكراون، بە درێژایی كووزەكان بەینا و بەین (قەلۆەز) دروستكراون بۆ ئەوەی ئاوەكە بە خێرایی بەناویاندا نەڕوات و دار و نەمامەكان تێر ئاوبن، دووری نێوان قەلۆەزەكان بەپێی ژمارەی دار و نەمامەكان دیاریكراوە، هەموو تەلآنێك (بەنگا)یەكی سەرەكی دەرژێتە ناویەوە، لە كۆتایی تەلآنەكەشدا

---

[1] كاتێك رووبەری باخەكانی هەورامان فراوانبووە و ژمارەیان زۆر بووە، ئاویش هەر ئەوە بووە كە پێشتر هەبووە بۆ ئەوەی كێشە لەناوخەڵكی ناوچەكەدا دروست نەبێت، نۆباو بەپێی سەعات و بەپێی جووڵەی خۆ رو شەورۆژ بۆ یەكەمجار ساڵی (1928ز) لەشارەدێی تەوێڵە و بە فەرمانی (قادربەگی جافرسان) پەیڕەوكراوە، ئەوەش بە دروستكردنی لیژنەیەكی تایبەت بۆ دیاریكردنی چوارچێوەی ئەم دوو شێوازە لە نۆباو بەشێوەیەك هەموو كەسێك بەشی ئاوی خۆی بۆ دیاری بكرێت، لیژنەكە لەچەند بەڕێزێكی ناوچەكە پێكهێنراوە لەوانە: (میرزا ئۆلقاری تەوێڵەیی، سەید فتح المبین، حاجی ئایزەی حەبیب، ئەحمەد ئیسحاق، غەفار بەگ ... هتد)، پاش ئەوەی لیژنەكە لەكارەكانیان بوونەتەوە باخدارێكی تەوێڵەیی كە شاعیرێكی میللیش بووە بەناوی (حەمەلەتیفی سەیفوور) كە باخەكەی كەوتووەتە سەر (جوۆ دەگیٚ = جۆگەی دێ) و سەرپەڕ بووە، ناڕەزایی لەبەشە ئاوەكەی بەنامەیەك بۆ (قادربەگ) نووسیوە، سەرەتای نامەكەشی بەم دوودێڕە شیعرە دەستپێدەكات:

قادربەگ بدییە پیٚ دەردو خەمیم — نوباوم بیەن بە هەڵسو چەمیم

كورە و كەمولە و بابالە و یاقو — پاراو باخەوان بەش بڕیا بڵكۆ

واتە: قادربەگ سەرنجی دەردوخەمی من بدە كە نۆرەئاوەكەم بووە بە فرمێسكی چاوم، لەكاتێكدا هەریەك لەو كەسانەی كەلە نیوەی یەكەمی دێڕی دووەمدا ناوی بردوون، باخەكانیان پاراوە و بۆ نموونە ناوی (باخەوان)ی هێناوە كە یەكێكە لەباخە هەرە چاكەكانی تەوێڵە، باخەكەی خۆشی كە ناوی (بڵكۆ)یە وشك و بەشبڕاوە.

پاش ئەم سكاڵایە (قادربەگ) بۆجاری دووەم چاوی كاری لیژنەكەدا خشاندووەتەوە و فەرمانیداوە كێشەكەی چارەسەر بكەن، ئیتر هیچ كەسێكی تر گلەیی لەم دووشێوازی دابەشكردنی ئاوە نەكردووە، پاشان هەمان شێواز لەگوندەكانی تری هەوراماندا پێڕەوكراوە.

[2] ماوەزا: بەو تەلآنە پان و پۆڕانە دەوترێت كە تایبەتن بە داری گوێزی گەورە گەورە.

بەنگایەکی تر هەیە زیادئاوی تەلأنەکە دەرژێنێتە تەلأنەکەی خواریەوە، هەندێك تەلأنیش لە ناوەراستیانەوە بەنگای بچووك هەیە بۆ زیاتر ئاسانکردن و سوود وەرگرتن لە ئاودان.

ئاوی (نۆباو) بۆ ئەوەی سوودی خۆی بگەیەنێت نابێت لێڵبکرێت، پاش ئاودانیش لەبەر ئەوەی تەلأنەکان دەبن بە قوڕ، بۆماوەی (21) رۆژ باخدارەکان پێیانناخۆشە خەڵك بەناو تەلأنەکاندا گوزەربکەن، یاخود منداڵ و مێرد منداڵان راوراوێنیان تێدا بکەن و لەو کاتانەدا پێیاندەڵێن قورەشێلمەکەن.

لە رۆژی (نۆباو)دا باخدارەکان خۆیان، یاخود یەکێك، یان زیاتر لەئەندامانی خێزانەکانیان و هەندێکجار تەنانەت هاوسەر و منداڵەکانیان، جارجاریش رێکدەکەوێت یەکێك لە کەس وکار، یاخود دراوسێ باخەکانیان لە گەڵیان بەشدارییدەکەن، هەتا ئاودانەکە بەرێکوپێکی بەرێوەبچێت، هەرچەند لەو رۆژەدا ماندوودەبن بەلأم وەك سەیرانێکی بچکۆلەیە بۆیان، چونکە هەوای باخەکان تەواو فێنك و دیمەنیان قەشەنگ و دڵرفێن دەبێت و مرۆڤ هەست بەچێژێکی ئەفسانەیی دەکات، خواردنی تایبەتیش ئامادەدەکرێت بۆ نیوەرۆ بەتایبەت (یاپراخ)، باشترین کاتی (نۆباو) لای هەورامییەکان شەوە و هەرباخێکیش بەشەو ئاوبدرێت دەڵێن شەواوی خواردۆتەوە، سەر لەبەیانی زوو و پاش فێنکی عەسریش دووکاتی گونجاون لایان، چوونکە لەوکاتانەدا پلەی گەرما نزمە و دار و نەمامەکان بەباشی لەئاودانیان سوودوەردەگرن، (نۆباو) ئەگەر بەشەو بێت زۆرجار کۆمەلێك کوڕ و کاڵ کۆدەبنەوە و بە شەوێك ئاوی باخێك، یان زیاتر دەدەن، بەتایبەت ئەو باخانەی دەکەونە ئەملا و ئەولای یەکترییەوە، ئەو شەوە لەگەڵ سەرقاڵبوونیان بە ئاودانەوە گۆرانیدەچڕن و خۆشی و بەشارەت دەبەخشنەوە، خواردنی تایبەتیش درووستدەکەن کەزۆرجار (سەروپی)یە و بۆسەرلەبەیانی زوو بە لایانەوە خواردنێکی پەسەندە.

(نۆباو)ی هەورامان یەکێکە لەو کارانەی گیانی هاوکاری و یارمەتیدانی تێدا بەرجەستەبووە، هەندێکجار وا رێکدەکەوێت خاوەن باخێك لەکاتی نۆباوەکەیدا ئامادە نییە، بێئەوەی بەدراوسێ باخەکەی وتبێت، بەلأم لە هەستکردن بە گیانی هاوکارییەوە ئاوەکەی بۆ دەدێرێت، ئەوەش وەك ئەرکێکی سەرشانی خۆی و بەبێئەوەی هیچ جۆرە منەتێکی بەسەردابکات، ئەوەش زیاتر گیانی خۆشەویستی و بەتەنگەوەهاتنی یەکتری لەنێوانیاندا پتەودەکات.

***سەرچاوەکانی ئاودان***

**سەرچاوەکانی ئاودان لەهەوراماندا بەشێوەیەکی سەرەکی بریتین لە:**

**1ـ چەم 2ـ جۆگە 3ـ کانی 4ـ ئەستێڵ 5ـ کارێز**

**ئاو لەم سەرچاوانەوە بەشێوەیەکی زۆرنایاب دەگاتە باخەکان، سەبارەت بە چەمەکانی هەورامان هەریەکە چەند جۆگەیەکیان لێهەڵدەکرێت، ئەوەش بەپێی کورت و درێژی چەمەکان و ژمارەی ئەو کانیانەی دەرژینە چەمەکانەوە و بڕی ئاوەکەیان، (کارێز)ەکانیش بایەخیان کەمترە، چونکە لەلایەك ژمارەیان کەمە و لەلایەکی تریشەوە زۆربەیان ئەستێل لەبەریان درووستکراوە، لەبەر ئەوە لەم باسەدا تەنها کەمێك لەسەر (جۆگەکان، کانییەکان، ئەستێڵەکان) دەدوێین بەم شێوەی خوارەوە:**

**1ـ کانی: یەکێکە لەسەرچاوەکانی ئاودان، زۆربەی کانییەکانی هەورامان ئاویان سارد و سازگارە، رادەی ساردی ئاوەکەشیان بەپێی نزمی و بەرزی شوێنەکەیانە، بەومانایەی هەتا کانییەکە لە بەرزایدابێت ئاوەکەی ساردترە، زۆربەی کانییەکان لەهەرچوار وەرزی ساڵدا ئاویان هەیە، بەڵام لەسەرپاییزدا ئاوەکەکەیان کەمدەکات، هەندێك کانیش هەن تەنها لە وەرزی بەهاردا ئاویان هەیە و پێیاندەوترێت (بەهاراو)، هەورامییەکان پاکی و سازگاری ئاوی کانییەکانیان بەوە دەنرخێنن تاچەند بۆ خواردنەوە سووك بێت و بەزوویی تینوویەتی بشکێنێت، هەروەها زیخ و چەوی ناوکانییەکە پاکبێت و قەوزە نەیگرێت.**

**کانییەکانی هەورامان بایەخێکی زۆریان بۆئاودانی زەوی و باخەکان هەیە، هەندێکیشیان بۆخواردنەوە لەلایەن (کەژەوان، راوچی، رێبوار، گیا و گزرەبڕ، وەڵاخدار، ئاژەڵدار و هەوارنشێنەکان)ەوە سوودیان لێوەردەگیرێت، ژمارەیەك لەو کانیانە کە ئاوەکانیان زۆرە یەکسەر دەرژێنە ناو جۆگەکان، یاخود چەمەکانەوە، ئەوانەشیان ئاوەکانیان کەمە، بۆکۆکردنەوەی ئاو (ئەستێڵ) لەبەردەمیاندا درووستکراون.**

**2ـ جۆگە**

**جۆگەکانی هەورامان هەندێکیان زۆردرێژن و چەندین پارچە باخ و زەوی ئاودەدەن، هەندێکیشیان کورتن و تەنها چەند پارچەیەك ئاودەدەن، ئاو لەسەرەتای دەستپێکردنی جۆگەوە زۆرترە چونکە بەدرێژایی جۆگەکان ئاویان لێدەچێت، کاتی واهەیە تەنها (70ـ80٪ ) ئاوەکە**





دەگاتــە ســەر ئــەو باخانــەی دەکەونــە کۆتــایی جۆگەکــەوە، یــاخود نــزیکن لــە کۆتاییەکەیــەوە، لەدرووستکردنی جۆگـەکانی هەورامانـدا ژیـری و سـەلیقەیەکی ورد خراونەتـەکار، لـەو زەوییـە سەختانەدا بەشێوەیەکی پێچاو پـێچ جۆگـەکانیان درووسـتکردوون و زۆر بـەوردی حسابیان بـۆ ئەوەکردووە، کام زەوی ئاوی جۆگەکە دەیگرێتەوە، لـە هەنـدێك شـوێنی یاخیـدا بـە جۆرێـك لـە (قەم) کە لەدار، یاخود لە لەوح درووستیانکردووە، ئاوەکەیان پەڕاندۆتەوە، هەروەها لە قەدپاڵی شاخەکان و بە لێواری ڕێگاکاندا بە مانـدووبوونێکی زۆر،جۆگـەکانیان راکێشاوە و حیـسابیان بـۆ هەموو وردەکارییەکان کردووە.[برترلج]

3| **ئەستێل**

ئەستێڵەکانی هەورامان وەك حەوزێکی گەورە وان، بۆ ئـەوەی دیوارەکانیـان بـە هێـز بـن زۆربەیان لەبـەردەم هەنـدێك لـە کانییەکانـدا، وەیـاخود کارێزەکانـدا لـە سـەر شـێوەی خـڕ، یـان هێلکـەیی درووسـتکراون، درووسـتکردنیان بـەو شـێوانە بـۆ ئەوەیـە کاتێـك ئاوەکـە لـە ناویانـدا پەنگدەخواتەوە دیوارەکانیـان نەتـەقێن، بـۆ (دەردان= خـاڵی کردنـەوە)ی ئـاوی ئەسـتێڵەکان، لـە بنـەوە دەرگایـان بـۆ درووسـتدەکرێت، گـەورە و بچووکیـشیان پەیوەسـتە بـە بـڕی ئـەو ئـاوەی دەڕژێتــە ناویانــەوە، ئەســتێڵی وا هــەن لــە شــەو و ڕۆژێکــدا تــەنها یــەکجار خاڵیــدەکرین و هەندێکیشیان ڕۆژێك زیـاتر لـە جارێـك خاڵیـدەکرین، لـە گـەڵ هـەموو خاڵیکردنەوەیەکیـشیاندا چەند تەلانێك باخ ئاودەدەن، لـە هەنـدێك شوێنیـشدا ئەسـتێڵ هەیـە بەیـەکجار خاڵیکردنـەوەی پارچەیەك باخ ئاودەدات.

هەندێك لە ئەستێڵەکان تەنها موڵکیـەتی یـەك کەسـن و هەنـدێکی تریـشیان موڵکیـەتی دووکەس، وەیاخود زیاترن، ئەوەش بـەپێی زۆر و کـەمی ئاوەکـەیان و ژمـارەی ئـەو باخانـەی لـە ئەستێڵەکەوە ئاودەدرێن.

---

[برترلج] سـەلیقەی هەورامییـەکان لـە بـواری باخـداری بەگشتی و درووسـتکردنی (تـەلان، جۆگـە، کـووز، قـەڵوەز و ئاژینـەکان....هتـد) و سـەرنجی کەسـێکی وەك ئێدمۆنـدزی راکێـشاوە و لـەم بـارەوە لـە کتێبـی (کـرد، تـرك، عـرب)دا نووسیویەتی:

ئەندازیارێکی گەورە کە پسپۆڕی بواری ئاودانبوو پێیوتم: (زانیارییەکانی من لە بواری ئاوداریدا شتێك ناخەنە سەر زانیاری هەورامییەکان).

بڕوانە سەرچاوەی ئاماژەپێدراو لاپەڕە (155).

لەکۆتایی ئەم باسەدا دەچینەسەر ئەوەی سیستمی ئاودان لە هەوراماندا زۆر جیاوازە لەزۆربەی ناوچەکانی تر و لە هەندێك شوێندا سنوورەکانی بەزاندووە، هەرچەندە هەردوو دیوی هەورامان لە (ئێراق و ئێران) لەسەر رۆشنایی پەیمانێکی نێودەوڵەتی و بە هێڵێك کە پێیدەوترێت (هێڵی هەمایۆنی) سنووریان لەیەکتری جیاکراوەتەوە، ژمارەیەك لە جۆگەکانی هەورامان ئەو هێڵە سنوورییە دەبڕن و ئاوی باخەکانی (دزاوەر، تەوێڵە، شۆشمێی خواروو، بیارە، هانەگەرمەڵە) ئاو دەدەن، بۆ نموونە جۆگەی (شاجۆ) کە لەناو بازاڕی (تەوێڵە)وە هەڵدەکرێت، پاش ئەوەی ئاوی چەندین پارچە باخی (تەوێڵە) دەدات، لەشوێنێك کە پێیدەوترێت (ملەشۆپە[*]) دەچێتە دیوی ئێران و ئاوی باخەکانی (شۆشمێی خوارو) دەدات. هەروەها ژمارەیەك لەباخی (تەوێڵەییکان) بە ئاوی جۆگەکانی چەمی (دزاوەر) وەك جۆگەی (مالین) ئاو دەدرێن، بە هەمانشێوە لەنێوان باخەکانی (هانەگەرمەڵەیی) و (بیارەییەکاندا) ئەمە دووبارە دەبێتەوە، چەندین ساڵە هیچ کێشەیەك لە سەر ئاو لەنێوان خەڵکی ئەم گوندانەدا درووستنەبووە، تەنها جارێك نەبێت کە بەفیتی هەندێك گێرەشێوێن خەڵکی گوندی (دزاوەر) ئاویان لەباخی (تەوێڵەییەکان) بڕیوە، بەرامبەر بەوە (تەوێڵەییەکان)یش ئاویان لەباخەکانی (شۆشمێی خواروو) بڕیوە وەك کارتێکی فشار هەتاکو (دزاوەرییەکان) ئاو بۆ باخەکانیان بگێڕنەوە.

هەر ئەوە ماوە بیڵێین هەر چۆن هەورامیەکان لە زۆربەی لایەنەکانی ژیان و گوزەرانیاندا جیاوازن، لە (نۆباو)یشدا تایبەتمەندی خۆیان هەیە، لەبەر ئەوە بووە بە هێمای تێکەڵاوی و خۆشەویستی و هاوکاریکردن و کاریگەرییەکی دیاریشی لەسەر خەڵکەکە دروستکردووە.

## 5 پێوەنکردن

---

[*] ملە شۆپە: ملەیەکە دەکەوێتە سەر سنووری نێوان عێراق و ئێران بەرامبەر بەگوندی سۆسەکان، لە لایەکەوە دەروانێت بەسەر هەردوو گوندی (شۆشمێی سەروو، شۆشمێی خواروو)ی هەورامانی ئەودیو= ئێران و لە لایەکی تریشەوە دەروانێت بەسەر چەمی خوارەوەی تەوێڵەدا، خاڵێکی سنوورییە وپایگەی حکومەتی ئێرانیش بەسەریەوە درووستاکراوە.

پێـوەنکردن یەکێکـە لـەکارەکانی بـواری باخـداری ، لـە رێـی ئـەم کـارەوە هـەم دارە (زڕو (زڕبەری)یەکان دەبن بەداری بەرهەمـدار، هـەم ئـەو دارانـەش بەرهەمەکـەیان ورد و کـەم و بێکەڵکـە، دەتوانرێـت بەرهەمەکـەیان باشـبکرێت، شـتێکی ئاشـکرایە ئێـستا لەزۆربـەی وڵاتـە پێـشکەوتووەکاندا زۆربـەی ئەونەمامــە بەرییانــەی دەڕوێنــرێن پێویــستە لــەو جۆرانــەبن کــە پێـوەنکراون، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش شـەتڵگەی تایبـەتی بـۆ بەرهـەمهێنانی نـەمام هـەن، لـەو شـەتڵگانەدا تۆوەکـان دەچـێنرێن، پاشـان پیوەنـدەکرێن و دوای ئـەوەی سـاڵێك بـە پێوەنەکـەوە دەمێننــەوە، بــۆ شــوێنی تایبــەتی خۆیــان لــەناو باخەکانــدا دەگوێزرێنــەوە، بــۆ پێــوەنکردنی نــەمامیش پێویــستە ئــەو نەمامانــە لــە نێـوان خۆیانــدا لەیــەك خێزانــی نــەباتی بــن و پێکــەوە گونجاوبن، بۆ نموونە دەکرێت ئەو دارانەی کە ناوکی بەرهەمەکانیان رەقە وەك: (قەیـسی، قـۆخ، هــەڵووژە، بــادام) لەســەریەکتری پێــوەنبکرێن، هــەروەها ئــەو دارانــەی کــە پێیانــدەوترێت (الحمضیات) وەك: (پرتەقاڵ، لیمۆ، نارنج) لەسەر یەکتر پێوەندەکرێن، هەروەها (سـێو، هـەرمێ، بەهێ، گۆیژ) دەکرێت بەسەرکەوتوویی لەسەر یەکتر پێوەنبکرێن.

کاری پێوەنکردن لە هەردوو وەرزی بەهار و پایزدا ئەنجامدەدرێت، پێـوەنکردنی بـەهارە بەپێی پلەی گەرمای شوێنەکان دەکرێت هـەر لەسـەرەتای مـانگی (مـایس)، هـەتاکو کۆتـایی ئـەم مانگە و سەرەتای مانگی (حوزەیران) ئەنجامبدرێت، پێوەنکردنی پایزەش لـە ناوەڕاسـتی مـانگی (تەمووز)ەوە دەستپێدەکات و بۆ ناوەڕاستی مانگی (ئاب) بەردەوامدەبێت، بەڵام پێویستە لێرەدا بـاس لـەوە بکـەین کـە زۆربـەی تاقیکردنـەوە زانـستییەکان لـە بـواری پێوەنکردنـدا، ئـەوەیان سـەلماندووە کـە پێـوەنکردنی پـایزە باشـتر و سـەرکەوتووترە، چـونکە  پێـوەنی بـەهارە گـەرمای مانگەکانی (تەمووز و ئاب) دێـت بـە سـەریدا و مەترسـی وشـکبوونی لێـدەکرێت، بـەڵام پێـوەنی پـاییزە سـەوزبوونی دەکەوێتـە کاتێـك کـە رۆژ لـە دوای رۆژ پلـەی گـەرما بـەرەو نزمبوونـەوە دەچێت، وەك لە هەوراماندا بـاوە دەڵێن گەلاویـژ دەردەچـێت و کاریگـەری گـەرما لـەم ناوچـەدا تەواو کەمدەبێتەوە، لای هەمووشمان زانـراوە ئـەو نـەمام و دارانـەی گـەرمای هـاوین گـەڵاکانیان قرچۆڵدەکاتەوە و وشکیاندەکات، پاش دەرچوونی گەلاویژ جارێکی تر گـەڵای تـازە دەردەکەنـەوە و بۆ ماوەیـەکیش دەکەونـەوە نەشونماکردن، هـەر لـەو ماوەیـەدا پێوەنـەکانیش خۆیانـدەگرن و گەورەدەبن، پاشان دەچنە قۆناغی سڕبوون و ترسی وشکبوونیان نامێنێت.

---

[*] داری (زڕبەری) بەو دارانە دەوترێت بەرەکەیان کەم و جۆرەکەشی خراپە.

هەرچەندە هەر لەدێرزەمانەوە پێوەنكردن لە هەوراماندا بووە، هەندێك لە باخدارەكان فێربوون بەباشی پێوەنیانداوە و لەكارەكەدا شارەزاییان پەیداكردووە، بەلاّم پێوەندانەكە تەنها لەرووی ژیری و سەلیقەی باخدارەكە خۆیەوە بووە و ئەوەندە بایەخ بە رووە زانستییەكەی نەدراوە، پێوەنكردن لە زۆربەی كاتدا لەسەر ئەو شێوەیە بووە كەوەك پیتی (T) ئینگلیزی وەهایە و بە گونجاندنی لە گەلّ باری كەشو هەوای ناوچە جیاوازەكان بە سەركەوتووترین جۆری پێوەنكردن لە قەڵەمدەدرێت، ئەوەش بە هەڵكەندنی توێكڵی لاسكی و لقی ئەو نەمام و دارەی ویستوویانە پێوەنیبكەن، بەدرووستكردنی درزێكی لابەلایی و پاشان درووستكردنی درزێكی تری ستوونی لەناوەراستی درزە لابەلایەكەوە بۆ خوارەوە، ئینجا ئەو گۆپكەی كە پێشتر لەدارێكی بەری چاكەوە وەریانگرتووە لە گەلّ كەمێك لە توێكڵی ژێر كۆپكەكەیان دەرهێناوە وخستوویانەتە نێوان ئەو توێكڵەی لە لاسكك، یان لقی ئەو دارەوە كە مەبەستیانبووە پێوەنیبكەن، پاشان هەر بە توێكڵی دارەكە خۆی، یاخود بە دەزوو بەستوویانە، ئیتر پاش (10 15) رۆژ كردوویانەتەوە، لەو ماوەیەدا پێوەنەكە سەوز بووە و ئەگەر سەوزیشنەبووبێت هەندێكجار كارەكەیان دووبارە كردۆتەوە.

بۆ ئەنجامدانی پێوەنكردن چەقۆی ئاسایی ناوچەكەی خۆیان بۆ درووستكردنی درزەكان بەكارهێناوە، بۆ بەستنی پێوەنەكەش هەر توێكڵی دارەكە، یاخود دەزوویان بەكارهێناوە، لێرەدا ئەو واتەی ئێمە دەسەلمێت كە پێشتر وتمان بایەخیاننەداوە بە رووە زانستییەكەی پێوەنكردن، چونكە ئەو چەقۆیانەی پێویستە لە پێوەنكردندا بەكاربهێنرێن، جۆرێكی تایبەتن كە پێیاندەوترێت (چەقۆی پێوەنكردن)، هەروەها بۆ بەستنی پێوەنەكان پێویستە جۆرێك لە دەزوو بەكاربهێنرێت كە پێیدەوترێت (دەزووی رافیا)، چونكە ئەم جۆرە دەزووە لەكاتی سەوزبوونی پێوەنكە بەپێی پێویستی نەشونماكردنی دەكشێت.

پاش قسەكردن لەسەر هەندێك لەكارە خزمەتگوزارییەكنی بواری باخداری لە هەوراماندا، دەچینە سەرباسكردنی ئەو دارە بەرهەمدارانەی بایەخێكی ئابووری گەورەیان لە ژیانی خەڵكەكەودا هەیە وەك:

***1/ داری گوێز:***





یەکێکە لەدارە بەرهەمدارەکان و بایەخێکی ئابووری زۆری هەیە، بەرهەمەکەشی هەر پێیدەوترێت گوێز، هەورامییەکان بە داری گوێز و بەرەکەشی دەڵێن (وەزی)، ئەم دارە تەمەنێکی زۆری هەیە و چەندین ساڵ دەژی، زۆربەی دارگوێزەکان بە درێژایی تەمەنی چەند نەوەیەك بەرهەمدەدەن، داری گوێز لە وەرزی پاییزدا گەڵاڕێزاندەکات و لە وەرزی زستانیشدا تەواو متدەبێت، بەهاران لەگەڵ خۆشبوونی کەشو هەوا دەژیێتەوە و دەکەوێتە نەشونماکردن، لە نەشونماکردنیشدا پێویستی بە ئاوی سارد و هەوای فێنك هەیە، لە شوێنی گەرمدا ناژی و گەرماو گڕەی هاوین وشکیدەکەن، ئەو زەوییانەی زۆر گریکدارن و لەکاتی وشکبوونەوەیاندا شەقدەبەن بۆ رواندنی گوێز گونجاو نین، رەگی داری گوێز زۆر بە ناو زەویدا رۆدەچێت و بڵاودەبێتەوە، هەروەها لق و پۆپیشی زۆر پەخشاندەبێتەوە بۆیە لە زۆربەی دارەکانی تر پێویستی بە شوێنێکی فراوانتر هەیە.

نەمامی گوێز لە رێی چاندنی گوێزەوە بەرهەمدێت، ئیتر ئەو گوێزانە باخدار خۆی بیانچێنێت، یاخود لەو گوێزانە بن سەرپاییز (سمۆرە) لە ناو باخەکاندا دەیانشارنەوە، گوێزەکان پاش سەوزبوونیان بە زمانی خەڵکی ناوچەکە پێیاندەوترێت (وەزڵێ) و باخدارەکان بە پێی پێویست سوودیان لێوەردەگرن، ئەوەش بە هەڵکێشانیان و گواستنەوەیان بۆ شوێنی هەمیشەییان لە ناو باخەکاندا، هەورامییەکان لە شێواز و چۆنییەتی رواندنی نەمامەکاندا زۆر شارەزان، لەم بوارەدا چەند خاڵێك هەن بایەخیاندەدەنێ بەم شێوەیە:

1ـ کێڵان وپەینکردنی شوێنی نەمامەکان.

2ـ پێچانی قەدەکانیان بە جورێك لە گوێنی کە پێیدەوترێت (گوێنی گوش)، بۆ ئەوەی گەرمای هاوین کاریان لێنەکات.

3ـ لەو شوێنەدا نەمامەکە دەروێنن ئەوە زۆر بە هەند وەردەگرن کە ئایا راستەوڕاست تیشکی خۆر لێیدەدات، یان نا.

داری گوێز کە لەبەهاراندا دەژیێتەوە و گەڵادەردەکات دیمەنێکی زۆر جوانی هەیە، سەرەتا بەگەڵاکەی دەوترێت (پاپا ژەرەژ)، پاشان بەرەبەرە گەڵاکەی گەورەدەبێت ولە گۆپکە بەرییەکانەوە گوێز دەردەکەون، زۆرجار گۆپکەیەك لەگوێزێك زیاتری پێوەیە و بەپێی ژمارەی گوێزەکان پێیاندەوترێت (دوو لەقان، سێلەقان، چوارلەقان) یان زیاتر، رێکیشدەکەوێت

گۆپکەیەك وەك هێشو گوێزی پێوەبێت، بەرهەمی گوێز سەرەتا بریتییە لە توێکلێکی سەوز و ناوەکی شلەیەیەکی تێدایە پێیدەوترێت (چڵمە لتە)، پاشان ئەو شلەیە بەرە بەرە خەستدەبێتەوە لەژێر توێکڵە سەوزەکەوە توێکڵێکی رەق دەوریدەدات ئیتر پێیدەوترێت (وەزە کەمکۆڵە)، بەبەردەوامبوونی خەستبوونەوەی شلەکەی ناوەوەی دەبێت بە (کاکڵەی فەریك)، خەڵکی ناوچەکە زۆر حەزیان لەو کاکڵە فەریکەیە و لەبەرئەوەی لەناو گوێزەکەدا بە چەقۆ دەریدەهێنن پێیدەڵێن (کاردە وەژی)، پاشان گوێزەکە رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو وشکبوونەوە دەچێت وتوێکڵە رەقەکەشی رەقتردەبێت، هەروەها توێکڵە سەوزەکەی دەرەوەی بەرەو وشکبوونەوە دەچێت و شەقدەبات، ئیتر گوێزەکان دەردەکەون و لەم حاڵەتەدا دەڵێن (گوێز ترەکیوە)، پاش (گوێز ترەکین)یش کاتی تەکاندیان دێتە پێشەوە.

دار گوێزەکان چەند جۆرێکیان هەیە کە لە هەورامانـدا بە پێی چاکی وخراپی و گەورەیی و بچووکی بەرهەمەکانیان ناویاننراوە، جۆرێکیان پێیاندەوترێت (بێتوێکڵ) چونکە توێکلی گوێزەکانیان زۆر باریکە و کاکڵەکەیان زۆرچاکە، جۆریکی تریان پێیاندەوترێت (گوێزە قەم) چونکە گوێزەکانیان گەورەن، جۆریکیشیان پێیاندەوترێت (گوێزی زوورەس) چونکە زووتر کاتی تەکاندیان دێتە پێشەوە، رێژەیەکی کەمیشیان هەن پێیاندەوترێت (گوێزە کوێر) چونکە توێکڵەکەیان زۆر رەقە و کاکڵکەیان کەمە و بە زەحمەت دەردێت، لەکاتی گوێز شکاندندا هەورامییەکان نەفرەت لەم گوێزانەدەکەن و دەڵێن (دەك ریخەت تەقو خۆ مەژگەکەش بە گوچەوەنی بەرنمێو[سمترلح]).

چەند نەخۆشی و مێرووییەکی زیانبەخش هەن بەردەوام هەڕەشەن بۆ سەر(داری گوێز)، ئەوانەیان لە هەوراماندا زۆر زیانبەخشن بریتین لە:

1- گڕەبردن= شەرابردن      2- کرمی چاڵهەڵکەن

سەبارەت بە گڕەبردنەوە لە وەرزی هاوین و لە گەڵ بەرزبوونەوەی پلەی گەرما بە تایبەتی لە مانگەکانی (تەمووز وئاب)دا گەڵای دار گوێزەکان بە تایبەت (نەمامەکان) قرچوڵدەکاتەوە و لاسکە ناسکەکانیان وشکدەکات، ئیتر ئەو نەمامانە ناتوانن وەك پێویست سوود لە تیشکی خۆر بۆ ئەنجامدانی کرداری هەرسکردن کەپێیدەوترێت (التمثیل الضوئی) وەرگرن، کە لە رێیەوە ئەو خۆراکەی لە رێی رەگەکانیانەوە هەڵیانمژیوە دەکرێت بە خۆراکی

---

[سمترلح]- بەواتای دەك رەگەکانت بتەقن خۆ کاکڵەکەی بە سووژن دەرنایەت.





سـوودمەند بۆيـان، چـونكە ئاشـكرايە دار و نەمامـەكان لـەرێى رەگەكانييـەوە ئـاو و خـۆراك وەردەگرن، پاشان لە رێى قەد و لق و لاسكەكانيانەوە دەگوێزنـەوە بـۆ نـاو گـەڵاكان و لـە وێ لـە گەڵ تيشكى خۆر تێكەڵيدەكەن و دەيكـەن بـە خـۆراكى بەسـوود، هـەروەك چۆن مـرۆڤ لـە رێـى گەدە و ريخۆڵەكانييەوە خۆراك هەرسدەكات، داريش لە رێـى گەڵاكانييـەوە هەرسـيدەكات، بـەڵام كاتێك گرە گەڵاكان وشكدەكات، ئيتر دارەكان و بە تايبەت نەمامەكان هيچ سوودێك لەو خۆراكـە وەرناگرن و وشكدەبن، هەوراميیەكان بەم جۆرە وشكبوونە دەڵێن (شەرابردن= گرەبردن).

سەبارەت بە كرمە چاڵهەڵكەنەكانيشەوە (الحفارات)، گەورەترين بەڵان بـۆ دار و نـەمامى گوێز و چـەند جۆريكيـان هەيـە، ئـەم كرمانـە دەبـن بـەهۆى كرمۆڵبـوونى دارە گـەورەكان، هـەم بێهێز و لاوازياندەكەن هەم بەرهەمەكەشيان خراپدەكەن، زۆر جـاريش دەبنـە هـۆى وشـكبوونى نەمامـەكان، كرمـەكان كەدەچـنە نـاو قـەد و لقـى دار و نەمامەكانـەوە تـونێلى پێـچاو پـێچ لەناوياندا درووستدەكەن، لە سەر ئەو چينە دەلـەوەڕێن كـە ئـەركى گواسـتنەوەى ئـاو و خـۆراك ئەنجامـدەدات، ورد و بێكەڵكيدەكـەن و وەك ئاردەمـشارى لێدەكـەن، ئـيتر ئـا و و خۆراكەكـە بـە شـێوەى شـلەيەكى رەش بەقـەدى دارەكـەدا و لـەو كونانـەوە دێنـەدەرەوە كـە درووسـتيانكردوون، خەڵكى هەورامان هەتاكو ئێستاش بايەخێكى وەها بە قەلاچۆكردنى ئەم كرمانە نادەن و رێگەى زانستى بۆ لەناوردنيان نازانن، بێجگە لە كرمە چاڵهەڵكەنەكان جۆرێكيش لە كرم هەيە دەچێتە نـاو بـەرى دارگوێزەكانـەوە، كاكڵـەكانيان رەش و بێكەڵكـدەكات و تاميـشى تاڵـدەكات، هەنـدێكجار گوێزەكە هيچ كاكڵەيەكى تێدا نامێنێت و كاتێك دەشكێنرێت تەنها پاشەرۆى كرمەكـەى تێدايـە، خەڵكى ناوچەكە بەم گوێزە كرمخواردوانـە دەڵێن (وەزى پووتـە، وەزى كرمەڵـە= گـوێزى پـووچ، گوێزى كرمۆڵ).

بـــەرى دارگـــوێز لـــە ئـــەنجامى كردارێكـــەوە كۆدەكرێتـــەوە پێيـــدەترێت (وەزشـــاى= گوێزتەكانـدن) كـە بـەپێى جيـاوازى شـوێنى باخـەكان هـەر لەناوەراسـتى مـانگى ئەيلوولـەوە دەستپێدەكات و شوێنى واش هەيە گوێزتەكاندنى دەكەوێتە ناوەڕاستى مـانگى تـشرينى يەكـەم، لـە بـەر ئـەوەى گـوێز بـە دارێـك دەتـەكێنرێت پێيـدەوترێت (شـەنە)، هەوراميیـەكان بـەكاتى

گوێزتەکاندن دەڵێن (تەقە شەنە[شمترلح])، (شەنە) دارێکی درێژ و سفت و باریکە لە داری چنار درووستدەکرێت، ئەوکەسەش گوێز دەتەکێنێت پێیدەوترێت (شەنییەر)، شەنییەرە هەوراممییەکان زۆر دارەوانن و هەرگیز چاویان لە بەرزی و سەختی دارگوێزەکان ناترسێت، زیاتر ئەو کەسانە کاری شەنییەری دەکەن کە خاوەن لەش و لارێکی ساخن و دەست و قاچیان زۆر بەهێزە، چونکە لە کاتی گوێز تەکاندندا بەو دارە بەرزانەوە هەردوو دەستیان بە شەنەکە دەگرن و تەنها بە هێزی قاچوقولیان خۆیان بەدارەکانەوە دەگرنەوە.

گوێزتەکاندن ئەوەندە کارێکی گرانە تا ئێستاش کرێی شەنییەر لە کرێی هەموو کارەکانی تری ناوچەی هەورامان گرانترە، شەنییەرەکان لەکاتی گوێزتەکاندندا زۆر وریان و هەوڵدەدەن لاسکەناسکەکان کە پێیاندەوترێت (قەمتەرە) بە زۆری نەخەنە خوارەوە، چونکە هەر ئەو لاسکانەن بۆ ساڵی دواتر گۆپکەی بەری دەردەدەن و گوێز بەرهەمدەهێنن.

هەرچەندە گوێز تەکاندن بۆ (شەنییەر) کارێکی گرانە، بەلاَم بۆباخدارەکان و ئەوانەی بەشداری لە چنینەوەی گوێزەکاندا دەکەن زرر خۆشە، سەرەرای ئەوەی ماندوودەبن کەچی وەك رۆژی سەیرانکردنە لە لایان، زۆرجار هەمووی خێزان و هەندێکجاریش دەر و دراوسی، یاخود خزم و کەسوکار بەشداریدەکەن و یارمەتی باخدارەکان دەدەن، ئەم یارمەتیدانەش بە عورفێکی کۆمەلاَیەتییە و پێیدەڵێن (دەسەوام)، لە کاتی گوێزتەکاندندا هەر کەسێك بەو ناوەدا گوزەربکات خوڵکی گوێزخواردنیدەکەن و ئەوانەی گوێزدەچننەوە گوێزی بۆدەبەن، ئیت هەڵبگرێت یان نا ئەوە بەکەیفی خۆیەتی، هەرکەسێکیش ئەو خوڵکەنەکات بە پیسکە و بەرچاو تەنگ لەقەڵەمدەدرێت و سەرزەنشتدەکرێت.

ئەو کەسانەی گوێزدەچننەوە (بەرچینە، تەیکە، توێشەبەرە....هتد) بەکاردەهێنن، هەر کەپڕیاندەکەن دەچن لەشوێنێك بە کۆمەڵ رۆیاندەکەن بەو کۆمەڵە گوێزە دەوترێت (کوماتڵی)، لەوێ کەسێك، یان زیاتر بە پێی زۆری وکەمی گوێزەکان و ژمارەی بەشدارانی گوێزچنینەوەکە توێکڵە سەوزەکەیان لێدەکەنەوە[لمحيرلح]، پاشان دەکرێنە ناو گوێنییەوە و

---

[شمترلح] هەوراممییەکان زۆرجار زاراوەی (تەقەشەنە) بەکاردەهێنن بۆ دیاریکردنی مێژووی هەندێك دیاردە و رووداو، بۆ نموونە دەڵێن فلاَنەکەس ئەوەندە ساڵ لەمەبەر لە تەقەشەنەدا لە دایکبووە، فلاَنە کەسیی تر لە تەقەشەنەدا نەخۆشکەوت، یاخود مرد، فلاَنە ساڵ تەقەشەنەبوو رەشەبایەکی بەهێز هەڵیکرد...هتد.

[لمحيرلح] گوێز پاش لێکردنەوەی توێکڵە سەوزەکە لێی پێیدەوترێت (گوێزی پاقلیر) بە واتای پاککراو.





دەگوێزرێنەوە بۆ شوێنی وشككردنەوەیان، ئیتر ئەو شوێنە لەناو گونددا بێت، یاخود لە کەوێڵ و لەناو باخدا بێت، پاشان گوێزەکان، یاخود لەلایەن خێزانی باخدارەکانەوە دەشکێنرێن و کاکڵەکەیان دەفرۆشرێت، یان هەر بەگوێزی دەفرۆشرێن و باخدار خۆی لەئەرکی شکاندنی گوێزەکان و وشکردنەوەی کاکڵەکەیان رزگاردەکات.

هەورامییەکان زۆر بایەخ بەوەدەدەن کاکڵەکەیان وشکبکەنەوە، هەرچەندە کێشی کەمدەکات بەڵام جۆرەکەی باشدەبێت و کڕیاری زۆرترە، چونکە ئەگەر وشکنەکرێتەوە، لە ئەنجامی کەرووهەڵهێنانەوە بۆنی ناخۆشدەردەکات و تامەکەی خراپدەبێت، هەروەها هەمیشە هەوڵدەدەن کاکڵەکە ورد نەبێت و بەیەکپارچەیی لە ناو گوێزەکەدا دەربهێنرێت، بەو جۆرە کاکڵەیە دەڵێن (کەلەبابە)، کاکڵەش هەتاکو (سپی، گەورە، وشك) بێت نرخەکەی گرانترە.

وەك پێشتر وتمان گوێزی پووچ هەیە کەلەئەنجامی ئەوەی کرم کاکڵەکەی خواردووە هیچی تێدا نەماوە، یاخود تەنها پاشەڕۆی کرمەکەی تێدایە کە بووە بە بۆدرەیەکی رەشباو، هەروەها هەندێك لە گوێزەکان هەر بە سەوزی توێکڵەکەیان پێوە رەش و وشکدەبێتەوە و کاکڵەکەی ناویشیان وشك و قاوەییدەبێت، بەم گوێزانە دەوترێت (قڕاڵی)، بوونی گوێزی (کوێر، پووچ، قڕاڵی) لە ناو گوێزی فرۆشتندا نرخی گوێزەکان دێنێتە خوارەوە، بۆیە زۆربەی باخدارەکانی هەورامان ئەم گوێزانە لە گوێزە باشەکان جیادەکەنەوە و تێکەڵیانناکەن.

رەوییەیەك هەیە کە ژمارەیەك لە باخدارەکانی هەورامان هەر لە دێر زەمانەوە هەتاکو ئێستاش پەیرەویدەکەن، بەوەی خۆیان گوێزەکانیان ناتەکێنن و دەیاندەن بە ئیجار، ئەکەسەی ئیجارەکەدەکات خۆی هەڵدەسێت بە کۆکردنەوەی بەرهەمەکە، هەندێك لەوانەی ئیجارەدەکەن ساڵانە چەند باخێك، یاخود چەند بنە گوێزێك ئیجارەدەکەن وەك سەرچاوەیەکی کاسبیکردن، پاشان بەرهەمەکە بە گوێزی، یاخود بە کاکڵەیی دەفرۆشن.

داری گوێز بێجگە لە گوێز چەند سوودێکی تریشی هەیە، بۆ نموونە گەڵاکەی بە سەوزی ژنان لە کاتی خەنێگرتندا سوودی لێوەردەگرن، بەوەی پاش ئەوەی خەنێکە دەسوون بەسەریاندا گەڵا گوێز دەخەنە سەری ئینجا دەیپێچن، هەروەها هەندێکجار گەڵاگوێزی زۆر ناسك لە کاتی یاپراخپێچانەوەدا دەپێچرێنەوە ودەکرێن بە یاپراخ، پاش وشکبوونەوەشی لەوەرزی پایزدا ، کۆدەکرێتەوە و لە وەرزی زستاندا تێکەڵ بە(ئالیك)ی ئاژەل و رەشە ولاخ دەکرێت، وشکەی دارەکان، یاخود ئەو دارانەی لە ئەنجامی نەخۆشی و کرمەرێزییەوە وشکدەبن، بۆ نانکردن و چێشت لێنان و خۆ گەرمکردنەوە لە وەرزی سەرما وسۆڵەدا بەکاردەهێنرێن،،

ئەمــە بێجگــە لــەوەی داری گــوێز سەرچــاوەیەکی گەورەیــە بــۆ  دروووســتکردنی تەختــەدار، تەختــەداری گــوێز باشــترین جــۆری تەختــەدارە و لــە بــواری پێــشەسازیدا بایــەخێکی ئــابووری گەورەی  هەیە، هەروەها لە هەندێك لە پێشەسازییە دەستییەکانی هەورامانـدا، بـە تایبـەتی بـۆ دروووســتکردنی (بێــشکە، لانــك، پنــە، تــیرۆك....هتــد) بــەکاردەهێنرێت، زووتــریش لــە بــواری بیناسازیدا بـەکارهێنراوە وەك (رایـەڵ، کۆڵەکـە،خێزرە) سـوودی لێوەرگیراوە، بـەلاَم ئێـستا ئـەو بەکارهێنانانە زۆر کەمبوونەتەوە و لە هەندێك شوێندا هەر نەماون.

کاکڵـەی گـوێز خـۆراکێکی بەسـوود و زۆریـش بـە لەزەتـە، لەهەورامانـدا وەك بەرچـایی دەخورێـت و لەدروووسـتکردنی (گیتــە مــەژگی= کــولێرە بەکاکلــە[لمجيرلخ]، بنــە هارگــای[لجيرلخ])دا بــە کاردەهێنرێت، هەروەها دەکرێتە ناو هەندێك خواردنەوە وەك: (یەکاوە سیاوە= قبـوڵی بـەترش، گیپە، کفتە شۆربا، کوبە، کولیچە)، بەشـێوەیەکی زانـستی سـەلمێنراوە چـەوری کاکڵەی گـوێز لـە هەموو چەورییەکان باشترە، چونکە رێژەی (کۆلسترۆل) لە خوێندا دەهێنێتە خوارەوە، هـەروەها سالاَنە برێکی زۆر کاکڵە و گوێزی هـەورامان دەبرێنـە شـارە گـەورەکان، هـەم وەك کەرەسـەیەکی خۆراکی هەم لە پێشەسازییە خۆراکییەکاندا سوودیان لێوەردەگیرێت.

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا هەرئەوە ماوە بلێین ئەو بەهەشتەی لـە هەورامانـدا دروووسـتبووە لـە دیمـەنی قەشـەنگی باخـەکان و سـێبەری چـڕ و هـەوای فێنـك، داری گـوێز گـەورەترین رۆڵـی تێدادەگێرێت، بۆ هەر شوێنێك ملدەنێیت هەر دار و نەمامی گوێزە بەرە و ئاسمـان چـەقیوە، لـە قرچەی گەرمای هاویندا شنەی شەماڵی ئارەقەت دەسرێت و مانـدوویت دەحەسـێنێتەوە، بـەلاَم جێـی داخ و نیگەرانییـەکی گەورەیـە ئـەو دۆخـەی پـاش گواسـتنەوەی زۆرە ملێـی گونـدەکانی هەورامانی ئەمـدیو لـە لایـەن رژێمـی رەفتـار فاشـی عێـراق و دواتـریش جـەنگی هەشـت ساڵەی (ئێراقٌ ئێران)، کاردانەوەیەکی زۆر خراپیـان لەسـەر هـەردوو دیـوی هـەورامان هـەبوو، زۆربـەی نـەمام و دارگوێزەکان وشکبوون، بەوەش خەڵکی هەورامان نـەك هەر زەرەریانکرد، بەڵکو بەشێك

---

[لمجيرلخ] (گێتـە مـەژگی= کـولێرە بەکاکڵـە) جۆرێکـە لـە کـولێرەی بەلـەزەت لەدروووستکردنیدا (هـەویری ترشـێنراو، کاکڵـەی گـوێز، زەردەچـەوە) بەکاردەهێنرێن، کاکڵـە گوێزەکـە بـاش دەهاررێـت و لەگـەڵ زەردەچـەوەکە تێکەڵـدەکرێن، هـەموو کولێرەیـەك کەدروووستدەکرێت رووی سـەرەوەی پڕدەکرێـت لەکاکلـە گـویز، هەندێکیـشیان پێیانـدەڵێن نـاودار چونکە کاکڵە گوێزەکە دەکرێتە ناویانەوە وەك چۆن پیاز دەکرێتە ناو کەلانەوە.

[لجيرلخ] (بنە هارگای) ئەمەش جۆرێکە لە کولێرەی ناوچەی هەورامان و لەم کتێبەدا باسی تایبەت بەخۆی هەیە.

له کولتوور و بەریماندووبوونی چەندین ساڵەی پێشینەکانیان لەدەستچوو، چونکە داری گوێز لەگەڵ ئەوەدا دارێکی بەرهەمدارە، بە شێکیشە لە پێشینەی مێژوویی و کولتوور و رەسەنایەتی خەڵکی ناوچەکە، ئامادەبوونی هەمیشەیی رۆحی پێشینەکانیانە لە ژیان گوزەرانی رۆژانەیانـدا، بەڵام ئەوەش شتێکی زۆر دڵخۆشکەرە پاش راپەرینە شکۆدارەکەی خەڵکی کوردستان لـە (ئـازاری 1991ز)، زۆربـەی خـەڵکی ناوچـەکە لـە هـەورامان ئەمـدیو گەڕانـەوە سـەر زێـدی باوبـاپیری خۆیان، باخدارەکان دەسیانکردەوە بە رێکخستنەوەی باخەکانیان و ساڵانە هەزاران نـەمامی نـوێ دەروێنن و خزمەتیاندەکەن، ئەمەش ئاماژەیەکی ئاشکرایە بۆ ئیرادەی گەورەی هەورامییـەکان و هاوکات هەوڵدانیشە بۆ زامنکردنی سەرچاوەیەکی داهات بۆ ئایندەی خێزان.

### 2/ داری توو

داری توو پانتاییـەکی گـەورەی لـە رووبـەری باخـەکانی هـەورامان گرتـووە و بەرەکەشـی هەر پێیدەوترێت توو، هەورامییـەکان بـە داری تـوو و بەرەکەشـی دەڵێن (تفـی)، داری تـوو لـەو دارانەیـە تەمـەنێکی زۆردەکـات و نەخۆشـی و مێـرووی زیانبـەخش ئەوەنـدە کـاری لێناکـەن، بەڵایـەك کـە زیانبگەیـەنێت بـە دارتووەکـانی ناوچـەی هـەورامان ئـەو کرمانـەن پێیانـدەوترێت (چاڵهەڵکەن= الحفارات)، داری توو لەزۆربـەی دارەکـانی تـری ناوچـەی هـەورامان زیـاتر بەرگـەی گەرما و تینووێتی دەگرێت، بایەخێکی ئابووری زۆریشی هەیە و لە رووی گرنگییەوە پـاش داری گوێز دێت، ئەم دارە لە رێگـەی تـۆوەوە سـەوزدەبێت و لـە سـەرەتای سـەوزبوونیدا پێیـدەوترێت (تفڵـی)، کـە گـەورە دەبێـت ئەگـەر لـە شـوێنەکەی خۆیـدا بهێڵرێتـەوە (زڕ)، یـان (زڕبـەری) دەردەچێت، بۆ ئەوەی ببێت بەدارێکی بەری باخـدارەکانی هـەورامان هەمیـشە نەمامـە توووەکـان دەگوێزنــەوە بــۆ شــوێنی تایبــەتیان لــە نــاو باخەکانیانــدا و لــە جــۆری تــووە چــاکەکان پێوەنیاندەکـەن، لـق و پـۆپی ئەمـدارە زۆر پەخـشاندەبنەوە و سـێبەری بـاش درووسـتدەکەن، رەگەکانیشی دەچن بـە قـووڵایی زەویـدا و بـەملاو ئـەولادا بڵاودەبنـەوە، دانیـشتن و پـشوودان و خەوتن لە ژێر سێبەری داری توودا زۆر باشە و بۆ مرۆڤ لەشسووکی و تەندرووستێیە.

داری توو لە پاییزدا گەڵاکـەی دەوەرێـت و لـە زستانیـشدا تـەواو متـدەبێت، لـە سـەرەتای وەرزی بـەهارەوە دەژیێتـەوە و بـۆ ماوەیـەك گەڵایـەکی ناسـك و تەڕچـکی هەیـە، لـەو ماوەیـەدا باشترین گەڵایە وەك ئالیکێکی تەڕ دەدرێـت بـەو کـار و بەرخانـەی پێیانـدەوترێت (ئەرەبەسـیا=

دابەستە) و هەندێك  باخدار لە ناو باخەکانیاندا رایاندەگرن، بەڵام پاشان بەرە بەرە گەڵاکەی ئەستوور و زبردەبێت و تەرچکییەکەی نامێنێت.

دارتووەکانی هەورامان بە شێوەیەکی سەرەکی و بەپێی جیاوازی بەرهەمەکەیان بریتین لە (تووی تارانی، تووی کۆمەدەرەیی، تووی خاڵۆدی، تووی بێناوك، تووی قادری، شاتوو)، لەم ساڵانەی دواییشدا جۆریکی تر بڵاوبوونەتەوە پێیاندەوترێت (تووە کوولەکە)، ئەم جۆرە هەرچەندە بەرەکەیان گەورەیە بەڵام کەمشیلە و بێلەزەتن، بەری داری توو سەرەتا سەوزە و هەورامییەکان پێیدەڵێن (کۆلینجە)،  لەگەڵ گەورە بوونیدا زیاتر ئاوە بەخۆوەدەگرێت، کاتێك پێدەگات شلدەبێتەوە و تامی شیریندەبێت و پێیدەوترێت (تفە تەڕی = تەڕە توو)، خەڵکی هەورامان زۆر ئالوودەی خواردنی تەڕەتوون و بە خواردنێکی چاك و بەلەزەتی دەزانن، کاتی تووپێگەیشتن بێجگە لەوانەشیان رۆژانە هاتوچۆی باخەکان دەکەن، هەندێکی تریشیان دەچن بۆ باخەکان بۆ تەڕەتوو خواردن بە تایبەتی پاش فێنکی عەسر و هەندێکجاریش سەر لەبەیانی، لەو کاتەدا یەکیکی دارەوان سەردەکەوێتە سەرداتوویەك لە جۆرە چاکەکان، لەرێگەی شەکاندنەوەی لقی دارتووەکەوە بە دەست و بەپێلەقە تووەکان دەوەرێنێت و ئەوانی تریش لە بن تووەکەدا هەتا دەتوانن (تەڕەتوو) دەخۆن، هەندێکجار لەکاتی تووتەکاندنەکەدا دووکەس تووەدەگرنەوە و بۆ ئەو مەبەستە (گلێم، بەرماڵ، مشکی، نایلۆن.... هتد)، بەکاردەهێنن، بەوەی دووکەسیان لەمسەرو ئەوسەرەوە بەهەردوو دەستیان (گلێم، بەرماڵ، مشکی، نایلۆن)ەکە بڵاودەکەنەوە و راستە و راست لە شوێن ئەو لق و پۆپەدا رادەوەستن کە دارەوانەکە تووەکانیان لێدەوەرێنێت، بەوەش بڕێکی زۆر لەتووە وەریوەکان بەپاکی و بەبێئەوەی بکەونە سەرزەوی و تێکەڵ بە خۆڵ، یان پووش و پەڵاشی بن دارەکان ببن دەگرنەوە و ئینجا دەیانخۆن، ئەم کارە زیاتر لەو باخانەدا ئەنجامدەدرێت کە خێزانیان تێدایە.

ئەو باخانەی توویان تێدا بەرهەمدەهێنرێت ساڵانە لە وەرزی بەهاردا پاکدەکرێنەوە لە گژوگیا، هەم لە رێی هەڵکێشان و دوورینەوەی گژوگیاکەیان و هەم لە رێی گەلکارییەکەوە کە پێیدەوترێت (گزی بارەکڵە)، ئەم گەلکارییە ریورەسمی خۆی هەیە و لەم  کتێبەدا لە شوێنی تایبەت بە گەلکارییەکانی هەورامان قسە و باسی لێوەدەکەین، یەکەم بەری توو لە سەرەتاوە کە پێدەگات شیرینی کەمە و بەزمانی خەڵکی ناوچەکە پێیدەوترێت (کڵوش)، کڵوش کە





وشکدەبێتەوە ڕەنگەکەی ڕەشە، بۆیە لەوەرزی زستاندا تێکەڵ بە ئالیکی ئاژەڵ و ڕەشە وڵاخ و بەرزە وڵاخ دەکرێت و کەرەسەیەکی خۆراکی زۆر باشە بۆیان، پاش ئەوەی بەری یەکەم تەواو دەبێت ئیتر تامی تووەکان شیرینتر و چاکتردەبێت، کە وشکیشدەبنەوە ڕەنگیان مەیلە و زەرد و جوانە.

بێجگە لەوەی ڕۆژانە ڕێژەیەك لە تووە گەیوەکان لە ئەنجامی گەیینیان. یاخود لەئەنجامی ڕەشەباوە دەوەرێن و دەچنرێنەوە، بە پێی زۆر و کەمی بەرهەمەکەش بەشیوەیەکی گشتی (2|1) جار گشت دارتووەکان لە لایەن دارەوانەکانەوە دەتەکێنرێن و لەلایەن ژنان و کچانەوە کۆدەکرێنەوە، هەندێکجار و بەتایبەتی لە باخە گەورەکانی بەرهەمهێنانی توودا جۆرە گەلکارییەك دەکرێت بۆ کۆکردنەوەی تووەکان کە پێیدەوترێت (گەلو تفۆچنییەی= گەڵی تووچنینەوە)، پاش کۆکردنەوەیان بەمەبەستی وشکبوونەوەیان دەبرێن بۆ شوێنێکی تایبەت لەنا و باخدا کە پێیدەوترێت (سانالی[*])، هەتاکو وشکدەبنەوە ڕۆژانە دووجار، یاخود زیاتر بەپێی بەرزی پلەی گەرما و قەبارەی تووەکان دەستیان تێوەردەدرێت و ئەمدیو و ئەودیو دەکرێن، پاش وشکەوبوونەوەیان دەکرێنە ناو گوێنییەوە و بۆ ناو (گوند) دەگوێزرێنەوە، پاش ئەوەی باخدار پێویستی خۆی لە چاکترین جۆری تووەکانی گلدەداتەوە هەر چیان زیادبن دەفرۆشرێن.

عورفێکی کۆمەڵایەتی هەیە بۆ چنینەوەی توو تائێستاش لە هەندێك شوێنی هەوراماندا پێڕەودەکرێت، عورفەکەش ئەوەیە ژمارەیەك لە باخدارەکان بەهەرهۆیەکەوە بێت خۆیان ناتوانن ئەو ئەرکە بگرنە ئەستۆ و باخەکانیان دەدەن بە خەڵکی تر بە(ئیجار، دووکوتی یاخود سێکۆچنی= سێیەك)، ئەوەش بەپێی ڕێکەوتنی نێوانیان.

توو لەهەوراماندا بە تەڕی و زوەردی[**] وشکی دەخورێت و چەند جۆرە خۆراکێکیشی لێدرووستدەکرێت وەك:

---

[*] (سانالی) پارچەیەك زەوییەیە لەناو باخدا وباش سواقدەدرێت، پێویستە لە شوێنێکی تەختدا بێت و خور لێیبدات بۆ ئەوەی تووەکان زوو وشکببنەوە.

[**] (تووی زوەرد) بەو توانە دەوترێت کەمێك وشکبوونەتەوە، بەڵام نەرمن و پێیاندەوترێت (ددانگیر)، چونکە لەکاتی خواردندا داندەگرن، ئەم توانە بەدۆوە دەخورێن.

1- سەكلە تفی= سەكلە توو: بۆ دروستكردنی سەكلەتوو، تووی وشكەوبوو لەناو (دۆڵ[*])دا دەكوترێن هەتاكو دەبن بەئاردەتوو و بەهێڵەك باش دەبێژرێن وئاویان لێدەپرژێنرێت، پاشان بە توندی دەپەستێنرێن و بۆ وەرزی سەرما و سۆلە هەڵدەگیرێن.

2- لەپارێ: بۆدروستكردنی لەپارێ (تووی وشكەوبوو، كاكڵەی گوێز) پێكەوە لە ناو (دۆڵ)دا باش دەكوترێن و ئاویان لیدەپەرژێنرێت، چەند جارێك لەناو دۆڵەكەدا ئەمدیو وئەودیو دەكرێن هەتاكو پێكەوەدەلكن و دەبن بەشیرینییەكی پتە و بەتام.

3- كوتە: ئەم جۆرە خۆراكە لە (تووی وشكەوبوو، قەزوانی ناسك) دروستدەكرێت، سەرەتا تووەكان لە ناو (دۆڵ)دا دەكوترێن ودەكرێنە ناو دەفرێكەوە، ئینجا قەزوانەكانیش بە جیا دەكوترێن، پاشان جارێكی تریش پێكەوە لەگەڵ تووەكوتراوەكاندا دەكوترێنەوە، بەوەش خواردنێكی چەو رو شیرین و بەتام دێتە بەرهەم.

4- دۆشاوی توو: بۆدروستكردنی دۆشاوی توو یەك پێوانە توو لەگەڵ دوو پێوانە ئاو دەكرێنە ناو مەنجەڵێكی پاكەوە و بۆماوەی سێ سەعات دەكوڵێنرێن، بەیناو بەین بە كەوچك یاخود كەوگیر تێكدەدرێن و ئینجا پاڵفتەدەكرێن، پاش پاڵفتەكردن جارێكیتر كەمێك دەخرێنەوە سەرئاگر و بۆجاری دووەمیش پاڵفتەدەكرێنەوە بەوەش دۆشاوێكی بەتام دروستدەبێت.

5- دروستكردنی ئاوی خۆشاو: بۆدروستكردنی ئاوی خۆشاو (تووی وشكەوبوو) بە پێی پێویست دەكرێنە ناو دەفرێكی پاكەوە ئاویانتێدەكرێت، پاش ماوەی (2-3) رۆژ تووەكان باش دەگوشرێن و پاڵفتەدەكرێن و ئامادەدەبن بۆ ئەوەی بكرێنە ناو ئەو میوانەی خۆشاوەكەیان لێدروستدەكرێت[**].

بێجگە لەو خۆراكانەی باسمانكردن، توو وەك كەرەسەیەكی سەرەكی بەكاردیت بۆ دروستكردنی (چكلێت، حەڵوای توو، كولێرە بەدۆشاو...هتد).

---

[*] (دۆڵ) بریتییە لە بەردێكی گەورەی لووس لەناوەراستیدا بە قووڵایی (15-20سم) و بە تیرەی (10-12سم) چاڵدەكرێت، هەر لەبەردیش دەسكێكی بۆدروستدەكرێت پێیدەوترێت (دەسەدۆڵ= دەسكەدۆڵ).

[**] بڕوانە گۆڤاری كەلەپوری كورد ل172، ژمارە (2) نەورۆزی 1993.





هەر ئەوە ماوە بڵێین رووی ئەو دەسەڵاتدارە شۆفێنیستانە رەشبێت کە بوون بەهۆی ئەوەی ژمارەیەکی تەواو زۆر لە دارتووەکانی هەورامان وشکبن، بەرهەمی توو ئەوەندە کەمببێتەوە وای لێبێت لەوانەیە ئێستا لە هەندێك شویندا خەڵك تێر تەرەتوو نەخۆن، ئەو رێورەسمە کۆمەڵایەتییانەش بۆ پاککردنەوەی باخەکان بەرێوەدەچوون ئەو خۆشی و جۆش و خرۆشەی جارانیان نەمێنێت.

### 3ـداری مێو

شتێکی ئاشکرایە مێو لە هەوراماندا لە رووی بایەخی ئابوورییەوە پاش (گوێز و توو) دێت و دارێکی (خۆهەڵواسە= متسلق) و دووجۆری هەیە بەم ناوانە:

1ـ مێوە دێمی= رەزە دێم کە زیاتر تایبەتن بەبەرهەمهێنانی ترێی رەش

2ـ مێو و داڵیتی = مێوی ناوباخ = ئەو مێوانەی خۆیان بەدارەکانی تردا هەڵدەواسن، ئەم مێوانە چەندین جۆری ترێێ نایاب بەرهەمدەهێنن وەك: (دەرەبۆڵە، لەق لەق، سەدانی، کەزای، کشمیشی، زوورەس= یاقووتی= مامەخولان، سەرەقووڵە، زەردەڵێێ، کوردەکوژە، سنەیی، ریشبابا....هتد).

مێوی ناوباخ خۆی بەدارەکانی تردا هەڵدەواسێت و بەسەر لق و پۆپیاندا بلاۆدەبێتەوەوە، سەرەرای ئەوەی ترێی چاکیان هەیە گەلا ناسکەکانیشیان بەبەردەوامی یاپراخی بەتامیان لێدرووستدەکریت.

سەبارەت بە (رەزەدێم)کان رووبەرێکی زۆریان لە قەدپاڵەکانی هەورامان داپۆشیوە و ساڵانە بەرهەمێکی باشیان هەیە، کارە خزمەتگوزارییەکانی (رەزەدێم) بە شێوزەیەکی سەرەکی بریتین لە (رەز کێلان، رەزبرین)، هەورامیەکان ساڵانە لە سەرەتای وەرزی بەهاردا بە پاچ رەزە دێمەکانیان دەکێڵن، پێشتر هەندێکجار بە گەلگاری دەکێڵران، بەڵام لەم رۆژانەدا خاوەن رەزەکان خۆیان دەیانکێڵن، یاخود کرێکاریان بۆ دەگرن.

(رەزبرین)یش بایەخی خۆی هەیە و بۆ ئەوە ئەنجامدەدرێت ئەو لق و پۆپانە کە وشك وکرمەرێز بوون ببرێن، هەروەها لاسکەکان کورتبکرێنەوە و بەشێوەیەك پەخشانەبنەوە بەرەکیان ورد وخراپ دەرچێت، چونکە رەزەدێم ئەگەر ساڵانە نەیبرن لق و پۆپی زۆربلاۆدەبێتەوە و بەرەکەی باشنابێت، هەورامییەکان هەر لە زووەوە دەرکیان بەگرنگی ئەم کارەکردووە بۆیە زۆر بایەخیپێدەدەن و ئەگەر بەرێککەوێت کەسێك رەزەکەی نەکێڵێت و

نەبڕێت پێیدەڵێن ڕەزەکەت بووەتەوە بە کەژ، بۆ بڕینی ڕەزەدێم (مەقەستی مێوبڕین،چەقۆی مێوبڕین) بەکاردەهێنن، هەندێکجاریش بۆ بڕینی کەڵەمە مێوی گەورە مشار بەکاردەهێنن، هەموو کەسێك ناتوانێت ئەم کارە بەرێکوپێکی ئەنجامبدات بۆیە ئەوانەی زۆرشارەزان تێیدا پێیاندەڵێن (مێوبڕ).

ئەوانەی شارەزای ڕەزیرینن دەزانن ئەو لاسکانە بەردەگرن کەلەوەرزی بەهاردا لەسەر لاسکی ساڵی پێشوو سەوزدەبن، بۆیە لاسکەکانی ساڵی پێشوو کورتدەکەنەوە بۆ ئاستێك کەتەنها (5–3) کۆپکەیان پێوە بمێنی و بەوەش کاتێك دەژێینەوە زۆر درێژنابن و بەری زۆر دەگرن.

هەورامییەکان پاش بڕینی ڕەزەکانیان کەڵەمە بڕاوەکان کۆدەکەنەوە و لە دەرەوەی ڕەزەکە، یاخود لە سووچێکی ڕەزەکەیاندا دەیانسووتێنن، بەوەش تارادەیەکی باش ڕەزەکانیان لە نەخۆشی و مێروە زیانبەخشەکان دەپارێزن.

بەرهەمی ڕەزەدێمەکانی هەورامان کەوەك پێشتر وتمان بە شێوەیەکی سەرەکی (ترێی ڕەشە) هەندێك لە ڕەزەکانیش بەینا وبەین چەند بنێك (ترێی سپی)یان تێدایە، ترێ کەرەسەیەکی خۆراکی زۆر زۆر چاکە و چەندین سوودی بۆمرۆڤ هەن، لەهەورامانەدا سەرەڕای ئەوەی وەك یەکێك لەمیوە سەرەکییەکان دەخورێت، (مێوژ، دۆشاوی ترێ، سرکە، شەراب)ی لێدرووسیتدەکرێت کەهەریەکەیان لەشوێنی خۆیاندا بایەخی تایبەتیان هەیە.

### 4/ داری بەهێ

داری بەهێ دیمەنێکی زۆر جوانی هەیە و بەرەکەشی هەر پێیدەوترێت بەهێ، هەورامییەکانیش بە دارەکە و بەرەکەشی دەڵێن (بەی)، ئەم دارە لەسەرەتاوە لە شاری (سیدۆن)ی دوورگەی (کریت) ڕوێنراوە و لەوێوە بلاوبۆتەوە، بۆیە ناوی زانستی (بەهێ) هەمان ناوی ئەو شارەی هەڵگرتووە، بەری (بەهی) تام و بونێکی خۆشی هەیە و لەهەورامانەدا چەند جۆرێکی هەیە وەك (بەهێی شیرین، بەهێی ترش و کەمێکیشیان مەیلەو تفت)ن، بەهێ سەرچاوەیەکی خۆراکی زۆر باشە ۆ کۆمەڵێك کەرەسەی خۆراکی تێدایە وەك: (گلیکۆز، سوکەرۆز، پەکتین، چەوری، هەردووترشی مالیك و تانین، ڤیتامینەکانی (A-B )، هەروەها (بەر، تۆو، گەلا)کەی لە بواری چارەسەرکردنی هەندێك نەخۆشیدا بەکاردێن.

هەورامییەکان سالآنە هەموو خێزانێکیان لە چاکترین جۆرەکانی (بـەهێ) دەخەنـە مـاڵ، پێشتر ئەم میوەیە بە (جووت) دەفرۆشرا نەوەك کیلۆ، لـەناو ماڵـدا دوو دوو لەگـەڵ کـەمێك لـە لاسـکەکەیاندا پێکـەوە بـە بنمیـچی خانووەکانیانـەوە هەڵیاندەواسـین و پێیانـدەوتن (لـەڤان)، هەروەها لەسەر رەفە و لە (سندوق، باهۆڵ...هتد) هەڵیاندەگرتن، تا ئێستاش سـەرەرای ئـەوەی (بـەهێ) وەك یـەکێك لـە میـوە پەسـەندەکانیان لـە شـەوانی زسـتاندا وەك شەوچـەرە دەخـۆن ، مرەبای نایابی لێدرووستدەکەن و لەتکە بەهێێ وشککەوکراوەش دەکەنە ناو خۆشاوەوە.

### 4/ داری هەنار

داری هـەنار یەکێکـە لـەو دارانـەی لـە هەورامانـدا بایـەخی ئـابووری هەیـە، دارێکـی مامناوەندییـە و لـە پاییزانـدا گـەڵاکانی دەوەرن و لـە زسـتاندا تـەواو متـدەبێت، هەورامییـەکان بەم دارە و بەرەکەشی هـەر دەڵێن (هـەنار)، زۆربـەی دارهـەنارەکانی هـەورامان لـە جـۆرە هـەرە چاکەکانی هەنار بەرهەمدەهێنن، گوندی شەڕەکانی هـەورامانی ئـەودیو یەکێکـە لـەو گوندانـەی بـە هـەنار بەناوبانگـە، چـاکترین هـەناری هـەورامانیش (هـەناری شـەڕەکان)ە، چـونکە (گـەورە، ئاودار وبەتام، توێکڵباریك)ە، هەنارەکانی هەورامان بە شێوەیەکی گشتی لە رووی تامیانەوە سـێ جۆرن بەم شێوەیە: (هەناری شیرین، هەناری مەلیسی= مێخۆش، هەناری ترش)، هەنار سـەرەڕای ئەوەی میوەیەکی زۆر باشـە و بڕێکـی بـاش لەکەرەسـە خۆراکییـە پێویسـتەکان و ڤیتامینـەکانی تێدایـە و وەك میوەیـەکی پەسـەند دەخورێـت، خـەڵکی ناوچـەکە لـە هـەناری تـرش (روگنـار= ربەهـەنار) درووسـتدەکەن و دەنکەگانیـشی وشـکدەکەنەوە بـۆ بـەکارهێنانیان لـە درووسـتکردنی هەنـدێك لـە چێـشتە میللیەکانیانـدا، هـەروەها لـە توێکڵەکەشـی سـوودوەردەگرن پـاش ئـەوەی وشـکیدەکەنەوە لـە نـاو (دۆڵ)دا دەیکوتن و پێیـدەڵێن (تـاڵ) بـۆ خۆشـەکردنی (مەشـکە، کونـە، پێستەی پێڵاوی چەرم) بەکاریدەهێنن.

### 5/ داری هەنجیر

ئەم دارەش یەکێکـە لـە دارە مامناوەندییـەکان، لـەوەرزی پـاییزدا گـەڵاکانی دەوەرن و لـە زستانیشدا متدەبێت، ناوچەی هـەورامان چـەندین جـۆر لەدارهـەنجیری تێدایـە بـە تایبـەت لـەو جۆرانەی بەرەکەیان زۆر چاك و بەتامە وەك (مجیفی، شاهەنجیر، کۆچـەزەردە = زەردە هـەنجیر، کۆچە سیاوە= رەشەهەنجیر، گۆچە کاو کە رەنگەکەیان مەیلەو ڤاوەییە، کۆچە پالآنەی، هـەنجیرە

بەڕیلە= هەنجیری دێمی، هەنجیری ڕێژاوی)، چەند گوندێکی هەورامانی ئەمدیو لەوانە: (پالآنیا، هاوار، هاوارەکۆن، جاور) بە بەرهەمهێنانی هەنجیری چاك بەناوبانگن، هەنجیر میوەیەکی زۆر بەسوودە لە ڕووی خۆراکییەوە و چەندین خەصڵەتی دەرمانیشی هەیە، هەورامییەکان بێجگە لەوەی (هەنجیر)وەك یەکێك لە میوە پەسەندەکان دەخۆن، وشکیدەکەنەوە و (لەپۆرت[*])یشی لێدرووستدەکەن کە لەوەرزی زستاندا وەك شەوچەرەیەکی زۆر بەتام لەگەڵ (کاکلەگوێز، مێوژ) دەیانخۆن.

### 6/ داری هەرمێ

یەکێکە لەو دارانەی هەر لەدێر زەمانەوە لە هەوراماندا ڕوێنراون و بایەخێکی ئابووری زۆری هەیە، خەڵکی ناوچەکە بەم دارە و بەرەکەشی هەر دەڵێن (مرۆ) و چەندین پارچە باخ هەن هەرمێ بەرهەمی سەرەکییانە، جۆرەکانی هەرمێ لەناوچەکەدا بە شێوەیەکی سەرەکی ئەمانەن: (مروە گولآوی= هەرمێ گولآوی، مروەسیاوە= هەرمێ ڕەشە، مروەشووتە= هەرمێی شیری، سێفرمە)، بەری داری هەرمێ زۆر دەوڵەمەندە بە کەرەسەی خۆراکی وەك: (پۆتاسیۆم، مەنگەنیز، کالیسیۆم، تانین، ئاسن، کلۆر)، هەروەها ڤیتامینەکانی (A-B-C )، ئەمەش وایکردووە هەم لە ڕووی خۆراکی و هەم لە ڕووی دەرمانییەوە سوودبەخشبێت.

هەورامییەکان بێجگە لەوەی لەکاتی پێگەیشتنیاندا (هەرمی) وەك میوەیەکی سەرەکی دەخۆن، زۆریش بایەخ بەوە دەدەن ساڵانە هەرمێ بۆ وەرزی زستان هەڵبگرن، بۆ هەڵگرتنیشیان لەناوخانووی پاك و سواقدراودا پاش ئەوەی گەڵا دەخەنە ژێریان بڵاویاندەکەنەوە، بەو شێوەیە ئیتر ماوەیەکی زۆر دەمێننەوە و خراپنابن، هەڵگرتنی هەرمێ لە ناو ماڵدا بۆن و بەرامەی خۆشدەکات، هەروەها لێیان وشکدەکەنەوە و لەدرووستکردنی (خۆشاو)دا بەکاریاندەهێنن.

---

[*] (لەپۆرت) لە هەنجیری زۆر گەییو درووستدەکرێت، پاش ئەوەی بڕێکیان بەتەڕی پێکەوە دەپەسترێن و وەك قاڵبیان لێدێت.

**7/ داری چنار**

**یەکێکی ترە لە دارە بایەخدارەکانی هەورامان، لە کەناری جۆگەی سەرەکی باخەکاندا دەیڕوێنن، هەندێك تەلانیش هەن هەر تایبەتن بەم دارە، ژمارەیەکی زۆر لە باخدارەکانی هەورامان کاتێك لە سەرەتاوە باخدادەنێن، یاخود تەلانە کۆنەکان نەوەکاندەکەنەوە لەگەڵ درەکانی تردا (چنار) دەڕوێنن، چونکە زووبەرزدەبێتەوە و شوێنێکی زۆری ناوێت، ئیتر هەتاکو دارەکان دەگەنە کاتی بەرهەمدان (چنار)ەکانیش گەورە دەبن و دەیانبڕن، خۆیان هەرچەندەیان پێویستبێت لێیانبەکاردەهێنن و زیادەکانیان دەفرۆشن، بەمەش داهاتێکی باش بەدەستدەهێنن، (چنار) شوێنێکی دیاری هەیە لە بیناسازی هەورامانـدا، ئەستوورەکانیان وەك (رایەڵ) بەکاردەهێنن، باریکەکانیشیان دەقڵێشسێنن و دەیانکەن بە (خێزرە).**

**بێجگە لەم دارانەی بەکورتی قسەمان لەسەرکردن چەند دارێکی ترهەن لە هەورامانـدا کەهەریەکە و بەپیی گرنگی خۆی سەرنجی هەورامییەکان رادەکەشێت و لە باخداریا بایەخی پێدەدرێت وەك: (هەشتاڵوە= قۆخ، شێلانی= قەیسی، هەڵوچی= هەڵووژە، ساوی= سێو).**

**لە کۆتایی ئەم بابەتەدا دەڵێن هەموو ئەم دارانەی باسمانکردن گەڵاوەریون.**

**دارستانە سرووشتییەکانی هەورامان**

**دارستانی سرووشتی بەو دارستانانە دەوترێت کەدار و دەوەنی خۆڕسکیان تێدایە، دار و دەوەنی خۆڕسکیش ئەو دار و دەوەنانەن کە خۆیان سەوزدەبن، بە بێئەوەی مرۆڤ هیچ دەستێکی لە ناشتن و سەوزکردنیاندا هەبێت، ئەم دار و دەوەنانە بەپێی جیاوازی لە(شوێنەکانیان، پلەی گەرما، تۆپۆگرافیەت) جیاوازن وچەندین جۆریان هەن، هەندێکیان لە قەد پاڵی کێوەکان و یاڵ و دۆڵەکاندا و لە شوێنە ساردەکاندا سەوزدەبن، هەندێکیشیان لە کەناری چەم و رووبارەکاندا سەوزدەبن و هەر لە دێر زەمانیشەوە رۆڵێکی کاریگەریان لە ژیانی مرۆڤدا بووە، سوود لە (گەڵا، بەر، لق و پۆپ)یان وەرگیراوە، بەرەکەیان وەك خۆراك و گەڵا و توێکڵێشیان بۆ خۆداپۆشین ولق و پۆپیشیان بۆ سووتاندن بەکارهێنراون، هەروەها سوودیان لێوەرگیراوە بۆ چارەسەرکردنی ژمارەیەك لەو نەخۆشیانەی مرۆڤ و ئاژەڵ تووشیانبوون.**

**هەورامان یەکێکە لەو شوێنانەی بەدەیان هەزار دۆنم دارستانی سرووشتی تێدایە، گرنگترین دار و دەوەنە خۆرسکەکانی هەورامان ئەمانەن:**

(قـەزوان، بـەڕوو، تـایلی= تـاوگ، گۆیـژ، سـنجوو، کەکـەوی= کێکـف، بـادام، پـەڵگ، بـی، تەڕینی= تەرو، هەنگەونی=گەون= گوێنو...هتد) لەم بابەتەدا بەکورتی باس لەوانـەیان دەکـەین کە لەژیانی خەڵکی ناوچەکەدا بایەخیان هەیە بە تایبەتی ئەمانەی خوارەوە:

**1داری قەزوان:**

به بایەخترین داری سروشتییە لە هەوراماندا بەرهەمەکەشی هەر پێیدەوترێت قـەزوان، هەورامییـەکان بـەداری قـەزوان و بەرەکەشـی دەڵـێن (وەنـی)، بـەری ئـەم دارە دووجـۆری هەیـە،جۆری یەکـەمیان (ورد، ناسـك، چـەور)ە و پێیـدەڵێن (وەنـە مـشکی=بەنەمـشك)، جـۆری دووەمیشی (ڕەق و گـەورەتر و چەوریـشی کـەمترە و پێیـدەڵێن (وەنـی سـۆزە) کە بەشـێوەزاری کرمـانجی خـواروو (قـەزوانی شـین)ی پێیـدەوترێت، بـەری قـەزوان بـە فـەریکی دەخورێـت و دەکرێتەناو (دۆ، ماستاو، ترشیات) و تام و بۆنیان خۆشـدەکات، قـەزوان وەك شەوچـەرە سـوودی لێوەردەگیرێـت بـەوەی بەتوێکڵـە سـەوزەکەیەوە دەقرتێنرێـت پـاش ئـەوەی توێکڵـە ڕەقەکـەی لێدەکرێتـەوە دەخورێـت، هــەروەها لــەناو خوێئــاودا ســوێردەکرێت چەرەســێکی بــەتامی لێدرووستدەکرێت، هەندێکجارجۆرێك لە قەزوان کەپێیاندەڵێن (وەنەکەڵی) دەکرێن بە تەزبیح، گەڵای داری قەزوان بۆ نەخۆشی خۆربردن زۆربەسوودە.

بێجگە لەوانەی باسمـانکردن، گـرنگترین بەرهـەمی ئـەم دارە (بنێـشتە) لـەڕێی کارێکـەوە دەهێنرێتەبەرهەم پێیـدەوترێت (وێژەنکـەردەی=بنێـشتکردن)، ئـەم کـارە زۆرگرانـە و بەکۆمـەڵ دەکرێـت نـەك بـە تاکەکەسـی، ئەوانـەی بنێـشتدەکەن کارەکـەیان وەك سـتاف بەشـدەکەن، هـەر سـتافێك پێکـدێت لـە سـێ کـەس بـەم شـێوەیە: (وەسـتای لەلـەدەر، وەسـتای کۆچەڵەبەسـت، بەردەست)، وەستای لەلەدەر (لەلـەی دارەکـان دەدات) بـەواتای قـەد ولقـی دارەکـان بەتەشـۆیەکی زۆرتیـژ برینـدار دەکـات و پێویـستە لـە کارەکەیـدا زۆرشـارەزابێت، وەسـتای کۆچەڵەبەسـتیش لەبەردەم شوێنی بریندارکردنەکەدا بە (قوڕەسوورە) کۆچەڵەکان دەبەستێت، هەتاکو بنێـشتەکە لەناویاندا کۆببێتەوە، ئەو کەسەش بەم کارە هەڵدەسێت پێویستە زۆر شارەزابێت و کۆچـەڵەکان بـەڕێکوپێکی ببەسـتێت، پێویـستی بـە دەفرێـك هەیـە کـە ئاویتێـدەکات پێیـدەڵێن (دەسـاو)، هـەمووجارێك دەسـت دەچـەقێنێت بەئاوەکـەدا هـەتاکو ئـەو قـوڕەی دەسـتی کـە کۆچـەڵەکەی پێدەبەستێت زیاتر (لووس و لیق) ببێـت و بەئاسـانی بلکێـت بەشـوێنی خۆیـدا و بەدەسـتییەوە





نـەلكێت، سـێیەم كـەس ئەوەیـە قوڕەكـە هەڵـدەگرێت و لەبەردەسـتی كۆچەڵەبەسـتدا دەبێـت پێیدەڵێن (وەردەست=بەردەست)، ئەم بەردەستە پێویستی بە (خام، گوێنی) بۆ قوڕكێشان هەیە، دەیـــدات بەكۆڵیـــداو بـــۆ هـــەر كۆچـــەڵەیەك پارچـــەیەك قـــوڕ دەدات بەدەســـت وەســـتای كۆچەڵەبەستەوە.

پـاش ئـەوەی كۆمـەڵێك كـەس بڕیـاردەدەن بنێـشتبكەن، ئـیتر ئـەو شـوێنەی بنێـشتەكەی تێدادەكـەن هـی یـەكێكیان بێـت، یـان هـی چـەند كەسـێكیان بێـت، یـان بـەكرێی سـاڵانە بیگـرن، پێداویستی تایبەت ئامادە دەكەن و رووەو شوێنی كاركردنیان دەكەونەڕێ، پێویستیان بـە بـەرزە وڵاخ بۆ گواستنەوەی كەلوپەلەكانیان هەیە، هەوەها (خۆڵ و ئاویـان) پێویـستە بـۆ قوڕگرتنـەوە، (پاچ) بۆ هەڵكەندنی خۆڵ و (بێژنگ)یش بۆ بێژانەوەی، (تەشۆ) بۆلەلـەدانی دارەكـان، (كونـە و جەوەنــە) بــۆ ئاوكێــشان، ئــاردبۆ نــانكردن، پێداویــستی چــالێنان و خواردەمــەنی بــۆ ئــەو چەندڕۆژەیان كە بەكارەكەوە سەرقاڵن، پاش ئەوەی دەگەنـە شـوێنی كاركردنیـان، یەكـەمكار كـە پێیهەڵدەســتن هەڵكەنــدنی خــۆڵ و بێژانــەوە و قوڕگرتنەوەیــە، قوڕەكــە دەبێــت لــەخۆڵێك بگیرێتـەوە زۆر (گریكـدار=پێـزدار) بێـت و پییـدەوترێت خـۆڵی (توێكڵـدار)، ئـەم جـۆرە خۆڵـە لەكاتی قوڕگرتنەوەدا وەك هەویرێكی توندی لیدێت.

پاش ئامادەكردنی قوڕ شـەوێك پـشوودەدەن، بـۆ سـەرلەبەیانی زوو لەخـەو هەڵدەسـتن و دەســـتبەكاركردن دەكـــەن، (وەســـتای لەلەلێـــدەر) دەســـبەكاردەبێت و پاشـــان ئـــەوانی تـــریش هەریەكەیان بەكاری خۆیان هەڵدەستن، ئەمە رۆژانە و تاریك بـۆ تاریـك بەردەوامـدەبێت، تـەنها ماوەیەك كورت نەبێت كە بۆنانخواردنی نیوەڕۆیان تەرخانـدەكرێت، كـەمێك پـێش ئـەو كاتـەش یـەكێك لەبەردەسـتەكان، وە یـاخود كەسـێك كەبەتایبـەتی بـۆ ئـەوكارەی دەبـەن، خواردنیـان بـۆ ئامادە دەكات، زۆرجار خۆیان نانـدەكەن، كاتیـان زۆركەمـە بـۆ چێـشتلێنان، زۆربـەی ژەمـەكانیان بریتین لە (نان وچا، نـان وئـاو، نـان و تەماتـە و خـەیار ... هتـد)، زیـاتر گرنگیـدەدەن بـەوەی كاتەكـەیان بەكاركردنــەوە بگــوزەرێنن، جارجــار بــەدەم كاركردنــەوە گورانیدەچــڕن و قــسەو بەسەرهاتی خۆش بۆ یەكتری دەگێڕنەوە، شەوانیش سەرەڕای ئەوەی زۆر مانـدوون ماوەیـەك بـە گۆرانیـچڕین دەبەنەسـەر، ئـیتر كارەكـە بـەم شـێوەیە بەردەوامـدەبێت هـەتاكو هـەموو دارەكـان لەلەدەدرێن و كۆچەڵەیان لێدەبەسترێت.

پــاش ئــەوەی مــاوەی (7) رۆژ پــشوودەدەن، وەسـتای لەلــەدەر بۆجـاری دووەم شــوێنی لەلەكەی پێشوو كەمێك لە پشتی لەلەی یەكەمەوە بریندااردەكاتەوە و بەم كـارەش دەڵێن (دووە

لەلە= دوولەلە)، لەم کارەدا وەستا و شاگرد بەشداریدەکەن و بە خێرایی کارەکەیات تەواودەکەن، پاش تێپەڕبوونی (7ـ 10) ڕۆژ بەسەر دوولەلەکەدا، کاتی چنینەوەوی بنێشتەکە دێتـە پێشەوە و دەسـت بـە چـنینەوەی دەکـەن و لـەو کاتـەدا پێیـدەڵێن (وێژەنـە تاڵـە=بنێـشتە تاڵـە)، لـە کۆکردنەوەی بنێشتیشدا (وەستا، شاگرد) بەشداریدەکەن، بەوەی ئەو دووچەنجەی پیانـدەوترێت (دۆشاو مژە و پەنجە کەڵە) دەیانچەقێنن بە ئـاودا و بنێـشتەکە لـەناو کۆچـەڵکاندا دەردەکـەن و دەیکنە دەفرێکەوە کە پێیانە، پاشان دەیکەنە ناو تەنەکەوە و لەم کاتەدا وەك ڕۆنێکی تەڕ وایە، پاش کۆکردنەوەی بنێشتەکە بە هێڵـەك پاڵفتەیدەکـەن و ئینجا دەیکوڵێنن، پاشـان هـەر چـوا تەنەکەی دەکەنە ناو کێسەیەکی خام و پێیدەڵێن (لنگە)، هەردوو لەنگەش پێیاندەوترێت (بـارە وێژەن= بارە بنێشت)، پێشتر لە هەوراماندا بنێشت هەر بە (لنگە وبار) فرۆشـراوە، بـەڵام ئێـستا بە کیلۆ دەفرۆشرێت، کێشی بارە بنێشت بە شێوەیەکی گشتی لە نێوان (150ـ 160کغم)دایە.

بنێشتکردن زۆرجار نزیکـەی یـەك مـانگی پێدەچێت، لەوماوەیـەدا بنێـشکەرەکان بـەدەر لەو چەند ڕۆژەی پشوویتێدادەدەن، ئیتر ڕۆژەکانی تر زۆر ماندوودەبن و بەشاخەوە دەمێننەوە.

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا دەڵێن ئەو بارانە ناوەختەی هەندێك ساڵ لە هاویندا دەبارێـت و خـەڵکی ناوچـەکە پێیـدەڵێن (کـەپرە شـینوجوولەکا)، گـەورەترین دوژمنـی بنێـشتکەرەکانە، چوونکە کۆچەڵەکان دەخوسێنێتەوە و بنێشتەکە دەشواتەوە بەوەش بەری ڕەنج ومانـدووبوونی بنێشکارەکان بەبادەدات، بۆیە هەر پەڵە هەورێك لەو کاتانەدا ڕووی ئاسمان بگرێت، بنێـشتکەری داماو دڵی لەدەستیدایە خەمی بارینی ئەو بارانە ناوادەیەتی.

2ـ داری بـەڕوو: ئـەم دارە زۆر سـەخت و مەحکەمـە و ڕەگـەکانی زۆر بڵاودەبنـەوە، گەڵاکانی سێبەری چاك درووستدەکەن، زیاتر لەو شوێنانەدا سەوزدەبێت کـە بارانیـان مـسۆگەرە و ڕێـژەی بارانبـارینی سـاڵانەیان لـە (500 ملـم) زیـاترە، (داری بـەڕوو) بەرەکەشـی هـەر پێیدەوترێت (بەڕوو) و بۆ خواردنی مرۆڤ و ئاژەڵ بـەکاردەهێنرێت، هەورامییـەکان بـە دارەکـە دەڵـێن (نـەرە) و بەبەرەکـەی دەڵـێن (بـەلوو)، بەرەکـەی زیـاتر لـەکاتی گرانـی و قەیرانـە ئابوورییەکانـدا لـە لایـەن مرۆڤـەوە وەك خـۆراك بـەکار هێنـراوە، بـەدەر لـەوە هەنـدێکجار لـە شەوانی زستاندا بە ڕێژەیەکی کەم دەخرێتە نـاو ئـاگرەوە دەبرژێـت وەك شەوچـەرە دەخورێـت، بەڵام بۆ ئاژەڵ خۆراکێکی زۆرباشە چونکە ڕێژەیـەکی زۆر (پـرۆتین، کاربۆهیـدرات)ی تێدایـە و دەبێت بەهۆی قەڵەوکردنیان، داری بەڕوو بێجگە لەبەڕوو (جـەوت)یـشی لێبەرهەمـدەهێنرێت،





**(جـەوت) لـەکاتی خۆیـدا زۆر بایـەخی هـەبووە بەتایبـەت بـۆ خۆشـەکردنی (مەشـکە، کونـە)ی تازەدرووسـتکراو و پتەوکردنـەوەی (مەشـکە وکونـەی کـۆن) چـونکە کاتێـك مەشـکە و کونـە خراونەتە ناو جەوتەوە پتەو و پاكژ بوونەتەوە.**

**گەڵای داربەڕوو بەسەوزی پێیدەوترێت (هەژگ) و بەکاردەهێنرێت بۆ سـەرگرتنی کـەپر و دروستکردنی پەچەی هاوینە بۆ ئاژەڵ، هـەروەها لـە زسـتاندا تێکـەڵ بـە ئالیـك دەکرێـت بـۆ ئاژەڵ و دارەکەشی بۆ سووتاندن و دروستکردنی (خەڵووز) بەکاردەهێنرێت.**

### 3ـ داری گوێز

**ئەم دارە لە هەوراماندا پێدەوترێت (بلچی) و بەرەکەشی هەمان ناوی هەیـە و رێژەکـەی زۆر کـەمترە لـە داری قـەزوان و بـەڕوو، بـەری داری گوێـز زۆر بـەتام و بەسـوودە ئەگـەر بـاش پێبگات، بەڵام خواردنی بە نەگەییوی دەبێتە هۆی ژانەسك و باکردنی ریخۆڵەکان، دارەکەشی بـۆ سووتاندن و خەڵووزکردن بەکاردێت.**

### 4ـ داری تاوگ

**هەورامییەکان بەم دارە دەڵێن (تایلێ) و بەرەکەشی هەر هەمان ناوی هەیە، هەندێك لـە بێئاگایان باس لەوە ئەوە دەکەن گوایا ئـەم دارە زۆر سەیروسـەمەرەیە و بێجگـە بـۆ سـووتاندنی کەس نازانێـت بۆچـی باشـە، بـەڵام بـەری ئـەم دارە لـەکاتی بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـی (تـاعون)دا تـەنها چارەسـەر بـووە بـۆ ئـەو نەخۆشییە، بەڕاددەیـەك خـەڵکی ناوچەکانی تـر روویانکردۆتـە هەورامان و بەتایبەت شارەدێی (تەوێڵە) وتوویانە دەچـین بـۆ (تایلـە)، یـەکێك لـە بۆچـوونەکان دەربارەی ناوی تەوێڵە، دەڵێن گوایا لەناوی (تایلی)وە هاتووە.**

**بێجگە لە دارەکان هەندێك لە دەوەنەکانیش بایەخی خۆیان هەیە لەوانە:**

**1ـ (هەنگەونی= گەون= گوێنو):**

**ئـەم دەوەنـە لـە زۆربـەی کـەژ و کێوەکـانی هەورامانـدا دەڕوێـت، گـەڵاکانی دڕکـاوین و دیمەنی لـەرووی دەرەوە وەك چـەتر وایـە، ئـەم دەوەنـە (کـەتیرە= جـەوی) لێبەرهەمـدەهێنرێت بەوەی (20سم) لە سەرزەوییەوە قەدەکەی (لەلەدەدەن) و ئـیتر لـە شـوین لەلەکـەوە شـیلەیەکی خەست دەردەچێت، پاشان کۆیدەکەنەوە و لەهەنـدێ کـاری پێویـستدا بەکاریـدەهێنن بەتایبـەتی (وەسـتای بنـەکڵاش) درووسـتکردن دەیـسوون بـە قـەراغی بنەکڵاشـەوە، هـەروەها قـەد و کۆتەرەکانی بۆسووتاندن بەکاردەهێنرێن.**

2 بەلاڵووك

هەورامییـەکان بـەم دەوەنـە و بەرەکەشـی هـەردەڵێن (برالـوی)، دەوەنێکـی گـەڵاوردە و بەرەکـەی ورد و رەنگـاو رەنگـە وەك (سـوور، زەرد، رەش)، بـەری بـەلاڵووك سـوودی زۆرە و رێژەیـەکی بـاش کەرەسـەی خـۆراکی و ڤیتامینـەکانی تێدایـە، بـەڵام خـوارنی بـە ناوکەکەیـەوە دەبێتــە هــۆی ژانەســك، دەوەنــی بــەلاڵووك (گــالۆك، دارجگــەرە، دەســکی دوالگــیر)ی لێدرووستدەکرێت.

بێجگە لەم دار و دەوەنانە و چەندانی تریش کە ناومانەهێناون، لەهەورامانـدا چـەندین گیاو گۆڵ هەن کە بایـەخی ئابووریـان هەیـە، چ بـۆ خـواردنی مـرۆڤ و بـەکارهێنانیان لـە بـواری پزیشکی و دەرمانگەری مێلیدا، چ بۆ سوود وەرگرتن لێیان بۆ بـەخێوکردنی (ئـاژەل، رەشـەوڵاخ، بەرزەوڵاخ)، ئەوانەشیان کەزیاتر گرنگن لە ژیانی هەورامییەکاندا بریتین لە:

(گەنڵە، سێیارا= سێداران، گەزەنی= گەزنـە، پوینـە= پوونـگـە، گوزروانـە= گـوزروان، پـسڵ، بەرگـەمی= کووزەلـە، غـازی= کـاردو= کـاردی، ریـواوی= رێـواس، شـنگ، هالـەکۆکۆکی= هالـەکۆك، بــەرەزا، پیــچك، کنیــواڵی، هــەزبێ= هەزبیلــە، پەلپینــە، ...هتــد) کــە بۆخــواردنی مــرۆڤ بــەکاردەهێنرێن، هــەروەها گــول و گیــا بۆنخۆشــەکانی وەك: (چــنور، شــەوبۆ، بــەرزەڵنگ، سوورەهەلاڵە، وەنەوشە) و دەیان گیای تری بۆنخۆش.

(قارچك)یش کە لـەرووی زانـستییەوە بـە یـەکێك لـە کـەرووەکان دەژمێردرێـت، هـەروەها ئەو گیایانەی کە پێیاندەوترێت (لۆ، کەما، تاڵێندۆس) و باشترین ئالیکیان لێدرووستدەکرێت، لە هەوراماندا بایەخی خۆیان هەیە، لەبەر گرنگی و بایـەخی ئـابووری هەریـەك لـە (لـۆ، قارچـك) لێرەدا تیشکێکدەخەینە سەریان.

### *لۆ سەرچاوەیەکی خۆراکی گەورەیە بۆ ئاژەڵ*

(لـۆ) یەکێکـە لـەو رووەکـە گیاییـە وەرزییانـەی لـە هەورامانـدا و بـە تایبـەت لـە شـوێنە سەخت و شاخاوییەکاندا سەوز دەبێت، هـەر لـە سـەرەتای بـەهارەوە چـووزەدەکات و بـەرە بـەرە پەخـشاندەبێتەوە، گـەلاکانی سـەوز و باریـك و ریـشەین، لـە شـێوەی دەرەوەیـەدا وەك (شـەعر بەنات) وایـە، لـەکاتی تەرِیـدا زۆر تالـەو مادەیـەکی لینجـی پێوەیـە و دەلکێـت بـە دەسـتدا، ئـەو شوێنانـەی بەزۆری (لۆ)یان تێدا سەوزدەبێت پێیاندەوترێت (لاس)، بە پێی عـورفی کۆمەڵایـەتی

ناوچـەکە لاسـەکان موڵکییـەتی تایبـەتین، کـڕین و فـرۆش دەکـرێن و وەچـە بـۆ وەچـە دەگوێزرێنـەوە، (لـۆ) پـێش ئـەوەی زەرد ببێـت دەیـبڕن و هەورامیـەکان بـەم کـارە دەڵـێن (لـۆ کەندن)، هەموو کەسێك ناتوانێت (لۆ) بکەنێت، چونکە هەم کـارێکی گرانـە و هـەم شارەزاییـشی پێویـستە، ئـەم کـارە زووتـر لـە هەورمانـدا زۆرجـار بـە گـەلکاری ئەنجامـدراوە و بـەوەی چـەند خاوەن (لاس)ێك لە خزم و دراوسێی یەکتری لـە نێـوان خۆیانـدا گـەلکارییانکردووە و لـە چـەند رۆژێکـدا (لـۆ)ی لاسـەکانیان کەنـدووە، یـاخود گـەلکاری گـشتی کـراوە بـۆ کەنـدنی (لـۆ)ی حکمڕانەکان وەك (سانەکان، بەگەکان)، لەم رۆژانەشدا بەدەر لەو کەسانەی کە لـە یـەکترەوە زۆر نزیکن، ئیتر کاری لۆکەندن بەرامبەر بەکرێ ئەنجامدەدرێت، گەلکارە گشتییەکانی (لۆکەندن) لە هەورامانـدا زۆر جیـاواز بـوون لـە و کارانـەی لـە هەنـدێك ناوچـەدا بـە بێگـاریکراون (لـە باسـی گەلکارییەکانی هەوراماندا ئاماژە بەم باسەدەدەین).

(لۆ) پاش کەندنی دەکرێت بە (ملۆ) هەتا وشکدەبێتەوە و پاش وشـکبوونەوەش کێـشە و گێرەدەکرێـت، ئینجادەگوێزرێتـەوە بـۆ نـاو گونـد و دەکرێتـە (کـادان)، ئـەم گیایـە سروشـتێکی گەرمی هەیە و بە کەرەسەی خۆراکی زۆر دەوڵەمەندە، لەوەرزی زستاندا دەدرێت بە رەشـەوڵاخ، ئەو رەشەوڵاخانەی بە زستاندا لۆیاندەدرێتێ کـەمتر پێویـستیان بـە دان هەیـە، چـونکە (لـۆ)کـە هەم بەهێزیاندەکات و بەرهەمەکەیان زیاددەکات، هەم تام و بۆنی ئـەو بەرهەمانـە خۆشـدەکات، هەورامیەکان دەڵێن ئەو مانگایـەی (لـۆ) دەخـوات، ماسـتەکەی ئەوەنـدە پتـەوە دەمەونخوونیـشی بکەیت ناڕژێت، ئەو خاوەن لاسانەی خۆیـان رەشـەوڵاخیان نییـە، سـاڵانە لاسـەکانیان دەدەن بـە ئیجارە، یاخود لۆکانیان دەکەنن و پاشان دەیفرۆشن، نرخـی (لـۆ) لـە نرخـی هـەموو ئالیکـەکانی تر گرانترە.

هەندێك لە خەڵکانی هەورامان بەتایبـەتی ئەوانـەیان لـە (لۆکەنـدن)دا شـارەزان، سـاڵانە چـەند لاسـێك بەکرێـدەگرن و (لـۆ)کـەیان دەکـەنن، پـاش ئـەوەی دەیکـەن بـە ئالیـك، وەك سەرچاوەیەکی داهات دەیفرۆشن، یـاخود هەڵیـدەگرن بـۆ وەرزی زسـتان و ئـەو کاتـە بـە خـاوەن رەشەوڵاخەکان دەیفرۆشن.

(لۆ) کاتێك دەکرێتە کادانەوە پێویستە شوێنەکەی زۆر وشکبێت و ئەگـەر تـەڕبێت ئـەوە بـە دڵنیاییـەوە خراپـدەبێت، لەبـەر ئـەوەش بـە وشـکی تـۆزی لێبەرزدەبێتـەوە، ئـەو کەسـانەی رۆژانە (لۆ) دەدەن بە رەشەوڵاخەکانیان، لەبـەر ئـەوەی تووشـی کێشەی تەندرووسـتی نـەبن لـە سییەکانیاندا دەم و لووتی خۆیان دەپێچن.

**قارچك:**

**یەكێكە لەو كەڕوانەی بایەخێكی گەورەیان هەیە و ڕێژەیەكی باش لە (پڕۆتین، ئاسن، فۆسفۆڕ، مس، پۆتاسیۆم، كالیسیۆم، لیپیۆم، نیشاستە) و چەند ڤیتامینێكی تێدایە وەك: (D،C،B،A)، زۆر كەس حەز بەخواردنی دەكەن و هەرسكردنی زۆر ئاسانە، هەندێك لە ولاّتە ئەوروپییەكان وەك (بەیتانیا، فەڕەنسا، ئەڵەمانیا) و چەندین ولاّتی تریش وەك (ئەمەریكا، چین، یابان) و ژمارەیەك لە ولاّتە تازە پێگەیشتووەكان بایەخدەدەن بە بەرهەمهێنانی، ئەوەی گرنگییەكی گەورەدەدات بە قارچك ئەوەیە بە (كولاّوی، كاڵی، برژاوی، سورەوكراوی) دەخورێت، سەرەڕای ئەوەی وشكدەكرێتەوە و دواتر بەكاردەهێنرێت، هەروەها دەخرێتە قوتووەوە= تەعلیبدەكرێت.**

**گرنگترین توخمەكانی قارچك ئەمانەن:**

**یەكەم= توخمی ئاگاریكەس:**

**ئەم توخمە چەند جۆرێكی هەیە و زۆربەی جۆرەكانی دەخورێن لەوانە:**

1ـ **قارچكە دارانە: لەوشوێنانەدا دەردێت داری سنەوبەری تێدایە و بۆنێكی تیژی هەیە.**

2ـ **قارچكی كێوی: لە دوادوای مانگی تەمووزدا و لە شوێنە دەشتاییەكاندا دەردێت، بەوەدا دەناسرێتەوە ئەڵقەیەكی تەنك بەسەر قەدەكەیەوە هەیە.**

3ـ **قارچكی كشتوكاڵی: ئەم جۆرەیان وەك بەروبوومی كشتوكاڵی بەرهەمدەهێنرێن، وەك پێشتر ئاماژەمانپێدا هەندێك لەولاّتە ئەورووپییەكان زۆر بایەخ بەم جۆرە قارچكانەدەدەن و بەرهەمیاندەهێنن، بۆنموونە ولاّتێكی وەك (بەریتانیا) ساڵانە سەدان ملیۆن پاوەن لەم جۆرە قارچانە دەفرۆشێت.**

4ـ **قارچكی ئەسپ: قارچكێكی گەورەیە و تامی بادامی هەیە و زیاتر لە مێرگەكاندا دەردێت.**

5ـ **قارچكەكانی ناوچەی هەورامان وەك: (قارچكی لۆـ قارچكی كەماـ قارچكی تاڵیندۆس، قارچكی گیا، قارچكی گوێز، قارچكی بی، بوومەترەكە) هەموویان لەم توخمەن و بۆخواردن دەستدەدەن.**

**دووەم= توخمی كۆپرانییەس:**

زۆربەی جۆرەکانی  ئەم توخمە رەنگیان رەشە، ریشەکانیان نەرمن و دڵۆپ دڵۆپ ئـاوێکی رەشیان لێدەچۆڕێت، زۆریان بەسەر پاشەڕۆی ئاژەڵ، یاخود خـۆراکی گـەنیوەوە و هەندێکیـشیان بەسەر دار و تەختەی رزیوەوە دەژین، ئەم توخمە تەنها ئەوانەیان دەخورێن کە رەنگیان سپییە و دەبێت زۆرباش بکوڵێنرێن ئینجا بخورێن.

سێیەم= توخمی ئارمیلاریا:

ئەم توخمە زیاتر بەچواردەوری بنی دار و بەسـەر لق و پۆپـە وشکەکانییەوە دەردێـن، رەنگیان هەنگوینییە و تامیان خۆشە، هەر لەبەر ئەوەیە پێیاندەوترێت (قارچکی هـەنگوینی) و بۆخواردن دەستدەدەن.

چوارەم= توخمی ئەمانیتا:

زۆربەی جۆرەکانی ئەم توخمـە زەهـراوین وەك: (قارچگە سـەگانە) هەرکـەس (قارچکە سەگانە) بخوات 90٪ دەمرێت، بۆیە پێیـدەوترێت (قارچـکی بکـوژ)، هـەروەها جـۆرێکی تـر لـەم توخمە پێیاندەوترێت (فریشتەی تێکدەر) سەرپاییزان بەسەر دار و تەختەی رزیوەوە دەردێن و قەدەکـەیان زبـرە، بـۆنێکی ئەوەنـدە  نـاخۆش و کەسـکونیان هەیـە، هەرکـەس هەڵیمـژێت دەیخەوێنێت، ئەم جۆرەش زەهراوین و خواردنیان دەبێتە هۆی مردن.

پـاش ئـەوەی باسـی توخمـەکانی قارچـکمان کـرد، دێینـە سـەرئەوەی زۆربـەی خـەڵکی هەورامان جۆری قارچکەکان دەناسن و بەئاسان چاك و خراپیان لە یەکتر جیادەکەنەوە، رۆیـشن بو شاخ و ناوباخ بۆ دۆزینەوەی قارچك یەکێکە لـەخووە کۆمەڵایەتییـەکانی خـەڵکی ناوچـەکە، لـەوەرزی بـەهاردا و بـە تایبـەتی لەوکاتانـەدا (لـۆ) کـەمێك پەخـشاندەبێتەوە، ژمارەیـەك گوندنشینەکان پاش بارینی هەر لێزمە بارانێکی هاوڕێ بە هەوەرەبرووسکە، ئیتر رێـی کێوەکـان دەگرنەبـەر و هـەر سـەرلەبەیانی تـا عەسـرێکی درەنـگ بـۆ قارچـك دەگـەڕێن، لـەم بـوارەدا قەناعـەتیان بـە دووشـت هەیـە، یەکـەمیان پێیانوایـە قارچـك بـە هـەورە برووسـکە دەردێـت، ودووەمیشیان پێیانوایە دۆزینەوەی قارچك بە(بەختە)، ئەوانەی لەم بوارەدا خۆیان بەبەختـدار دەزانن دەڵێن (ڕەجنیم هەنە) و بەپێچەوانەشەوە دەڵێن (رەجنـیم نییەنـە)، شـتێکی ئاشـکرایە ئـەم قەناعەتـە لـەرووی ژیـری و زانـستییەوە هـیچ بنەمایـەکی نییـە، بـەڵام ئەوانـەی پێیقـایلن تارادەیـــەکی زۆر پێوەیوابەســـتەن، زۆربـــەی ئەوانـــەی بۆدۆزینـــەوەوی قارچـــك خۆیـــان بـــە بێبەختدەزانن ناچن بۆ کێوەکان بۆدۆزینەوەی، کـاتێکیش دەڕۆن بەدەسـتی بـەتاڵ دەگەڕێنـەوە،

یاخود تەنها دانەیەك یان چەند دانەیەك دەهێننەوە، كەچی ئەوانەی خۆیان بەبەختدار دەزانن بە توێشەبەرەی ئاخنراو لە قارچك دەگەڕێنەوە ماڵەوە.

**تێبینی:**

**بەرهەمە جۆراوجۆرەكانی هەورامان لە (میوە، سەوزەوات، بەری دارە خۆرسكەكان، گژ وگیا، گوڵ و گوڵاڵە...هتد) چەندین سوودیان لەبواری پزیشكی و دەرمانگەریدا هەیە، لێرەدا قسەمان لەسەرنەكردن بەڵام لەبابەتی (پزیشكی و دەرمانگەری هەورامان)دا سوودەكانیان دەخەینە پێشچاو.**

## ئاژەڵداری

ڕەواڵەتەكانی رووی زەوی و كەش و هەوا كاریگەری گەورەیان لە سەر شێوازی ژیانی ئاژەڵداری و كۆچەری خەڵكی هەوراماندا هەیە، لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا هەوڵدەدەین ئەو كاریگەرییە روونبكەینەوە و تیشكبخەینە سەر تایبەتمەندییەكانی ناوچەی هەورامان لەم بوارەدا، مەبەستی سەرەكیشمان لەم چەند دێڕە سەلماندنی ئەوەیە كە دانیشتووانی ناوچەكە بە پێچەوانەی دانیشتووانی زۆربەی ناوچەكانی تری كوردستانەوە بە تایبەتی دانیشتووانی ناوچەكانی هاوسنوور بە هەورامان لە هەردوو بەشی ئێران و عێراق لە كوردستانی باشووردا، شێوە ژیانی هۆزایەتی و شوانكارەییان بە خۆیانەوە نەدیوە، بێگومان هۆكاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ كاریگەریی جوگرافیایی سروشتی ناوچەكە، هەر لەبەر ئەوەشە باوەڕمان وایە كە دانیشتووانی هەورامان لەم چەند سەدەی دواییدا هۆزیان نەبووە و هەرچی ئاماژەیەكیش بۆ هۆزەكانی هەورامان كرابێت، زیاتر بۆ ئاسانكردنی بابەتەكە بووە لەلای ئەم نووسەری بێگانە، یان ئەو خۆرهەڵاتناسەوە، یان بەهەڵە لێكدانەوەی مێژووی ناوچەكە بووە لەلایەن مێژوو نووسانی كورد و مێژوو نووسانی گەلانی دراوسێی وەكو عەرەب و فارسەوە، زۆربەی ئەو نووسەرانە بەهەمان پێودانگی لێكدانەوەی مێژووی دانیشتووانی شارەزوور مێژووی هەورامانیشیان لێكداوەتەوە، هەندێك لە مێژوونووسی كوردیش بەهەمان هەڵەدا چوون، بۆ نموونە گەورە مێژوونووسێكی وەكو (محەممەد ئەمین زەكی بەگ) بەهەڵە چەند هۆزێكی بەهەورامی داوەتە قەڵەم كە یەكێكیان (هۆزی تاوەگۆزی)یە و لە هەمان كاتدا ناویشی لە لیستی

هۆزەکانی جافدا تۆمارکردووە، شایانی ئاماژەپێکردنیشە مێژوونووسی ناوبراو لە بواری تری مێژووی هەوراماندا دووچاری هەڵەی گەورەتر بووە، وەك ئەوەی لە لاپەڕە(201)ی کتێبی خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستاندا سەبارەت بە زمانی خەڵکی هەورامان دەڵێت: (زمانێکی خصوصیان هەیەو لە کوردی ناچێ).

پاش ئەم چەند دێڕەی سەرەوە دەچینەوە سەر کرۆکی باسەکەمان، وەك پێشتر وتمان کەشو هەوا و رووی زەوی ناوچەی هەورامان کاریگەرییەکی زۆریان لە سەر نەگونجاویی ناوچەکە بۆ شێوە ژیانی کۆچەری و هۆزایەتی هەیە ، لەم بوارەدا باس لەوە دەکەین لەوەرگە شاخاوییەکان بەدرێژایی وەرزی زستان بەفر دایاندەپۆشێت وپلەی گەرما بە رۆژ لە بەشێکی زۆری ناوچەکەدا نزیك پلەی سفر دەبێتەوە، شەوانیش دەگاتە (5 تا 20 )پلەی سەدی ژێر سفر، واتە پلەی گەرما لەم وەرزەدا لە ژێر پلەی گەشەکردنی گژوگیاوەیە، لەم وەرزەدا لە هیچ شیو ودۆڵ و قەدپاڵی کەژێکی هەوراماندا هاوکات لە گەڵ لوتکەی چیاکاندا لەوەڕگەیەك بەدەستناکەوێت، لەبەر ئەوە دەبێت ئاژەڵ لەگەوڕەکاندا دەرنەچێت، واتە گوندنشینەکانی هەورامان دەبێت ساڵانە چوار مانگ پتر خۆیان ئالیکبدەن بە ئاژەڵەکانیان، بەدەستهێنانی ئەم بڕە ئالیکەش لە لەوەڕگە و پاوەنە بچووکەکانی هەوراماندا نەوەك کارێکی زۆر سەختە، بەڵکو شتێکی لە توانا بەدەرە، گریمان بەدەستهێنانی بڕی ئالیکی پێویستیش لە توانادا بێت، بەلام هەڵگرتنی ئەو بڕە ئالیکە و ئەنبارکردنی زۆر لەبەدەستهێنانی گرانترە[سمیرلخ].

لێرەدا دەبینین فاکتەرەکانی (ڕواڵەتی ڕووی زەویی، کارگەری کەشو هەوا) دەکەونە کار، سەختیی ناوچە شاخاوییەکانی هەورامان هەمیشە ڕێگەیان لەوەگرتوە کە گوندنشینان بتوانن گەوڕ و ئەنباری گەورە دروستبکەن و ژمارەیەکی زۆر ئاژەڵ بەخێو بکەن، هەر لەبەر کاریگەریی ئەم دوو فاکتەرەش بووە کە زۆربەی خێزانە ئاژەڵدارەکان تەنها ژمارەیەکی کەم ئاژەڵیان بەخێوکردووە، پێشتریش لە هەندێك حاڵەتدا ژمارەیەك خێزان لە گوندێك، یان لە شارۆچکەیەکی هەوراماندا ئەگەر ویستبێتیان ئاژەڵداریبکەن، ناچار بوون ناوجەرگەی هەورامان بەجێبهێڵن و ڕووبکەنە ناوچە پێدەشتەکان، هەردوو گوندی (خارگێلان و خەرپانی)ش باشترین نموونەی ئەم ڕاستییەن، خەڵکی (خارگێلان) لە ریشەدا دانیشتووی

---

[سمیرلخ] (م. فەیرۆز حەسەن) سیستمی ئابووری، سیاسیی و کۆمەلایەتی هەورامان لەم چوار سەدەی دواییدا گۆڤاری هەورامان ژمارە (1)، لاپەڕە (28) زستانی (2002.

شارۆچکەی تەوێڵە بوون، بەڵام نەگونجاویی ئەم شارۆچکەیە بۆ ئاژەڵداری بـە ئاسـتێکی فـراوان، بووە بەهۆی ئەوەی ئەوانەی ژمارەیـەکی زۆر ئاژەڵیـان بـەخێوکردووە لـە دوادوای پـاییزدا بێنـە (خارگێڵاَن) و بە درێژایی وەرزی زستان تێیـدا بمێننـەوە، دواجـاریش ژمارەیـەکیان لـەو شـوێنەدا نیشتەجێببن و ئاوەدانییبکەنەوە.

ئاژەڵـدارەکانی هـەورامان (بـزن، مـەڕ) بەخێودەکـەن و بەڕەچـاوکردنی ئاسـتی لـەباری سروشتی ناوچەکەش زیاتر بایەخ بە بەخێوکردنی (بـزن) دەدەن، هـەروەها ڕاگرتنـی ڕەشـەوڵاَخ وەك: (گا، مانگا) و بەرزە وڵاَخ وەك: (کەر، ئێستر)یش بایەخی خۆیان هەیە.

بەرهەمی ئاژەڵ و ڕەشە وڵاَخەکان لە (ماست، کـەرێ، پـەنیر، ڕۆن، کەشـك، خـوری، مـوو، پێستە) و بە ئاستێکی کەمیش (دۆ)، پاش ئەوەی پێویستی خێزانیان لێهەڵـدەگیرێت زیادەکـەیان دەفرۆشـرێت، ژمارەیـەك لـە خێزانـە هەورامییـەکان بایەخـدەدەن بـە ڕاگرتنـی (گـاجووت) بـۆ کێڵاَنی کێڵاَنی (باخ، ڕەز، زەوی)یەکانیان سوودیان لێوەردەگرن، خاوەن گاجووتەکانیش هـەر لـە کۆنەوە تا ئێستا لە ناو خەڵکدا بەچاوی ڕێزەوە سەیردەکرێن.

لە بواری ئاژەڵداری هەوراماندا پێویستە باس لە (گەلەبێرە= ڕانەبێرە) بکـەین، کـە وەك خوویەکی کۆمەڵاَیـەتی شـوێنی خـۆی لـەناو کولتـووری ناوچـەکەدا کردۆتـەوە و بـووە بەیـەکێك لەسیما جوانەکانی ژیانی کۆمەڵاَیـەتی خـەڵکی هـەورامان، (گەلـە بێـرە) بریتییـە لـەوەی شـوانە هەورامییـەکان لـەوەرزی بـەهاردا ڕۆژی (2)جـار و لـە وەرزەکـانی (هـاوین و پـاییز)یـشدا ڕۆژی جارێك ڕانەکان دەهێننەوە بۆ شـوێنێکی نزیـك گونـد بـۆ ئـەوەی ئەوانـەیان شـیردەرن لـە لایـەن خاوەنەگانیانـەوە بدۆشـرێن، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش (کـچان و ژنـان) خۆیـان دەڕازێننـە و بـەرەو (بێرەگا[شمیرلچ]) دەکەونەڕێ، هاوکات کوڕە گەنجەکانیش بۆ هەمان شوێن دەڕۆن و لەوێ دڵـدارەکان دەکەونە چاوبڕکێ و خۆنواندن، ئەم خووەش ساڵاَنە هـەتاکو کـاتی (پەڵـەدان[لحسملچ]) بەردەوامـە، بەڵاَم پاش پەڵەدان شوانەکان ئێواران ڕانەکان دەهێننەوە نـاو گونـد بـۆ ئـەوەی شـەوان ئالیکیـان بدرێتێ، تا ئێرە بەکورتی باسی ئاژەڵداریمان کرد، بەڵاَم لەبەر ئەوەی ڕاگرتنی (بـەرزە وڵاَخ) لـە

---

[شمیرلچ] (بێرەگا) مەبەست لەو شوێنەیە کە شوانەکان ڕانەکانی تێدا مۆڵدەدەن بەمەبەستی دۆشینیان.

[لمحسملچ] (پەڵـەدان) مەبەسـت ئـەو کاتەیـە کـە ئەوەنـدە باراندەبارێت زەوی بەتـەواوی دەخوسـێتەوە و کێڵاَنـی ئـەو زەوییانە دەستپێدەکات کە (وەرد) نین بە واتا لەوەرزی بەهار و هاویندا نەکێڵراون، لای کۆمکـەڵی کوردەواری ڕۆژی (5 )ی مانگی تشرینی دووەم) بە دواکاتی هەقە پەڵە دادەنرێت.

**هەوراماندا بایەخێکی زۆری هەیە و یەکێکە لەسەرچاوە سەرەکییەکانی بژێوی ژمارەیەکی زۆر لە خێزانەکان، لە خوارەوە باسی تایبەتی خۆی هەیە لە ژێر ناوونیشانی (وەڵاخداری)دا.**

## وەڵاخداری

**وەڵاخداری یەکێکە لەو کارانەی هەر لەزووە وە و هەتاکو ئێستاشی لەگەڵدابێت بایەخێکی گەورەی لە هەوراماندا هەیە، بە یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی دابینکردنی بە شێك لە ژیان و گوزەرانی ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشینەکانی هەورامان دەدرێتە قەڵەم، هەرچەندە لەم رۆژگارەدا زۆربەی هەرە زۆری گوندەکانی هەردوو دیوی هەورامان رێی ئۆتۆمۆبێلیان لەسەرە، کەچی وەڵاخداری هەر بایەخی خۆی هەیە، ئەو وڵاخانەی لەهەوراماندا هەن بەشێوەیەکی سەرەکی بریتین لە (کەر، ئێستر، بارگیر)، کەر لەو وڵاخانەیە کە هەر لەزووەوە لە هەوراماندا راگیراوە، بەڵام ئێستر لەئەنجامی تێکەڵاوکردنی کەری کورد و ماینی عەرەبەوە پەیدا بووە و ماوەیەکی زۆر پاش کەر لە وەڵاخداری هەوراماندا سەریهەڵداوە.**

**هەورامییەکان وەڵاخەکانیان بۆ (سواری، گواستنەوەی بەروبوومی باخ و رەزەدێمەکان، دارکێشان، کوتان و گواستنەوەی گزرە و لۆ و کەما و درك، گواستنەوەی پێداویستییەکانی بیناسازی، کاروانکردن) و هەروەها بە ریژەیەکی کەمیش لە کاری کێڵانی زەوی و باخەکانیاندا بەتایبەتی ئەو شوێنانەی کەمێك تەختن بەکاریاندەهێنن، هاوکات لە ئاڵوویردکردنی سەر سنوورەکاندا سوودیان لێوەردەگرن.**

**شتێکی ئاشکرایە زۆربەی (باخ، رەزەدێم، لاس، قۆرخ)ەکانی هەورامان لە شوێنی سەختدان و بە وڵاخ هاتووچۆیان دەکرێت، هەندێك شوێنیش هەن تەنانەت هاتووی چۆی وڵاخیش تیایاندا گرانە، بۆیە بەرهەمی ئەو شوێنانە بە کۆڵی مرۆڤ دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو شوێنانەی وڵاخ پیایاندا گوزەردەکات، دارلە زۆربەی گوندەکانی هەوراماندا تا ئێستاش بە وڵاخ دەکێشرێت و هەر بەباریش دەفرۆشرێت، هەورامییەکان بە وەڵاخەکانیان لە رێگەی کاروانکردنەوە بەرهەمەکانی خۆیان وەك: (گوێز، توو، میوەی تر بە تەڕی، یاخود وشکەوکراوەیی، بەرهەمی پیشەدەستییەکان....هتد) بۆ دەرەوەی هەورامان گواستۆتەوە و**

لەوێـشەوە زۆربــەی پێداویـستییەکانیان کـە لـە هەورامانــد کـەمبوون، یـاخود نــەبوون وەك: (گەنم،جۆ، نۆك، نیسك، چەڵتووك،خورما، دۆشاوی خورمـا)یـان، هێنـاوە، هـەروەها ژمارەیـەکیان بـەکاروان چـوون بـۆ نـاو دەوار نـشینەکانی (جـاف) وبـەم کاروانــەیان وتــووە (خێڵـی)، لـەوێ بەرهەمـەکانی خۆیـان فرۆشـتووە و چـەند کەرەسـە و پێداویـستییەکیان هێنـاوە وەك: (خـوری، موو، رۆن، کەشك....هتد).

وەڵاخـدارەکانی هـەورامان لـە ئـەنجامی کاروانکردنــەوە ئاشـنایەتییان لەگـەڵ خـەڵکانی دەرەوەی هەوراماندا پەیداکردووە، هەر لەم رێیەوە خۆیانناساندوە بە خەڵکانی ئەو ناوچانە و جۆری ژیانی خۆیان و هەندێك لەبوارەکانی کولتووریان بەوان ناساندووە، لـە کولتـوور و جـۆری ژیانی ئەوانیش ئاشنابوون، خـەڵکی هەنـدێك لـە شـوێنەکانی هـەورامان بـە تایبـەت (هـەجیج و ژاوەرۆ) لە رێی کاروانکردنەوە ئەو کەرەسانەی بۆ بەرهەمهێنانی ژمارەیەك لە کاڵا دەسـتییەکان پێویستبوون هێناوە، هەر بۆنموونە: (پەڕۆ، پێستە، ئەندامی نێرینەی کەڵەگا) بۆدرووسـتکردنی (کڵاش و پێڵاو).

هەورامییـەکان هەرچـۆن بایـەخ بـە پاراسـتنی تەندرووسـتی خۆیـان دەدەن، درووسـتی وڵاخەکانیشیان لامەبەستە، گەوڕی وڵاخەکانیان و شوێنی ئەمبارکردنی ئالیك لـە شـوێنی ژیـانی خۆیان جیاوازە، هەمیشە لایان مەبەستە (کورتان، سەرجل، توورەکـە)ی چـاك بـۆ وەڵاخـەکانیان دابینبکەن و بەینا و بەینیش بە پێی پێویـست لای ناڵبەنـدەکان ناڵیاندەکـەن، بایەخـدەدەن بـە رازاندنــەوەیان و هـەر کـەس وەڵاخەکـەی چـاك و دەماخبێـت شـانازی پێوەدەکـات، وەڵاخ لــە هەورامانــدا زۆر جـار دەسـەوامیپێدەکرێت بـە تایبـەت لـە کـاتی گەلکارییەکانـدا، یـاخود بـۆ بـاربووکردنی ئەوانــەیان وەڵاخیـان نییـە و کارێکیـان هەیـە پێویـستی بـە وەڵاخـە، ئەمـەش سیمایەکی دیاری هاوکاریکردن و بەتەنگەوەهاتنی یەکترە.

پێشتر ئەو دەسەڵاتدا ر و دەوڵەمەندانەی وەڵاخیانبووە خۆیان وەڵاخدارییان نـەکردووە، بەڵکو بۆ ئەو مەبەستە رەنجبەرێکیانگرتووە کە پێیـانووتوە (هەربەنـە)، هەربەنـەکان سـەرەڕای ئەوەی وەڵاخدارییەکەیانکردووە، هەندێك ئیشوکاری ماڵی خاوەن وەڵاخەکەشـیان کـردووە وەك: (هێزمۆکـەردەی= دارقڵێـشان، بانتلنـای= سـەربانگێڕان، وەرومـاڵای= بـەفرمالین)، بـەڵام ئەمـە هــەرگیز واینـــەکردووە بەچــاوی ســووکەوە تەماشــابکرێن و وەك کۆیلــە هەڵــسووکەوتیان

لەگەڵدابکرێت، بە پێچەوانەوە ئەوەندە رێزیان لێگیراوە بە کوڕی خاوەن وەلاٌخەکە لە قەڵەمدراون، زۆرجار رێککەوتووە خاوەن وەلاٌخ کچی، یاخود خوشکی خۆی لە (هەربەنەکەی= وەلاٌخدارەکەی) مارەبڕیوە و ئیتر بەتەواوی بووە بە ئەندامێکی خێزانەکەی.

وەلاٌخداری لە هەورامانـدا زۆرجار لە باوکەوە بۆ کوڕەکەی دەگوێزرێتەوە، بنەماڵەی وەها هەن چەند نەوەیەکیان وەلاٌخداربوون.

هەر ئەوە ماوە بڵێین لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنەی لە لایەنە جیاجیاکانی ژیان و گوزەرانی خەڵکدا هاتۆتە ئاراوە، کەچی تا ئێستاش وەلاٌخداری هەورامان بایەخی خۆی لەدەستنەداوە و چەندین خێزان بەم پێشەیە ژیانێکی خۆش دەگوزەرێنن.

### پیشەسازییە دەستییەکانی هەورامان

هەورامان مەڵبەندێکی گەورەی پێشەسازییە دەستییەکانە و پیشەسازییەکانیش زۆر و جۆرا و جۆرن، وەك: (جۆلایی، هەلاٌجی، تەونگەری، کلاٌشکەردەی= کلاٌشدروووستکردن، پالاٌوراستەی= پێلاٌودوورین، ئاسنگەری، دارتاشی....هتد)، ئەم پیشەسازییانە پێشتر سەرچاوەی سەرەکی دابینکردنی بژێوی ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لەخەڵکی ناوچەکە بوون و هەندێکیان تا ئەم رۆژانەش بایەخێکی گەورەیان هەیە، وەستا هەورامییەکان زۆر شارەزا و کارامەن لە بواری درووستکردنی کالاٌ دەستییەکاندا، ژمارەیەك لە کالاٌ دەستییەکانیش سەفیری هەورامییەکان بوون و نازناوی ناوچەکە و خەڵکەکەیان وەرگرتووە وەك: (رانکوچۆغەی هەورامان، کلاٌشی هەورامی، چەقۆی هەورامان، مەوج و جاجمی هەورامان.....هتد)، ئەم کالاٌیانە و چەندین کالاٌی تریش ئەوانەیان لە پێویشتی خەڵکی ناوچەکە زیادبوون فرۆشراون و داهاتێکی باشیان بۆ ئەو خێزانانە مسۆگەرکردووە کە بەرهەمهێنانیانەوە خەریکبوون، پیشەوەرەکانی هەورامان بە شێوەیەکی گشتی پایەی کۆمەلاٌیەتی خۆیان هەبووە و لەناو خەڵکەکەدا پێیانوتراوە (دەس زەڕین= دەست زێڕین)، ئەوانیش هەردەم هەوڵیانداوە داهێنەر بن و ئەفراندن لە کارەکانیاندا بکەن، هیوایان ئەوە بووە ناویان بە وەستای باشدەرچێت و جۆرە شانازییەکیان بەوەوە کردووە.

پاش ئەم پێشکەکییە دەچینە سەر باسکردنی ژمارەیەك لە بەرهەمی پیشەسازییە دەستییەکان، بە تایبەتی ئەوانەیان تا ئێستاش بایەخێکی ئابووری گەورەیان لە ژیانی خەڵکەکەدا هەیە.

***1/رانکو چۆغە***

شتێکی ئاشکرایە مرۆڤ هەر لەسەرەتای ئاشنابوونییەوە بە جۆرێك لەژیانی کۆمەڵایەتی بۆ داپۆشینی لەشی و پاراستنی لە سەرما و گەرما پێویستی بە پۆشاك بووە، بۆیە لە هەرقۆناغێکی ژیانیدا بەو کەرەسانەی لەبەردەستیدا بوون پۆشاکی دروستکردووە، لەم بوارەدا سەرەتا لە گەڵا و تویکڵی دار و دەوەن و لە گژوگیا سوودی وەرگرتووە، پاشان بەرهەمی (دڕندەی کێوی، ئاژەڵ، باڵندە)ی بەکار هێناوە وەك: (پێست، خوری ، مەرەز، موو، پەڕ...هتد)، زەرورەتی دروستکردنی پۆشاك مرۆڤی فێری رستن و چنینی دەستی کردووە، ئامێرەکانی رستن و چنینیش بە پێی قۆناغەکانی گەشەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی گەشەیانکردووە، پاشان شۆڕشی پێشەسازی و دەسکەوتە مەزنەکانی بازێکی گەورەشیان بە رستن و چنین داوە و چەندین ماشێن و کارگەی رستن و چنین دروستکراون، ئیتر کەم کەم رستن و چنینی دەستی بریق و باقێکی وەهای نەماوە و بەرهەمی کارگەکانی رستن و چنین تەنگیان بە بەرهەمی رستن و چنینی دەستی هەڵچنیوە، سەرەڕای ئەم بازدانە گەورەیە و دروستبوونی دەیان هەزار گارگەی رستن و چنین لە سەرانسەری جیهاندا و بەرهەمهێنانی سەدان هەزار جۆر قوماش، کەچی رانکو چۆغەکەی خۆمان ساڵ لە دوای ساڵ نرخی زیاددەکات و بووە بە پۆشاکێك هەموو کەسێك بۆیناکرڕێت.

رانکو چۆغەی هەورامان بە پێی ئەو کەرەسەی لە دروستکردنیدا بە کاردەهێنرێت دوو جۆری هەیە، جۆرەکانیش ئەمانەن:

1ـ رانکوچۆغەی مەرەز

2ـ رانکوچۆغەی خوری

رانکۆچۆغەی مەرەز لە هینی خوری باشترە، چونکە هەم نەرمتر و سفتتر و جوانترە، هەم نرخەکەشی زیاترە و چەند رەنگێکیشی هەیە وەك: (سوور، خورمایی، سپی، رەش، شینکی کە لە تێکەڵکردنی هەردوو رەنگی سپی و رەش دروستدەکرێت، سپات ئەم رەنگەیان کەمێك زەردباوە).

رانکوچۆغە بەچوار قۆناغ دروستدەکرێت بەم شێوەیە:

1ـ قۆناغی شتن و پاککردنەوەی مەرەز یاخود خوریەکە: لەم قۆناغەدا ئەو کەرەسەی رانکوچۆغەکەی لێدرووستدەکرێت ئیتر مەرەز بێت ،یاخود خوری پاك دەشۆرێتەوە و لە





پاشــەڕۆی وشــکەوبووی ئــاژەڵ پاکدەکرێتــەوە، ئینجــا بــە پێــی ئــەو ڕەنگــە ســەرەکییەی رانکوچۆغەکەی لێدرووستدەکرێت بژاردەکرێت و هەر رەنگێکی نەگونجاوی تێدابێت لادەبرێت، پاشان کەرەسەکە شیدەکرێتەوە و بە ئامێرێك کە پێیدەوترێت (شەی) و ئەویش هەر بەرهەمی پیــشەسازییە دەســتییەکانی ناوچــەکەیە، شــەیدەکرێتەوە و پاشــان دەکرێــت بــە دەستپێــچك، شەیکردنەوە بۆ ئەوەیە کەرەسەکە زیاتر شیببێتەوە و ئامادەبکرێت بۆ رستن.

2ـ قۆناغی رستن: لـەم قۆناغـەدا ئـەو (مـەرەز، خـوری)یـەی شـی و شـەیکراوەتەوە و بـۆ رســتن ئامـادەکراوە، دەکرێـت بـە سـێ بەشـەوە، دووبەشـی بەشـێوەیەکی باریـك دەڕێـسرێت و پێیـدەڵێن (تـان)، بەشـەکەی تریـشی کـەمێك ئەسـتوورتر دەڕێـسرێت و پێیـدەڵێن (پـۆ)، پـاش رستنیشی (تان) و (پۆ) بەجیا دەکرێن بە (گلۆڵە)، گلۆڵەی (تان) دوو تاڵ و گلۆڵەی (پۆ)ش یەك تاڵن، لەم قۆناغەدا ژنان و کچانی فەیرە کاردەکەن و کەرەسەکە بە تەشی دەڕێسن، رانکۆ چۆغە رێسە کارامەکان جۆری تەشییان جیایە بۆ رێسانی (تان) و (پۆ).

3ـ قۆناغی نانەوە: هەموو تەشی رێسێك ناتوانێت رانکوچـۆغە بنێتـەوە و ئـەو ژنانـەی بەم کارە هەڵدەستن پێویستە زۆر شارەزابن، بۆ ئەنجامدانی کارەکەشیان لە شوێنێکی تەختدا بە درێژای (30ـ 33 گەز) داردادەکوتن کە (هەڵاوەچۆ)یـان پێیانـدەوترێت، ئـەو دارانـە لـە سـەرەوە دوولەپن و لە رووی ئەستووریشەوە بە قەد دەسکە خاکەنازێك ئەستوورن و درێژییەکەشیان لـە نێوان (125ـ 150سم) دایە، لەم قۆناخەدا ئەو رێسەی کراوە بـە (گلۆڵـەی تـان) دەژەنرێتـە نـاو (سرێـشاو) و بەسـەر هەڵاوەچـۆکاندا دریژدەکرێتـەوە، ژەندنیـشی بـە نـاو سرێـشاودا بـۆ ئەوەیـە زیاتر پتەو ولووس بێت، پاش ئەوەی تاقێك بەسـەر هەڵاوەچـۆکانەوە دەمێنێتـەوە، دەکرێـت بـە یەك گلۆڵەی گەورە و دەبرێت بۆ لای جۆلا.

4ـ قۆناغی چنین: هەورامییەکان بەم قۆناغە دەڵێن (قۆناخۆ کـەردەی و کۆتـدای)، کـاری چـنینی رانکوچـۆغە لەلایـەن جـۆلا شـارەزاکانەوە ئەنجامـدەدرێت، لـەم قۆناغـەدا ئـەو رێـسەی هێنــراوە بـۆ لای جـۆلا (تـان)ەکـەی بەسـەر دەزگـای جۆلاییەکـەدا کـە پێیـدەوترێت (پاچـاڵ) درێژدەکرێتەوە، دیارە ئەو دەزگایەش هەموو پێداویستیەکانی جۆلایی وەك: (خـەڕەك، مـەکۆی جۆلا، لوولە، دەف، شانە، پردەڵە...هتد) تێدایە، ئینجا ئەو رێسەی کـراوە بـە (پـۆ) بـە خـەڕەك هەڵدەکرێتـە سـەر جـۆرە لوولەیـەکی باریـك کـە لـە قـامیش درووسـتدەکرێت و دەخرێتـە نـاو (مەکۆ)کەوە، ئیتر جۆلاکە بەجووڵەی هەردوو دەستی و هـەردوو قاچـی (پـۆ)کـە بـە شـێوەیەکی ئاسۆیی لەسـەر ستوونی دەخاتـە نـاە (تـان)ەکـەوە، هـەتا چـنینەکەی تـەواودەکات و لـەم کاتـەدا

پێیدەڵێن (گلێم)، گلێمەکەش یەك بەرە و پانایی لە نێوان (15ـ20سم)دایە، بۆ ئەوەی بەرەکەی تەسکبکاتەوە و ئەو خەتانەی تێدا درووستبکات کە شێوەیەکی گۆل گۆل دەنوێنن کۆتیدەدات، کاری کۆتدانیش بریتییە لەوەی (جۆلا) گلێمەکە لەمسەر و ئەوسەرییەوە بە دوو مێخەوە توند توند شەتەکدەدات، ئینجا لەمسەروەوە بۆ ئەوسەر بەتوندی بە سێ دەق باش دەقیدەدات و ئیتر ئامادەدەکرێت بۆ دوورین.

لێرەدا هەر ئەوە ماوە بڵێین رانکوچۆخەی هەورامان یەکێکە لە پۆشاکە پەسەندەکانی ناو کۆمەڵی کوردەواری و بە هێمایەکی دیاری پۆشاکی کوردی رەسەن لە قەڵەمدەدرێت.

### 2ـ کلاشی هەورامی

پاپۆشێکی کوردی رەسەنە و یەکێکە لە بەرهەمی پیشەسازییە دەستییەکانی هەورامان، لەزۆربەی ناوچەکانی کوردەواریدا ڕەواجی هەیە و رۆڵێکی سەرەکی هەیە لەدابینکردنی بژێوی ئەو کەسانەی بەبەرهەمهێنانییەوە خەریکن، مێژووی درووستکردنی کلاش زۆر کۆنە و جووتێك کلاش کە بۆ پیشالیار درووستکراون لەلایەن وەستایەکەوە بەناوی (قلەندەر) کە یەکێکبووە لە پیرەکانی هەورامان، تا ئێستاش تاکێکیان ماوە و لە خانووەکەی خۆیدا پارێزراوە، بەم پێیە کلاش لە سەرەتاوە لە هەورامانی ئەودیوەوە هاتۆتە هەورامانی ئەمدیو، هەرچەندە هیچ سەرچاوەیەکمان لەبەردەستدا نییە ئەوەمان بۆ دەربخات ئایا هەورامییەکان لە شوێنێکی ترەوە فێری کلاشکردن بوون، یاخود هەر لەسەرەتاوە خۆیان درووستکەر و داهێنەری کلاش بوون، بەلاَم ئەگەر بە وردی بڕوانینە کلاشی ناوچەی هەورامان و کلاشی ناوچەکانی تر، بە ئاسانی بۆمان دەردەکەوێ کە هەورامییەکان خۆیان داهێنەری کلاشن، چونکە کلاشی هەورامی لە کلاشی هەموو ناوچەکانی تر چاکترە و نرخی گرانترە.

(شارەدێی تەوێڵە) کە ئێستا مەڵبەندێکی گەورەی بەرهەمهێنانی کلاشە و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکەکەی وەستای بە سەلیقەن لەم بوارەدا، پێشینەکانیان ماوەی (250) ساڵ زیاترە فێری درووستکردنی کلاش بوون، دەوترێت یەکەم کەسی تەوێڵەیی کە فێری درووستکردنی کلاش بووە کەسێکبووە بەناوی (باباخاڵەکە)، ناوبراو سەرەتا لە (هەورامانی ئەودیو= هەورامانی ئێران)دا فێری کلاشدرووستکردن بووە و هەر لە ژیانی خۆشیدا چەند کوڕ و






کورەزایــەکی فێــری پیــشەکە کــردووە، ئــیتر بــەرە بــەرە بڵاوبۆتــەوە و بــووە بــە پێــشەیەك ژمارەیــەکی زۆر لــە خــەڵکی تەوێڵــە بەتــەنگ فێربوونییــەوە بــوون، بێجگــە لــە تەوێڵــە چــەند گونــدێکی تــری هــەورامان بەبەرهــەمهێنانی کــڵاش بــەناوبانگبوون لەوانــە: (نۆدشــە، ڕەزاو ...هتد).

کڵاشدرووستکردن بریتییە لە چەند کارێکی یەك لە دوای یەك و ئەو کارانـەش بـە سێ قۆناخ ئەنجامدەدرێن بەم شێوەیە:

1قۆناخی پێکەنەگرتن:

ئــەم قۆناخــە تایبەتــە بــە بەرهــەمهێنانی پێکەنــە وەك کەرەســەیکی بنــەڕەتی بــۆ درووستکردنی بنە کڵاشەکە و (وەستای پێکەنەگیر، شاگرد) بەشداری تێدادەکەن، پێکەنەگیر بۆ ئەنجامدانی کارەکەی پێویستی بە پەڕۆی خام هەیە کە لە (خامی کۆن، چێرچەفی کۆن، متێلە لێفی کۆن) دابیندەکرێن، ماوەی چەند ساڵێکیشە جۆرێك لە خامی تازە بەکاردەهێنرێت کە پێیدەڵێن (خامی بۆر)، ئەو پەڕۆیانەی بۆ پێکەنەگرتن بەکاردەهێنرێن، نابێت مادەی نایلۆنیان تێدا بێت، هەر پەڕۆیەك نایلۆنی تێدا بێت پێکەنەگیرەکان پێیدەڵێن (سرك) و لەلایان پەسەند نییە و بەکاریناهێنن، پەڕۆی پێکەنەگرتن پاش ئەوەی پاك دەشۆرێنەوە زۆربەیان بە ڕەنگی (شــێن) و کەمێکیــشیان بــەڕەنگی (ســوور) ڕەنگــدەکرێن، دوای ڕەنگکردنیــان لــە ســێبەردا هەڵــدەخرێن هــەتاکو وشــکدەبنەوە، هەڵخــستنی پــەڕۆکان لــە ســێبەردا بــۆ ئەوەیــە خــۆر کاڵیانەکاتەوە، ئینجا ئەو پەڕۆیانە لەلایەن وەستای پێکەنـەگیرەوە بەدرێـژی (12سم) و پـانی (43سم) دادەدڕێـن و پێیانـدەڵێن (خـشتی پـەڕۆ)، خـشتە پـەڕۆکان لەلایـەن شـاگردەوە پارچـە خـامی کـۆن دەخرێتـە ناویانـەوە ولەسـەریەکیانەوە بـەپانی (1سـم) دەقـدەدرێن و بـەم کـارەش دەوترێت (پەرونیای)، پاشان وەستای پێکەنەگیر بە (مشتە) دەیانکوتێت و دەیانکات بە (فتیلـە)، ئینجا فتیلـەکان بـە (درەوش) کونـدەکات و پاشـان بـە ئـامێرێکی دەسـتی کەهـەر پێیـدەوترێت (پێکەنە)، فتیلەکان یـەك لـە دوای یـەك ریزدەکـات و بـە پێـی کـورت و درێـژیان ڕێکیانـدەخات، ئینجا فتیلەکان لە پێکەنەکە دەکەنێتەوە و دەیانکات بە سێ بەشی وەك یەك، دواجـار ئـەو سێ بەشـە لەسـەریەك دادەنێـت و بەتونـدی بـە پەڕۆیـەکی باریـك کـە پێیـدەڵێن (درز) پێکـەوەیان شـەتەکدەدات و دەبـن بـە تاکێـك پێکەنـە، هـەردوو تـاکیش پێکـەوە شـەتەکدەدات و دەبـن بـە جووتێك پێکەنە، وەستای پێکەنەگیر چەند ئامێرێك لەوانە: (مشتە، کۆتە، درەوش، پێکەنە) بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکەی بەکاردەهێنێت.

2ـ قۆناخی دروستکردنی بنەکلاش:

لەم قۆناخەدا ئەو پێکەنانەی ئامادەکراون، لە لایەن وەستای کلاشکەرەوە دەکرێن بە (بنەکلاش)، بۆ دروستکردنی بنەکلاشیش وەستای کلاشکەر سەرەتا جووتێك پێکەنە دەهێنێت و بەدەمی گازن ئەو پارچە پەڕۆیە دەبڕێت کە پییدەڵێن (درز) و هەردوو تاکە پێکەنەکەی پێکەوە شەتەکداوە، ئینجا لە لووتەوە بۆ پاژنە (سیرم) دەخاتە ناو ئەو کونەی کە پێشتر وەستای پێکەنەگیر لە ناو فتیلەکاندا بە درەوش دروستیکردووە، خۆشی سێ جاری تر درەوشیدەدات، دووجاریان لە لووتەوە بۆ پاژنە و جارێکیان لە پاژنەوە بۆ لووت و هەموو جارێکیش (سیرم) بە ناو کونی درەوشدانەکەدا رەتدەکات و بە هەموو هێزێکییەوە کێشمانیدەدات، ئەو کێشماندانە بۆ پتەوبوونەوەی بنەکلاشکە و پێکەوەنووسانی فتێلەکانە بە یەکترییەوە، لەم کاتەدا بنەکلاشەکە زۆر پانە بۆیە لە هەرچوار لاوە زیادەی فتیلەکان بە (گازن و درەوش) دەپاچێتەوە و بە مشتە تەختیدەکات، ئینجا بەدرەوشێکی تایبەت کە پێیدەوترێت (درەوشی پەرگەما سم) رووی سەرەوەی لە پاژنەوە بۆ لووت لە هەرچوارلاوە دەسمێت، پاش سمینی بنەکلاشکە لەلایەن شاگردەوە بەمووی رێسراوی بزن پەرگەمادەنرێت، پاش پەرگەمانان وەستای کلاشکەر دەست بەبڕینی دەکات، بەوەی لە هەرچوارلاوە زیادەکانی دەبڕێت و لەسەر شێوەی پێ رێکیدەخات، بە مشتە باش دەیکوتێتەوە و لووت و پاژنەکەی بزماررێژدەکات، دواجار کەتیرە دەسوێت بە قەراخەکانیدا و پاش وشکبوونەوەی کەتیرەکە ئیتر ئامادەدەبێت بۆ چنین.

وەستای کلاشکەر بۆ راپەڕاندنی کارەکەی بێجگە لە پێکەنە پێویستی بە چەند ئامێرێکی دەستی و کەرەسەیەکی سەرەتایی هەیە وەك: (کۆتە[لمجسملح]، مشتە[لجسملح]، گازن[لجسملح]،

---

[لمجسملح] کۆتە: لەدار و لەسەر جۆرە شێوەیەکی هەرمێیی دروستدەکرێت، دووجۆری هەیە پێیاندەوترێت:

(کۆتەی کلاشکەر، کۆتەی پێکەنەگیر)، کۆتەی کلاشکەر لە کۆتەی پێکەنەگیر کەمێك ئەستوورتر و گەورەترە، درێژییەکەی لە نێوان (45-50سم) دایە و نزیکەی (15-20سم) لەخوارەوە دەتاشرێت هەتاکو بچەقێنرێتە ناو زەوی، رووی سەرەوەی شێوەیەکی بازنەیی هەیە و بەردەوام سافدەکرێت تیرەکەی لەنێوان (12-15سم)دایە، ئەو دارەی کۆتەی لێدروستدەکرێت پێویستە زۆر ساغ و مەحکەم بێت و باشترین دار بۆ ئەم مەبەستە (کێکف، بەڕوو، گوێز)ن.






**درەوش[لخسملح]، کوڵــەدرەوش[برسملح]، دەقــاق[ترسملح]، قــەدگیر[برسملح]، دوالگــیر[سمسملح]، چــل مێــردە[شمسملح]، دەرزی[لحشملح]، چەقۆ، کەتیرە= جەوی، بزمار، بەزوبەزدان[لحشملح]مەبرەد...هتد).**

---

[لحسملح] مشتە: لە پۆلا دروستدەکرێت و لەسەر شێوەی دەسکە هاوانە بەلام ئەستوورترە و دووجۆری هەیە بەم ناوانە:

مشتەی کلاشکردن: تیرەکەی لەبنەوە (4-3سم) و درێژییەکەشی (15سم)، وەستای کلاشکەر بۆکوتانەوەی بنە کلاشەکە بەکاریدەهێنێت.

مشتەی پێکەنەگرتن کەمێك بچووکترە لە مشتەی کلاشکردن و وەستای پێکەنەگیر بۆ کوتانی فتیلە پەڕۆکان بەکاردیدەهێنێت.

[لحسملح] گازن، دەمەکەی لە (مەبرەد، پۆلا) و دەسکەکەشی لە(دار) دروستدەکرێت، دەمەکەی نزیکەی (15سم) درێژ (3سم) پانە، زۆر تیژە و بەردەوام دەمەزەرددەکرێتەوە، کلاشکەرەکان بۆ (هەڵهێنانی چەرم، پاچینەوە و بڕینی بنەکلاش) بەکاریدەهێنن.

[لخسملح] درەوش: لەسەر شێوەی دەرنەفیزە و دەمەکەی لە (پۆلا) و دەسکەکەشی لە(دار) دروستدەکرێت، چەند جۆرێکی هەیە لەوانە:

(درەوشی درەوشدان، قۆدەپاچ، درەوشی پاژنە و لووت سمی= چەك سم).

[برسملح] کوڵەدرەوش، وەك درەوش وایە بەلام دەمەکەی لەخوارەوە نووکێکی تاڕادەیەك کوڵی هەیە و چەند جۆرێکی هەیە لەوانە:

(کوڵەدرەوشی گەورە = کوڵە درەوشی پاش درەوشدان، کوڵەدرەوشی پەرگەما نان، کوڵە درەشی وجارەکردن) کە هەریەکە و لە کاری تایبەت بەخۆیان بەکاردەهێنرێن.

[ترسملح] دەقاق: لەپارچە تەختەیەکی مەحکەم دروستدەوکرێت لەسەر شێوەی چوارگۆشە وایە، درێژی هەر لایەکی (15سم) و ئەستووریشی نزیکەی (5سم)، بۆ تەختکردکردنی بنەکلاش بەکاردەهێنرێت.

[برسملح] قەدگیر: پارچە ئاسنێکە لەسەر شێوەیەکی نیوەهیلالی کراوە، درێژییەکەی نزیکەی (17سم) و پانییەکەی لەنێوان( 50٪ 1 –2سم)دایە، بۆ کوتانەوەی (لووت،سنگ، قۆدە)ی بنەکلاش بەکاردەهێنرێت.

[سمسملح] دوالگیر: وەك دەرزییەکی دلیوان وایە و دەسکی پێوەیە، دەمەکەی لە (ئاسن، پۆلا) و دەسکەکەشی لە (داری بەلالووك، پلاستیك) دروستدەکرێت، وەستای بنەکلاش لەکاتی کێشمانکردنی بنەکلاشەکەدا دەیدات لەسیرمەکە هەتاکو لەناو کونی درەوشدانەکەدا نەڕەوێتەوە.

[شمسملح] چلمێردە: پارچە دارێکی خڕە بەدرێژایی (10-12سم) و پانی (2-3سم)، وەستای درەووستکردنی بنەکلاش لەکاتی درەشداندا دەیاخەتە کۆتایی شوێنی درەوشدانەکەوە بۆ ئەوەی کاتێك کەدەمی درەوشەکەی لێوەدەردەچێت دەستی بریندار نەکات.

[لحشملح] دەرزی: لەقۆناغی دروستکردنی بنەکلاشدا سێ جۆر دەرزی بەکاردەهێنرێن بەم ناوانە:

دەرزی گەورە: درێژیەکەی نزیکەی (40سم) و ئەستووریشی لەئەستووری (سووژن) کەمترە، لەسەر شێوەی نیو هیلالێکی تەواو کراوەدایە، بۆ رایکردنی (سیرم) بەناو کونی درەوشداندا بەکاردەهێنرێت.

دەرزی پێنجتیر: لەسەر هەمان شێوەی دەرزی گەورە دروستدەکرێت بەلام کورتترە و تەنها (20سم) درێژە، بۆ رایکردنی سیرمی پێنجەم تیری بنەکلاشە.

### 3ـ قۆناخی کڵاشچنین

لەم قۆناغەدا ئەو بنە کڵاشەی لە لایەن وەستای کڵاشکەرەوە درووستکراوە دەچنرێت و ئەوانەش بەم کارە هەڵدەستن پێیاندەوترێت (کڵاشچن)، کڵاشچنین سەرەتا لەوەوە دەستپێدەکات (کڵاشچن) لە دەزووی لۆکە بە چەند تاڵێك بە پێی (جۆری دەزووەکە لە رووی باریکی و ئەستوورییەوە، جۆری کلاشەکە لە رووی ئەوە ئایا کڵاشی بازارییە، یاخود خسووسی، سەلیقەی وەستاکە لە رووی ئەوەوە ئایا کڵاشچنێکی باشە یاخود ئاساییە)، دەستدەکات بە درووستکردنی (پەرگ[لخشملح])، پەرگەکە بە (پەرگەماڵ[لخشملح]) لووسدەکات و دەیکات بە کوونی (تەبەنە[لخشملح])کەیدا و لە بنپەرگەکەوە دەست بە چنینی کڵاشەکە دەکات، ئینجا بەردەوامدەبێت ریز لەسەر ریز دەورەکەی دەچنێت و بەهە ریزێکیش دەوترێت (گەڕ)، پاشان بەدەوری پاژنەکەییدا چەند ریزێکی یەك لەسەر یەك کە لەخوارەوە بۆ سەورەوە کورتدەبنەوە و پێیاندەڵێن (وەچ) دەچنێت و بەم شێوەیە دەوری کڵاشەکە تەواودەکات، بۆ چنینی سەرەکەش سەرەتا (ساراچن)ەکە و دوای ئەویش (سادە)کان دەچنێت، دواجاریش لەسەر بنپەرگەکە وە شیرازەی کڵاشەکە لەهەرچوار لاوە دەچنێت.

لێرەدا پێویستە ئاماژەبدەین بەوەی کڵاشەکانی ئێستا هەم لە رووی بنەکڵاشەکان و هەم لە رووی چنینیانەوە لە کڵاشی زووتر جوانتر و ناسکترن، زووتر کڵاش دووجۆری هەبووە

---

دەرزی پەرگەما: ژمارەیان چوار دەرزییە و لەسەرهەمان شێوەی دەرزییەکانی پێشووتر درووستدەکرێن، بەڵام باریکتر و کورتترن، درێژی هەریەکەیان نزیکەی (8سم) دەبێت، ئەم دەرلازییانە لەکاتی پەرگەمانانی بنەکڵاشدا بەکاردەهێنرێن.

[لمجشملح] بەزدان: پارچە پێستەیەکی خۆشەکراوی بچووکە بە قەبارەی لەپی دەستێك، بەز دەکرێتەو ناوییەوە بۆ چەورکردن و لووسکردنی (سیرم) لەکاتی درووستکردنی (بنەکڵاش)دا.

[لخشملح]پەرگ: وەستای کڵاشچن لە دەزوو درووستیدەکات پاش ئەوەی دەزووەکە بەچەند تاڵێك بەپێی پێویست پێکەوە بادەدات و گرژیاندەکاتەوە و ئیتر وەك تاڵێکیان لێدێت، پەرگی چواردەوری کڵاش لە پەرگی سەرەکەی ئەستووورترن.

[لخشملح] پەرگەماڵ: لەپارچە قوماشێکی (مەرەز، خوری) درووستدەکرێت پاش ئەوەی چەند دەقدەکرێتەوە و پێکەوە دەدووررێت، بۆ لووسکردنی پەرگەکان بەکاردێت.

[لخشملح] تەبەنە: لەشێوەی سووژندایە بەڵام باریك تر و راست و سافە، زیاتر لە تەلەچەتر درووستدەکرێت وپاش ئەوەی تەواو لووسدەکرێت و دەورووبەری کونەکەی دەسوون هەتاکو بچووکدەبێتەوە، ژمارەیەکی زۆر لە کڵاشچنەکان (تەبەنە)ی چنینی (دەور، سەر)ی کڵاشیان جیاوازە.

که پێیانوتراوه (گیوەیی، لووت و قۆدەسوور)، کلاشی گیوەیی بە گشتی بنەکەیان لە خامی سپی دروستکراوه و چنینەکەیان ورد و سفتبووه، کلاشی لووت و قۆدەسووریش لە (لووت، پاژنە، قۆدە= ناوەڕاست)یانەوه چەند فتێلەیەکی سووریان تێدا بووه و لووت و پاژنەکەشیان لە پێست دروستکراوه و بەو پێستەشیان وتووه (چەك)، بەلام هەر لە ناوەڕاستی شەستەکانەوه (وەستا ئەبووبەکری تەوێڵەیی) بە دروستکردنی (بنەکلاشی پێنج تیر، کلاشی ژێرشین، بەکارهێنانی ئەندامی نێرینەی کەڵەگا بۆ دروستکردنی لووت و پاژنەی کلاش) چەند داهێنانێکی لە دروستکردنی کلاشدا کردووه، هەروەها هەمیشە کلاشچنەکانی هانداوه داهێنان لە چنینی کلاشەکاندا بکەن، ناوبانگی کلاشی وەستا ئەبوبەکر بەهەموو ناوچەکانی کوردەواریدا بلاوبۆتەوه و خەڵکانی دەرەوەی هەورامان تا ئێستاش بە کلاشی باش دەڵێن (کلاشی ئەبوبەکری)، بە واتای کلاشی ئەبووبەکری بووه بە ناسنامەی باشترین کلاشی هەورامی.

ئەوەی شایەنی باسکردنە لە کۆتایی ئەم باسەدا دەڵێن (کلاشی هەورامی) هۆکارێکی زۆر کاریگەرە بۆ ئەوەی گەنجە هەورامییەکان بێکارنەبن، لەم ساڵانەی دواییشدا لە کاتێکدا بێکارییەکی کوشندە لە ئەنجامی سیاسەتی شۆڤێنیستانەی داگیرکارانی کوردستان و ڕاگواستنی زۆرە ملێی گوندنشینەکان ڕوویکردبووه خەڵکی کوردستان، خەڵکی هەورامان لە شار و شارۆچکەکاندا بەبەراورد بە خەڵکی زۆر لەناوچەکانی تر باری گوزەرانیان باشتربوو، هۆی سەرەکی ئەوەش سەرقاڵبوونیان بوو بەبەرهەمهێنانی کلاشەوه.

### 3/ مەوج و جاجم و بەرماڵی هەورامان

مەوج و جاجم و بەرماڵ و بۆپەشمینی هەورامان لەو کالا دەستییانەن کە لە کاتی خۆیدا ڕەواجێکی باشیان هەبووه و سەرچاوەیەکی باشبوون بۆ داهاتی ئەو خێزانانەی بەبەرهەمهێنانیانەوه سەرقاڵبوون، بەلام لەم ڕۆژانەدا بەردەوام دروستکردنیان لە پاشەکشێدایە بەتایبەتی (مەوج، جاجم)، وەستاکانی هەورامان زۆر کارامە و لێزانن لە بەرهەمهێنانی ئەم کالایانەدا و بەسەلیقەیەکی وردەوه دروستیاندەکەن، مەوج و بەرماڵ پاش ڕستن و نانەوەیان لەلایەن ژنانەوه دەبرێن بۆ لای جۆلاکان بۆ چنینیان، زۆرجار بێجگە لە خورییە ڕێسراو و ڕەنگاوڕەنگەکە جۆرێك لە سیمی (سپی، زەرد) کە پێیدەوترێت (کلافەسیم) لەچنینیاندا بەکاردەهێنرێت، بەلام (جاجم) زیاتر بەشێوەی تەونگەری لەلایەن ژنانەوه دەتەنرێت، پێشتر مەوجی هەورامان زیاتر بۆ داپۆشینی پێخەف بەکاردەهێنرا، هەورامییەکان

تائێستاش لە کاتی بەرێکردنی تەرمی مردووەکانیاندا بۆ گۆڕستان مەوج دەدەن بەسەر جەنازەکەیاندا، (جاجم)یش بۆ درووستکردنی جۆرێك لە لێفەی گەرموگوڕ بە ناوی (لێفەی جاجم) بەکاردەهێنرێت.

بێجگە لە (مەوج، جاجم، بەرماڵ) لە هەوراماندا چەند کاڵایەکی تر لە (خوری و موو) بەرهەمدەهێنرێن لەوانە: (قاڵیە= فەرش، لەی= بەڕە، نمەد= لەباد، فەرەجی= کوڵەباڵ، گڵێم، پوزەوانە، دەسکێش، وەرێسە= گوریس، خەرار= خەروار....هتد).

### 4/ چەقۆی هەورامان

چەقۆ و قەڵەمبڕی هەورامان لەو کاڵا دەستییانەن تا ئێستاش بایەخی خۆیان هەیە و وەك دیاری بۆ دۆست ناسراوان بەملا و ئەولادا دەنێررێن، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا ڕەواجی باشیان هەیە و خەڵکی ئەو ناوچانە دەڵێن (چەقۆی هەوامان) مووەکات بە واتای زۆر تیژە، ئەو وەستایانە چەقۆ و قەڵەمبڕ درووستدەکەن، لە هەوراماندا پێیاندەڵێن (کاردکەر= چەقۆساز)، لە درووستکردنیشیاندا (شاخی ئاژەڵ، مەبرەد، پۆڵا، قەپاغە فیشەك) بەکاردەهێنن، دەمەکەیان لە (مەبرەد، پۆڵا)و دەسکەکەشیان لە (شاخی ئاژەڵ) درووستدەکەن، بەلام لەم ڕۆژانەدا بۆ درووستکردنی دەسکەکانیان زیاتر جۆرێك لە بۆری پلاستیك بەکاردەهێنن، بێجگە لە (کاردکەر= چەقۆساز)ەکان هەندێك لە ئاسنگەرەکانی هەورامان توانای درووستکردنی چەقۆیان هەیە.

لە هەوراماندا چەندین کاڵای دەستی و پێداویستی تر لە لایەن (ئاسنگە، دارتاش)ەکانەوە درووستدەکرێن، بۆنموونە ئاسنگەرەکان (تەور، تەورزێن، تەورداس، داس، پاچ، خاکەناز، بێڵ، قفڵ و کلیل، ساجی نانکردن، مەقاش، سۆپا، سێپا...هتد) درووستدەکەن، دارتاشەکانیش (دەرگا، پەنجەرە، بێشکە و لانکی مندال، لوولە= بلوێری ناو بێشکە، پنە، تیرۆك، تەشی، دیمەك...هتد) درووستدەکەن، شتێکی ئاشکراشە خەڵکی گوندی (هەجیج)یش کە گوندێکە لە هەورامانی ئەودیو لە درووستکردنی (کەوچك و دەفری دارین، شانە، تەشی)دا بەناوبانگبوون.

هەروەها هەوراميیەكان لە لاسك و چڵی ناسكی چەند دارێكی وەك (ئەرخەوان و بی) زۆر شارەزایانە (سەوە= سەبەتە، تەڕیانە= قووڵێنە، نانەشان، تەكەللە=تەیكە، قەفەز) درووستدەكەن و قامیشی ناسكیش بۆ درووستكردنی (چنگڵە= بەرچینە) بەكاردەهێنن.

ئەگەر بە وردی بڕوانینە بەرهەمی پیشەسازییە دەستیبیەكانی هەورامان، بۆمان ئاشكرادەبێت هەوراميیەكان تاچ رادەیەك لە بواری بەرهەمهێنانی ئەم كاڵایانەدا ژیر و بەسەلیقەن، چونكە كاڵاكانیان لە زۆربەی كاڵا دەستییە هاوشێوەكانیان لە ناوچەكانی تردا هەم لە رووی شێوەی درووستكردنیان و هەم لە رووی رەختەیی و مەحكەمییانەوە باشترن، هاوكات ئەوەمان بۆ ئاشكرادەبێت كە كاڵاكان پڕ بەپێستی خەڵكی ناوچەكە درووستكراون و وەڵامدانەوەیەكی جیددین بۆ پێویستی رۆژانەیان، هەر بۆ نموونە (كڵاشی هەورامی) باشترین پاپۆشی هاوینەیە لە سرووشێكی وەك سرووشتی هەورامانـدا بەكاربهێنرێت، چونكە خەڵكی ناوچەكە لەم وەرزەدا بەردەوام هاتووچۆی (شاخ، باخ، رەزەدێم، قۆرخ)ەكانیان دەكەن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی زووتر ژمارەیەكی زۆریان بە تایبەت وەڵاخدارەكان هاتووچۆی شوێنە دوورەدەستەكانی هەورامانیان كردووە، هەم بۆ كاروانكردن و فرۆشتنی بەرهەمەكانی ناوچەكەیان، یاخود گۆڕینەوەیان بەو كەرەسە و ویستەمەنیانەی لەهەورامانـدا نەبوون، هاتووچۆی لەم شێوانەش پێویستی بە پاپۆشێكی (سووك،فێنك، مەحكەم) كردووە، دەبینین كڵاشی هەورامی سەرەڕای ئەوەی ئەم خەصڵەتانەی هەیە، لەبەر ئەوەی پاپۆشێكی تەختە بەهیچ شێوەیەك ئازاری پێی مرۆڤ نادات وەك زۆربەی پاپۆشەكانی تر كەپاژنەكانیان بەرزن، هەروەها وەك ئەو پاپۆشانە كێشەی تەندرووستی بۆ پشت و جومگەكان درووستناكات، بێجگە لەوەی دەكرێت رۆژانە ئەم پێ وئەو پێ بكرێن، چونكە هەردوو تاكەكانیان وەك یەكە و بۆ پێی مرۆڤ جیاوازییان نییە.

لە بەرر ئەوەی كاڵا دەستییەكانی هەورامان زۆرن، ناكرێت نموونە لە سەر خەصڵەتەكانی هەموویان بهێنینەوە، بەڵام بۆ زیاتر نزیكبوونەوە لەوەی ئێمە مەبەستمانە كە دەرخستنی ژیری و سەلیقەی هەوراميیەكانە لە بەرهەمهێنانی كاڵا دەستییەكانیاندا، نموونەیەكی تر لە سەر (قەڵەم= بلوێر، گۆزەی منداڵی ساوا) دەهێنینەوە كەدەخرێنە ناو بێشكەكانیانەوە، ئەوەی پێیانوتووە (قەڵەم= بلوێر) بە پێی پێویستی ئەندامی نێرینە و مێیینەی منداڵ لە دار دەتاشرێت و لە كاتی پێچانەوەی منداڵەكەدا ئەو ئەندامەی دەخرێتە ناویەوە، ئیتر هەرچەندە میزبكات لە قەڵەمەكەوە دەچێتە ناو گۆزەكەوە، سەبارەت بە

گۆزەکەش لە خۆڵی سووری سوورەوکراوە دروستدەکرێت و قەراخی بۆ دەکرێت بۆ ئـەوەی لـەو کوونەی کە لە بنی بێشکەکەدا درووسـتکراوە قایمبکرێـت و پاشـەڕۆی مندالّەکـە راسـتە و راست بچێتە ناویەوە، بەم شێوەیە ئیتر بە درێژایی پێچانەوەی لە نـاو بێـشکەکەیدا پێخـەفی ناوەکـەی هەمیشە وشکە، ئەمەش لەلایەکەوە مندالّەکە لە هەندێك کێـشەی تەنـدرووسـتی دەپارێزێـت، لـە لایـەکی تـرەوە بـۆن و بەرامـەی بێـشکەکە خۆشـە، هەربۆیـە (قەڵـەم و گـۆزەی منـدالّی سـاوا) سەرەڕای سادەییان زووتر هەمیشە داواکاریان زۆر بووە و رەواجی باشیان هەبووە.

# هەورامان ناوچەیەکی خودکەفایە

ئەگەر بـەوردی لـە هـەموو لایەنـەکانی ژیـان و گـوزەرانی خـەڵکی هـەورامان بکۆڵینـەوە، دەبیـنین هـەر لەدێرزەمانـەوە هەوڵیانـداوە بەشـی خۆیـان کـالاّ و پێداویـستی ژیـانی رۆژانـەیان بەرهەمبهێنن، لێرەدا مەبەستمان گەورەکردنی ئـەم بابەتـە و پیاهەڵدانی هەورامییـەکان نییـە، بـەڵکو مەبەسـتمان ئـیرادەی گەورەیانـە لەهـەموو بوارەکـانی ژیانـدا کـە بـواری بەرهـەمهێنان و دابینکردنـی پێداویـستی ژیـانی رۆژانـە یەکێکـە لەهـەرە بـوارە گـەورە و بایەخـدارەکانی، بۆدەرخـستنی ئـەو ئـیرادە گەورەیـەش لـەوەوە دەسـتپێدەکەین هـەتاکو بیـستەکانی سـەدەی رابوردوو ئەو پۆشاك و پاپۆشەی خەڵکی هـەورامان بـەکاریانهێناون وەك: (جلی ژێـرەوە، رانکـو چـۆخە، فەقیانـە، مێـزەر، پـشتوێن، کوڵـەباڵ، پەسـەك، گـۆرەوی، پووزەوانـە، کـلاّش، پـێلاّو) هەموویان خۆیان درووسیانکردوون، جلوبەرگی ژێرەوەیان و فەقیانەکانیان لـە جۆرێـك قومـاش درووستیانکردوون و (هەلاّوە)یان پێیانوتووە، ئـەو قوماشـەش خۆیـان رسـتن و چـنینیانکردووە، سەبارەت بە پۆشاکەکانی تر و پاپۆشەکانیشەوە لە بابـەتی پیـشەسازییە دەسـتییەکاندا قسەمان لەسەرکردوون و پێویست بەدووبارەکردنەوە ناکات، لێرەوە دەتوانین بڵێین هەموو هەورامییـەك توانیویەتی هەر لە مێزەرەکەی سەریەوە هەتاکو پێلاّوەکـانی پێـی، بەرهـەمی ناوچـەکەی خـۆی بەکاربهێنێت و لەم بوارەداپێویستی بەکالاّی هیچ شوێنێکی تر نەبێت.

سەبارەت بە زۆربەی پێداویستییەکانی (ناو ماڵ و کارکردن)یشەوە لە بوارە جیاجیاکانی ژیانی ئەو رۆژانەدا کە بریتیبوون: لە (لەباد، مەوج، جاجم، پۆپـەشمین، بـەرماڵ، گڵێم، کـەنوو، جەرە، گۆزە، دەفری گڵێنە، کەوچکی چێشت و کەوچـکی چـا، دۆلکـە، کـەوگیر، کـەوجێز، چـەقۆ،

قەڵـەمبڕ، بـادی، مـەن، دنـگ، کەشکەسـاو، تەیکـە، قووڵینـە، نانەشـان، سـەبەتە، بەرچـینە، هەزارپێشە، یەخدان، بێشکە، لانك، سێپا، ساج، پنە، سۆپا، گۆزە و بلـوێری منـداڵ، تەشـی، شـانە، گوریس، هۆڕ، شەل، خورج، کورتان، تەور، تـەوەرزێن، تـەوەرداس، تەشـۆ، مـشار، چـەکوش، داس، بێـل، خاکـەناز، پیـك، نوێـڵ) و هـەموو پێداویـستییەکانی (هـەلاجی، جـۆلآیی، کلاشـکردن، ئاسنگەری، دارتاشی) و دەیان پێداویستی تریش خۆیان درووستیانکردوون.

ئـەم بەرهەمانـەی ناومانهێنـان ، هەنـدێکیان تـەنها پڕبەپێـستی پێداویـستی خـەڵکی ناوچەکە بوون و لەدەرەوەی هەوراماندا بازرگانییان پێوەنەکراوە، بەڵام ژمارەیەکیان بە تایبەت ئەمانەیان ناویاندەهێنین وەك: ( کلاش، رانکوچۆخە، چەقۆ، مەوج، جـاجم، بـەرماڵ، گڵێم) بـە رێژەیـەکی زۆر زیـاتر بەرهـەمهێنراون، لەگـەڵ بەرهـەمی باخـەکان وەك: (میـوە چ بـە تـەری، یـاخود وشـکەوکراوەیی) و هەنـدێك بەرهـەمی دارە خۆڕسـکەکان وەك (بنێـشت)، لـە لایـەن وەڵاخدارەکانەوە بە شێوەی کاروانکردن براون بـۆ ناوچـەکانی دەرەوەی هـەورامان و فرۆشـراون، یـاخود کـالآ بـەکالآیان پێکـراوە و گۆڕدراونەتـەوە بـەو کـالآ و پێداویـستییانەی لـە هەورامانـدا نەبوون ،یاخود کەمبوون وەك: (گەنم، جۆ، نۆك، نیسك، ماش، چـەڵتووك، رۆن، کەشـك، مـەرەز، خوری، موو، پێستە...هتد).

ئەمەش خۆی لەخۆیدا جۆرە تەواوکەرییەك بووە لە نێوان کەرتەکانی بەرهـەمهێنان لـە ناوچەکەدا، بۆیە لە راستیدا هەورامان لـەرووی (خودکەفاییـەوە) ناوچـەیەکی نموونەییـە، نـەك هەر لەکوردستاندا، بەڵکو لە دەوڵەتـە دراوسێکانیـشدا، هەقـە لـەم بـوارەدا چـەندین لێکۆڵینـەوە بکرێت و پەنجەی رێز بۆ ئیرادەی هەورامییەکان درێژبکرێت.

# پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە هەوراماندا

بۆچوونە ناو ئـەم بابەتـەوە لـەوەوە دەسـتپێدەکەین کـە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکانی هـەر کۆمـەڵێك، رەنگدانـەوەی ئاسـتی رۆشـنبیری ئـەو کۆمەڵـەن و گەشـەکردنیان بـۆ پەیوەنـدی بـالآتر بەشـێوەیەکی سـەرەکی بەگەشـەکردنی ئاسـتی فیکـری و رۆشـنبیریی تاکەکانییـەوە پەیوەسـتە، هەرچـەندە پێـشکەوتنی زانـستی و تـەکنۆلۆژی کاریگـەری گـەورەیان لەسـەر پێشکەوتنی ژیار و خۆشگوزەرانکردنی مرۆڤەکان هەیـە، بـەڵام ئـەم جـۆرە پێـشکەوتنە هـەرگیز ناتوانێـت گرنتـی پێـشکەوتنی فیکـری و رۆشـنبیری کۆمـەڵ بـدات و گۆرانکـاری لـە (چـەمکە

کۆمەڵایەتییەکان)دا بکات، هەر بۆنموونە کۆمەڵگەی یابانی لە رووی پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژییەوە لە ترۆپکدان و هەموومان دەزانین کاڵاً یابانییە جۆراوجۆرەکان چ رەواجێکیان هەیە و چۆن زۆربەی بازاڕەکانی جیهانیان داگیرکردووە، کەچی خەڵکی ئەو وڵاتە لە رووی رۆشنبیرییەوە بەو شێوەیە نین و تا ئێستاش چەندین قەناعەتی رۆحی و کۆمەڵایەتی دواکەوتوویان هەیە، وەك ئەوەی (ئیمپراتۆڕ) بەنەوەی خوادەزانن و جیاوازی بەرچاو لەنێوان (نێر و مێ)دادەکەن، ژن بەئامرازێکی خزمەتکردنی پیاو دەزانن و لە زۆربواری ژیاندا رێگەی کارکردنی لێدەگرن.

کۆمەڵی کوردەواری یەکێکە لەو کۆمەڵانەی تا ئەم رۆژانەش پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە دواکەوتووەکان کاریگەری خراپیان لەسەری هەیە، خەڵکی زۆربەی ناوچەکانی کوردەواری وابەستەبوونێکی پتەویان بە ئەقڵیەتی خێڵەوە هەیە، بڕیارە کۆمەڵایەتییەکانیش کە دەرهاوێشتەی ئەو ئەقڵەن لە ناویاندا هێزی یاسایان هەیە و زۆرجاریش هێزی یاسا دەبەزێنن.

بەلاَم ئەگەر بمانەوێ لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکی هەورامان وردببینەوە، دەبینین بەو شێوەیە نین و جیاوازیەکی تەواو گەورەیان هەیە، تائاستێکی باش ئەقڵییەتی خێڵیان تێپەڕاندووە و لە سروشت و سونەت دەرچوون، بە رای ئێمە ئەم جیاوازییە بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە و گرنگەکانیان ئەمانەن:

1 هۆکاری دینی: خەڵکی هەورامان ماوەیەکی دوور و درێژ لەسەردینی میترائی و پاشان لەسەردینی زەردەشتی بوون، شتێکی ئاشکراشە تێڕوانینی دینی زەردەشتی بۆ مرۆڤ، تێڕوانینێکی ئەقلانییە و درووشمە سەرەکییەکانیشی بریتین لەپابەندبوونی مرۆڤ بە: (نییەتی چاك، کرداری چاك، گوفتاری چاك)ەوە، هەموو زەردەشتییەك بۆ ئەوەی لە گشت چرکەیەکی ژیانیدا ئەم سێ دروشمە لەیادیدابن، پێویستبووە لەسەری هەر لەتەمەنی پانزە ساڵییەوە پشتوێنێك ببەستێت کە بریتییبووە لە (72) تەڵ بەنی لە خوری رێسراو، هەروەها (3) گرێ بدات لەپشتوێنەکەی و رۆژانە چەند جارێك لەو گرێیانە رامێنێت[*]، ئەو

[*] هادی بەهمەنی لە کتێبی (پەیامی هەورامان)دا نووسیویەتی: هەموو زەردەشتییەك رۆژانە چەندجارێك پشتوێنەکەی کردووەتەوە و بەستوویەتەوە و هەموو جاریکیش (نوێژی کوشتی) لەگەڵدا خوێندووە.
بڕوانە (هادی بەهمەنی) پەیامی هەورامان بەرگی یەکەم لاپەڕە (388).





تێڕامانەش بۆ ئەوەبووە هەتاکو هەموو هەڵسوکەوتەکانی لەچوارچێوەی دروشمە پیرۆزەکانی دیینەکەیدا ڕێکبخات، ئیتر بەوە هیچ پانتاییەکی بۆ (منگەرایی و خودپەسەندی) نەهێشتووەتەوە کە بەردەوام کەللەڕەقی و شەڕەنگێزی بەرهەمدەهێنن، هەر بۆیە مرۆڤگەلێکی کراوە بوون، هەم بەرووی یەکتریدا و هەم بەرووی بەها پیرۆزەکانی مرۆڤایەتیدا.

2. هۆکاری نیشتەجێبوون: خەڵکی هەورامان هەر لەدێر زەمانەوە بەشێوەیەکی گشتگیر لە ناوچەکەی خۆیاندا نیشتەجێبوون و چەندین بەڵگەی مێژوویی هەن ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن[ترشملح]، شتێکی شاردراوە نییە کەنیشەجێبوون هاندەری مرۆڤە بۆ ئەوەی گەشبینبێت و بەبڕواوە لە ئایندەی خۆی بڕوانێت، ئەمەش هاندەرێکی گەورەیە بۆ ئەوەی هەمیشە هەوڵبدات بۆ ئەوەی نەك هەر کاربکات بۆ خۆشگوزەرانبوونی خۆی و هاو سەردەمەکانی، بەڵکو هەوڵیشبدات لەکارەکانیدا داهێنەربێت، لەم بوارەدا پێویستە ئاماژەبدەین بەوەی یەکێك لە بنەمابنەڕەتییەکانی کۆمەڵ مەدەنی نیشتەجێبوونە، بۆیە هەورامییەکان لەم بنەمایەوە ئەگەر بە شێوازێکی سەرەتایش بێت، هەنگاویان بەرەو ئەو کۆمەڵە ناوە، لە لایەکەوە قەواڵەکانی هەورامان[يرشملح] و لەلایەکی تریشەوە بوونی ئەنجوومەنی پیران لە ناوچەکەدا بەدەسەڵاتێکی فراوانەوە کە تەنانەت هەڵبژاردنی حوکمڕانەکانیشی گرتۆتەوە، دوو بەڵگەی حاشاهەڵنەگرن لەم بوارەدا.

3. هۆکاری ئابووری: بنەمای ئابووری خەڵکی هەورامان هەر لەکۆنەوە و ئێستاشی لەگەڵدابێت بەشێوەیەکی سەرەکی بریتییە لە: (باخداری، پیشەسازییە دەستییەکان، وەڵاخداری، ئاژەڵداری، ئاڵوویێردی سەر سنوور)، سەبارەت بە باخداری هەورامییەکان خاوەنی زەوی و باخی خۆیانن و هیچ دەسەڵاتدارێك نەیتوانیوە ئەم مافەیان لێزەوتبکات، سەبارەت بە کارەکانی تریشەوە هەر خۆیان خاوەنکار و بڕیاربەدەستبوون، لێرەوە دەتوانین بڵێین لە پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتیدا ژیاون کە بنەمای ئابووریەکەی موڵکی خۆیان بووە و لەم بوارەدا لە چەوساندنەوەی دەسەڵاتداران دووربوون، ئەوەش کاریگەرییەکی زۆری درووستکردووە بۆ ئەوەی لەرووی فکرییەوە لە پێکهاتە کۆمەڵایەتییە هاوشێوەکانیان پێشکەوتووتربن.

---

[ترشملح] (د. محممەدعەلی سوڵتانی) ایلات وطوایف کرمانشاهان بەرگی یەکەم لاپەڕە (23، 24).

[يرشملح] لەبابەتی (هەورامان وەك ناو، ناوچە و هەورامی وەك دیالێکت) دەربارەی ئەم قەواڵانە قسەکراوە.

4ـ هۆکـاری پـەروەردەیی: هـەورامان مەڵبەنـدێکی گـەورەی زانـست و ئـەدەب بـووە، مزگەوتـەکانی (تەوێڵـە، بیـارە، پـاوە، نۆدشـە...هتـد) و خانـەقاکانی نەقـشبەندی شـوێنی خوێندنی زانستەکانی ئەو سەردەمانە بوون و رۆڵی زانکۆی ئێستایان گێڕاوە، سەدان مـەلای گەورە لەو شوێنانەدا پەروەردە بوون و دەیان کەڵە ئـەدیب و شاعیریش تیایانـدا کۆبوونەتـەوە، تێکەڵاویکردنی خەڵکی هەوارمان لەگەڵ ئەزاتانـە کاریگەرییـەکی باشـی درووستکردووە لەسـەر ئاستی بیرکردنەوە و تێفکرینی خەڵکی هەورامان و بەرەو پێشانبردووە.

ئـەو هۆکارانـەی باسمـانکردن رۆڵێکـی گاریگـەریان گێـڕاوە لـە بـواری گەشـەکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکی هەورامان و تایبەتمەندییان داونەتێ، هەر لەبواری ئەو تایبەتمەندییانانەدا دەڵێین:

1ـ (ژن بـەژن، گـەورە بەبـچووك، مـارەبڕینی سـەر بێـشکە و لانـك) کـە لـە نەریتـە دواکەوتووەکانی ژیانی کۆمەڵایـەتی کۆمـەڵی کوردەواری بـوون و هەشـیانە بـۆ نموونـە ژن بـەژن تائێستاش لە هەندێك ناوچەدا بە خەستی پەیڕەودەکرێت، کەچی لە هەورامانـدا زۆر دەگمـەن بوون و لەهەندێك شوێنیی وەك (شارەدێی تەوێڵە) هەر نەکراون.

2ـ کێـشەی خـوێن و یـەکتری کوشـتن و تۆڵەسـەندنەوە لـە هەورامانـدا زۆر کـەمبوون، هەرچەند ماوەیەك بە فیتی داگیرکـاران هەنـدێك رووداو لـە نێـوان ژمارەیـەك (سـان، بـەگ) لـە بنەماڵـەی حوکمڕانـەکانی هەورامانـدا روویـداوە، بـەڵام لـە ناوچـەکەدا هـەرگیز نـەبووە بـە خوویـەکی کۆمەڵایـەتی، ئەگـەر بـە رێکـەوت رووداوێکـی لـەم چەشـنەش رووبـدات هـەرزوو بـە گیانێکی لەخۆبوردوانەوە چارەسەر دەکرێت.

3ـ فرەژنـی و رووداوی تەڵاقـدان لـە هەورامانـدا لـە هـەموو ناوچـەکانی تـری کوردسـتان کەمتەن و ژیانی خێزانی لە ناو هەوراميیەکاندا زۆر جێگیرە.

4ـ خۆشەویـستی و هاوکـاریکردنی یـەکتری زۆر لەناویانـدا بـاوە، هـەر لـەمبوارەدا بـاس لەوەدەکـەین زۆربـەی دێکـان سـندوقی تایبـەتیان بـۆ کۆمـەککردن بـە خـەڵکانی (خـاوەن پرسـە، نەخۆش) تا رادەیەکیش نەدار و بێدەرەتان هەیە.

# گەلکارییەکانی هەورامان

گەلکارییـەکانی هـەورامان زۆر و جۆراوجـۆرن و بـۆ ئەنجامـدانی ئـەو کارانـەن ئەگـەر بەشێوەیەکی گەلکاری نـەبێت گرانـە لـەکاتی خۆیانـدا بـە ڕێکوپێکی ئەنجامبـدرێن وەك: (گـزی بارەکڵـە، گـەلو تفۆچـنییەی= گـەلی تووچـنینەوە، ڕەزکـێلاَن، ڕەزبـڕین، گزرەبـڕین، لـۆ و کەماکەنـدن)، ئـەم گەلکارییانـە زووتـر هـەموویان بـە (دەسـەوام= بێکـریێ) ئەنجامـدراون، لـەم ڕۆژانەشـدا کـەزۆرێك لـە چـەمکە کۆمەلاَیەتییـەکان گۆڕانییـان بەسـەردا هـاتووە، بـەلاَم هێـشتا هەندێك لە گەلکارییـەکانی هـەورامان وەك خۆیـان ماونەتـەوە و بـە بێکـریێ ئەنجامـدەدرێن، بـۆ ئەنجامـدانی هەریـەك لـەم گەلکارییانـەش توانایـەکی بـاش و ڕۆحییـەتێکی پـاك نمایـشدەکرێن، بەرنامەیـەکی تایبـەتیش هەیـە بـۆ ئـەوەی بەباشـترین شـێوە جێبـەجێبکرێن و کاتیـان بەسەرنەچێت، لەسەر ڕۆشنایی ئەو بەرنامە تایبەتە کاتەکانی: (کارکردن، دانیـشتن و پـشوودان، نانخواردن، نوێژکردن، گۆڕانیچڕین و هەلپەڕکێ) دیاریکراون، هەرچەندە زۆربـەی ئـەو کارانـەی بە گەلکاری ئەنجامدەدرێن گرانن و بەشدارەکانیان زۆر ماندوودەبن، بەلاَم خەلکی ناوچەکە زۆر بەگەرمییەوە بە پیریانەوە دەچن و بەشدارییان تێدادەکەن.

ئەگەر بەراوردی گەلکارییەکانی هەورامان بکـەین لەگـەلْ ئـەو کارانـەی لـە شـوێنانەکانی تردا بە جۆرێك لە بێگاری لە لایەن (ئاغا، بەگ، کوێخـا، سـەرکار)ەکانـەوە بەسـەرخەلکانی هـەژا رو گوندنشیندا سەپێنراون، تەواو لەیەکتری جیاوازن، لە کاتێکدا لەو شوێنانەدا ئـەو بێگارییانـە بـەزۆرەملێ ئەنجامـدراون و بوونەتـە مایـەی نـاڕەزایی بەشـدارەکانیان، ئەگـەر بەرێکـەوت کەسـێکیش لێیـان دواکـەوتبێت سـزادراوە و لەبەرچـاوی گوندنـشینانەوە خراوەتـە نـاو حـەوزی مزگەوتـەوە و دارکـاریکراوە، کەچـی تەنانـەت گەلکارییـە گـشتییەکانی هـەورامانیش کـە بـۆ بەرژەوەنـدی خێزانـە دەسـەلاَتدارەکانی وەك: (سـان، بـەگ)ەکـان ئەنجامـدراون، جیاوازییـەکی زۆریان لە گەلْ گەلکارییەکانی تردا نەبووە و بەهەمان ڕۆحییەتـەوە بەشـدارییانتێداکراوە، هـەر بـۆ نموونـە ئـەو گەلکارییـە گـشتییانەی بـۆ کەنـدنی (لاس)ی ئـەو دەسـەلاَتدارانە کـراون، ڕۆژی دەستپێکردنیان بەشدارەکانیان لەسەر (ئـاوازی سـەحەری) شمـشالْ لـە خـەو هەسـتاون و بـەرە و شـوێنی کارکردنیـان کەوتوونەتـەڕێ و هـەمان چـێژی گەلکارییـەکانی تریـان بـووە، چـونکە بـە شێوازێك ئەنجامدراون بەشدارەکانیان هەستیان بەوەنەکردووە ئەو گەلکارییانە شتێك لـە بـەها ئینسانییەکانیان کەمدەکەنەوە.

لەم بابەتەدا نموونەیەك لەسەر گەلکارییەکانی هەورامان دەهێنییەوە ئـەویش گـەلکاری (گزی بارەکلە)یە.

(گزی بارەکڵە) بۆ پاککردنەوەی ئەو تەلاَنانەیە کە تایبەتن بە بەرهەمهێنانی (توو)، بۆ ئەوەی توووەکان بە پاکی بچنرێنەوە و کاری تووچنینەوە ئاسانبێت، بەشدارەکانی ئەم گەلکارییە پێویستیان بەچەند کەرەسەیەك هەیە وەك: (گسکی تایبەت کە پێیدەوترێت تاڵەوامی[سمشملح]، باڕەکڵە[شمشملح]، خاکەناز، دەسەبەرە)، ئەوخاوەن باخەی گەلکارییەکەی بۆ ئەنجامدەدرێت ئەرکی دابینکردنی ئەم پێداوبیتییانەی دەکەوێتە ئەستۆ و هەندێکجار بەشدارانی گەلکارییەکەش لە دابینکردنی پێداویستییەکاندا هاوکاریدەکەن.

رۆژی گزی بارەکڵە بەشدارانی گەلکارییەکە لە هەردوو رەگەزی (نێر و مێ) سەرلەبەیانی زوو بەرەو ئەو باخە دەکەونەڕێ کە گەلکارییەکەی تێدا ئەنجامدەدرێت، هەر بەگەیشتنیان بە شوێنی مەبەست جلی کارکردن لەبەردەکەن و بەپێی گەورەیی و بچووکی باخەکە و ژمارەی بەشدارانی گەلکارییەکە دەبن بەچەند دەستەیەکەوە، هەر دەستەیەکیان ئەرکی پاککردنەوەی چەند تەلاَنێکیان لە باخەکە دەکەوێتە سەر و دەستدەکەن بەکارکردن، (ژنان و کچان) لە سەرەتای تەلاَنێکەوە بەگسکی تایبەت خۆڵ و شەخەڵی تەلاَنەکە گسکدەدەن و (پیاوان و کوڕان)یش بە باڕەکڵە رووبەروی ئەوان خۆڵ و شەخەڵەکە لەبەردەمیاندا دەکێشنەدواوە، کەسێکیش لە بەشداران بە خاکەناز دەیکاتە دەسەبەرەیەکەوە و دووکەسیش لەمسەر و ئەوسەریەوە دەسەبەرەکە هەڵدەگرن و دەیبەن لە شوێنێك لەناو باخەکەدا رۆیدەکەن کە پێیدەڵێن (خوڵوم[لحلحلخ])، هاوکات باخدارەکە خۆی، یان یەکێك لە بەشداران ئەو بەردە گەورانەی لە کەلەکەکان بەربوونەتەوە دەیانخاتەوە شوێنی خۆیان.

---

[سمشملح] تاڵەوامی: وشەی تاڵە وامی ئەگەر گەقا و دەق وەریگێڕرێنە سەر شێوەزاری کرمانجی خواروو (بادامی تاڵ) دەگەیێنێت، بەلاَم خۆی جۆرێکە لەدەوەنی کێوی و لاسکەکانی بۆ دروستکردنی گسکی تایبەت بە (گزی بارەکڵە) بەکاردەهێنرێن، خەڵکی ناوچەکە هەر لەناوی دەوەنەکەوە ناوی گسکەکەشیان ناوە.

[شمشملح] باڕەکڵە: لە شێوە گشتییەکەیدا وەکو (فاسی میسری ) وایە، دەمێکی پانی هەیە کەلەتەختەدار دروستدەکرێت و دەسکەکەشی هەرلەدار دروستدەکرێت ، دەمەکەی لەسەرشێوەی لاکێشەییە، درێژییەکەی لە نێوان (30-25سم)دایە و پانییەکەشی نزیکەی (15سم) دەبێت، دەسکەکەی بەقەد دەسکەخاکەناز ئەستوورە بەلاَم کورتترە.

[لمحلمحلخ] خوڵوم: شوێنێکە لەناو باخدا دوورە لە لق و پۆپ و سێبەری دارتووەکانەوە و توو ناوەرێتە سەری، بۆیە هەرچی خۆڵ و خاشاك و وردەبەردی ناو باخەکە هەیە رۆدەکرێنە ناوییەوە.





زۆرجـــار بەشـــداران لـــەکاتی پاککردنـــەوەی تەلانەکانـــدا لـــەنێوان خۆیانـــدا جـــۆرە پێشبڕكێیەك سازدەدەن و بەو پێشبڕكێیە دەڵێن (كێوڵكانی)، هـەر دەسـتەیەك زووتـر تەلانەكـە پاكبكەنـــەوە دادەنیـــشن گۆرانیدەچـــڕن و قـــاو و قیـــل دەكـــەن وەك شـــانازیكردنێك بـــە پێـشكەوتنیانەوە، ئـەوەش دەبێتـە هانـدەرێك بـۆ ئـەوانی تـر بـۆ ئـەوەی زووتـر كارەكـەیان تەواوبكەن، بەو شێوەیە كاركردن هەتاكو نزیكی نیوەڕۆ بەردەوامدەبێت، پـێش خـواردنی نـانی نیوەڕۆ بێجگە لەوانەیان كە بە چێشتلێنانەوە خەریكن، هەموویان لەدەوری یەكتری كۆدەبنـەوە، یـەكێك یـاخود زیـاتر لەدەنگخۆشـەكانیان دەسـت بەگۆرانیـچڕین دەكـەن، بـە تایبـەت (گـۆرانی دەرەیی، بەزمی خاو) و گۆرانییەكانیش تـا دانـانی خـواردنی نیـوەڕۆ كـە بەشـێوەیەكی سـەرەكی بریتییــە لــە (یــاپراخ، دۆ، ســەوزە بــە تایبــەت تــەرەپیاز) بەردەوامــدەبن، پــاش نــانخواردن چادەخورێتەوە و ئـیتر (كوڕ وكاڵ) بـۆ ماوەیـەك كـۆڕی هەڵپـەڕكێ گەرمدەكـەن و بـە گـۆرانی چـەپڵەڕێزان زەماوەنـدێك تەیاردەكـەن، پاشـان بەهـەمان شـێوازی پێـشنیوەڕۆ دەسـتبەكاركردن دەكەنەوە و هەموو باخەكە پاكدەكەنەوە، زۆرجار نزیكی عەسر، یـان كـەمێك دوای ئـەو ماوەیـە و پـاش خواردنـەوەی عەسرەچـایی كـەزیاتر پیـاو و ژنـە بەتەمەنـەكان حـەزی لێدەكـەن، بـۆ ماوەیەكی كەم پشوودەدەن، پاشان لەچاكترین جۆری تووی ناو باخەكـە دارتوویـەك دەتـەكێنن و تاتێردەبن (تەڕەتوو) دەخۆن، دواجار كۆڕی گۆرانیچڕین و ڕەشـبەڵەك هـەتاكو سـەر لـەئێوارە و كاتی گەڕانەوەیان بۆ ناوماڵ گەرمدەكەنەوە.

ڕۆژی (گـــزی بارەكڵـــە) بـــۆ بەشـــدارەكانی ســـەرەڕای مانـــدووبوونیان، ڕۆژی خۆشـــی و ســـەیرانە، هەریەكـە و لەشـوێنی خۆیـەوە بـە (قـسەی خـۆش، گۆرانیـچڕین، هەڵپـەڕكی، قـاو وقیل...هتد) بەشداری لـەو خۆشـییەدادەكات، بـەوەش لـەو مەیدانـەدا هـەموو بـەها جوانـەكان خۆیان نمایشدەكەن و بەشدارانیش ئاسوودە و دڵخۆشدەبن.

ئەمە نموونەیـەك بـوو لـە ڕۆژێكـی گـزی باڕەكڵـەی هـەورامان و تـەنها ڕۆژیـش نییـە بـۆ بەشدارانی، چونكە وەرزی گزی بارەكڵە بەجیاوازی پلەی گەرمای گونـدەكان و شـوێنی باخـەكان، نزیكـەی مانگێـك دەخایـەنێت، لـەم بـوارەدا بـاس لـەوە دەكـەین لـە شـوێنێكی وەك (شـارەدێی تەوێڵـە) گـەلكاری گـزی بارەكڵـە لـە باخـەكانی چـەمی خـوارەوە دەسـپێدەكات و بـە باخـەكانی سـەرووی هـەردوو چـەمی (ئاوێـسەر و دزاوەر) كۆتاییـدێت، ئـەو ماوەیـەش نزیكـەی (15) ڕۆژ دەخایـەنێت كـە بەبـەردەوامی لـە هـەر ڕۆژێكـدا چـەندین پارچـە بـاخ پاكدەكرێنـەوە، لـەو ماوەیەشدا بەشداران بەهەمان خۆشی و جۆش و خرۆشەوە سەرقاڵی كارەكەیان دەبن.

هەندێك شێوازی گەلكارییەكانی هەورامان سەرنجی خانمێكی بیانی وەك (هانی هارۆڵد هانسن)ی ڕاكێشاوە و نووسیویەتی: لە بەڵخە ژن بانیان بە گلگەچ سواقدەدا، ئەمەش زۆرماڵ پێكەوە و بەدەستەوام دەیانكرد و سواقدانی بان هەر بە هەرەوەزبوو[1].

# ژیانی هاوینە هەوارەكانی هەورمان

نیشتەجێبوون یەكێكە لە هۆكارە بنەڕەتییەكانی بە شارستانیبوون و دووركەوتنەوە لەو پەیوەندییە خێڵەكییە دواكەوتووانە كە لەسەر بنەمای كۆچ و گۆچبار و گەڕانی بەردەوام بە دوای لەوەرگە و سەرچاوەی ئاودا دامەزراون، شتێكی ئاشكرایە ئەو جۆرە پەیوەندییانەش لە چوارچێوەی تەسكی (خێزان، تیرە، عەشیرەت)دا قەتیسدەمێنن و ئەقڵێك بەرهەمدەهێنن كە توانای دیالۆكی نییە و هەمیشە بەرامبەرەكەی ڕەتدەكاتەوە، ئەو كەسانەی لە كۆچ و كۆچباری بەردەوامدا ژیان دەگوزەرێنن شوێنێكیان نییە بڵێن ئەمە شوێنی ئێمەیە و دوورن لە ژیانی دامەزراو لە شوێنێك، یاخود زەوییەكی دیاریكراودا، ئەگەر لەم ڕوانگەوە لە ژیانی كۆمەڵایەتی ژمارەیەكی زۆر لە تیرە و عەشیرەتەكانی كۆمەڵی كوردەواری بڕوانین، بۆماندەردەكەوێت پەیوەندییە خێڵكییە دواكەوتووەكان تا سەرمۆخ كاریگەری خراپیان لەسەر ئاستی گەشەكردنی كۆمەڵایەتیان دروستكردووە، بەڵام سەبارەت بە خەڵكی هەورامان لەبەر ئەوەی لە زۆر زووەوە نیشتەجێبوون و لە ناو خانو و گوند دا ژیاون شێوەی ژیانیان و ئاستی گەشەكردنی كۆمەڵایەتیان بە ئاستێكی بەرچاو جیاوازە، بەڵگە مێژوویەكان باس لەوەدەكەن هەندێك لە نەتەوە زاگرۆسییەكانی وەك (لۆلۆ، گۆتی) لە هەوراماندا ژیاون و حوكمڕانییانكردووە، هەر لەم بوارەدا دەڵێن هەورامان بەشێك بووە لە (مەلەكەتی زاموا) كە نەتەوەی (لۆلۆ) دایانمەزراندووە ئەمە لە لایەكەوە لەلایەكی تریشەوە بوونی چەندین (قەلا، ئاتەشگەی زەردەشتی، شوێنەواری كۆنە گوند و بالاخانەو خانوو)، ئەو قەوالانەی لە هەوراماندا دۆزراونەتەوە و ئێستا لە مۆزەخانەكانی بەریتانیا و ولاتە ئەوروپییەكاندا پارێزراون[2]، هەروەها دۆزینەوەی سەدان

---

[1] بڕوانە (هانی هارۆڵد هانسن)| ژیانی ئافرەتی كورد| وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە (عەزیز گەردی)|لاپەڕە (138).

[2] بۆ زیاتر ئاگاداربوون لەم بارەیەوە بڕوانە بابەتی یەكەمی ئەم كتێبە بە ناو نیشانی (هەورامان وەك ناو، ناوچە و هەورامی وەك دیالێكت لەسەرچاوە مێژووییەكاندا).

(گۆزە، کووپە، دەفر، سکەی جۆراو جۆری سەردەمە جیاوازەکان)، ئەمانەی باسمانکردن گەواهی ئەو راستییەن کە هەورامان هەر لە دێر زەمانەوە شوێنی شارستانییەت و نیشتەجێبوونبووە.

هەورامییەکان لە زۆر کۆنەوە ئاشنای ژیانی کەشتیاری بوون و رواڵەتی ئاشکرای کەشتیاریش لە ناوچەکەدا باخدارییە، ئەو هەمموو (باخ، رەز)انەی هەورامان کە بەری هەزاران رۆژ کاری بەردەوام و ماندووبوونی چەندین نەوەی یەك لە دوای یەکن، هەرگیز بەو شێوەی ئێستا نەدەبوون ئەگەر هەورامییەکان نیشتەجێ نەبوونایە، چونکە ژیانی رەشماڵنشینی و کۆچ و کۆچبار بوارنادات مرۆڤ بۆ ماوەیەکی زۆر و لە شوێنێکی دیاریکراودا خەریکی کارکردن بێت، هەر لێرەوە دەڵێین بوونی ئەم هەمموو باخ و رەزەدێمە بەڵگەیەکی تری نیشتەجێبوونی دێرین و ژیانی شارستانی خەڵکی ناوچەکەیە، ئەمەش هۆکارێکی کاریگەربووە بۆ ئەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە هەوراماندا زیاتر لە زۆربەی ناوچەکانی تری کوردەواری گەشەکردووتربن، هەرچەندە لە بابەتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکی هەوراماندا ئاوڕ لەم مەسەلەیە دراوەتەوە، بەڵام لێرەدا بۆ سەلماندنی ئەم دەربڕینە تەنها ئەوەندە بەسە لەهەمووی هەوراماندا کەسێك نییە بڵێت من لە فلان هۆزم، یاخود فلان تیرە، کاتێکیش دەڵێت هەورامی، یان هەورامانیم مەبەستی ئەوەیە کە بەشێوەزمانێك قسەدەکات پێیدەوترێت (هەورامی) و نیشتەجێی شوێنێکە (هەورامان)ی پێیدەوترێت.

خەڵکی هەورامان مانگەکانی سەرما و سۆڵە لە ناو گوند و لە خانوودا دەگوزەرێنن، لەو مانگانەشدا کەشو هەوا خۆشدەکات، ئیتر ژمارەیەك لە باخدارەکانیان بە شێوەیەکی کاتی بۆ ناو باخەکانیان کۆچدەکەن و ئاژەڵدارەکانیشیان دەچنە هەوارەکانی هاوینەیان لە کوێستانەکانی نزیك خۆیاندا، کۆچکردن بۆ ناو باخ و هەواری هاوینە هەر لە سنووری گوندەکانە و جۆری ژیانی ئەو شوێنانەش هیچ جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ جۆری ژیانی ناو گوندەکاندا نییە.

کۆچکردن بۆ ناو باخ لە هەردوو دیوی هەوراماندا تا ئەم رۆژانەش بە ئاستی جیاواز لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر بەردەوامە، ئەم کۆچە بۆ ئەوەیە باخدارەکان نزیکبن لە شوێنی کارکردنی رۆژانەیانەوە و باشتر بتوانن بەرهەمەکانیان کۆبکەنەوە، هەروەها چەند مانگێك دوور لە گەرما و مێش و مەگەزی ناو گوندەکان لە ژێر ساباتی فێنکی باخەکاندا ژیان بگوزەرێنن، لەم کۆچەشیاندا (ئاژەڵ، رەشەوڵاخ، بەرزەوڵاخ، مریشك و کەڵەشێر) و هەر پەلەوەرێك هەیانبێت لەگەڵ خۆیان دەیانبەن، هەندێك لە خێزانە باخدارەکان لەکاتی کۆچکردنیاندا بۆ ناو باخ دەبن بە دووبەشەوە، ئەوانەیان توانای کارکردنیان هەیە دەچنە ناو

باخ و ئەوانی تریان لە ناو گونددا دەمێننەوە، بەلاّم بە شێوەیەکی رۆژانە، یاخود هەرچەند رۆژ جارێـك هاتووچـۆی یـەکتری دەکـەن، ژیـانی نـاو بـاخ بـۆ ئـەو خێزانانـەی کۆچـدەکەنە نـاو باخەکانیان جیاوازییەکی وەهای لە گەڵ ژیانی ناو گوندا نییە، ئەو شتانەی لە ناو گوندا لەبەردەستیانداں، زۆربەیان لـە نـاو باخیشدا بۆیان مەیسەردەبن، لەباخەکانـدا لـە نـاو (کـەپر، کۆگـا، کـەوێڵ= کـووخ)ی پـاك و سـواقدراودا دەژیـن، (راخـەر، پێخـەف، دەفـر، ئازووخـە)، هەمووپێداویستییەکانی تـری ژیـانی رۆژانـەیان لەگـەڵ خۆیـان دەبـەن، زۆرجـار رێکدەکـەوێت چەند دراوسێ باخێك پێکەوە لەیەك شوێندا، یـاخود زۆر لـە نزیکـی یـەکترەوە (کـەپر و کۆگا) درووستدەکەن و بەردەوام هاتووچۆیان هەیە و لە خۆشی و ناخۆشـیەکانی یەکتریـدا بەشـدارن، ئەوەش زیاتر گیانی هاوکاری و پێکەوە ژیان لە نێوانیاندا پتەودەکات.

خێزان لە ناو باخدا سەر لەبەیانی زوو لـە خـەو هەڵدەسـن و هەریـەکێکیان دەچـێت بـە لای کاری رۆژانەی خۆیەوە هەتاکو نزیکی نیوەڕۆ، ئینجا لـە دەوری سفرەی نیـوەڕۆ کۆدەبنـەوە بێجگە لەوانەیان شوێن و جـۆری کارکردنیـان بـواری گەڕانـەوەیان نـادات و هـەر لـە بەیانییـەوە توێـشووی نیوەڕۆیـان لەگـەڵ خۆیـان هەڵدەگرن، پـاش نـانی نیـوەڕۆ بـۆ ماوەیـەك پـشوودەدەن، یاخود سەرخەوێك دەشکێنن، پاشان ماوەیەك بە قسەی خۆش و دەمەتەقێ دەگـوزەرێنن و هـەر لـەو ماوەیـەدا لـەو میوانـەی لـە بەردەسـتیندان دەخـۆن، پـاش ئـەوە دووبـارە دەچـنەوە سەرکارەکانیان هەتاکو ئێوارەیەکی درەنگ، ئینجا خێزان بۆ جارێکی تر لە سـەر سفرەی ئێـوارە کۆدەبنەوە، پـاش خـواردنی نـانی ئێـوارە چـەند دراوسـێ باخێـك لـە کۆگا و کـەپری یەکێکیانـدا کۆدەبنەوە و ئەو شەوەیان بە دەمەتەقی و قسەی خـۆش و گۆرانیـچڕین دەگـوزەرێنن و ئـاوازی گۆرانییە رەسەنەکانی هەورامان تێکەڵ بە دەنگی جۆرەها مەل و مێرووی دەورووبەریان دەکـەن و پێکەوە ئارامی شەوەکە دەشڵەقێنن، پـێش خـەوتنیش راوێـژ و تـەدبیری کـاری رۆژی داهـاتوو دەکەن، قسەی باوك، یاخود (دایك، برای گەورە) بۆ ئەو خێزانانەی بێباوکن لەم بوارەدا بڕیـاری یەکالاکەرەوەیە.

هەنـدێك لـە باخـدارەکان بـە تایبـەتی ئەوانـەیان دۆخـی (زەوی، ئـاو)ی باخـەکانیان گونجاوبێـت، لـە مـاوەی کۆچـی هاوینەیانـدا بێجگـە لـەوەی خزمـەتی باخـەکانیان دەکـەن و بەرهەمەکەیان کۆدەکەنەوە، چـەند بـەرو بـوومێکی کێکلگـەیی و سـەوزەواتیش بەرهەمـدەهێنن وەك: (تووتن، زەڕات، تەماتە، بامێ، باینجان، کوولەکە، بیبەر، کاڵەك، پەتاتە، پیاز، توور، شێلم،

سلق، سەوزەواتی تر)، ئەم بەر و بووم و سەوزەواتانەش پێویستی خێزانیان بۆ خواردنی ڕۆژانـە لێهەڵدەگیرێت و لێیان وشکدەکرێتەوە و زیادەکەشیان دەفرۆشرێت.

باخـدارەکان پـاش کۆکردنـەوەی بـەروبوومی باخـەکانیان کاتێـك بنەوبارگـەی بـاخ دەپێچنەوە و بۆ ناو گوند دەگەرێنەوە، بارەکانیان جۆرەها جیرەی زستانی تێدایە، ئەمە بێجگە لەوەی تونیویانە بە باشترین شێوە خزمەتی باخەکانیان بکەن و بەرهەمەکانیان کۆبکەنەوە.

کۆچکردن بـۆ هـەوارەکانی هاوینـەش تایبەتـە بـە ئاژەڵدارەکانـەوە، لـە وەرزی بـەهاردا و بەرلەوەی گژ وگیا وشکببێت دەستپێدەکات، لەم ڕۆژانەدا لەهـەورامانی ئەمـدیو ئـەم شـێوازە لـە کۆچکردن نـەماوە، بـەڵام لـە هەنـدێك لـە گونـدەکانی هـەورامانی ئـەودیو و بـە تایبـەت لـە نـاو ئاژەڵدارەکانیاندا تا ئێـستاش بەردەوامـە، ئـەم شـێوازە لـە کۆچـکردن کـەمێك جیـاوازی لـە گـەڵ کۆچی باخدارەکان هەیـە، چـونکە ئەوانـەی کۆچـدەکەنە هـەوارەکانی هاوینـەیان زیـاتر پێکـەوە (گلێـر = کۆمـەڵ)ن، زۆرجـار هـەموو دانیـشوانی گونـدێك بـۆ هـەوارێك، یـاخود دوو هـەوار لـە کوێستانەکانی نزێـك گوندەکـەیان کۆچـدەکەن، ئـەو شـوێنانەش موڵکییـەتی تایبـەتی خۆیانـە و هەموو خێزانێکیشیان شوێنی کەپر و کۆگای خۆیان هەیە، ئەوانەی دەچنە هـەوارەکانی هاوینـە (ڕاخـەر، پێخـەف، دەفـر و قـاپ، ئازووخـە، هـەر نەختیینەیـەك هـەیانبێت، پێداویـستی تـر) هەروەها هەموو (ئـاژەڵ، ڕەشـەوڵاخ، بـەرزەوڵاخ، پەلـەوەر)ەکانیـان لـە گـەڵ خۆیـان دەبـەن، بـەم شـێوەیە ئـەو گوندانـەی دانیـشوانەکانیان دەچـنە هـەواری هاوینـە، هەنـدێکجار بـە تـەواوی چۆڵدەبن، یاخود خامۆش و کەم قەڵباڵغدەبن.

کۆگای هەواری هاوینە بریتییە لە جێگەیەك تا ئاستی مەتر و نیوێك، یـاخود زیـاتر بـە وشکە کەڵەك بەرزکراوەتـەوە و شـوێنی چـوونە ژوورەو و هاتنـە دەرەوەی بـۆ هێڵراوەتـەوە کـە هەورامییـەکان پێیـدەڵێن (کەلەبـەرە)، کاتێـك هەوارنـشینەکان دەگەنـە شـوێنی خۆیـان کـەپر و کۆگاکانی خۆیـان چاکدەکەن، بـەوەی لەسـەر وشـکە کەڵەکـەوە تائاسـتی مـەترێك، یـاخود زیـاتر هەژك دادەنێن، ئەگەر کۆگاکانیان پان و پۆڕبن کۆڵەکەیـەکی داریـن لـە ناوەراسـتدا دەچـەقێنن وچەند دارێکی باریك لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر دەخەنە سەریان، پاشان بە هەژگ، یـاخود بـەگیای کوێـستانەکان سـەریاندەگرن، کـەیبانووەکانیش زەوییەکـەیان و بـەردەمیان بـە چـەند مـەترێکی دووجا بەباشی سواقدەدەن، هەروەها لە نزیك خۆیانەوە (پەچە) و شوێنی تایبەت بۆ (ئـاژەڵ و وڵاخ)ەکانیـان دابیندەکـەن، لـە هەنـدێك شوێنیـشدا هـەموو هـەوار نـشینەکان پێکـەوە لـە نزیـك هەوارەکانیانەوە شوێنێك بۆ (پەچە)ەکانیان تەرخاندەکەن.

له ماوەی هەوارنشینیدا هەموو هەوارنشینەکان هەوڵدەدەن هەم (ئاژەڵ و ولاٚخەکان)یان باشترین شێوە بەخێوبکەن، هەم جیرەی زستانیان بۆ ئامادەبکەن، ئەو خێزانانەی خاوەن (لاس)ن (لۆ، کەما،تاڵینەدۆس، گژ وگیا، تەنانەت درك)ی لاسەکانیان دەبڕن، پاش وشکبوونەوەیان دەبن بە (ئالیك) و بۆ ناو گوندەکان دەیانگوێزنەوە، ئەوانەشیان (لاس)یان نییە هەندێکیان لاسی ئەو کەسانەی ئاژەڵ و ولاٚخیان نییە ئیجاردەکەن، هەموو هەوار نشینەکانیش سوود له گژوگیا جۆربەجۆرەکان وەردەگرن بۆ (ئالیك) دەیانبڕن.

ژیان هەوار نشینی لەگەڵ ئەوەدا ماندووبوون و ئارقڕشتن و جووڵەی بەردەوامە، بەلاٚم لێوان لێوە لە جوانی و سادەیی و دەروونپاکی، هەوارنشینەکان لەلایەکەوە بەبۆنی (چنوور، شەوبۆ، بەرزەڵنگ، بۆژانە، سوورەهەلاڵە) و گیابۆنخۆشەکانی تر، هەوای فێنك و ئاوی ساردی کوێستانەکانی هەورامان، دۆی تام و بۆن خۆش و کەرێی رەقی کوێستانەکان سەرمەستدەبن، لەلایەکی تریشەوە کەڕەسێڵی شەوانەی هەوارنشینەکان و دەمەتەقێی ژێر مانگەشە و شۆڵەی چرادەستییەکان، تێکەڵ بە ئاوازەکانی (سیاچەمانە، گۆرنی هەمە جۆر، شمشاڵ) زیاتر نەشئەیاندەداتێ و لەو کوێستانە خۆشانەی هەورامانەدا جوانترین شێوازی ژیانی کوردەواری دەخەنەپێشچاو.

هەوارنشین کە سەرلەبەیانی زوو بەقوولەی کەلەشێری سەر کۆگا و کەپری هەوار، دونگە دونگی هەوارنشینێکی دراوسێی، ئاوازی سەحەری شمشاڵژەنێکی هەوارنشین، هاوهوی شوان و بەرغەلەوان و زڕەی زەنگی ملی ئاژەڵەکان) لەخەوهەڵدەسێت، پاش نان و چاخواردنێکی خێرا توێشوویەکی بۆ ئامادەدەکرێت و یەکسەر بۆ شوێنی کاری رۆژانەی دەکەوێتەڕێ، (داربەدار، دەوەن بە دەوەن، گولاڵە بەگولاڵە) ئەو کوێستانە لێرەوارانە بۆ دابینکردنی هەندێك لە پێداویستی ژیانی خۆی و پێداویستی بۆ ئاژەڵ و ولاٚخەکانی تەیدەکات، هەرچۆن پوورە هەنگێك هەر لەبەیانی زووەوزە هەموو هەنگە کارکەرەکانی گوڵ بە گوڵ دەگەڕێن و شیلەی گوڵەکان دەبەنەوە بۆ ئەوەی بیکەن بە هەنگوین و زستان هەنگوینی خۆیان دەخۆن، هەورار نشینەکانیش بەری رەنج و ماندووبوونیان له هەنگوین بۆیان شیرینترە، بۆیە لەوەرزی سەرما و سۆڵەدا دەستی ماندوو دەخەنەسەر سکی تێریان و وەك خۆیان دەڵێن (موحتاجی دەستی نامەرد نابن).

**ئـەو ڕێوڕەسمــە کۆمەڵایەتییانــەی لــە نــاو گونــددا ئەنجامــدەدرێن بەهــەمان گــەرم و گوڕییەوە لە هەوارەکانیشدا بەڕێوەدەچن، لەوانە: (ناونـانی منـداڵ، خەتەنەسـووران) و ژنهێنـان بەهەموو وردەکارییەکانییەوە وەك: (خوازبێنی و دەستماچکردن، شەکراوخواردنەوە، مارەبڕین، گواستنەوە و زەماوەندکردن، بەرەو باوانکردنەوەی بووك) هەروەها (پرسەدانانی مـردوو، کـۆڕی لاواندنەوەی) تەنانەت بەخاکسپاردنیش بە تایبەت لـە و هەوارانـەدا کـە هێنانـەوەی مـردوو بـۆ گۆڕسستانی گوند ئەرکێکی گرانە.**

**پێشتر ژمارەیـەك لـە هـەوار نـشینەکان هەنـدێك لەبەرهەمـە تەڕدەسـتەکانیان وەك (دۆ، کەرە) کە لە پێویستی خۆیان زیـاتر بـوون دەیـانبردن بـۆ گونـدە قەڵەباڵغـەکان و دەیانفرۆشـتن، یاخود کاڵا بە کاڵایـان پێـدەکردن، لـەم بـوارەدا هـەوار نـشینەکانی (دزاوەر، کەیمنـە، بێـدەرواس، هانەگەرمڵە) دۆ، کەرە، خەیاریان دەهێنایە تەوێڵە و بە تووە وشکە دەیانگۆڕییەوە.**

**هەرئــەوە مــاوە بڵــێن هەوارنــشینەکان هــەتا کــەش و هــەوا ســاردەکات لەهــەوارەکان دەمێننەوە و پاشان بۆ ناو گوندەکانیان دەگەڕێنەوە، بەوەش بیرەوەرییەکانی ئەمساڵی هـەواریان بە ساڵێ رابردوو دەسپێرن.**

**تێبینی: هیچ مێژوویەکمان بۆ کۆچکردن بۆ باخ وهەوار و گەڕانەوە بۆ گوند دیارینەکردووە، چونکە زیاتر جیاوازی پلەی گەرمای گوندەکان و هەوارەکان ئەو مێژووانە دیاریدەکات و بەشێوەیەکی گشتیش لە پاش بارانبڕانەوە دەستپێدەکەن.**

# هەورامییەکان و خۆئامادەکردنیان بۆ وەرزی زستان

پێشتر قسەمان لەسەر ئەوەکردووە کە هەورامان شوێنێکی سەخت و شاخاوییە و دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەو ناوچانەوە بارانیان مسۆگەرە، بۆیە دەبینین زۆربەی گوندەکانی لە هەردوو وەرزی پاییز و زستاندا بارانی زۆریان لێدەبارێت و هەندێکیشیان لەوەرزی زستاندا ئەوەندە بەفریان لێدەبارێت لە هەندێك ساڵدا نەك بۆ چەند رۆژێك، بەڵکو بۆچەند هەفتەیەك رێگەی هاتوچۆیان دەبەسترێت، شارێکان بەفر دایاندەپۆشێت و وڵاخەرێ و پیادەرێکانیش کەس ناتوانێت پێیاندا گوزەربکات، پێشتر خەڵکی ئەو گوندانە بەجۆرە گەلکارییەکی گشتی رێگاکانیان پاکدەکردەوە، لەم رۆژانەشدا زۆرجار دەزگا دەوڵەتییەکان ئەو ئەرکە رادەپەرێنن و بە ماشێنی گەورەی وەك (گرێدەر، بلدۆزەر، شۆفڵ) شارێکان پاکدەکەنەوە، ئەمە بۆ ئەو گوندانەی کە رێگای ئۆتۆمبێلیان لە سەرە، بەڵام ئەو گوندانەی کە بە شوێنە سەختەکانەوەن و هەتاکو ئێستاش ئۆتۆمبێلیان بۆ ناچێت، هەر بەتەواوی لەدەوروبەریان دادەبڕێن و هەتاکو بەفر نەتوێتەوە هاتوچۆکردنیان ئەرکێکی زۆرگرانە، لێرەوە دەبینین هەورامییەکان هەر لە دێرزەمانەوە لەسەر ئەوە راهاتوون هەر لەناوەراستی هاوینەوە دەستبکەن بە خستنی جیرەی زستان و خۆیان بۆ ئەو وەرزە ئامادەبکەن، هەرچەندە ئێستا گوندەکانی هەورامان هاتوچۆی زۆرتریان لەسەرە و زۆربەی گوندەکان رۆژانە ئۆتۆمبێل دەچێتە ناویانەوە، بەوەش ئەرکی جیرەخستن و بەدەستهێنانی ویستەمەنییەکانی ژیانی رۆژانە لە رووی شێوازەوە گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە و ئەو ویستەمەنییانە زیاتر لەخەڵکی ناوچەکە نزیکبوونەتەوە، کەچی زۆربەی خێزانە هەورامییەکان هەوڵی خستنی جیرەی زستان دەدەن و ئەو خێزانانەی لەم بوارەدا کەمتەرخەمبن نەك هەر بەبێموبالات دەدرێنە قەڵەم، بەڵکو وەك ئەوەیە نەنگییەکیان بەسەر خۆیاندا هێنابێت.





سەرەڕای ئەو گۆڕانەی بەسەریدا هاتووە، بەڵام جیرەخستن جێگای خۆی لەکولتووری خەڵکی هەوراماندا هەیە و بووە بەخوویەکی کۆمەڵایەتی، شتێکی ئاشکرایە هەر گۆڕانێکیش بەسەرئەو خووەدا هاتبێت نابێت بەهۆی لەبیرچوونەوە و فەرامۆشکردنی.

لەبەرئەوەی سروشتی رووی زەوی هەورامان بۆ بەرهەمهێنانی بەروبوومە کێڵگەیەکان و لەسەرووی هەمووشیانەوە بۆ دانەوێڵەیەکی ستراتیژی وەك (گەنم) گونجاو نییە، کە تا کۆتایی حەفتاکانی سەدەی بیستەم بەرهەمێکی ستراتیژی بووە بۆ سەرانسەری کوردستان و نرخی خۆی وەك کالایەکی ستراتیژی گومنەکردووە[لخ]، هەورامییەکان پێشتر پێویستی خۆیان لە (گەنم) لە دەرەوەی هەورامانەوە دابینکردووە، ئەوەش لە رێگەی کاروانکردنەوە بۆ ناوچەکانی (شارەزوور، گەرمیان، مایدەشت) و کڕینی گەنم لەو ناوچانە بەپارە، یاخود لە رێگەی کالا بەکالاکردنەوە، هەروەها کڕینی گەنم لەو خەڵکانەی لە وەرزی پاییزدا لەناوچەکانی خۆیانەوە گەنمیان هێناوەتە هەورامان و بەخەڵکی ناوچەکەیان فرۆشتووە، بەهەمان شێوازی دەسخستنی (گەنم) هەندێك بەروبوومی تریان دەستی خۆیان خستووە وەك: (نۆك، نیسك، ماش، چەڵتووك، زەڕات...هتد).

ئەو گەنمەی دەهێنرێتە ماڵەوە سەرەتا لە لایەن کەیبانووەکانەوە پاك دەشوردرێتەوە، پاش وشکبوونەوەی لە ناو خانوودا ئەمباردەکرێت و بۆ ئەمبارکردنیشی (کەنوو، بەرمیل، گوێنی) بەکاردەهێنرێن، بەینا و بەین بە پێی پێویستی خێزان لێیدەهاڕن و ئاردەکان لە (کەنوو، هەمانە، بەرمیل، گوێنی) دادەنێن.

لە گەنمی تایبەت بە (ساوەر) ساوەر درووستدەکەن بۆ ئەو مەبەستەش سەرەتا (گەنم)ەکە دەشۆنەوە و لەناو قازانی گەورەدا دەیکوڵێنن، پاش کوڵاندنی دەیکەنە ناو قووڵێنەوە هەتاکو ئاوجۆڕەکات و ئینجا دەیبەن لە سەربانی پاك و سواقدراودا دەیخەنە بەرخۆر هەتا وشکدەبێتەوە، پاش وشکبوونەوەی کەمێك لە کەیبانووەکان لە ناو (دۆڵ)دا دەیکوتن و زۆربەشیان کەسێکی شارەزا بانگدەکەن بۆ کوتانی کەپێیدەڵێن (پەتڵەکۆ= ساوەرکوت)، بۆ ساوەرکوتان ئەو گەنمەی پێشتر کوڵێنراوە و وشکبۆتەوە دەکرێتە ناو قوڵێنەوە و کەمێك ئاوپڕژێندەکرێت، ساوەر کوتەکە بە (مێکوت) تێیبەردەبێت و کەیبانوویەکیش لەگەڵ هەموو

---

[لخ] (مامۆستا فەیرۆز حەسەن) سیستمی ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتیی هەورامان لەم چوار سەدەی دواییدا گۆڤاری هەورامان لاپەڕە (14).

مێکوتێکدا دەستێکیتێدەخات و ئەمدیو وئەودیوی دەکات هەتا پووشەکەی لێدەبێتەوە، ئیتر بەم شێوەیە کارەکە بەردەوامدەبێت و هەموو ساوەرەکە دەکوتن.

پاش کوتانی جارێکی تر دەخرێتە بەرخۆر بۆ ئەوەی وشکببێتەوە، ئینجا کەیبانووەکان بەبایدەکەن و دەیبەن بۆ ئاش بۆ هارین، پاش ئەوەی لە ئاش دەیهێننەوە تەتەڵەیدەکەن و بە هێڵەك (ئاردەساوەر، کژنیژ= پیرخەنی)یەکەی لێجیادەکەنەوە، ئیتر دەبێت بەو ساوەرەی ئامادەدەبێت بۆ چێشتلێنان.

هەر لەگەنم برویشك بۆ گرتنەوەی ترخێنە دەهارن، بۆ ئەو مەبەستەش (شێلم) بە گەلاَ و سەلکەوە وردورد دەجنن، برویشکەکەش لەسەرئاگر دەپیشێنن و لەگەڵ شێلمە جنراوەکەدا تێکەڵیاندەکەن، ئینجا دەیانخەنە ناو جەرەی تایبەتەوە و کەمێك ئاوی تێدەکەن و سەریدادەپۆشن، پاش ئەوەی سێ رۆژ بەسەردایپۆشراوی دەیهێڵنەوە ئینجا دەستیتێدەخەن و باش تێکیدەدەن و سەرەکەی بۆ (3، 4) رۆژی تر دادەپۆشنەوە، پاش ئەو ماوەیە دەیکەن بە سەلك و (گەلاَ هەنجیر، پوونگە) دەخەنە ژێریری، لەم کاتەدا پێیدەڵێن (شەلەمینە تەری= تەرەترخێنە) و بۆچەند رۆژێك لێدەخۆن، ئینجا سەلکەکان دەخەبەرخۆر هەتا (زوەرد= زۆردە) دەبنەوە و پاشان دوو دوودەیاندەن لە لەڤان هەتا بەتەواوی وشکدەبنەوە و ئیتر بۆ وەرزی زستان هەلدەگیرێن.

هەر لە گەنم (گەنمە کوتراو) دەکەن بۆ (کەشکەك)، هەروەها (نۆك، نیسك، ماش، ماشەسپی، چەڵتووك) دەکرن و بۆ وەرزی زستان ئەمبارياندەکەن.

بێجگە لەمانەی ناومانهێنان هەورامییەکان (تەماتە، بامێ، باینجان، کوولەکە) وشکدەکەنەوە و هەندێك لە تەماتە وشکەوبووەکەش دەهارن و لە زستاندا چێشتیان لێدرووستدەکەن، هەر لە بواری ئەمبارکردنی جیرەی زستان، (دەنکە هەنار) وشکدەکەنەوە و لە هەناری ترش (ربە هەنار) درووستدەکەن و دەیانکەنە ناو هەندێك لە چێشتەکانیانەوە ، هەروەها (لەتکە بەهێ، لەتکە هەرمێ، لەتکە قەیسی، لەتکە قۆخ، هەڵووژە وشکە) هەڵدەگرن بۆ وەرزی زستان و دەیانکەن بە (خۆشاو)، هەشیانن وەك: (لەتکە قەیسی، هەڵووژە وشکە) بێجگە لەوەی دەیانکەن بە (خۆشاو)، بۆ چێش لێنانیش بەکاریاندەهێنن .





لـە ترێـی رەش مێوژدەکـەن و هـەنجیریش وشـکدەکەنەوە، یـاخود هـەنجیرەکان بەتـەڕی پێکەوەدەشێلن و وەك ڤاڵبیان لێدێت و بۆ زستان هەڵیانـدەگرن، ئەمانـە لەگـەڵ کاکڵەی گـوێزدا شەوچـەرەیەکی بـە تـام و نایـابن، (تـووی وشـك، سـەکلە تـوو[لخلحلخ]) هەڵـدەگرن بـۆ زسـتان و لـە تووەکان (کوتە، لەپارێ[3]) درووستدەکەن، هەورامییەکان لە چاکترین جۆری (بەهێ، هـەنار)ی ناوچەکەیان دەسـت خۆیـان دەخـەن و بـۆ زسـتان هەڵیانـدەگرن، زۆرجـار چـەند دانەیـەکیان بـە لاسکەکانیانەوە بـە بنمیـچی خانووەکانـدا هەڵدەواسـن و ئـەوانی تریـشیان لەسـەر رەفـە، یـاخود لەسندووقدا هەڵدەگرن و شەوانی زستان دەیـانخۆن، هـەروەها (هـەرمێ) لـە ناومالْـدا هەڵـدەگرن بەوەی لە شوێنێکی وشکدا لە سـەر گـەلاَکانیان بلاَویاندەکەنـەوە، بـەلاَم لەبەرئـەوەی خراپنـەبن زووش دەخـورێن، هـەلگرتنی (بـەهێ و هـەرمێ) لـە نـاو مالْـدا بـۆن و بەرامـەی خانووەکـان خۆشدەکەن.

ئـەو خۆراکانـەی هەورامییـەکان هەڵیانـدەگرن بـۆ زسـتان بـە تایبـەت میوەکانیـان زۆر بۆیـان بەسـوودن، چـونکە رێژەیـەکی زۆر کەرەسـەی خـۆراکی بەسـوود و ڤیتامینیـان تێـدان، لەوەرزی ساردی زستاندا لەشیان بەهێزدەکات و قەرەبووی هەر کەمو کوڕییەك دەکاتەوە کـە لـە خواردنی رۆژانەیاندا هەبێت.

خـەڵکی هـەورامان بیبێجگـە لـەوەی جـیرەی زسـتان بـۆ خۆیـان مـسۆگەردەکەن، جـیرەی پێویستیش بۆ ئاژەڵ وڵاخەکانیان دەخەن، لەم بوارەدا (کلۆوش= تـووی وشـکی رەشـەوبوو، جـۆ، هــەرزن، گــزرە، لــۆ و کــەما و درك، گــەڵای وشــك) لــە کادانییەکانیانــدا بــۆ وەرزی زســتان ئەمباردەکەن، بۆیە ئاژەڵ وڵاخەکانیان لە وەرزی سەرماوسۆڵەدا تێر و کۆکدەمێننەوە.

دواجــا قــسەلەسەر ئەوەدەکــەین ئــەمبارکردنی دار لــە ناوچــەکەدا بایــەخێکی زۆری دەدرێتێ، لەم بـوارەدا هەورامییـەکان سـوود لـە داری (بـاخ و قـۆرخ)ەکانیـان وەردەگـرن، هـەموو خێزانێك بەپێی توانای خۆی دار ئەمباردەکات، ئیتر لە داری باخ و قۆرخی خـۆی بێـت، یـاخود بە پارە لە خاوەن بەرزە وڵاخ و خاوەن قۆرخەکان بیکرێت.

لـە کۆتـایی ئـەم بابەتـەدا دەڵـێن خـەڵکی ناوچـەکە لەبـەر ئـەوەی بـۆ وەرزی زسـتان خانوویان پڕ لە ئازووخە و لێژنەی دارەکانیان قەبەیە، لەم وەرزەدا بەسکی تێرەوە لـە تەنیـشت

---

[لخلمحلخ] چۆنییەتی درووستکردنی (سەکلە توو) لە بابەتی داری (توو)دا باسی لێوەکراوە.

[3] چۆنییەتی درووستکردنی (کوتە، لەپارێ)ش لەهەما بابەتدا باسکراون.

سۆپای گەرمدا بە دڵخۆشییەوە پاڵی لێدەدەنەوە، هەر ئەمەش هۆکارێکی گەورەیە بۆ ئەوەی سەرەڕای درێژی و سەختی زستانی هەورامان، کەچی خەڵکەکە ئاسوودە وخۆشگوزەرانن.

# خواردنە میللییەکانی هەورامان

هەموو نەتەوەیەك خواردنی میللی خۆی هەیە، خواردنەکانیش زۆر و جۆراجۆرۆن و بەجیاوازی ناوچەکانیش جیاوازییان هەیە، ناوچەی هەورامان یەکێکە لەو ناوچانەی بە خواردنی میلی بەناوبانگە، خواردنەکانیشی بەشێوەیەکی گشتی سەرچاوەی خۆراکی بەسوودن و هەرچەندە ئێمە زووتر تەنها بۆ تێرکردنی سکمان خواردوومانن، بەلأم سوودی تەواویان گەیاندووە بە لەشمان باشترین جۆری پرۆتینیان بۆ لەشمان دابینکردووە کە (پرۆتینی رووەکی) پێیدەوترێت، بەتاقیکردنەوەی زانستیش سەلمێنراوە ئەم جۆرە پرۆتینە زۆر لە (پرۆتینی حەیوانی) بەسوودترە کە لەخواردنی (گۆشت بەهەموو جۆرەکانییەوە، هێلکە، شیرەمەنی) و سەرچاوە ناڕووەکییەکانی ترەوە دابیندەکرێت، چونکە (پرۆتینی حەیوانی) سەرەڕای سوودەکانی هەندێك شتی زیانبەخشی تیایە کە دەبنەهۆی دروستکردنی بەرد لە (گورچیلە، بۆریەکانی میز، میزڵدان، زراو)، هەرلەبەر ئەوەشە لەم رۆژانەدا هەندێك لە وڵاتە پێشکەوتووەکان وەك (وڵاتی یابان)، زیاتر روویانکردووەتە خواردنی پرۆتینی رووەکی، هەروەها چەندین کەس لە وڵاتە جیاجیاکانی دنیادا هەن تەنها بەرهەمی رووەکی دەخۆن و بەتەواوی وازیان لە خواردنی پرۆتینی حەیوانی هێناوە.

هەرچەندە ئێستا لە زۆربەی دێهاتەکانی هەوراماندا خەڵك ئەوەندە بایەخ بە خواردنە میللییەکان نادەن و زیاتر روویانکردووەتە ئەو خواردنانەی کە رۆژانە بەتەڕوتازەیی لەلایەن کەیبانووەکانەوە لێدەنرێت، بەلأم خواردنە میللیەکان سوودی ئێجگار زۆریان هەیە، هەر بۆ نموونە زۆرجار دەبیستین گوایە ئەوسا نەخۆشی نەبوو ئێستا نەخۆشی زۆرن، هەرچەندە ئەمە خۆی لەخۆیدا کاریگەریەکی گەورەی زۆربوونی هوشیاری تەندروستی لەسەرەو خەڵك زیاتر لەتەندروستی خۆیان دەپرسنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەری جۆری خۆراکی لەسەرە کە خەڵك





بەشێوەیەکی گشتی رووپانکردووەتە خواردنی ئەو کەرەستانەی رێژەیەکی زۆر چەوریان تێدایە، ئەوەش کاریگەرییەکی تەواو خراپی بۆ بەرزبوونەوەی رێژەی کۆلسترۆل لەخوێندا و تووشبوون بەنەخۆشی جۆراوجۆر هەیە.

لەخوارەوە ناوی ژمارەیەك لە خواردنە مییللییەکانی هەورامان وەك: (شەلەمینە= ترخێنە، دۆخەوا، دانەدوە= دۆینە، گوننینە= دۆینەیەکی خەست کەرۆنی هەڵقرچاوی خۆماڵی بکرێت بەسەریدا، تشاوە قوڵی= ترشاو= مزرۆکە، ماشڵێنە= ماشێنە، میژوێنە= نیسکێنە، کەشکەك، سەربەزەڕینی= شۆربای نیسکی هاڕراو، ماشوپەتڵە= ساوەروماش پێکەوە لێدەنرێت، ماشوبرنج، پەتڵێنە= ساوەر، گێتە مەژگێ و بنەهارگایە ... هتد)، لێرەدا قسە لەسەر ئەوانەیان دەکەین کە لەم رۆژانەدا بوونەتە یادەوەری و نەماون، یاخود ئەگەر لەهەندێك شوێندا مابن، زۆر بەرێژەیەکی کەم دەخورێن، لەوانە:

# بنەهارگایە

خواردنێکی زۆر بەتام و لەزەت و بۆنخۆشە و وزەیەکی باش بەلەش دەدات، زووتر هەم دروستکردن و هەم خواردنی زۆر بەربڵاو بووە، بەتایبەتی لەکاتی سەرماوسۆڵەی زستاندا، کاتێك کە خێزان لەچواردەوری ئاگری سۆپاو کوانووەکانیان کۆبوونەتەوە، بەهەمانشێوە لە ئاشەکاندا لەوکاتانەدا کۆمەڵێك ژن شەوانە سەرەیانگرتووە بۆ هاڕینی دانەوێڵە دروستکراوە.

بنەهارگایە لەلایەکەوە سکی خێزانی تێرکردووە و لەلایەکی تریشەوە وزەوگەرمای بەلەشیان بەخشیوە، بۆ دروستکردنی بنەهارگای ئەم شتانە پێویستن: (ئارد، کاکڵەی گوێز، خوێ، پیازی وشك)، بەڵام پیازەکە هەمووکاتێك بەکارناهێنرێت و بەپێی حەزی ئەو کەیبانووەیە کە دروستیدەکات، پاش ئەوەی ئەم شتانە ئامادەدەکرێت، سەرەتا ئاردەکە باش دەبێژرێتەوە و دەکرێتە ناو (دۆڵە=تەشت)ی هەویر، پاشان بەقەد هەویری نان خوێی تێدەکرێت و وەك هەویری نانی تیری دەشێلرێت، کاکڵەی گوێزەکە دەکرێت هەربەساخی، یاخود بە هاڕراوی وەك چۆن بۆ دروستکردنی (گێتەمەژگی=کولێرە بەکاکڵە) بەکاردەهێنرێت ئامادە بکرێت، ئەگەر پیازیش بەکار بهێنرێت وردورد دەجنرێت و تێکەڵ بەکاکڵە گوێزەکە دەکرێت، گونکی گەورە ئامادە دەکرێت و بە قەبارەی نانێکی بازاڕی پاندەکرێتەوە، دیوی سەرەوەی

پڕدەکرێت لە کاکڵە و پاشان چینێکی تر هەویر بەهەمانشێوە دەخرێتەسەری و کاکڵەی تێدەکرێت، زۆرجار چینەکان لە سیان و چوار تێپەڕدەکەن و جاری واش هەیە دەکرێن بەشەش چین بەپێی حەزی ئەو کەیبانووەی ئامادەیدەکات.

بە مەبەستی برژاندنی بنەهارگایەکە کە وەك قالبێکی کێکی لێهاتووە، دەخرێتە ناو (کوانوو، سۆپای دار) و پشکۆی ئاگر دەدرێت بەسەریدا هەتاکو بەتەواوەتی لەهەموولایەکەوە دادەپۆشرێت، پاش ماوەیەك بەتەواوی دەبرژێت و کاکڵە گوێزەکەش لەناویدا دەپیشێت و ئیتر ئادەدەکرێت بۆ خواردن.

لەم رۆژانەدا کە فڕن و تەباخ لە زۆربەی ماڵەکاندا هەیە، دەکرێت بۆ برژاندنی بنەهارگای سوودیان لێوەربگیرێت و تا رادەیەکیش بۆ کەیبانووەکان ئاسانترە.

خواردن و دروستکردنی بنەهارگای لە هەورامانـدا چەند رازێکی هەیە، یەکێك لەو رازانە لە تەوێڵەدا روویداوە بەم شێوەیە: خێزانی (مامو عەبدیلە) ناوێك کە ئاشەوان بوون، هەمووسالێك سەرپایز کە گەڕاونەتەوە بۆ ناو ئاش، یەکەم شەوی گەڕانەوەیان بنەهارگایان دروستکردووە، بەڕێکەووت لە یەکێك لە ساڵەکاندا کەیبانووی ئەو ماڵە سەرقاڵبووە و بۆینەکراوە دروستیبکات، کوڕی گەورەی بەناوی (رەشید) بەدایکی وتووە: بۆچی بنەهارگاییمان بۆناکەیت؟ ئەویش لەوەڵامدا وتوویەتی: ئەمشەو سەرقاڵم و بۆ سبەی شەو بۆتان دروستدەکەم، وەڵامی رەشیدیش بەم شێوەیە بووە: مادام بنەهارگاییمان بۆ دروستناکەیت، مانای ئەوەیە نەهاتوینەتەوە بۆ ئاش.

شاقوڵیاغە: بۆ دروستکردنی ئەم خواردنە (ساوەر + شێلمی ترخێنە + هەڵوژە وشکە) پێکەوە دەکوڵێنرێن هەتاوەکو خەستدەبنەوە، دەڵێن شاقوڵیاغە بەناوی یەکێك لە دەسەڵاتدارانەوە، بەناوی (شاقوڵی ئاغا، یان شاقوڵێ بەگ) ناونراوە.

خۆشاو: یەکێکە لە خواردنە زۆربەتام و بۆنخۆشەکان و زیاتر لەوەرزی زستاندا ئامادەدەکرێت و وەك شەوچەرە دەخورێت، بۆ دروستکردنی خۆشاو پێویست بە چەندجۆر میوەی وشکەوەکراو دەکات وەك: (هەڵوژە، مێوژ، توو، لەتکە هەرمێ، لەتکە بەهێ، لەتکە سێو، قۆخی وشکەوکراو، هەندێکجاریش قەیسی)، بەڵام زۆربەی کەیبانووەکان قەیسی بەکارناهێنن لەبەرئەوەی زوو دەخوسێتەوە و هەڵدەوەشێت.

ئەم میوە وشکەوکراوانە جگە لە هەڵوژەکان سەرەتا پاك دەشۆرێنەوە و پاشان دەکرێنە ناو (سوزگی، تەیکە، نانەشان) هەتاوەکو ئاوچۆڕبکەن، هەڵوژەکان بەجیا دەکرێنە ئاو بۆئەوەی نەرم ببنەوە و پاشان باش دەکوڵێنرێت، پاشان لەگەڵ میوەکانی تر دەکرێنە ناو مەنجەڵێکی گەورەوە و پێکەوە دەکوڵێنرێنەوە، بەنسبەت تووەکانیشەوە بەجیا دەشۆردێنەوە و دەکوڵێنرێن، پاشان دەگوشرێن و پاڵفتە دەکرێن، ئینجا ئاوەکەیان دەکرێتە ناو ئەو مەنجەڵەوە کەمیوەکەی تێدا کوڵێنراوە، بۆجارێکی تر پێکەوە دەکوڵێنرێنەوە، لەگەڵ بەردەوامی کوڵاندنیاندا بەرەبەرە رەنگی ئاوی مەنجەڵەکە سووردەبێت، هەتاکو زیاتر بکوڵێنرێن ئاوەکە سوورتر دەبێت و خۆشاوەکەش خەستتردەبێتەوە، پاشان دادەنرێت تا سارددەبێتەوە و لە هەر کاتێکدا کە ئارەزووی بکەیت بۆ خواردن ئامادەیە.

خۆشاو نزیکەی یەك مانگ دەمێنێتەوە و بەساردی دەخورێت، هەتاکو شوێنی هەڵگرتنی ساردبێت زیاتر دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر لە شوێنی گەرمدا هەڵبگیرێت کەڕوو دەگرێت و خراپ دەبێت.

خۆشاو پڕە لە ڤیتامینە جۆربەجۆرەکان و شەکرە تاکەکانی ناو میوە کە بەئاسانی هەرسدەبن، چونکە ئەو کەرەستانەی لە دروستکردنیدا بەکار دەهێنرێن هەموویان سەرچاوەی خۆراکی دەوڵەمەندن، هەر بۆیە سوودی دەرمانیشی هەیە و باشترین چارەسەرە بۆ رزگاربوون لە نەخۆشیەکانی (هەڵامەت و ئەنفلۆنزا، کەمخوێنی، بەدخۆراکی).

# داب و نەریتی کۆمەڵایەتی

داب و نەریتی کۆمەڵایەتی یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی درووستبوونی نەتەوە، لایەنێکی گرنگی پێکهاتەی کولتوورییەتی و شوێنی دیاری لەناو بیر و هزری تاکەکانیدا هەیە، داب و نەریت و شێوەی ژیان و بیروباوەڕی (تیرە، هۆز، خێڵە) کوردەکانیش بە (نیشتەجی و کۆچەر)یانەوە وێناکردنێکی ئەتنۆگرافییانەی کۆمەڵی کوردەوارییە، بۆیە پێویستە لەگەڕان و ئەودالبوون بەدوای کۆکردنەوەی کەلەپووری نەتەوایەتیماندا بایەخی خۆی بدرێتێ، لای هەندێك کەس لێکدانەوەی زۆرهەڵە بۆ داب و نەریت دەکرێت و پێیانوایە تەنانەت ناوهێنانیشی بقەیە، چونکە گەڕانەوەیە بۆ ناو سروشت و سونەت، بەڵام ئەمە خۆی لە خۆیدا

تێڕوانینێکی ساویلکانەی سەرپێییە، شتێکی راستە  لەناو کۆمەڵە دواکەوتووەکاندا پابەند بـوون بەداب ونەریتەوە بە ئاستێك لە ئەقڵیەتیاندا رەگیـداکوتاوە، زۆرجـار هێـزی یاسا دەبـەزێنێت و هیچ بیرێکی نـوێش ناتوانێـت بەئاسـانی پاشەکشێ بـەو پابەندبوونـەوە بکات، بۆیـە لـەم جۆرە کۆمەڵانـــەدا بڕیـــارە کۆمەڵایەتییـــەکان بـــەردەوام داواکارییـــەکانی ئایـــدۆلۆژیا وبـــیری پێپێشکەوتووخواز دەدەنـە دواوە و زۆرجـار خـودی ئایـدۆلۆژیا لەبـەردەم بڕیـارە خێڵەکییەکانـدا دۆشـدادەمەنێت و هەنـدێك جـاریش نـەوەك هـەر دۆشـدادەمێنێت، بـەڵکو خۆیـشی دەبێـت بەبەشێك لە واقعەکە و توانای هیچ گۆڕانکارییەکی نامێنێت، شتێکی ئاشکرایە (داب و نـەریت) خۆی لە خۆیدا دووبەشە، بەشێکی کۆنبووە و سەردەم بەجێیهێشتووە بەکەڵکی ئـەم سـەردەمە نایەت، بەڵام هەندێك لە داب و نەریتەکان لێوان لێون لە جوانی و دەکرێت لەگەڵ رۆحی عەسر و پێشکەوتنخوازیشدا بگونجێن، بۆیە نەفرەتکردن لێیان دەچێتە هـەمان تـای تـەرازووی پابەنـد بوونی کوێرانە بە داب و نەریتە دواکەوتووەکانەوە.

لەبەرئەوەی ئەم سەردەمە سەردەمی جیهانگیری و پێشکەوتنی زانـستی و تەکنۆلۆژییـە، پێدەچێت قسەکردن لەسەر داب و نەریت لای هەندێك کەس بەشتێکی بێبایەخ لەقەڵەمبدرێت، بەڵام ئەو بەڕێزانەی بەم شێوەیە بیردەکەنەوە دەبێت ئەوە بزانن هەر نەتەوەیـەك کـە تێکـەڵاو بـە بـەدنیای جیهـانگیری دەبێـت، پێویـستە خـاوەنی گوتـاری نەتـەوەیی خـۆی بێـت، ئـەگینا ناسنامەی خۆی لەدەستدەدات و لەو جیهانەدا بەتەواوی گومدەبێت، بـەو پێیـەش داب و نـەریت بەشێکە لە ناسنامەی نەتەوەیی، لێرەوە ئیتر گرنگی داب و نەریت دەردەکەوێت.

هەر لەم بوارەدا دەڵێین ئەگەر داب و نەریت گرنـگ نییە، ئـەی بۆچـی دەبێـت کەسـێکی وەك (ئەلکسەندەر ژابا) کە کونسوڵی رووسیای تزاری لە (ئەرزوڕۆم) و خۆرهەڵاتناسێکی ناسـراو بووە، ئەوەندە بایەخ بە نووسـینەکانی (مـەلا مـەحمودی بایەزیـدی[*]) بـدات و بیانخاتـە سـەر

---

[*] مەلا مەحموودی بایەزیدی زانایایەکی ئایینی و زمانناسێکمی دیاری سەدەی نۆزدەیەم بووە، دەستێکی باڵای هەبووە لە (ئەدەب، زمان، نووسینی دەستنووس)دا، کتێبی داب و نەریتی کوردەواری یەکێکە لە دەستنووسە بەنرخەکانی ناوبراو کە (ئەلکسەندەر ژابا) لەگەڵ خۆیدا بدوونی بۆ رووسیا و لە نامەخانەی (سالیکۆف شیدرن) پاراستوونی.

بڕوانە (مەلا مەحمودی بایەزیدی) داب و نەریتی کوردەواری وەرگێڕانی لە رووسیەوە (د. شوکریە ڕەسووڵ) لاپەڕە (5).

زمانــەکانی (رووســی، فەرەنــسی) و لــە وڵاتــە پێــشکەوتووەکاندا بلاّویانبکاتــەوە، یــاخود چــۆن خــانمێکی بیــانی وەك (هــانی هارۆڵــد هانــسن) کتێبێکــی گــەورە لــەبارەی ژنــی کــوردەوە بــەناوی (ژیــانی ئــافرەتی کــورد) بنووســێت، لــەو کتێبــەدا باســی چــەندین بابــەت بکــات وەك: (پایــەی کۆمەڵایــەتی ژنــی کــورد، بەشــوودانی، جلوبــەرگی، خۆڕزاندنــەوەی، منــداڵبوونی، منــداڵ بەخێوکردنی، هەموو هەڵسووکەوتەکانی تری لەناو ماڵ و لەدەرەوەی ماڵدا...هتد)[1].

کۆمەڵی کوردەواری یەکێکە لەو کۆمەڵگە خۆرهەڵاتییانەی تا ئێستاش داب و نەریتی کاری خۆی تێدادەکات، بەوپێیەی خەڵکی هەورامان بەشێکن لە پێکهاتەی کۆمکەڵی کوردەواری، هەندێك لەو داب و نەریتانە کە بەشێکن لەبڕیاری کۆمەڵی کوردەواری تا ئێستاش کاریگەرییان لەسەر ژیانی خەڵکەکە هەیە، پاش ئەم پێشەکییە کورتە چەند نموونەیەك لەم بارەوە دەهێنینەوە:

1- ئەگەر لەکاتی پێڵاو داکەندندا پێڵاوەکان بکەونە سەریەکتری بەخاوەنەکەیان دەڵێن سەفەرێکت لەرێدایە.

2- ئەگەر پشیلە لەناو ماڵدا دەم وچاوی بشوات، چۆلەکە پاساری لە حەوشەدا بجریوێنن، دەڵێن میوان بەرێوەیە.

3- ئەگەر ناولەپی دەستی راست بخورێت دەڵێن پارەمان بۆدێت، بەلاّم ئەگەر هینی دەستی چەپ بخورێت دەڵێن شەرێك بەرۆکمان دەگرێت.

4- ئەگەر باڵندەیەك بەسەر ماڵێکەوە بخوێنێت، دەڵێن دەنگوباسێکمان لەکەسێکی نزیکەوە پێدەگات.

5- جارێك پژمە نیشانەی (سەبرە) و لای هەندێك کەس دەبێتە هۆی دواخستنی سەفەرێك، یاخود پەشیمانبوونەوە لەکارێك، بەلاّم دووجار پژمە نیشانەی (جەختە) و رەواندنەوەی هەموو دوودڵییەکە بۆ ئەنجامدانی ئەو سەفەرە، یاخود ئەو کارە.

6- زۆربەی خەڵکی هەورامان لە چاوی پیس دەترسن و چاوپیسەکان بەخەلکی بێزراو و قێزەون لەقەڵەمدەدەن.

7- ئەگەر کچێکی مارەبڕاو دەسگیرانەکەی بمرێت دەڵێن سەرەخۆرە و سەربەگۆبەنە و خەڵکی تر بۆ داوای ناچن.

---

[1] (هانی هارۆڵد هانسن)- ژیانی ئافرەتی کورد- وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە (عەزیز گەردی).

8ٲ شەوان سەیری ئاوێنە ناکەن، دەڵێن خراپە و ئاوێنەکە شێتدەبێت.

9ٲ ئێواران درەنگ و شەوان گسکی ناو ماڵ نادەن و دەڵێن خراپە.

10ٲ زۆریان رۆژانی سێشەممە ریشیان ناتاشن و رۆژانی چوارشەممەش خۆیان ناشۆن.

11ٲ هەرکەسێك خواردنێك، یان میوەیەك بخوات کەسێکی تر لەلایا بێت بەشیدەدات، چونکە باوەڕی وایە ئەگەر بەشینەدات نەفسی ئەو کەسە دەێت بەمار و شەودێتەخەوی.

12ٲ ئەگەر کەسێك پاروو لەقورگیدا بگیرێت، وادەزانێت کەسێکی نزیکی لەغەریبیدا برسییەتی، یاخود کەسێك چاوی لێبووە ئەو خواردنەی هێناوەتە ماڵ و دڵی چۆتەسەری.

13ٲ لەکاتی مردنی کەسێکدا جلەکانی دەدەن بە هەژار و نەدار، ئەگەر کابرا دەوڵەمەند بێت و جلەکانی باش بن دەیاندەن بە مەلای گوند.

14ٲ لەکاتی هەر ناکۆکییەکی نێوانیاندا و بۆ کۆتاییهێنان بەو ناکۆکییە، زۆر رێز لەقسەی (شێخ، مەلا، ریشسپی)یان دەگرن.

15ٲ زیادەرۆیی ناکەنەسەر ماڵی مزگەوت و دەڵێن هەرکەس ماڵی مزگەوت بخوات وەك ئەوەیە قوزەڵقورت بخوات.

16ٲ دڵپیسی و بەدگومانی لەنێوانیاندا زۆرکەمە و هەر کەسێك دڵپیسبێت پێیدەڵێن (پەخمە).

17ٲ رەزیلی زۆر شورەییە لەلایان و هەرکەس رەزیل بێت دەڵێن (نانو دۆڵەی مژمارۆ= نانی تەشت دەژمێرێت).

18ٲ زۆر لەسوێندخواردن بە قورئانی پیرۆز دەترسن و ئەگەر کەسێك لەسەر هەقیش سوێندبخوات بە قورئان کەفارەتی سوێندەکەی دەدات.

19ٲ سەفەری رۆژانی جومعە بەچاك نازانن و ئەگەر زۆر پێویست نەبێت سەفەرناکەن.

20ٲ زۆرجار خەڵکانی دەستڕۆیشتوو لەکاتی خەتەنەکردنی کوڕەکانیاندا، خەتەنەی منداڵانی خێزانە دەستنەڕۆیشتووەکان دەکەن.

21ٲ ئەگەر کەسێك تووشی ژانەسك ببێت، دەڵێن بایەکێك بیشێلێت کە نۆبەرەی دایکی بێت، هەروەها ئەگەر کەسێك دەماری پشتی بپلێت، دەڵێن با ژنێکی دووشووکەر بەقاچ پشتی بشێلێت.





22ٲ ناهێڵن (تازەبووك، ژنێك کەتازە منداڵی بووبێت) ئێواران ئاوی گەرم برژێنێت.

23ٲ ژمارەی (13) لەلایان شوومە و لەکاتی ژمارەدا ناوینـاهێنن، بـەڵکو زۆرجـار دەڵـێن (زیادبی محەممەدی).

24ٲ منداڵی ساوا نابەنە لای ئەو ژنانەی تازە منداڵیانبووە و دەڵێن بەبۆندەکەوێت.

25ٲ کاتێك بـووك دەهێننـە ماڵـەوە منـداڵی نێرینـە دەخەنـە باوەشـییەوە، ئـەوەش لـەو باوەڕەوە کەزوو منداڵی ببێت.

26ٲ ئەگەر لەکاتی گواستنەوەی بووکدا بەفر و باران بباریێت، دەڵـێن ئـەو بووکـە بنکـڕی خواردووە.

27ٲ هەندێك گیاندرا و باڵندە بەشووم دەزانن لەوانە: (کەروێشك، کۆتر، کونەبەبوو).

28ٲ زۆرجار راستی بڕی داهـات و بـەروبوومیان لای کـەس ئاشـکراناکەن و دەڵـێن دەبـین بەچاوەوە.

29ٲ ئەگەر کەسێك لەخەودا لەگەڵ مردوودا بڕوات، یـاخود مردووەکـە شـتی لێبـسێنێت، ترسی ئەوەی لێدەنیشێت کە دەمرێت، بـەڵام ئەگـەر مردووەکـە شـتێکی بـداتێ پێیوایـە تووشـی خێرێك دەبێت

30ٲ رۆژانـــی چوارشـــەمە ســـەردانی مـــەزاری (پیرەکـــان، ســـەیدەکان، شـــێخەکان، پیـــاوە دینییەکان) دەکەن، ئەم خووەش لەبنەڕەتدا خوویەکی دینـی زەردەشـتییەکانە، چـونکە رۆژی چوارشەممە لای ئەوان پیرۆزە هەروەك چۆن رۆژی هەینی لای موسڵمانان پیرۆزە.

31ٲ ئەو ژنەی ژنی دێت بەسەردا دەچێتە سەربان و مەنجەڵێکی رەش دەمەونخونـدەکات و لەســەری دادەنیــشێت، گوایــا بــەو کــردارەی ژنــی تــازە لای مێردەکــەی رەشــدەکات و خــۆی شیریندەکات.

32ٲ ئـەو ژنـەی ژنـی دێـت بەسـەردا کـە بـووکی تـازە دەگاتـە مـاڵ، ژنـی یەکـەم بـەناوی بەخێرهاتنــەوە باوەشــدەکات بەملیــدا و لەوکاتــەدا بەهــەموو هێزێکییــەوە قاچـیدەخاتە ســەر پەنجەگەورەی پێی بووکەکە، گوایە بەوە دەیترسێنێت و بەسەریدا زاڵدەبێت.

33ٲ دەڵێن ئەوژنەی سکنەکات منداڵدانی پێچپیخواردووە، بۆیە ئەگـەر بـچێتە لای ژنێکـی شارەزا و تیرۆکبگێڕێت بەسـەر پـشتیدا ئـیتر سـکدەکات، لـەوباوەڕەدان ئـەو تیرۆکگێڕانـە دەبێـت بەهۆی راستکردنەوەی منداڵدانی.

34 چەند داب و نەریتێك هەن لە ناوچەی هەوراماندا کاریگەری دیینە کۆنەکانیان لەسەرە، وەك دیینی زەردەشتی و میترائی ئەمانەش ژمارەیەکیانن: (ئاگری ئاگردان پێویستە بەپاکی پارێزگاریبکرێت[سملحلخ]، کانیاو نابێت پیسبکرێت و ڕێگا نابێت شتی تێفرێبدرێت، درەختی بەردار نابێت ببڕرێت، یان بنەکەی پیسبکرێت، لەهەر جێگایەکدا مردوو بشۆرێت پێویستە هەتاکو حەوت شەو لە شوێنەکەیدا ئاگری تێدا بکرێتەوە، یاخود چرا دابگیرسێنرێت[شملحلخ]، خۆراکێك ئەگەر شەو بهێڵرێتەوە بۆ بەیانی بە پشکۆی ئاگر مۆربنرێت).

# ڕێوڕەسمی ژنهێنان لەهەوراماندا

ژنهێنان و پێکەوەنانی خێزان زامنی بەردەوامبوونی ژیانی مرۆڤایەتییە و پیرۆزییەکی گەورەی لای دیینەکان و کولتوورە جیاوازەکان هەیە، ئەم ڕێوڕەسمە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گۆڕانکاری بەسەرداديێت و شێوازە ناوچەییەکانی گومدەکات ولە شێوازێکی گشتگیرنزیکدەبێتەوە، لەم بابەتەدا کەتەرخانە بۆ ڕێوڕەسمی ژنهێنان لە هەوراماندا لەسەر شێوازە کۆنەکەی دەدوێین، لەبەر ئەوەی لەلایەکەوە شێوازێکی تایبەتە بە ناوچەکە و لەلایەکی ترەوە تا ئێستاش لەهەندێك شوێنی هەوراماندا پەیڕەودەکرێت.

لەسەر بنەمای ئەم شێوازە ژنهێنان بەچەند کارێکدا پێدەپەڕێت بەم ناوانە: (رامالّی= ڕێخۆشکردن، هیجبی= خوازبێنی، شەکراوخواردنەوە، مارەبڕین، گواستنەوە) و سەرەتا بەڕێخۆشکردن دەستپێدەکات، بەوەی ژنێکی سەرە لە خزمانی کوڕ، یان کەسێکی خۆشەویست لەهەردوولاوە، پاش ئەوەی لەلایەن خێزانی کوڕەوە ڕادەسپێردرێت لەرێی (باخ، کانی، ئاش)، یاخود بەسەردانێکی ئاسایی بۆ ماڵی باوکی کچ، قسەیەك دەدات بە گوێی دایکی کچەدا بەوەی کوڕی فلاّنەکەس کوڕێکی چاکە و حەزبەخزمایەتیتان دەکەن، دایکی کچەش ئەگەر خۆی کارەکەی پێباشبێت بەرروویەکی خۆشەوە وەلاّمیدەداتەوە و قسە لەگەڵ کچەکەیدادەکات و

[سملحلخ] بێجگە لەوانەی لەسەر دیینەکانی میترترائی و زەردەشتی بوون، لای زۆرێك لە خەڵکانی تریش ئاگر و ئاگردان بە پیرۆز دانراون، هەر بۆنموونە لەناو مەغۆلەکاندا هەر کەسێك میزیکردبێتە ناو ئاگرەوە حوکمی کوشتنیدراوە.

[شملحلخ] ئەو ماوەیە لە هەندێك شوێندا (3) شەوە بووە.





زەمینەی هاتنی خوازبێنیکار بۆ لای مێردەکەی سازدەدات، بە پێچەوانەشەوە بەسارداییەکەوە قسەکە بەگوێی مێردەکەیدادەدات، ئینجا دایکی کچە خۆی، یان لە ڕێی ژنێکی ترەوە وەلامی ڕێخۆشکەرەکە دەداتەوە، بەوەی کارەکەیان پێباشە یان نا، ئینجا کاری (هیجبیکردن= خوازبێنیکردن) دێتە پێشەوە، ئەوانەی بەکاری خوازبێنی رادەسپێردرێن خەڵکی دیار و خۆشەویستی هەردوولان، (باوك، مام، برای گەورە)ی کوڕەشیان لەناودایە و زیاتریش بەشەودا خوازبێنیدەکەن، کاتێك خوازبێنیکەران دەچن بۆ ماڵی باوکی کچ زۆر ڕێزیانلێدەگیرێت و هەرپاش کەمێك دانیشتن، شەوچەرەیەك دەخۆن و بەدەم قسەکردنەوە مەرامەکەی خۆشیان دەدرکێنن، ئەگەر ماڵی کچە ڕەزامەنییان هەبوو، ئەوا یەکێك، یان زیاتر لە خزمانی کوڕە دەستی سەرۆك خێزانی کچەکە ماچدەکەن و پاش ماوەیەك بەخۆشییەوە هەڵدەسن، کاتی شەکراوخواردنەوەش هەر شەوی خوازبێنیکردن، یان کەمێك دواتر بەپێی ڕێککەوتنی هەردوولا دیاریدەکرێت و زۆرجار هەرلەگەڵ شەکراوخواردنەوەدا مارەبڕینیش تەواودەکرێت، پاش شەکرا و خواردنەوە و مارەبڕین بەینا و بەین کوڕ لەگەڵ کەسوکاریدا هاتوچۆی ماڵی کچ دەکات.

هەرچەندە ئێمە لە باسکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکی هەورامانـدا، قسەمان لەسەر ئەوەکردووە کە تێڕوانیتی خەڵکی هەورامان بۆ ژن تێڕوانینێکی تایبەتە و هەرگیز ژن وەك کالا سەیرنەکراوە، لێرەدا دەڵێین بنەمای ژنخواستن لەهەورامانـدا لەسەر وەرگرتنی شیربایی، ژن بەژن، گەورە بەبچووك...هتد) دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر ڕەزامەندی هەردوو خێزانی (کوڕ و کچ) و لەسەر پیکەوەنانی خێزانێکی ئاسوودە دامەزراوە، هەر بۆیە شتە مادییەکان لەلایان زۆر بە هەندوەرناگیرێن، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئەو جۆرە شتانە وەك: (خشڵ، جل وبەرگ، بڕێك پارە کەپێیدەوترێت ماڵ)نین، بەلام ئەمانە زیاتر پەیوەستن بەباری ئابووری خێزانی کوڕە و بەدەگمەن هەڵدەکەوێت کارەکە پەکبخەن.

پاش تەواوبوونی ئەو ماوەی کوڕ و کچ بەدەسگیرانی، یان مارەبڕاوی دەمێننەوە، تا کاتی گواستنەوەی بووك بۆماڵی زاوا دێتە پێشەوە، ڕۆژێك پێش گواستنەوە ماڵی زاوا کەرەسەی خواردەمەنی وەك: (گۆشت، برنج، ڕۆن، شیرینی، سەوزە و میوە...هتد) و جلو بەرگی ئالۆ والای بووکێنی، خەنە، بۆنی خۆش، بۆ ماڵی بووك دەنێرن، چەند ژنێکیش کە یەکێکیان، یان دووانیان پێیاندەوترێت (پاوێو= بەربووك) دەچن بووکەکە دەشۆن و دەست و پێی دەگرنە خەنە و دەیرازێننەوە.

بۆ بەیانییەکەی لە ماڵی بووك و زاوا چێشت لێدەنرێت و ئەوانەی لە ماڵی بووك کۆبوونەتەوە لەوێ ناندەخۆن، خەڵك بەپێی توانا و حەزی خۆیان و دوور وونزیکی شوێنەکە بەسواری، یان پیادە بەدوای بووکدا دەچن، هەر کە لە ماڵی زاواوە بەرێدەکەون، دەنگخۆشەکانیان دەست بە گۆرانیچڕین دەکەن، کە دەگەنە بەردەم ماڵی بووك بەچەپڵەرێزان و گۆرانیچڕین ئەو ناوە دەهەژێنن، بەزمەکانی تایبەت بەگواستنەوەی بووك دوو بەزمن بە ناوی (وەی وەی باڵابەرز، بادە و بادە)ن، بەزمی (بادە و بادە) لە کاتی ڕۆیشتن بۆ هێنانی بووك لە لایەن گۆرانیبێژەکانەوە دەچڕرێت هەتا گەیشتن بە ماڵی بووك، پاشان ئیتر بەزمی (وەی وەی باڵابەرز) دەستپێدەکات هەتا گەیاندنی بووك بە ماڵی زاوا.

پێویستە ئەوە بڵێین کاتێك بووك لە ماڵی باوکی دەهێنرێتەدەرەوە، ئامادەبووان ئەملاو ئەولای دەگرن،، ئینجا دووکەس پیاو، یان ژن بەپێی نەریتی شوێنەکە قۆڵدەکەن بەقۆڵیدا و بەرەو ماڵی زاوا دەکەونەڕێ، بەپێی دوورونزیکی نێوان هەردوو ماڵیش شێوازی گواستنەوەی بە سواری، یان بە پێ دەستنیشاندەکرێت، هەر بە گەیشتنیان بۆ ماڵی زازا، لەبەردەم ماڵەکەدا زاوا خۆی، یان باوکی بووکەکە بەسەر وەلاخەکەوە دادەبەزێنن و بەپێی توانا شتێکی پێشکەشدەکەن.

ئینجا ئامادەبووانی زەماوەند هەموویان لەماڵی زاوا ناندەخۆن و پاشان کۆڕی هەڵپەڕکێ و ڕەشبەڵەك گەرمدەکرێت، زۆربەی ئامادەبووان لەسەر ئاوازی (گۆرانی چەپڵەرێزان، شمشاڵ، زوڕنا و دەهۆڵ) ریز ریز هەڵدەپەڕن، کاتی وا هەیە زەماوەندگێڕان چەند ڕۆژێك دەخایەنێت، زۆر کەمیش ڕێکدەکەوێت کەسێك لە دانیشوانی ئەو شوێنە لە زەماوەندەکە دابڕاوبێت، چونکە ڕەفتارێکی لەو چەشنە بەباش لەسەری ناشکێتەوە و دەبێتە مایەی سەرزەنشتکردنی.

هەمان ڕۆژی گواستنەوەی بووك بۆ شەوەکەی لە ماڵی زاوا هەڵوایەکی بە تام دروستدەکرێت، بێجگە لەوەی بووك و زاوا لێیدەخۆن، بەشی کوڕی بێژن و کچی شوونەکردووشی لێدەدەن، لە وبڕوایەوە کە ئەوانیش بەختیانبەربێت و خێزان پێکەوە بنێن، بۆ ڕۆژی دوایی (پێخەسوو) پەرۆی کچێنی بووك بۆ ماڵی باووکی دەباتەوە و دەیداتە دەست دایکی، یاخود خوشکی گەورەی، زۆرجا ئەو پەڕۆیە دەخرێتە ناو ئەو سەرینەی بووك و زاوا دەیخەنە ژێرسەریان، گوایا بەوە تەمەنی هاوسەرێتییان درێژدەبێت و بەختەوەردەبن،





**هەرهەمان رۆژ ژنانی خزم و دەرودراوسێ بۆ مەبەستی پیرۆزبایی دەچنە لای بووك و دیاریش لەگەڵ خۆیاندەبەن، پاش چەند رۆژێك لەگواستنەوەی بووك کەزۆرجار هەفتەیەك دەخایەنێت ماڵی بووك دێن بۆ ماڵی زاوا و پاش شەونشینی بووك لەگەڵ خۆیان دەبەنەوە، چەند رۆژێك لەماڵ باوکی دەمێنێتەوە و ئەو ماوەیەش زیاتر دوور و نزیکی ماڵی هەردوولا لەیەکترەوە دیاریدەکات، ئینجا ماڵی زاوا دێن بەشوێنیدا و لەگەڵ خۆیان دەیبەنەوە، ئەم هاتنەی ماڵی زاوا هەمیشە زاوای تێدایە.**

**بێجگە لەمانەی باسمانکردن زووتر چەند هەڵسوکەوتێکی ترهەبوون کە لەگواستنەوەی بووکی هەورامانـدا پەیڕەودەکران و بەڵام ئێستا ئەو شتانە زۆرکەمبوونەتەوە و لەهەندێك شوێندا نەماون، ئەو هەڵسوکەوتانەش بەم شێوەیە بوون:**

**1ـ پەشتە بەرانە= پشت دەرگانە: کاتێك خەڵکان دەچوون بەدوای بووکدا ژنێك دەرگای ژووری بووکێی لێدەگرتن، یەکێك لەکەسوکاری زاواش دیارییەکی دەدا بەو ژنە ئینجا رێگەیدەدان بچنە ژووەرەوە و بەو پارەش دەوترا (پەشتەبەرانە).**

**2ـ پالاڵ وەژانە= پێڵاوداکەندنانە: برێك پارە لەماڵ بووکەوە دەخرایە ناو پێڵاوەکانییەوە، کاتێك دەبرایە ماڵ زاوا ژنێك پێڵاوەکەی بۆدادەکەند و پارەکەی بۆ خۆی دەبرد، بەو پارەیە پالاوەژانە دەوترا.**

**3ـ زەماخوانە= زاواخوان: پێش ئەوەی بۆ یەکەمجار بووك بەرە و باوانبکرایەتەوە، چەند رۆژ لەماڵی زاوا بوایە، رۆژانە لەماڵی باوکییەوە خواردن دەهات بۆ ماڵی خەزووری و بەو خواردنە دەوترا (زەماخوانە).**

# خۆڕازاندنەوە لە هەورامانـدا

**ئاشکرایە خۆڕازاندنەوە هەر لەسەرەتای ئاشنابوونی مرۆڤ بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە سەریهەڵداوە و هەموو قۆناخێکیش جۆرێك لەخۆڕازاندنەوەی هەبووە، کۆمەڵەکان لە رووی خۆڕازاندنەوە جیاواز بوون، بە مانایەکی تر هەموو کۆمەڵێك لەم بوارەدا تایبەتمەندیی خۆی هەبووە و هەوڵیشیداوە ئەو تایبەتمەندییانە بپارێزێت، خۆڕازاندنەوە هەر تایبەت نەبووە بە رەگەزێك، یان بە ئاستێکی دیاریکراوی تەمەن، بەڵکو نێرومێ بە پێی ساڵەکانی تەمەنیان تێیدا بەشداربوون و بۆ خۆڕازاندنەوەشیان کەرەسە و خشڵی تایبەتیان هەبووە.**

هەر لە سەردەمە دێرینەکانەوە هەتاکو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم لەلای کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان و ئێستەشی لەگەڵدابێت لای زۆر لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکان، چەك بەشێکە لە پێداویستییەکانی خۆڕازاندنەوە، ئەمە بێجگە لە کەرەسەکانی تر کە بە(خشڵ) ناویاندەبرێت، ئیتر ئەو خشڵانە هەرجۆرێك بووبن و لەهەر ماددەیەك دروستکرابن لە خۆڕازاندنەوەدا بایەخی خۆیان هەبووە و هەیە.

سەبارەت بە کۆمەڵی کوردەواری ئێمەشەوە لە گشت ناوچەکانی کوردستاندا بایەخێکی زۆر بە خۆڕازاندنەوە دەدرێت، لای هەندێك کەس بەبەشێك لە کەسێتی لە قەڵەمدەدرێت و هەندێکی تریش بە هەوڵێك بۆ کامڵبوونی کەسێتی دەزانن.

(خەڵکی هەورامان) وەك بەشێکی دیار لە پێکهاتەی کۆمەڵی کوردەواری هەمیشە بایەخیان بە خۆڕازاندنەوە داوە، خۆڕازاندنەوەش هەرلە بایەخدان بە (پۆشاك، پاپۆش)ەوە دەستییپێکردووە، هەتاکو دابینکردنی ئەو کەرەستانەی بەکاریان هێناون، چ ئەوانەیان خۆیان دروسیانکردبن، یاخود ئەوانەیان لە دەرەوەی ناوچەکەی خۆیانەوە گەیشتبنە دەستیان، هەر لەم بوارەدا زۆرجار گوتراوە (خەڵکی هەورامان) تەرپۆشن.

ئەگەر چەند ساڵێك میلی کاتژمێری تەمەنمان بگەڕێنینە دواوە، بەتایبەت ئەوانەمان کە لە ساڵەکانی پەنجاکانی سەدەی بیستەم وپێشتر هاتووینەتە دونیا، بیر لە خشڵ و بابەتەکانی خۆڕازاندنەوەی ئەو سەردەمە بکەینەوە، دەبینین زۆر جیاوازیان لەگەڵ ئەوانەی ئێستادا هەیە، جۆری جلوبەرگ وەك هینی ئێستا نەبووە، هەندێك جلوبەرگ کە لەو رۆژانەدا زۆر باوبوون ئێستا، یان هەر نەماوون، یاخود زۆر کەمبونەتەوە بۆ نموونە: (سەرەپێچ، پۆشین، کۆڵوانە، لەچك، سوخمە، کەوای بەتانەدار، سەڵتەی بەتانەدار، بەروانکە...هتد)، ئەو ژن و کچانەی کە تا ئێستاش لەناو ماڵەکانیاندا لە دەرەوەی ماڵیشدا هەر جلی کوردی لەبەر دەکەن، ئەمانەی کە ناومان هێنان بەکارناهێنن، بە هەمانشێوە سەبارەت بە ئەو کوڕ و پیاوانەشەوە کە تا ئێستاش جلی کوردی لەبەر دەکەن، هەندێك پۆشاك کە پێشتر بەکارهاتوون، وەك: (فەقیانە، سوخمە و کراسی بێیەخە، چۆغەی بەتانەدار) بەکاریانناهێنن.

با بێینە سەر ئەو ئامرازانەی کە پێیاندەوترێ (خشڵ)، دیارە خشڵەکان جۆراو جۆربوون و زۆربەی ئەندامەکانی لەشیان گرتۆتەوە وەك: (سەر، چاو، گوێ، لووت، پەنجە، دەست،





مەچەك، قاچ...هتد)، پێشتر ژنان و کچانی (هەورامان) سەریان رووتنەکردووە و کڵاویان بەسەرەوە بووە، کچانی بچووك هەتا گەیشتوونەتە کاتی هەرزەکاری و شووکردن کەمتر کڵاویانکردۆتەسەر و هەر سەرپۆشیان بەکارهێناوە، بەڵام پاش شووکردن ئیتر پێویستیکردووە کڵاوبکەنە سەریان، کڵاو یەکێکبووە لەو پێداویستییانەی لە کاتی کچ بەشووداندا لەماڵی زاوا داواکراوە، کڵاوەکەش دووجۆری هەبووە بەم شێوەیە:

1ـ فێس: زۆربەی کات فێس (پڕچکە)ی پێوە بووە، پڕچکەش دوو جۆربووە، یەکەمیان (پڕچکەی زەنگیانە) کە زیاتر بە زەنگیانەی زەرد هۆنراوەتەوە، دووەمیان (پڕچکەی تەلاّیی)ن، بۆ ئەمجۆرەیان لەبری زەنگیانەکان لەهۆنینەوەیدا (تەلاّی بچوك) بەکارهێنراون.

2ـ کڵاوزێر=کڵاّوزەڕ: ئەم جۆرەیان بێجگە لە (پڕچکەی تەلاّیین) پێویستیکردووە جۆرە سکەیەکیشی پێوەلکێنرابێت کە پێیوتراوە (پارەی سپی)، ئەویش چەند جۆرێکی هەبووە وەك: (نیوقەران، یەکقەرانی، دووقەرانی، پێنجقەرانی، تاك، ئەشرەفی ... هتد)، سەبارەت بە ئەو خێزانانەش کە دەستڕۆشتوو بوون، ئاڵتوونیان لکاندووە بە کڵاوزێڕەکەوە وەك: (چارەکەلیرە، نیولیرە، لیرە، دوولیرەیی، پێنجلیرەیی)، پێنجلیرەییش زیاتر کراوە بە (قوڵپ)ی کڵاوەکە.

بێجگە لەکڵاو (ملوانکە)ش کەرەسەیەکی تری خۆڕازاندنەوە بووە، ملوانکە چەندجۆرێکیان هەبوون، وەك: (ملوانکەی ئاڵتوون، ملوانکەی زیو، ملوانکەی کارەبا، ملوانکەی شەوە، ملوانەکەی خونچەی گوڵەباخ) کە لە هەوراماندا پێیاندەوترێت (قووتیلە ولی)، هەروەها هەندێکجارجۆرە خشڵێکی تر کەپێیوتراوە (دڵڕوبا) کراوە بە ملوانکە و خراوەتە ناو (مورو، زیو، ئاڵتوون).

بۆ خۆڕازاندنەوە (بازن) بەکار هێنراون و چەندجۆرێکیان هەبووە وەك: (بازنی شوشە، بازنی مس، بازنی زیو، بازنی ئاڵتوون)، (گوارە و ئەنگوستیلە و لوتەوانە)ش لە خۆڕازاندنەوەدا بایەخی خۆیان هەبووە.

لای هەورامییەکان (هەیاسە) کەرەسەیەکی بەنرخی خۆڕازاندنەوە بووە، زیاتر لە زیو دروستکراوە و ژنان بەستوویانەتە پشتیان، هەموو ژنێك نەیتوانیوە بە ئاسانی ببێتە خاوەنی هەیاسە.

(گۆبەرۆك، حێلومێخەك، لولە و زنجیر)یش لەو خشڵە گەورانە بوون کەمژن بوون بە خاوەنیان، بەتایبەت ئەگەر لە ئاڵتوون درووستکرابن، (گەردانەی زیوین، گەردانەی جەوهەردار)یش دوو جۆری تری (خشڵ) بوون و لە خۆڕازاندنەوەدا بایەخی خۆیان هەبووە،

پاشتر (گەردانەی ئاڵتوون) هاتۆتە ناوخشڵەکانی خۆڕازاندنەوە، هەروەها (قاپقورئانی زیوین و قاپقورئانی ئاڵتون)یش دوو کەرەسەی تری خۆڕازاندنەوە بوون.

هەر لەبواری خۆڕازاندنەوە، ژنان وکەمتر کچان (خەنە، وسمە)یان بەکارهێناوە، بۆ خەنەو وسمەگرتن، سەرەتا (خەنە) و پاشان (وسمە)یان گرتۆتە سەریان، (خەنە) و (وسمە) شوێنی بۆیاخی ئێستایان گرتووەتەوە، بێجگە لە سەر (خەنە) گیراوەتە دەست و قاچ و نینۆکیشی پێڕەنگکراوە، هەندێکجار (پیاو، کوڕ)یش خەنەیانگرتۆتە سەریان و وتراوە بۆ لابردنی سەرئێشە بەسوودە.

(کل) بۆ چاوڕەشتن بەکارهاتووە، ژنان (میل و کلدان)یان هەڵگرتووە و زۆربەی کات لە گیرفانیاندا بووە، وەك پێداویستییەکی تری خۆڕازاندنەوە خاڵکوتان لەشوێنی جیاجیای لەشدا وەك: (چەناگە، گوپ، سنگ، دەست، قاچ، مەچەك، پووز)، ئەم خووە لەخۆڕازاندنەوەدا جیاواز لە ناوچەکانی تری کوردستان لە هەوراماندا بە ئاستێکی کەم پەیڕەوکراوە.

سەبارەت بە پیاو و کوڕیشەوە کەرەسەی تایبەتیان بۆ خۆڕازاندنەوە هەبووە، وەك پێشتر ئاماژەمانپێدا (چەك) یەکێکبووە لەو کەرەستانە، بەتایبەت (خەنجەر، دەمانچە، فیشەکلۆغ، تفەنگ)، چەك دەست هەمووکەسێك نەکەوتووە، زیاتر بەدەست ئەو کەسانەوە بووە کە باش بەکاریانهێناوە و توانیویانە داکۆکیپێبکەن لەسەروماڵی خۆیان و خەڵکانی ناوچەکەیان.

(تەسبیح) بایەخێکی تایبەتی بووە بۆ خۆڕازاندنەوە، زۆرجار تەسبیحی (کارەبا، سندس، زەرد، شەوە، شووشەیی، ئەبڵەق ... هتد) کراون بەقەد خەنجەرەوە، یان گیراون بەدەستەوە و یاریانپێکراوە، (دەستەسڕی ئاوریشم) کەرەستەیەکی تری خۆڕازاندنەوە بووە، هەروەها پیاوان (ئەنگوستیلەی زیو، ئەنگوستیلەی ئاڵتون، ئەنگوستیلەی مۆرخاندار...هتد)یان بۆ خۆڕازاندنەوە بەکارهێناوە.

بۆ رازاندنەوەی منداڵ جارجار شتی زۆر سادەوساکار بەکارهاتوون وەك: (مووروو، قۆپچە، زەنگیانە، کوێچکەماسی، هێلکە شەیتانۆکە= گوشگەڵۆ).

هەر لە بواری خۆڕازاندنەوە (بۆنی خۆش) بایەخی خۆی هەبووە، سەرچاوەکانی بۆنیش زیاتر ئەمانە بوون: (گوڵاو، میسك)کە هەردوو رەگەز بەکاریانهێناون، بەلام (مێخەك، سمڵ، حەتحەتۆکە)، تایبەتبوون بەژنان و کچانەوە.

پێدەچێ خوێنەرێك بڵێت لەم ڕۆژەدا کە چەرخی ئەنتەرنێتە بایەخی بابەتێکی لەم چەشنە دەبێ چیبێت؟ بۆ وەڵامی پرسیارێکی لەم جۆرە دەڵێین: ئەم شتانەی باسمانکردن ئێستا لە هەندێك لە مۆزەخانەکان نمونەیان پارێزراوە، چونکە بەشێکن لە کولتووری نەتەوەکەمان، بۆیە پێویستە ئێمەش ئەگەر هەرچەندە کەمیش بێت زانیاریمان دەربارەیان هەبێت، بەتایبەت بۆ ئەو وەچانەی کە ئەم کەرەستە و خشڵانەیان نەدیوە چونکە زۆربەیان چوونەتە دووتوێی یادەوەرییەوە.

## ڕێوڕەسمی پرسە

مردن ئەنجامی حەتمی هەموو گیاندارێکە و دوا قۆناغی گەشەکردنی بایەلۆژییەتی، لەدەستدانی ئازیزان و کۆتایهاتن بەژیانییان هەر لەدێر زەمانەوە بووە بەهۆی دلگرانی و ماتەمی، لەناو زۆربەی کۆمەڵگەکاندا ڕێوڕەسمی بەڕێکردنی مردوو بۆ دوامەنزلگەی و پرسەگێڕان بۆی بایەخی خۆیان هەیە، کۆمەڵگەی کوردەواریش وەك نەریتێکی دیینی و کۆمەلآیەتی پابەندبوونێکی پتەوی بەم ڕێوڕەسمەوە هەیە، ناوچەی هەورامان وەك پێکهاتەیەکی کۆمەڵی کوردەواری زووتر تا ئاستی جۆرێك لەزیادەڕۆیی بایەخیانداوە بەم ڕێوڕەسمە، لە ئێستاشدا هەر بایەخیپێدەدەن، لەهەر شوێنێکدا کەسێك دەمرێت خەڵکی ئەو شوێنە بەشێوەیەکی گشتی بەشداری خەم و ماتەمی خاوەن مردووەکە دەکەن، بەوەی ئەرکی بەخاکسپاردن و بەشداریکردن لەپرسەگێڕان دەگرنە ئەستۆ، هەر لەگەڵ گیاندەرچوونی مردووەکەدا کۆمەڵێك خەڵك خۆویستانە دەستدەدەنە (پاچ و خاکەناز) و پێداویستی تری گۆڕهەڵکەندن و بەرەو گۆڕستان دەکەونەڕێ، هەندێکیش تەرمی مردووەکە هەڵدەگرن و بەرە و مزگەوت دەیبەن بەمەبەستی شتنی، هەتاکو دەشۆررێت زۆربەیان لەمزگەوت کۆدەبنەوە، پاشان بەرە و گۆڕستان بەڕێدەکەون و بەخاکیدەسپێرن، پاش بەخاکسپاردن مەلا تەڵقینیدەدات و ئامادەبووانیش فاتحەی بۆدەخوێنن، هەموویان لەخوادەپارێنەوە لێیخۆشبێت و هاوکات گەردنی ئازاددەکەن، ڕێوڕەسمی پرسەگێڕان تاچەند ساڵێك لەمەو بەر بریتیبوو لەوەی کەسوکاری مردووەکە ماوەی سێ ڕۆژی لەسەریەك لەو شوێنانەی مزگەوتیان تێدا بوو لەمزگەوت دادەنیشتن، ئەو شوێنانەش مزگەوتیان تێدانەبوو لەماڵەوە دادەنیشتن و هەموو

خـەڵکی ئـەو شـوێنەش زۆربـەی ئـەو ماوەیـە لەگەڵیانـدابوون، چـەند ڕۆژێکـیش لەماڵـەوە دادەنیـشتن، بـەڵام لـەڕۆژی چـوارەمدا چـەند کەسـێکی نزیکـی مردووەکـە ڕیـشیاندەتاشی و بـۆ ماوەیەوك دەچوونە ناو (بازار، چایخانە)، یـان هـەر شـوێنێك کەخەڵکەکەی تێـدا کۆدەبوویـەوە، لەوێ خۆیان پیشانی خەڵك دەدا بۆ ئەوەی ئەوانیش ڕیـشیانبتاشن، لەهـەر شوێنێکیـشدا (رادیـۆ، تەسـجیل) هەبوایـە بەدەسـتی خۆیـان دەیـانکردەوە، چـونکە لـە ڕۆژانـی پرسـەکەدا کـەس ئـەو شتانەی نەدەکردەوە، سـەبارەت ژنانیـشەوە لـە ڕۆژانـی پرسـەکەدا کەرەسێڵیاندەبەسـت و لەگـەڵ خاوەن مردوودا و لەسەر جلوبەرگەکەی کۆڕی شیوەن و گریانیان گەرمدەکرد، هەر ژنێك لـەماڵ خۆیەوە لەگەڵ خۆیدا بڕێك ئازووخەی لە: (برنـج، شەکر، ڕۆن، گەنم، ئارد)دەبرد و هەنـدێکجار تەنانەت نانیش دەبرا، بە تایبەت بۆ ئەو خاوەن مردووانـەی هـەژار و کەمدەسـتبوون، هەنـدێك لـە پیـاوە دەسترۆیـشتووەکانیش، یـاخود کەسـوکاری خـاوەن پرسـە بەشـدارییان لـە خـەرجی پرسەکەدا دەکـرد، بـەوەش زۆربـەی خـەرجی پرسـەکە لەسـەر مـاڵی مردووەکـە لادەچـوو، ڕۆژی چوارەم ژنان بەرەو سەرقەبران دەکەوتنە ڕێی و کەسێك لەگەڵیاندەچوو بـۆ ئـەوەی گۆڕەکـەیان پیـشانبدات، لـەو ڕۆژەدا مـاڵی خـاوەن مردووەکـە خۆیـان، یـان کەسـوکار و دەرودراوسـێیان (گێتەمەژگێ= کولێرە بەکاکڵە، کولێرە چەورە)یـان دەبـرد و بەسـەر ژنەکانـدا دەیانبەخشییەوە، مـاوەی چـەند ڕۆژێـك ڕۆژانـە قورئـانخوێن دەچـوو لەسـەر گۆڕەکـە قورئـانی دەخوێنـد و ئـەو ماوەیەش لە سێ ڕۆژی یەکەمـە وە هـەتاکو هەفتەیـەك، یـان چـل ڕۆژی دەخایانـد، بـۆ هەنـدێك مردووش ساڵێك هـەموو ڕۆژێکـی هـەینی قورئـان لەسـەریان دەخـوێنرا، خـەیرکردن بـۆ مـردوو چەند جۆرێکی هەبوو کە هەر لەکاتی شتنییەوە دەستپێدەکرد، ئەو خێرکردنەش، یـان لەسـەر بنەمای وەسیەتی مردووەکە خۆی بوو، یاخود بەپێی حەزی خاوەن پرسـەکە بـوو، خێرەکـانیش بریتیبوون لە (ئیسقات= بەشـکردنەوەی بڕێـك پـارە پـێش بـەرێکردنی مـردوو بـۆ سـەرقەبران، بەشکردنەوەی کـولێرە چـەورە لەسـەر قـەبران، جومعانـە ئـەوەش بەبەخـشینەوەی هـەر شـتێك لەبەر دەستیاندا بێت لە ئێوارەی هەینیدا)، هەندێك لەو مردووانەش کە دەسترۆیـشتوو بـوون و حەجیاننەکردووە، خاوەن مردوو یەکێك دەنێرن بۆ حەج هەتاکو حەجی بۆبکات.

ژنان و جارجاریش پیاوان لە ناو خێزانی مردوو، یاخود کەسە نزیکەکانیدا جلی ڕەش و شـینیان لەبـەردەکرد و هەنـدێکجار هـەتا سـاڵێك هـەر ئـەو جـۆرە جلانـەیان لەبـەردەکرد و

بەتایبەت ژنەکان لەهەموو سیمایەکی ئارایشتکردن خۆیان دووردەخستەوە، هەموو رۆژێکی هەینیش دەچوون بۆ سەرقەبران و کۆڕی شیوەنیان تازەدەکردەوە، ئەمە بێجگە لەوەی لە ناومالّدا (دایك، خوشك، هاوسەر)ی مردوو بەشێوەیەکی رۆژانە، بەدەم (لاواندنی منداڵ، یاخود لەبەر خۆیانەوە) چینێك شیوەنیاندەکرد.

پێویستە لەباسکردنی رێورەسمی پرسەی هەورامانـدا ئاوڕێکی خێرا لە (ئالآی کۆتەڵ) بدەینەوە، ئەم رێورەسمە لەگەڵ ئەوەدا دەربڕینی ماتەمی و دلگرانی بووە بۆ لەدەستدانی ئازیزان، هاوکات کارێکی هونەری بووە و چەند وردەکارییەکی تێدابووە، (ئالآی کۆتەڵ) زیاتر بۆ خەلّکانی حوکمڕان و دەسەلآتدار سازدراوە، لەم بوارەدا زۆربەی خەلّکی هەورامان باسی ئەو (ئالآی کۆتەل)ەیان بیستووە کە بۆ (جافرسان و کەریم سان) گێڕدراون.

(جافرسـان) هەرچەندە لە هەڵەبجە کۆچی دواییکردووە و لە عەبابەیلیّ بەخاکسپێردراوە، کەچی کەسوکاری لە هەورامانی ئەودیو (ئالآی کۆتەڵ)یان بۆگێڕاوە، هەروەها کاتێك (کەریم سان) کۆچی دواییکردووە گەورەترین ئالآی کۆتەڵی بۆگێردراوە و ماوەی پەنجا رۆژ بەم شێوەیە بەردەوامبووە:

کۆمەڵی پیاوان بە شەش ریز، یان کەمتر وەك تیپی سەرباز بەپێوە وەستاون و ریزی پێشەوەیان هەموویان قوڕبەسەر و شانییانەوەبووە و پارچە قوماشێکی رەش کە پێیوتراوە (دەواری رەش) کراوەتە ملیان، هەر لەبەینی چەند مەترێکیشدا ئالآیەك کە بریتیبووە لە پارچە قوماشێکی ڕەش کراوە بە دووداروەی و دووکەس لەمسەر و ئەوسەر دارەکانیان گرتووە بەدەستییانەوە، خزمەتکاری تایبەتی (کەریم سان)یش قوڕپێپێواوە و ئەسپەکەی سانی بەدەستەوە بووە وتفەنگەکەشی کردووەتە شانی، بەلآم لوولەکەی بەرەوخوارکردۆتەوە، داهۆڵی سانیش بەسەر ئەسپەکەوە بە جلوبەرگەکەی درووستکراوە، ئەو کەسەش شیعری لاواندنەوەی بە بالآی ساندا هەڵداوە، لە پێش تفەنگقۆڵچییەکەوە رۆیشتووە و لەناو ریزی پیاوەکانیشدا زوڕناژەن و دەهۆڵژەن وەستاون، ژنان بە چەند ریزێك لەدوای ئەسپەکەی سانەوە رۆیشتوون و سەرپاکیان قوڕیانپێواوە و قەلآخی دراوە بەسەریاندا، کە شاعیر دەسیکردووە بە لاواندنەوەی (سان)، هەموو پیاوان بە (باوکەڕۆ، ئاغەڕۆ) و زۆرناو دەهۆڵ بە ئاوازی چەمەری، ژنانیش بە هاوار وگریان وقژرووتاندنەوە کردوویانە بەرۆژی حەشر، شیوەن و گریان تا نیوەڕۆ بەردەوامبووە، ئینجا نانی نیوەڕۆیان خواردووە و پاش پشوویەکی کورت بەهەمانشێوە

دەستیانپێکردۆتەوە، شایانی وتنە ئەو کەسانەی ئاڵا ڕەشەکانیان بەدەستەوە بووە بەیناو بەین لەگەڵ گەرمەی شیوەنکردندا نەویانکردوون.

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا دەڵێین: ڕێوڕەسمی پرسە لەهەورامانـدا، هەم لەرووی ڕۆژانی پرسەگێڕان و ڕۆیشتنەوە بۆ سەرقەبران، هەم لەرووی شێوازی هاوکاریکردنی خاوەن پرسەوە گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووە، بەڵام پێویستە ئاماژە بەوەبدەین لە زۆر شوێنی هەورامانـدا خەڵکان خۆویستانە سندووقیان داناوە و مانگانە پارەی تێدادادەنێن بۆ ئەوەی هەندێك خەرجی خاوەن پرسەکانی پیجێبەجێبکەن.

## شەونشینی هەورامان

شەونشینی یەکێکە لە سیما دیارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی هەورامان و هەر لەکۆنەوە شوێنی خۆی لەناو کولتوورییاندا کردۆتەوە، لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکارییانەی بەسەر ژیانی خەڵکدا هاتوون و سەرەڕای گۆڕانی هەندێك لە چەمکە کۆمەڵایەتییەکان لە لایەکەوە و بڵاوبوونەوەی چەندین ئامێری وەك: (رادیۆ، تەلەفزیۆن، ڤیدیۆ، سەتەلایت)کە شەوان هاودەمی خەڵکن، کەچی شەونشینی هەورامان وەك خوویەکی کۆمەڵایەتی هەتاکو ئێستاش هەر شوێنی خۆی گومنەکردووە.

خەڵکی ناوچەکە چ لەمانگەکانی سەرما و سۆڵە و کۆبوونەوەیان لەناوماڵەکانیانـدا، یاخود لەو مانگانەدا کەشوهەوا خۆشدەکات و باخدار و ئاژەڵدارەکانیان بەشێوەیەکی کاتی کۆچدەکەنە ناو باخەکانیان و هەوارگەکانی هاوینەیان، ئەم خووە لەناویانـدا بەردەوامە و فەرامۆشنەکراوە، جیاوازییەك کە لەنێوان شەونشینییەکانی ناوباخ و هەوارگە و شەونشینییەکانی ناو ماڵدا هەبێت ئەوەیە، شەونشینییەکانی ناوماڵ زیاتر (گلێرن= کۆن) و جۆری شەوچەرەکەشیان زیاتر میوەی وشکەوکراوەیە.

پێشتر هەندێك لە خێزانە هەورامییەکان بەتایبەت خێزانەکانی: (سان، بەگ، کوێخا، هەندێك لە پیاوە دەستڕۆیشتووەکان)، بەشێوەیەکی بەردەوام شەوانە کۆڕی شەونشینییان





گەرمـدەكرد و شەونـشينييەكەش تارادەيـەك گـشتی بـووە، ئـەوجۆرە شەونـشينييانە سـەرەتا هەندێك قسە وباسی گشتييان تێداكراوە، پاشان بڕگـەكانی شەونـشينی دەسـتيانپێكردووە وەك: (گێڕانـەوەی رازو سەرگوزشـتە، نوكتـەو قـسەی خـۆش، خوێندنـەوەی شـيعر، يـاری مييلـی بـە تايبەت گۆرەوی بازی[1]، تەڵەو ڕواس= تەڵەورێوی، خوگە ملێ= بـەرازە ملـێ..هتـد)، لـە نێـوان بڕگەكاندا ئەوانەی دەنگخۆشبوون گۆرانييانچڕيوە، سـەرەڕای ئـەوەی دوابڕگـەی شەونـشينييەكە گۆرانيـچڕينبووە و جارجـاريش لەسـەر ئـاوازی گـۆرانی چـەپڵەڕێزان و شمـشاڵژەنين بۆماوەيـەك هەڵپەڕكێ سازدراوە، ئەم جۆرە شەونشينييانە ئێستا بەڕادەی نەمان كەمبوونەتەوە.

سـەبارەت بـە شەونـشينييە تايبەتـەكان كەبەهـەمان ريبۆڕەسمـەوە بەڕێوەچـوون، تـا ئێـستاش بـەردەوامن، لـەم بـوارەدا ئـەو خێزانانـەی هاتووچـۆی يەكترێدەكـەن، هـەر شـەوێك لەماڵێكيانــدا كۆدەبنــەوە و كـۆڕی شەونــشينی گەرمدەكــەن، لەشەونــشينييەكاندا جۆرەوهــا شەوچـەرە ئامادەدەكرێـت وەك: (كوتــە، لــەپارێ[2]، كاكڵـەگوێز، مێـوژ، هــەنجيری وشــك، لەپۆرتە[3]، قـەزوان) و هەنـدێك لـەو ميوانـەی كەهـەتاكو ماوەيـەكی زۆر بەتـەڕی دەمێننـەوە وەك: (هـەنار، بـەهێ)، هـەروەها (خۆشـاو[4])يـش يەكێكـە لـەو شەوچـەرانەی لـە شەونـشينی هەورامانـدا بايـەخی خـۆی هەيـە، پـاش ئـەوەی رێگـەی ئۆتـۆمبێليش بـۆ زۆربـەی ديهاتـەكان كراوەتـەوە، ميـوە تەڕدەسـتەكانی تـريش وەك: (سـێو، پرتـەقاڵ، لالـەنگی) چـوونەتە نـاو شەوچەرەكانەوە.

شەونـشينی هـەورامان هيمايـەكی گـەورەی تێكـەڵاوی و پێكـەوە ژيـانی هەوراميیـەكان و جوانييەكانی هەردەمێنن.

## راوەكەو

راو بەشێوەيەكی گشتی لای ژمارەيەك لە خەڵكی هـەورامان بـووە بەخوويـەك بەدرێـژای تەمـەنيان لەگەڵيانـدايـە و لەهەنـدێك ديهاتيـشدا نـەك هـەر خـووە، بـەڵكو بـووە بەديارەدەيـەكی

---

[1] (گۆرەوی بازی) لەهەندێك ناوچەدا پێيدەوترێت كلاوێن.

[2] (كوتە، لەپارێ) لەباسی داری تووداا قسەيان لەسەركراوە.

[3] (لەپۆرتە) لەباسی داری هەنجيردا قسەی لەسەركراوە.

[4] (خۆشاو) لەباسی خوادنە ميلييەكانی هەوراماندا قسەی لەسەركراوە.

کۆمەڵایەتی لەناو دینیشیینەکاندا و ژمارەیەکی ئێجگار زۆریان پێوەیوابەستەن، هەرچەندە ئێمە وەکو خۆمان راوکردنی باڵندە و گیاندارە کێوییەکانمان بەلاوە شتێکی خراپە، بەڵام ئەو خووە قووڵاییەکی مێژووی لەناو کولتووری خەڵکەکەدا هەیە و سڕینەوەی لەلایەکەوە کات و لەلایەکی تریشەوە زیادبوونی هۆشیاری کۆمەڵایەتی گەرەکە، راو لەهەورامانـدا چەند جۆرێکی هەیە لەوانە: (راوۆ ژەرەژا= راوەکەو، هۆریشە ڕاوە= راوە کەروێشك، کەڵەڕاوە= راوی بزن و مەڕی کێوی، خووگەڕاوە= راوەبەراز، راوەماسی، راو بەتەڵە ئەم جۆرەیان زیاتر بۆ رێوی، گورگ، چالەکە بەکاردێت)، بەرادەیەکی کەمیش راوی (ریشۆڵە و ئایرەمەل= ئایینەمەل)دەکەن، لەم بابەتەدا باسی راوەکەو دەکەین کەبەربلاوترین جۆری راوە لەهەورامانـدا، بەڵام بەر لەوەی بچینە ناوەرۆکی بابەتەکەوە پرسیارێکی بچووك بەگوێی برا راوچییەکاندا دەچپێنین و پێیانـدەڵێن: باشە پێوە کەزۆربەتان کەوتان خۆشدەوێ و لەناوماڵـدا رایانـدەگرن و خزمەتییاندەکەن، توخوا چۆت دڵتاندێ ئەو باڵندە جوان و ئێسیك سووك و دەنگخۆشانە بکەنە قوربانی حەزێکی تایبەتی خۆتان؟.

<u>راوەکەو لە هەوراماندا چەند جۆرێکی هەیە وەك:</u>

1کۆڵێت: لەدوادوای هاوین و سەرەتای وەرزی پایزدا کەو زۆرن چوونکە زۆربەی بارەکەوەکانی ئەوساڵە گەورەبوون، راوچییەکان بەیانیان زوو لەنزیك کانییەکانەوە خۆیان لەناو (کولێت=داوگە)دا دەشارنەوە، کاتێك کەوەکان دێن بۆسەر ئەوکانییانە بۆ ئاوخواردنەوە تەقەیانلێدەکەن و دەیانکوژن.

2دێجامە= دێوجامە: بریتییە لەپارچە قوماشێکی گەورە و چەند پارچە قوماشێکی ورد ورد و رەنگاوڕەنگی پێوە دەلکێنرێت و لەناوەڕاستتەوە کونێکی تێدایە، راوچییەکان دێوجامەکە دەبەستن بە دووقامیشەوە و خۆیان لەپشتییەوە دەشارنەوە، کاتێك کەوەکان لەو پارچە قوماشە نزیکدەبنەوە راوچییەکان لەکونی دێوجامەکەوە تەقەیانلێدەکەن و دەیانکوژن.

3ویاری= سیپە: وشەی ویار لە (راویەر= رێبوار)ەوە هاتووە بەوەی کەوەکان لە ئاخر و ئۆخری مانگی شوبات و سەرەتای مانگی ئازاردا، لەگەرمییانەوە بە پۆل دەچن بۆکوێستان، راوچییەکانیش لەناو (سیپە) کە لەبەرد دیواریدەکەن و سەرەکەی بەهەژگ و پوش وپەڵا دەگرن، لەشوێنێکدا درووستیدەکەن کەوەکان لێیدەنیشنەوە، بەیانییان زۆر زوو، یاخود

عەسران، خۆیان دەشارنەوە و دەیانکوژن، دەبارەی ویار لەهەوامانـدا رازێـك هەیـە دەڵـێن: کـاتی دەستپێکردنی (ویار) رۆژی (18/ مانگی شوباتە) گوایا لەو رۆژەدا (بەقەسـپی[لخلجلخ]) داویـەتی لـە (قەڵای هەورامان) و رەقبوودتەوە.

4 شەڕەبەق: خۆرشترین جۆری راوە بەلای راوچییەکانەوە، پاش کاتی (ویار) و لەئاخری زستاندا دەستپێدەکات و بەجیاوازی کەشـو هـەوای ناوچـەکە ماوەیـەکیش لەبـەهار دەخایـەنێت، ئەو کەسەی دەچێت بۆ (شەڕەبەق) نێرەکەویکی باش کە بـەزمانی هەورامییـەکان پێیـدەوترێت (بەق) لەگەڵ خۆیدا دەبات، کەوەکەی کە لەناو قەفەزدایە دەبەستێت بە دارێکـەوە و خۆشـی لـە (داوگە)کەیدا دادەنیشێت، کانتێك کەوەکەی دەستدەکات بەخوێندن نێرەکەوەکانی ئەو ناوە دێن بەدەم ئەو دەنگە غەریبەوە، کاتێـك لـە قەفەزەکـە نزیکدەبنـەوە راوچـییەکە تەقەیانلێـدەکات و دەیانکوژێـت، بـەپێی قـسەی راوچـییەکان راوچـی بەختـەوەر ئەوەیـە کەوەکـەی بـاش بخوێنێـت ونـەگبەتیش ئەوەیە کەوەکەی نەخوێنێت و لەم حاڵەتەدا دەڵێن (بنەی مەکەرۆ).

5 چێڵکڕ: دوا بـەدوای کـاتی شـەڕەبەق دەسـتپێدەکات، لـەو کاتـەدا (چـێڵ= ماکـەو)ەکـان کڕدەکـەون و بەسـەر هێلکەکانییانـەوە دادەنیـشن، ئـیتر نێرەکـەوەکان بەتـەنیا دەمێننـەوە و لەوکاتانەدا راوچییەکان (چێڵ= ماکەو) لەگەڵ خۆیـان دەبـەن و کاتێـك دەخـوێنن نێرەکـەوەکان دێن بۆ لایان و راوچیەکان دەیانکوژن.

6دامـی= داو: جـۆرێکی تـرە لەڕاوەکـەو بـەوەی راوچـییەکان داودادەنـێن بـۆ کـەوەکان و دەیانگرن، بەتایبەت لەکاتی (ویار و کۆلێیت)دا.

7شەوارێ =شەوارە: زیاتر لەشـەوە تاریکـەکانی پـاییز و زسـتاندا ولـەو کاتانـەدا دەکرێـت کەوەکان دەچن بۆ هێلانەی شەویان کە هەورامییەکان پێیدەڵێن (شۆلان).

راوچییەکان بەمەبەستی راوکردن (ساچمەزەن، وەرەندڵ، تاپڕ، فلچە) بەکاردەهێنن.

---

[لخلجلخ] بەقە سپی= نێرەکەوی سپی.

# بیناسازی هەورامان

پێـشتر و لەبابــەتی ژیـانی خــەڵکی هــەورامان لــە ناوهــەوارەکانی هاوینەیانــدا باسمــان لەوەکردووە کە هەورامان مەڵبەنـدی نیـشتەجێبوونی دێرینـە و لێرەدا بـەو باسـەدا ناچـینەوە، بەڵام لەوەوە دەستپێدەکەن پێـشینەی مێـژوویی نیـشتەجێبوونی هەورامییـەکان لـە ناوچـەکەی خۆیاندا هۆکارێکی گرنگبووە بۆ ئەوەی بتوانن لەرووی بیناسازی و دروستکردنی خانووبـەرە و رازاندنەوەی ماڵەکانیاندا لە زۆربەی ناوچەکانی تر تەواو جیاوازبن، دەبیـنین لەقـەدپاڵی کێـو و لەناو دۆڵەکاندا بە شێوەیەکی رێکوپێك خانووەکانیان درووستدەکەن، لـە درووسـتکردنیاندا زۆر بە وردی حیساب بۆ (خۆر، شـەماڵ، رەشـەبا، رادەی شـێ، سـەیل و بـاران) دەکـەن، بـەردی زل زل دەخەنـە بناغـەی خانووەکانییانــەوە بـۆ ئـەوەی زۆر قایمبێـت، (دیمـەك[1]) بـەکاردەهینن بـۆ بەسـتنەوەی مـور و دیوارەکـان بەیـەکترەوە، دیمـەکیش لـەداری تـوو لەسـەر شـێوەی شەشـپاڵوو درووسـتدەکەن، لەبەرئــەوەش لــەو دارە درووســتیدەکەن چـونکە نارزێـت[2]، بــەکارهێنانی (دیمەك) لە بیناسازی هەوراماندا گەواهێکی گەورەی ژیری هەورامییەکانـە لـەم بـوارەدا، کاتێك کە دەخرێتـە نـاو دیـوارەوە قورسایی دیوارەکـە دابەشـدەکات و مـور و دیوارەکـان بەیەکترییـەوە شەتەکدەدات، ئەمەش خۆی لە خۆیـدا یاسایەکی فیزیاویـە و پێیـدەوترێت (هاوکێـشە)، شـتێکی زانراوە هەورامییەکان لەرووی زانستییەوە پەیان بۆ گرنگی دیمەك نەبردووە وسـەدان سـاڵ بـەر لەسـەرهەڵدانی (یاسای هاوکێـشە) دیمـەك لەهەورامانـدا بـەکارهێنراوە، بـەڵام لـە رێـی ژیـری و سەلیقەی خۆیانەیاوە پەیان بەو گرنگییە بردووە.

لەبــەر ئــەوەی هــەورامان ناوچــەیەکی کوێــستانە و وەرزی بــەفر و بــارانی درێــژە، وەستادیوارەکانی هەورامان لەدرووسـتکردنی خـانوودا هەمیـشە حیـساب بـۆ ئـەوە دەکـەن رادەی

---

[1] باسی شێوەی (دیمەك) و چۆنییەتی درووستکردنی لە لایەن دارتاشە هەورامییەکانەوە لە بابەتی هونەری ژیان لە هەوراماندا کراوە.

[2] خەڵکی هەورامانی ئەمدیو کاتێك لە ئەنجامی راپەڕینە شکۆدارەکەی جەماوەری گەلەکەمان هەر لەساڵی (1991ز) دەستیانکرد بەگەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان، دیمەکەکانی ناو دیوارەکانیان بەکاردەهێنایەوە، هەرچەندە زیاتر لە بیست ساڵ بوو خانووەکانیان رووخابوون، کەچی زۆربەی دیمەکەکان وەك خۆیان مابوونەوە، پاش ئەوەی تەنیا توێژاڵێکی باریکیان لێدەتاشین وەك دیمەکی تازە وابوون.





شىێ لـە نـاو خانووەكانـدا بەڕادەیـەك نـەبێت هەڕەشـە لەتەندرووسـتیانبكات، بۆیـە دیـواری خانووەكانیـان بـەپانی دروسـتدەكەن و بـۆ ئـەو مەبەسـتەش بـەردو تۆپەڵـە قـوڕی پتـەو بەكاردەهێنن، سەرەكەشیان بەدار و خێزرەی ناوچەكەی خۆیان دارەڕادەكەن[*]، پاشـان بـەردی تـەنكی بـچووك كەپێیـدەڵێن (دێڵـە) دەخەنـە سـەر خێزرەكـە و ئینجـا بـە تۆپەڵـەقوڕی پتـەو قوڕەكاری سـەر (دێڵـە)كـە دەكـەن، پاشـان بـە خـۆڵ گلێبانیاندەكـەن، (پاسـار) بـۆ خانووكانیـان دروسـتدەكەن بۆئـەوەی دیوارەكـان نەخوسـێنەوە و سـاڵانە لەگـەڵ بـارینی یەكـەم بارانیـشدا سـەربانەكانیان كاڕێژدەكـەن و بـانگردێن دەگێـڕن بەسـەریاندا، لـەوەرزی بـەفر و بارانیـشدا بەردەوام سەربانەكان دەماڵن و بانگردێن دەگێڕن بەسەریاندا.

زۆربەی خانووەكای هەورامان دووقات و سێ قاتن و چەندین خانووی یەك قاتیش هـەن بەتایبەت لە دیهاتە دوورەدەستەكاندا، قـاتی ژێـرەوە بـۆ (ئـاژەڵ، بـەرزە ولاّخ، ڕەشـەولاّخ، كـادان، شـوێنی لێژنـەدار) بـەكاردەهێنرێن و قاتـەكانی تـریش شـوێنی ژیـانی خێـزانن، هەورامییـەكان هەرگیز تێكەلاّوی لە نێوان شوێنی ژیانی خۆیان و ئـاژەڵ و ولاّخەكانیانـدا ناكـەن و دەزان ئـەوە هەڕەشـە لـە تەندرووسـتییان دەكـات، لـەناو شـارەدێی و شارۆچكەكانیـشدا قـاتی ژێـرەوە زیـاتر دەكـرێن بـە: (دوكـانی جۆراوجـۆر، چـایخانە، كەبابخانـە، چێـشتخانە...هتـد) بەتایبـەت ئـەو شوێنانەی بە ئۆتۆمبێل هاتووچۆیاندەكرێت، خـەڵكی هـەورامان جیـاواز لەخـەڵكی تـر هـەرزوو دەركیـان بـەگرنگی (تـەوالێت) كـردووە، لـەناو ماڵەكانیانـدا تـەوالێت و سەرشـۆرگەیان دروستكردووە و لە مزگەوت و كانیاوە گشتییەكانیـشدا تـەوالێتی گـشتییان دروسـتكردووە، لـە هەنـدێك شـوێندا (مـاڕ)یـان دروسـتكردووە كـە بریتییـە لـە تـونێلێكی بـچكۆلە و دوو كووچـە دەبەستێت بەیەكترەوە و سەرەوەی دەكرێت بە خانوو.

هەر لەبواری بیناسـازیدا پێویـستە بـاس لەوەبكـەین هەورامییـەكان بـە جـوانترین شـێوە دیـواری نـاوەوەی خانووەكانیـان ماڵـەدەدەن، كـەیبانووەكانیش زەوی و دیوارەكـانی نـاوەوە بـە (سیرەكۆڵێ= هێلەساو)، بەخۆڵی ناوچەكەی خۆیان سـواقدەدەن، سـەرەتا بـە هێلەسـاوێكی گـەورە دووجار سواقیاندەدەن، پاش ئەوەش كزردەبنەوە بە هێلەسـاوێكی بـچووك دواسـواقیاندەدەن كـە بـەزمانی خۆیـان پێیـدەڵێن (ڕەقەسـاو)، ئـیتر بـەجۆرێك سـاف و لووسـیاندەكەن بریقـەیان

---

[*] پێـشتر چـەند جۆرێـك دار بەتایبـەت داری (گـوێز، تـوو، كێكـف) وەك رایـەڵ بـۆدارەڕاكردنی خـانوو بەكاردەهێنران، بەڵام لەم رۆژانەدا زیاتر (داری چنار) بەكاردەهێنرێت و تەختەش لەبری خێزرە دەخرێتە سەریان.

لێوەدێت[سملجلخ]، هونەری سواقدانی خانوو هەموو ژنێك نایزانێت و هەندێك ژنیش كە لەم بوارەدا شارەزایی تەواویان هەیە پێیاندەڵێن (یانە ناو= ماڵ سواقدەر).

هونەری بیناسازی هەورامان بە گشتی و دروستكردنی تەوالێتەكان بە تایبەتی، ئەوەندە هونەرێكی گەورەیە سەرنجی ژمارەیەك خەڵكی بیانی راكێشاوە، یەكێك لەوانە (ئێدموندز) بووە، كە لەم بوارەدا نووسیویەتی: لەكاتی سەردانەكەمدا بۆ هانەگەرمڵە شەو بووم بەمیوانی (ئەفراسیاوبەگ)، ئەوەی زۆر سەرنجی راكێشام تەوالێتی ماڵەكان بوون كەبەشێوەیەكی پێشكەوتووتر لەهەموو ئەوانەی لە دەرەوەی هەورامان ئێران و ئێراقدا دیبوومن دروستكرابوون، هەروەها لە وانەی شارستانێتی (ڤسباسیان) لە ئیتالیا پێشكەوتووتربوون[شملجلخ].

هەورامییەكان سەرای ئەوەی لە دیهاتەكاندا خانوو دروستدەكەن، لە ناو باخ و رەزەكانیشیاندا (كەوێڵ= كوخ) دروستدەكەن، لە كاتی هاتوچۆی ئەو شوێنانەدا، یان لە ماوەی كۆچكردنی هاوینەیان بۆ ئەو شوێنانە تیایاندا دەحەوێنەوە.

ئیرادەی خەڵكی هەورامان لە دروستكردنی خانووەكانیاندا ئیرادەیەكی گەورەیە، زۆجار لەدووری سەدان مەترەوە (بەرد، خۆڵ، دار، خێزە) و پێداویستی تر بەكۆڵ، یاخود بەولاخ دەگوێزنەوە، لەو شوێنە سەخت و لێرەوارانەدا دوور لەسستی و تەمبەڵی ئەم كارانە ئەنجامدەدەن، ئەوەی لەدەرەوەی هەورامانەوە دەچێتە ناوچەكە چەندە بە سەلیقەی هەورامییەكان لە بوای (باخداری، پیشەسازییە دەستییەكان) سەرسامدەبێت، بەهەمانشێوە بە بیناسازییەكەیان سەرسامدەبێت و یەكسەر دەڵێت: ئەو هەموو خانووە چۆن لەو بەرزاییانەدا دروستكراون.

لە زۆر ناوچەی هاوشێوە بەهەورامان خانوو دروستكراون و رازێنراونەتەوە، چەندین ساڵ شوێنی ژیان و حەوانەوەی خێزان بوون، بەلام خەڵكی هیچ شوێنێك وەك خەڵكی هەورامان نەیانتوانیوە ئەفراندن لە دروستكردنی خانووەكانیاندا بكەن.

---

[سملجلخ] لەم رۆژانەدا خەڵكی زۆربەی شوێنەكانی هەورامان دیواری ناوەوەی خانووەكانیان كەچكاری و زەوییەكەشیان بە چیمەنتۆ كۆنكرێتدەكەن.

[شملجلخ] سیسڵ جۆن ئێدمۆندز (كرد، ترك، عرب) لاپەڕە (157).

# پزیشكی و دەرمانگەری میللی

**لەســەرەتاوە هــەتاكو ماوەیــەكی دوورو درێــژ هۆكارەكــانی نەخۆشــی لای مرۆڤــەكان نــەزانراوبوون، بــۆ رزگــاربوون لــەو نەخۆشــییانە تووشــیانبوون، پــەنایانبردووە بــۆ ئــەو شــتانەی لەبەردەستیاندابوون، وەك: (خۆڵ، گژوگیا، گــەڵاو توێكــڵ وبــەروبوومی رووەك، پاشــەڕۆی ئــاژەڵ ...هتــد)، لــەوەوە ســەرەتاكانی پزیــشكی و دەرمانگــەری ســەریانهەڵداوە، لەگــەڵ بــەردەوامبوونی ژیــان ئــیتر زانیویانــە ئــەو نەخۆشــیانەی كــە تووشــیاندەبن چــەند هۆكارێكیــان هەیــە لەوانــە: (هۆكاری سروشــتی) بــۆ نموونــە گــەرماو ســەرما، (هۆكــاری خــۆراكی)، هــەروەها هەنــدێك رووداو كەدەبنە هۆی (شكان، سووتان، برینداربوونی یەكێك، یان زیاتر لە ئەندامەكانی لەش)، بۆیە بــۆ چارەسەری نەخۆشی پەنایانبردۆتە بــەر هەنــدێك (ســروتی ئەفسانەیی)، یــان سوودوەرگرتن لــە هەنــدێك شــت وەك: (گــژوگیا، گــەڵاوتوێكڵ و بــەروبوومی روەك، میتــاڵ، ئەندامــەجیاجیاكانی لەشی ئاژەڵ وباڵندە).**

**هەنــدێك خــەڵك لەئــەنجامی ئــەزموون، یــان لــە دانــایی و ژیــری خۆیانــەوە جۆرەهــا دەرمانیان درووستكردووە و شارەزاییان پەیداكردووە، ژمارەیەك نەخۆشییان چارەسەركردووە.**

**لەناوخــەڵكی هــەورامان و لەســەردەمە جیاوازەكانــدا كەســانێكی زۆر هەڵكــەوتوون، تارادەیــەكی بــاش لــە خۆپاراســتن و چارەســەركردنی هەنــدێك نەخۆشــی بەشــێوەی پزیــشكی و دەرمانگەری میللی شارەزا و كارامە بــوون، وەك: (چاككردنەوەی شكان و لەجێچوونی دەســت و قاچ، لەجێچوونی كلۆك وشان ...هتد)، ئەم جۆرە كەسانە بەزمانی خەڵكی ناوچەكە پێیــانوتراوە (جەڕاح)، بۆ مەبەستی كارەكەشیان تــەنها ئــامرازی ســەرەتاییان لەبەردەســتدابووە، وەك: (ئــاوی گەرم، لەدوای دەركــەوتنی صابوون ئــیتر ئــەمیش بــەكارهێنراوە بــۆ شــێلانی شــوێنی شــكان، یــان لەجێچوونەكە) هەروەها (پێستە، خام، هێلكە، قامیش، مۆم)یــان بــەكارهێناون، پێــستە گیراوەتــە ئــەو شــوێنە شــكاوەی كــە ماوەیــەك بەســەر شــكانەكەیدا تێپــەربووەو نەگیراوەتــەوە، یــاخود لەئــەنجامی بەهەڵــە گرتنــەوەی لاروســەقەت بــووە، بــۆ ئــەوەی ئــەو شــوێنە نەرمبێتــەوە ئینجــا بگیرێتەوە، پێستەی تــێگیراوە، دوای ئــەوەی شــكان، یــاخود لەجێچوون بــە راكێــشان و تەقانــدنی لەلایــەن جەڕاحەكــەوە گیراوەتــەوە، زەردێنــەی هێلكــە بــۆ جارێــك، یــان زیــاتر خراوەتەســەر**

پارچەخامێك و بەسەریدا بلاوكراوەتەوە كە (مشەممای هێلكە)یان وپێوتووە و گیراوەتە شوێنی شكان، یان لەجێچوونەكە، ئینجاچەند پارچە قامێشێكی تاشراو بەقەبارەی قەڵەمێك، یان بچووكتر بەپێی شوێنی شكستەكە لەسەر مشەمماكە بەشێوەیەكی تەریب دانراون باش بەستراوە، بەم شێوەیە هەزاران كەس لە شەلی و كەمئەندامی پارێزراون .

لەبواری چارەسەركردنی نەخۆشی و درووستكردنی دەرمانیشدا، چەندین خەڵكی شارەزا هەبوون بە (حەكیم) ناسراون، جەڕاح و حەكیمەكانی هەورامان ژمارەیان زۆرە و ناكرێت ناوی هەموویان بهێنین، بەلام هەر وەك نموونە ناوی چەند كەسێك لە ناسراوەكانیان دەهێنین، لەوانە: (پیرشالیاری یەكەم، باواخۆشێن، میرزا ئەولقادری تەوێڵەیی، شێخ هەیات، مەحمودی شێخ هەیات، شێخ عوسمان كوڕی شێخ عەلائوددینی بیارە، حاجی ساڵحی دزاوەری، كوێخا تۆفیقی هاواری، وەستا صادقی تەوێڵەیی، حاجی ئەلیبەگی بەڵخەیی، پورە گوڵەی ئەلاوەیس...هتد).

لە خوارەوە ناوی ژمارەیەك لە نەخۆشییەكان و ئەو چارەسەرانەی بۆیان بەكارهێنراون دەخەینە پێشچاو:

1/ بۆ چارەسەركردنی رۆماتیزم كە پێیانوتووە (ژان وبا= باداری) گۆشتی رێوی بەكارهێنراوە.

2/ بۆ چارەسەركردنی (سكچوون)، (برێشكەی نۆك، ماست و ئاردی نۆك، هێلكە بەترش) بەكارهێنراون.

3/ بۆچارەسەركردنی (ژانی گەدە، ژانەسك بەگشتی) چەند شتێكی وەك: (چایی گوڵەفەقێ، ئاوی توو، بنێشتە تاڵ، رازیانە، سملێ، ئاوی نەعنا، گەڵای گوڵەباخ پاش كوڵاندنی لەناو ئاو) بەكارهێنراون.

4/ بۆچارەسەركردنی (ئازاری گورچیلە، ئازاری میزڵدان، بۆرییەكانی میز)، (بەڕەزا، قەیتەران، ریشاڵی گەنمەشامی بەشێوەی چالێنان) بەكارهێنراون

5/ بۆچارەسەركردنی مایەسیری، (گێلاخە، گەڵای هەنجیر) بەكارهێنراون.

6ا ئاوی گەلای بی لەگەڵ بڕوێشکی گەنم پێکەوە کولێنراون بۆچارەسەرکردنی (دۆمەڵ) هەتاکە زەردبووە، ئینجا (پیازی پیشاو، باینجانی پیشاو) بەکار هێنراون بۆ دەردانی کێمەکەی و پاککردنەوەی.

7ا (گیای سینەمەکی، شەلەمە= شەروالْبەکۆڵ، تۆڵەکە، رۆنی گەرچەك) بۆ چارەسەرکردنی (قەبزی) بەکارهێنراون.

8ا (گوڵنار+ سمڵ+ مێخەك+ خوێ+ مازووی شین) پێکەوە کوتراون، تۆزەکەیان بەکارهاتووە بۆچارەسەرکردنی (هەوکردن و تلۆقەکردنی زمان)، هەروەها لە تۆزەکەیان هەویر درووستکراوە بۆ چارەسەرکردنی (ئازاری دان)، بەم دەرمانە وتراوە(حەوت دەرمانە) کە زۆرجار بۆ چارەسەرکردنی (گەڕی و کەچەڵی)ش بەکارهێنراوە.

9ا (ئاوی تەماتەی کاڵ) بۆ چارەسەرکردنی (بالووکە) بەکارهێنراوە.

10ا بۆ چارەسەرکردنی (کرمی ناوسك)، (ناوکە کوولەکە بەکاڵی +کەرێ+ شەکر) بەکارهێنراون، بە مەرجێك پێش خواردن بخورێن.

11ا ئاوی توێکڵی پرتەقاڵ، گوڵەهێرۆ بۆ چارەسەرکردنی (قژ رووتانەوە) بەکارهێنراون.

12ا گۆشتی ژیژك، تۆوی ئەسپەندەر بۆ چارەسەرکردنی (بەبۆنکەوتنی مندال) بەکارهێنراون.

13ا (ئاوی کەرەوز، ئاوی جۆ) بۆ چارەسەرکردنی (میزگیران) بەکارهێنراون.

14ا چایی گوڵە وەنەوشە بۆ چارەسەرکردنی (ژانە سەر، تەنگە نەفەسی) بەکارهێنراوە.

15ا گەلا ریکێشە بۆ چارەسەرکردنی (زیپکە و دۆمەڵ) بەکارهێنراوە.

بێجگە لەمانەی سەرەوە کە باسمانکردن، خەڵکێکی شارەزا هەبوون توانای هەڵکێشانی (ددان) و برینپێچییان هەبووە، ئەوەش بەهەڵدڕینی برین و ئە وشوێنانەی کە هەویانکردووە وپاککردردنەوەیان لەکێم وپیسی، هەروەها کەسانێك هەبوون چارەسەری ئەوانەیان کردووە (مار و دووپشك) پێوەیانداون، ئەوەش بەپێچانی توندی شوێنی پێوەدانەکە، ئینجا بە چەقۆی تیژ، وپێیانوتووە یاخود گوێزان برینداریانکردووە و بە (کەڵەشاخ) خوێنەکەیان هەڵمژیوە، پاشان (سیر و خوێ)یان پێکەوە کوتاون و خستوونیانەتە سەر برینەکە، هەروەها (شیری خاو)یان دەرخواردی ئەو کەسانە داوە کە (مار و دووپشك) پێوەیداون هەتاکو بڕشێنەوە، بەم شێوەیە تونیویانە گیانی ئەوانە لە مەترسی بپارێزن.

لێرەدا پێویستە بڵێین لەگەڵ ئـەم هەمووپێشکەوتنەی لـەبواری پزیـشکی و دەرمانگـەری زانـستیدا بەدەسـتهاتووە، دەبیـنین هێـشتا (گـژوگیا، گەڵاوبـەروبوومی روەك ...هتـد) لـەبواری دەرمانگەری میللی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی جۆراوجۆر بـەکاردەهێنرێن، جاری واش هەیـە ئەنجامی باشیان هەیە، لەم ساڵانەی دوایشدا دەرمانگە وشوێنی تایبـەت بـەم جـۆرە چارەسـەرانە کراونەتەوە و رەواجی باشیشیان هەیە.

هـەر لـەم بابەتـەدا پێویـستە ئـەوە بەبیربهێنینـەوە لـە باسـی باخـداری و دارسـتانە سرووشتییەکان و ناوهێنانی هەندێك گژوگیای هەوراماندا باسمـان لەوەکردهەنـدێك لەبـەروبوم و گژوگیاهی هـەورامان خاسـییەتی دەرمانیـان هەیـە لـە خـوارەوە نـاوی هەنـدێکیان دەهێـنین و کەمێك لە خاسییەتەکانیشیان دەخەیەنە پێشچاو.

1 بەرگەمی = کوزەڵە: بەعەرەبی پێیدەوترێت (کرفس الماء) بـە فارسـیش پێیـدەوترێت (رواس)، گیایەکی تام و بۆنخۆشە و سوودی خۆراکی و دەرمانی هەیە، بەم شێوەیە:

یارمەتی هەرسکردنی خۆراك دەدات، بۆ چارەسەری (زەردوویی، ئاوسـانی سـپڵ، ژنەسـك، میزگیران، لەرز) زۆرباشە، زۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکان زۆرگرنگـی پێـدەدەن و هـەر بـۆ نموونـە بەریتانییەکان لە ئینجانەدا دەڕوێنن و بە مسقاڵ دەیفرۆشرن.

2 پوینــە = پونگــە: بەعــەرەبی پێیــدەوترێت (نعنــاع الـبری)، خــواردنی پونگــە بــۆ چارەســەرکردنی ژانەسـك بەسـوودە، چـای پونگـە چارەسـەرێکی مـسۆگەرە بـۆ (سـنگگیران، تەنگەنەفەسی، سکچوون، ژانەسکی بێنوێژی، فشاری خـوێن، شـەکرە)، هـەروەها چارەسـەرێکی باشە بۆ نەخۆشی غوددە و بەهێزکردنی پووك.

3 گەزەنێ= گەزنە: خـواردنی گەزنـە بـۆ ئەوانـەی نەخۆشـی شـەکرەیان هەیـە زۆر باشـە چـونکە رێــژەی شــەکرەکەیان کەمدەکاتــەوە، میزپێکــەرە و بــۆ چارەســەکردنی هــەوکردنی گورچــیلەکان زۆر بەســوودە، بــۆ ئەودایکانــەی شــیردەدەن بــە منداڵــەکانیان خــواردنێکی کەمنموونەیــە و شــیریان زیاددەکــات، (چــا)ی گەزنــە نەخۆشــی مانگانــەی ژن خێرادەکــات، بۆزیادکردنی ئارەزووی سێکسی زۆر باشە، ئەگـەر گەڵاکـەی لەگـەڵ (ئـاوی جـۆ)دا بکوڵێنرێـت و بخورێت سنگ نەرمدەکاتەوە و تەنگەنەفەسی ناهێڵێت، ئەوانـەی تووشـی لووتپژانـدەبن گـەڵای گەزنـە بکەنـە لووتیانـەوە و بۆنەکـەی هەڵمـژن لـە لووتپژانەکـە رزگاریانـدەبێت، گـەڵای گەزنـە





لەگەڵ هەنگوین پێکەوە بکوترێن و بخرێنە سەر (دومەڵ) بەزوویی دەریدەدەن و هەموو کێم و پیسییەکەی پاکدەکەنەوە، غەرغەرەکردن بە ئاوی گەزنە هەوکردنی (لۆزەتەین) سووکدەکات، خواردنی گەڵاکەی پاش کوڵاندنی بە رۆنی زەیتوونەوە ئاوسانی قوڕگ و بناگوێ ناهێڵێت، ئەو شوێنانەی مرۆڤ تووشی سڕبووندەبن و پێستەکەیان دەمرێت کە پێیدەوترێت (ئیفلیجی کاتی) ئەگەر بە گەڵای گەزنە بکوترێن وریادەبنەوە و جووڵەیانتێدەکەوێتەوە.

4[] گۆزروانە = گۆزروان: بەعەرەبی (لسان الثور) و بەفارسی (گاوزبان)ی پێیدەوترێت، سوودی زۆرە و خواردنی دەبێتە هۆی بەهێزکردنی مۆخ، لابردنی سنگئێشە، کوڵاندنی گوڵەکەی لەگەڵ (ئاوی سێو و مێوژ)دا دەبێتە خواردنەوەیەك مرۆڤ سەرمەستدەکات، هەر لەبەر ئەوەشە پێیدەوترێت (شەرابی حەڵاڵ).

5[] پەڵپینی = پەڵپینە، بەعەرەبی پێیدەوترێت (بربین)، خواردنی پەڵپینە بەکاڵی و بە کوڵاوی پارمەتیدەرێکی باشە بۆ گەدە، ئەو کەسانەی تووشی (کرمی شریتی) بوون، ئەگەر سێ ڕۆژ پێش خواردنی دەرمانی کرم شۆربای پەڵپینە بخۆن، کرمەکان لەناوسکیاندا بێهۆشدەکەون و خۆشیان رەواندەبن، ئەوەش یارمەتیدەرێکی باشە بۆ ئەوە بەئاسانی فڕێیاندەن، ئارەزووی خواردن زیاد دەکات و چارەسەرێکی باشە بۆ خۆربردن، خواردنی پەڵپینە لەگەڵ ماستدا سوودێکی زۆری هەیە بۆ رزگاربوون لە (لەرزوتا)، بۆ پاککردنەوەی کۆئەندامی میزکردن بەسوودە چونکە گیایەکی میزپێکەرە، رەگی پەڵپینە ئەگەر بکوترێن و باش بگوشرێن ئاوێکیان لێدەردەچێت چارەسەرێکی باشە بۆ لابردنی بالووکە.

6[] قێتەران= قەیتەران: خواردنی چایی قەیتەران چەندین سوودی جۆراوجۆری هەیە لەوانە: (ئارەق بە مرۆڤ دەکات و چارەسەری برك و کۆلێنج دەکات، قوڕگپاکدەکاتەوە و بەڵغەم لادەبات، میزپێکەرە و (رمڵ)ی گورچیلەکان فڕێدەداتە دەرە و ناهێڵێت ببێت بەبەردی گورچیلە و زۆرکەسیش بەخواردنەوەی چایی قەیتەران بەردی گورچیلەیان فڕێداوە)، کەمێك قەیتەرانی وشك بکرێتە ناو دووکوپ رۆنی زەیتوون و بۆ ماوەی (10) رۆوژ بخرێتە شووشەیەکەوە، بەڵام بەمەرجێك رۆژانە بشڵەقێنرێت، پاش ئەو ماوەیە رۆژانە بنی مووەکانی سەری پێچەوربکرێت ئەم سوودانەی هەیە: (کرێشکی سەر ناهێڵێت، تووکەسەر بەهێزدەکات و رووتانەوەی رادەگرێت).

7[] ریواوی = رێواس: بەعەرەبی پێیدەوترێت (ریباز)، خواردنی بۆ بەهێزکردنی دڵ و جگەر بەسوودە، ئاوی رێواس لەگەڵ ئاردی جۆ تێکەڵدەکرێت و لەشی پێسواقدەدرێت هەم

نەرمیدەکاتــەوە و هــەم زیپکــە لادەبــات، هــەروەها زۆربەســوودە بــۆ نەهێــشتنی سەرئێــشە و چــاکبوونەوە لــە هەڵامــەت و ئــەنفلۆنزا، خــواردنی ڕێــواس دەبێتــە هــۆی پاکژکردنــەوە و پتەوکردنــەوەی دەمودان، هــەروەها بــۆ دابەزانــدنی فــشاری خــوێن زۆربەســوودە، ڕەگــی ڕێــواس بەســوودە بــۆ کەمکردنــەوەی ڕێــژەی شــەکر لەخوێنــدا، بەتایبــەت بــۆ ئەوانــەی توشــی نەخۆشــی شەکرە هاتوون.

8 بەلو = بەڕو: بەعەرەبی بێیدەوترێت (بلوط)، ئەگەر بکوترێت و لـەناو ئـاوی گەرمـدا بکوڵێنرێت چارەسەرێکی باشە بۆ سکئێشە، خواردنی بەڕوو بۆ ئەوانەی شەوانە میزدەکەنە ژێر خۆیان زۆر بەسوودە، بەڕووی کـوتراو بـۆ هـەوکردنی هـەموو برینێـك چارەسـەرێکی مـسۆگەرە، گەڵای داربەڕوو بە وشکی بکوترێت و وردبکرێت بۆنکردنی بۆ چارەسەری خوێنبەربوونی لووت باشە.

9 تفی= توو:

1 خــواردنی تــەڕەتوو بــۆ چەرەســەرکردنی (قــەبزی) و نەرمکردنــەوەی ریخۆڵــەکان زۆرباشە.

2 خواردنی شاتوو بۆچارەسەرکردنی قورگ ئێشان و سنگ ئێشان زۆر بەسوودە.

3 تووی وشکەوبوو بکرێنە ناو ئاوەوە و ئاوەکەیان بـە سـکی خـاڵی بخورێتـەوە باشـە بـۆ چارەسەرکردنی (برینی گەدە و دوانزەگری).

4 ئاردی توو لەگـەڵ (قـەیماغی سـرێش) بـۆ دەردانـی بـرین و پاککردنـەوەی لـە کـێم و پیسی زۆر بەسوودن.

5 خواردنی توو لـە زسـتاندا ڕێژەیـەکی بـاش وزە و گـەرمایی بەلـەش دەدات، لـە شـوێنە کوێستانەکاندا بۆ پاراستنی مرۆڤ لە نەخۆشییەکانی سەرما تەواو بە سوودە.

10 بەی= بەهێ:

1 یەك بەهێی گەورە پاکبکرێت و لەناو لترێك ئاودا بۆ ماوەی (20) دەقیقە بکوڵێنرێت وئینجـا شــەکری تێکــەڵبکرێت، چارەســەرێکی زۆر باشــە بــۆ (سکــچوون، بێهێــزی ریخوڵــەکان، هەوکردنی سی و جگەر).





2ـ یەك كەوچكی گەورە تۆوی بەهێ بكرێتە ناو كوپێك ئاو و بەباشی تێكبدرێت هەتاكو ئاوەكە خەستدەبێتەوە، رۆژانە چەند جارێك لێیبخورێت بۆ چارۆسەركردنی برینی گەدە و دوانزەگرێ بەسوودە.

3ـ یەك كەوچك تۆوی بەهێ بكرێتە پیاڵەیەك شیرەوە وكەمێك گەرمبكرێت، پاشان دابنرێت هەتاكو سارد و خەستدەبێتەوە رۆژانە لێیبخورێت چارەسەری سنگگیران و كۆكە دەكات.

4ـ یەك كەوچكی گەورە تۆوی بەهێ بكرێتە ناو كوپێك ئاوەوە و دابنرێت هەتاكو باش خەستدەبێتەوە، بۆ چارەسەركردنی (وشكبوونەوە و چرچ و لۆچی پێست، سووتاوی چرو وچاو، هەوكردنی مایەسیری، لابردنی بیرۆ) زۆر بەسوودە، بەلاّم بەمەرجێك رۆژانە بەو شوێنانەدا بیسوویت.

5ـ كەمێك گەلاّی بەهێ لەناو لترێك ئاودا بۆماوەی (15) دەقیقە بكولێنرێت، پاشان كەمێك گولاّوی تێبكرێت و رۆژانە كەوچكێكی گەورەی لێبوخورێت، بۆ هێوركردنەوەی مێش زۆر بەسوودە.

11ـ مرۆ= هەرمێ:

1ـ مێشك ئاسوودەدەكات و بیری مرۆڤ تیژدەكات.

2ـ دڵ بەهێزدەكات و جۆرێك لە ئارامی پێدەبەخشێت.

3ـ ریخۆڵەكان نەرمدەكاتەوە و كرداری هەرسكردن لە گەدەدا رێكدەخات.

4ـ بۆ چارەسەركردنی نەخۆشی شەكرە زۆر بەسوودە.

5ـ میزپێكەرە و ئازاری میزڵدان و بۆریەكانی میز هێوردەكاتەوە.

6ـ چارەسەرێكی باشە بۆ ئەوكەسانەی تووشی (رۆماتنیزم، هەوكردنی جومگەكان، دەردەمەلیك) بوون.

7ـ ئارەزووی سێكسی زیادەكات و كرداری ئەندامە سێكسییەكان رێكدەخات.

8ـ خوێن پاكدەكاتەوە و فشاری كەمدەكاتەوە.

12ـ ساوی= سێو:

1ـ دوو تا سێ سێو لەتبكرێن و بكرێنە لترێك ئاوەوە، پاش ئەوە بۆماوەی چارەكێك بكولێنرێن كەمێك بەلەكیان تێبكرێت بۆ (هەوكردنی سی، وەرەمی سی) چارەسەرێكی باشە.

2 دوو تا سێ سێو ئەگەر لەڕنە بیدرێن و بخورێن و لەو کاتەدا خواردنی تر نەخورێت زۆرباشە بۆ چارەسەرکردنی گیرانی گەدە و ئارەزوونەکردنی خۆراك.

3 سێو بۆ چارەسەرکردنی برینی گەدە و دوانزەگری زۆر بەسوودە.

4 خواردنی سێو دەبێتە هۆی بەهێزکردنی چاو، جگەر، مێشك و تەنگە نەفەسی ناهێڵێت.

5 چارەسەرێکی باشە بۆ نەخۆشییەکانی (ڕۆماتیزم، هەوکردنی جومگەکان، نەخۆشی دەردەمەلیك).

6 خواردنی سێو بۆ چارەسەرکردنی بەردی (زراو، گورچیلە) زۆر بەسوودە.

7 شەربەتی سێو بۆ نەخۆشییەکاتنی سەرما و هەڵامەت چارەسەرێکی مسۆگەرە.

8 چارەسەرێکی تەواو بەسوودە بۆ کەچەڵی و برینەکانی پێست.

شتێکی ئاشکرایە بێجگە لەوانەی ناموانهێناون، چەندین (میوە، بەروبووم، گژوگیا)ی ترهەن لە هەوراماندا کە خاسییەتی دەرمانیان هەیە و لەم بوارەدا سوودیان لێوەردەگیرێت.

## گوڵبژێرێك لە (واتۆ وەڵینا= پەندی پێشینان)

بۆچوونە ناو ناوەرۆکی ئەم بابەتەوە لەوەوەدەستپێدەکەین کەپەندی پێشینان بەشێکی زیندوون لەناسنامەی نەتەوەیی، لەم بارەیەوە ئینگلیزەکان دەڵێن: (پەندی هەر نەتەوەیەك کتێبێکی گەورەیە بەئاسانی ڕەوشتی ئەو نەتەوەی تێدا دەخوێنرێتەوە)، هەروەها (مەکسیم گۆرکی) گەورە نووسەریش وتوویەتی: (هەرگیز ناتوانرێت مێژووی راستی هیچ گەلێك بزانرێت ئەگەر ئەوبەرهەمانەی دەما و دەم دەیانگێڕنەوە نەزانرێن و بایەخیانپێنەدرێت، چونکە ئەوبەرهەمانە ئاوێنەیەکن بۆ پیشاندانی ژیانی گەل بەهەموو دیاردەکانییەوە و لەهەموو سەردەمە جیاجیاکاندا[1]).

---

[1] بڕوانە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی لاپەڕ (70)، وەرگێڕانی لە رووسییەوە (د. شوکریە رەسولْ ئیبراهیم و جەلال تەقی).

گەلی کورد لەبواری (پەندی پێشینان)دا خاوەنی سامانێکی لەبنەهاتووە، پەندەکانی گەنجینەیەکی پڕلەگەوهەرن و هەموو بوارەکانی ژیانی (کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، فەرهەنگی) دەگرنەوە و ناواخنکراون بە (تێبینی، فەلسەفە، زانیاری، ئامۆژگاری، تاقیکاری)، ئەم پەم پەندانە بەرهەمی رۆڵە (ژیر و هوشیار، زانا و دانا، قسەزان، بەئەزموون)ەکانی گەلەکەمانن و پشتا وپشت بۆنەوەکان گوێزراونەتەوە، پڕن لە (ڕەوانبێژی، جوانکاری، لێکچوون، مانادۆزینەوە، خوازە و خواستە) و ڕەگەزەکانی تری بەلاغە، هەندێك کەس دەڵێن هەموو پەندەکان بۆ گشت سەردەمەکان دەشێن و گیانی نەمری و جاویدانیان لە خۆگرتووە و کەڵکیان هەر بەردەوامە، لەگەڵ رێزی زۆرمان بۆ هەڵگرانی ئەو بۆچوونە بەپێویستی دەزانین لەدیدی خۆمانەوە بڵێن: لە بەر ئەوەی پەندەکان لەدایکبووی سەردەمە جیاجیاکانن، زیاتر تێگەیشتنە ئەقڵانییەکانی ئەو سەردەمانەیان بۆ ژیان هەڵگرتووە، بەلاّم وەك ئاشکرایە رەوەڕەوەی گەشەکردنی ژیان لە هەموو بوارەکانیدا لە بەرەوپێشچوونی بەردەوامدایە و لەگەڵ خۆیدا گۆرانکاری جیددی بۆ هەندێك لە تێگەیشتنەکان پێیە، بۆیە هەموو پەندەکان بۆ هەموو کاتێك گونجاونین، بەتایبەتی ئەوانەیان لەگەڵ رۆحی سەردەم ناگونجێن، وەیاخود سەردەم بێکەڵکی و پووچیان دەسەلمێنیت، کەواتە تەنها ئەو پەندانە بەجاویدانی دەمێننەوە کە نرخ و بەهاکانی ژیان و مرۆڤ بەبەرز و پیرۆز رادەگرن، ئیتر ئەوانی تریان هەرچەندە هەرسامانی نەتەوەیین و بەشێکن لەکەلەپوورمان و نابێت بەبێکەڵك سەیریانبکرێت و نەفرەتیان لێبکرێت، بەلاّم پابەندبوونپێیانەوە بێجگە لە دیلبوون لەناوسرووشت و سوونەت و بێماناییدا شتێکی تر نابەخشێت.

(پەندی پێشینان) لە هەورامانا پێیاندەوترێت (واتۆ وەڵینا)، دیارە واتە بەمانی (وتە) و (وەڵینا) بەمانی پێشینان دێت، کەواتە (واتۆوەڵینا) مانای (واتەی پێشینان) دەبەخشێت، بۆیە ئێمە لەم بابەتەدا هەر بەناوە هەورامییەکەیان ناویان دەهێنینین، هەروەها واتەکان هەرچۆن لەسەر زاری خەڵکی هەورامان دەوترێنەوە دەیاننوسینەوە و بەرامبەریشیان ماناکانیان بەشێوەزاری کرمانجی خواروو دەنووسین، بەواتای دەقە هەورامییەکەیان دەگۆڕینە سەر شێوەزاری کرمانجی خواروو، هاوکات کارمان بەوە نییە ئەم واتانە چۆن لەشێوەزاری کرمانجی خواروودا وەکو پەندی پێشینان بەکاردەهێنرێن. هەر لێرەدا باس لەوەشدەکەین لەکتێبێکی لەم جۆرەدا کە هەموو بوارەکانی ژیانی خەڵکی هەورامان دەگرێتەخۆ، ناکرێت هەموو (واتۆ وەڵینا)کانمان بەپێی پیتەکانی دەستپێکردنیان و بەزنجیرەیەکی یەك لەدوای یەك بنووسین و

قسەیان لەسەر بکەین، بەلاّم وەك لەناونیشانی بابەتەکەدا نووسیومانە گولّبژێرێك لێیان، لەگەلّ راز و بەسەرهاتەکانی پەیوەست بەهەندێکیانەوە بەم شێوەی خوارەوە دەخەینەروو:

1[1] (ونۆ سیاو وەحشیەنە= خوێنی سیاوەحشە)، یاخود دەلێن (بی بە ونەکۆ سیاو وەحشی= بوو بەخوێنی سیاوەحش)، ئەم واتەیە بنەمایەکی مێژوویی هەیە و لە رووداوی کوشتنی (سیاوەیش= سیاوەش)ەوە سەرچاوەیگرتووە، (سیاوەیش) کە هەورامییەکان پێیدەلێن (سیاو وەحش) کوڕی (کەیکاوس) بووە و رازی کوشتنەکەی لەناو کۆمەلّی کوردەواریدا زۆر کۆنە و بۆ سەردەمی پێش نووسینی (شانەمەکەی فیردەوسی)دەگەڕێتەوە، لەسەر رۆشنایی ئەو رازوەش دەوترێت (سودابە) کەیەکێك بووە لەژنەکانی (کەیکاوس) حەزیکردووە لە (سیاوەیش)، بەلاّم هەرچەندە هەولّیداوە لەگەلّیدا نەیتوانیوە لەخشتەیبەرێت، بۆیە دواجار لای کەیکاوس زمانلێداوە بەوەی گوایا دەستدرێژیکردۆتە سەری، بۆ سەلماندنی پاکی و بێتاوانی (سیاوەیش) ئاگرێکی گەورەیان بۆکردۆتەوە و لەمسەر بۆئەوسەر بەناو ئاگرەکەدا چووە و چونکە بێتاوانبووە هیچی لێنەهاتووە، ئیتر لەوەوە خۆی بەدلّشکاو زانیوە و لەباوکی دوورەپەرێزبووە، کاتێك (ئەفراسیاو= ئەفراسیاب)ی شای تووران هێرشیهێناوەتە سەر قەلّەمرەوی (ماد)، کەیکاوس فەرمانیداوە سووپاکەی لەژێر فەرمانەیی (سیاوەیش)دا بەرپەرچی سوپای دوژمن بداتەوە، بەلاّم (سیاوەیش) چونکە خۆی زۆر بەدلّڕەنجاو زانیوە پەیوەندی بەلەشکری (ئەفراسیاو)ەوە کردووە، ئەویش بۆ ئەوەی بۆ جێبەجێکردنی مەرامەکانی خۆی بەکاریبهێنێت زۆر ریزی لیگرتووە و کچێکی خۆی داوەتێ، بەلاّم پاش ماوەیەك بەنامەردانە کوشتوویەتی، کاتێك هەوالّی کوشتنی (سیاوەیش) گەیشتۆتە لای (رۆستەم)، دەستبەجێ چۆتە ناو کۆشکی (کەیکاوس)ەوە و (سودابە)ی سەربڕیوە، هاوکات بەلەشکرێکی گەورەوە پەلاماری (ولاّتی توران)یداوە و کردوویەتی بەیەك پارچە ئاگر و (ئەفراسیاو) هەلّهاتووە، (رۆستەم) ماوەیەك لەوێ ماوەتەوە و حوکمڕانی تورانی کردووە و پاشان بۆ ولاّتی خۆی گەڕاوەتەوە، ئینجا (ئەفراسیاو) توانیویەتی بگەڕێتەوە بۆ (توران)، هەر لەسەر رۆشنایی ئەم رازە هەرکێشەیەك لەناو خەلّکی هەورامانیدا بتەنێتەوە و رەنگدانەوەی خراپی هەبێت دەلّێن (ونو سیاووەحشیەنە).





2 (ڕەنجش بی بەرەنج و فەرادی= ڕەنجی بوو بەرەنجی فەرهاد)، ئەم واتەیەش هەر ناوەرۆکێکی مێژوویی هەیە و لە بەباچوونی ڕەنج و ماندووبوونەکەی (فەرهاد)ەوە سەرچاوەیگرتووە، بەوەی لەکاتێکدا خۆشەویستی (شیرین) هێزێکی وەهای پێبەخشیوە توانیویەتی کێوی بێستوون کونبکات، بەڵام (خوسرەوی پەروێز)ی هاوسەری (شیرین) بەرامبەری درۆزن و ناپاکبووە و بەفیتی پیرێژنێك کە هەواڵی درۆزنانەی مەرگی شیرینی گەیاندۆتە لای، فەرهاد قوڵنگەکەی دەستی هەواداوە بەئاسماندا و نێوچاوانی خۆی داوەتەبەری و لەئەنجامدا مردووە، ڕازی خۆشەویستی نێوان (شیرین و فەرهاد) بۆچوونی جیاواز لەبارەیەوە هەیە، هەندێك بەئەفسانە و هەندێکیش بەڕاستی دەزانن، بەڵام لەهەمووو بارێکدا ئەم ڕازە (خۆشەویستی و ئەوینێکی گەورە، ڕەنج و ماندووبوونێکی زۆر، ناکامی) فەرهاد و (بێبەڵێنی و ناپاکی) خوسرەوی پەروێز دەخاتەڕوو، خەڵکی هەورامان ئەم (واتە)یە دەرهەق بەوانە بەکاردەهێنن کە هەمیشە لە ئەرك و ماندووبووندان و کەچی هیچیان دیار نییە، یاخود بەو خۆشەویستانە دەڵێن کە خۆشەویستیەکەیان بێئەنجامە و بەیەکتری ناگەن.

هەرچەندە هەرکەسێك ڕازی خۆشەویستی (شیرین وفەرهاد)ی بیستبێت، هەمیشە سۆزی بەلای (فەرهاد)دا چووە، کەچی یەکێك لە شاعیرەکانمان لەم بارەیەوە بۆچوونێکی جیاوازی هەیە، لەم بارەیەوە با لەم دوو دێڕە شیعرە وردبببینەوە:

**هیچ کەس نەواچۆ وە فەرهاد ڕەندەن نەقشی شیرینش نەرووی سەنگ کەندەن**

**دەك ڕیزان دەس با وەرجە گیان سەندەن کێ ئەڵماس وە رووی دید و وێش شەندەن**

ئەم شیعرە کەمێك جیاوازی لەسەری هەیە، زۆرکەس دەڵێن شیعری (مەولەوی) و هەندێکیش پێیانوایە شیعری (خانای قوبادی)یە، بەهەرحاڵ شیعری هەرکام لەدوو زاتە بێت، ناوەرۆکەکەی باس لەوەدەکات: هیچ کەس نەڵێت (فەرهاد) کەسێکی ڕەند بووە و نەقشی شیرینی لە ڕووی بەرد هەڵکەندووە، ئەگەر ئەو ئەویندارێکی ڕاستەقینە بووە چۆن دڵی هاتووە قوڵنگە بگرێتە نێوچاوانی خۆی؟ لێرەدا مەبەستی شاعیر لەنێو چاوانی خۆی ئەوە نییە کە (فەرهاد) قوڵنگەی گرتۆتە نێوچاوانی خۆی و لەئەنجامی ئەوەدا مردووە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە چۆن دڵی هاتووە لەکاتی تاشینی پەیکەرەکەی (شیرین)دا بەمەبەستی دەرکردنی شێوەی ڕوومەتی لەسەر بەردەکانی بێستوون قوڵنگە ئاژنی ڕوومەتی بکات.

3 (گۆڕێ گرتشا کەنار ژەنی لوێ ئۆهەوار= گەورەکان گرتیان کەنار ژنانیش چوون بۆ هەوار)، ئەم واتەیەش هەر وەکو هەردوو واتەی پێشوو ناوەرۆکێکی مێژوویی هەیە و

دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی لەشکرکێشییەکانی (میرتەیمووری گورگانی= تەیمووری لەنگ)، دیارە ناوبراو کەسێکی خوێنڕێژ و داگیرکارێکی جیهانگیربووە، لەکاتی لەشکرکێشییەکانیدا ژمارەیەکی زۆر لە حوکمڕان و دەسەڵاتدار و کەسێتییە دیارەکانی ئەو ناوچانەی هێرشیکردوونەتەسەر، بۆ پاراستنی گیان خۆیان کەناریانگرتووە و خۆیانشاردۆتەوە، ژن و منداڵەکانیش ڕێگەی هەوارگە شاخاوی و سەختەکانیان گرتۆتەبەر، هەرچەندە لێرەدا پێویستە ئاماژەبدەین بەوەی حوکمڕانی هەورامان لەوسەردەمەدا (سلێمان بەگ) بووە و بەجۆرە ڕێککەوتنێك توانیویەتی هەورامان لە کوشت و کوشار و وێرانکاری بپارێزێت.

4 (ولی بێ دڕەیە نییەنە= گوڵی بێ دڕك نییە)، شتێکی ئاشکرایە ئەوەی لە شێوەزاری کرمانجی باشووردا پێیدەوترێت (گوڵەباخ) لە هەوراماندا پێیدەوترێت (ولی) و چەند جۆرێکیان هەیە وەك (ولە گولاوی، ولە هۆشێ، ولەتووتی...هتد)، ئەم گولانە بەشێوەیەکی گشتی دیمەنیان جوانە و هەشیانە بۆنی زۆر خۆشە بەتایبەت (ولە گولاوی)، ئەم گولانە هەرچەندە هێمای (بۆنخۆشی، خۆشەویستی، پاکی، بەها جوانەکان)ن، بەلام زۆربەیان دڕکیان هەیە، مرۆڤ ئەگەر بەهێمنی و بەئاگاییەوە دەستیان بۆ نەبات لەوانەیە دڕکەکانیان بچن بەدەستیدا، ئەم واتەیە بنەمایەکی کۆمەڵایەتی هەیە و زۆر بەواقعبینانەش دەڕوانێتە مرۆڤ، شتێکی ئاشکرایە مادام مرۆڤ (حەز، ئارەزوو، غەریزە)ی هەیە هەرگیزا و هەرگیز ناتوانێت فریشتەئاسا ڕەفتاربکات، کەسێك نییە لەسەر ڕووی ئەم دونیایەدا هیچ کەمو کوڕییەکی نەبێت و لەهەموو دۆخەکاندا بتوانێت سەرجەم بەها جوانەکان لەخۆیدا کۆبکاتەوە، بۆیە بەرامبەر بەو کەسانەی سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵێك خەصڵەتی باشیان هەیە، کەچی ڕێکدەکەوێت جۆرە هەڵسوکەوتێك دەکەن کە شیاوی کەسێتی ئەوان نییە، یاخود لە سووچێکی بچووکی کەسێتییانەوە کەموکوڕیان هەیە، دەوترێت (ولی بێ دڕەیە نییەنە).

5 ئیندەت مدۆ ونە بیاوی هەری واچی مەرحەبا لالۆ= ئەوەندەت لێدەدەم بگەیت بەکەر بڵێت مەرحەبا خاڵۆ)، ئەم واتەیە هەڕەشەیەکی زیادەڕۆیانەیە کەسێك لە کەسێکی تری دەکات، دیارە بەپێی ناوەرۆکی واتەکە ئەوەی هەڕەشەکەدەکات زۆر خۆی بەخاوەن هێز و توانا دەزانێت و بەرامبەرەکەی بە بێدەسەلات دەزانێت وەك خۆفشکردنەوەیەکە بەسەریدا.




**6[1] (بەچەمچێو ئاوی مێوە مەڵێ= بەکەوچکێك ئاو دێتە مەلە)، بەرامبەر بەو کەسانە دەوترێت کە (نەدی و بدی)ن، بەدەسکەوتێکی کاتی کەم لەخۆیان بایدەبن و پێشینەی خۆیان لەبیردەکەن، ئەو جۆرە کەسانە هەم لەرووی هەڵسو کەوت و هەم لەڕووی قسەکردنیانەوە دەگۆڕێن.**

**7[1] (تەوێڵەیی قاقەزی چەرمە موانۆوە= تەوێڵەیی کاغەزی سپی دخوێنێتە)، دەربارەی ئەم واتەیە لە ناو خەڵکی هەوراماندا دوو سەرگوزەشتە هەیە، یەکەمیان باس لەوە دەکات گوایا لە یەکێك لە هێرشەکانی حکومەتی (حەمەڕەزا شای پەهلەوی) بۆ سەر هەورامان (گوندی دزڵی) سوتێنراوە و خەڵکەکەی هیچیان بۆ دەرنەچووە، ئەوەش بووە بەهۆی خولقاندنی دۆخێك لەنەبوونی و کەمدەستی لەناویاندا، لەو ساڵەدا (مەحموود خانی دزڵی) نامەیەکی بۆ (قادربەگی جافرسان) نووسیوە کە لە (تەوێڵە) نیشتەجێبووە و داوای بڕێك قەرزی لێکردووە، کاتێك نامەکە گەیشتۆتە دەست ناوبراو هەڵیپچڕیوە و سەیریکردووە هەر سپییە و هیچی تێدا نەنووسراوە، ئەویش زۆری پێسەیر بووە و داویەتە دەست یەکێك لە ئامادەبووانی مەجلیسەکەی بەناوی (میرزا ئەولقادری تەوێڵەیی) و پێیوتووە ئایا تۆ هیچ شتێك لەم نامەیە تێدەگەی؟ ئەویش داوایکردووە چرایەکی فانۆسی داگیرساوی بۆ بهێنن و کاتێك نامەکەی داوەتە بەر رۆشنایی چراکە، توانیویوتی بیخوێنێتەوە و مەرامەکەی (مەحموود خان)ی بۆ (قادربەگ) ئاشکراکردووە، هاوکات وتوویەتی ئەم نامەیە بە ئاوی پیاز نووسراوە، دیارە مەبەستی (مەحموود خان) ئەوە بووە ئەگەر دەست کەسێکی ناحەز کەوت، نەزانێت ناوەرۆکەکەی چییە، ئیتر لەوەوە وتراوە تەوێڵەیی کاغەزی سپی دەخوێنێتەوە.**

**سەرگوزەشتەی دووەمیشیان دەڵێت: لەسەردەمی حوکمڕانی (ناسرەدین شای قاجار)دا چەند کەسێکی هەورامی کە یەکێکیان تەوێڵەی بووە گیراون و پێکەوە لە زیندان پەستێنراون بەبێئەوەی کەسێك هەواڵیان بزانێت، لەناو خۆیاندا قسەیان لەسەرئەوەکردووە چۆن هەواڵیان بگەیەننە کەس وکاریان، بۆیە تەوێڵییەکە بە ئاوی پیاز نامەیەکی نووسیوە و باسی چۆنییەتی دەستگیرکردنیان و شوێنی زیندانیکردنیانی تێدا نووسیوە، ئەوانەی لەگەڵیدابوون وتوویانە خۆ ئەمە هەرسپییە و هیچی تێدا نەنووسراوە، ئەویش لەوەڵامدا وتوویەتی خوادەکات دەتوانم بینێرم بۆ کەس و کارم ئەوان دەیخوێنەوە چونکە تەوێڵەیی کاغەزی سپی دەخوێننەوە.**

**لێرەدا دەمانەوێ بڵێین ئەم شێوە لە کاغەز نووسین زۆرجار دووبارە بۆتەوە هەربۆنموونە: (فەهد)ی سکرتێری گشتی حزبی شیوعی عێراق لەکاتی زیندانیکردنیدا، چەند**

جارێك بەناوی پیاز نامەی نووسیوە و ناردوویەتی بۆ رێکخسنەکانی ئەو حیزبە لە ئاستە بەرزەکاندا.

8 (تیکە بژاوە ئینجا قووتش دە= پارو بجو ئینجا قووتی بدە)، شتێکی ئاشکرایە مرۆڤ پێش ئەوەی پارو قووتدابدات پێویستە باش بیجوێت، خۆ ئەگەر نەیجوێت پێدەچێت بگیرێتە قورگی و ئازاری بدات، وەیاخود بیخنکێنێت، ئەگەر بە بێجوین چووە ناوگەدەشی ئەوە هەر باش نییە و هەرسکردنی گرانە، ئەمەی باسمانکرد تا ئێرە تەنها مانا روالەتییەکەی ئەم واتەیە، بەلاَم ناوەرۆکەکەی شتێکی ترە و پێماندەلێت: بەرلەوەی قسەیەك بکەن بزانن چیدەلێن و ئەو قسە چەکاردانەوەیەك لەسەر ئەوانەی گوێگرینی دروستدەکات، شتێکی وانەلێن پاشان پەنجەی پەشیمانبوونەوە بگەزن، هەروەها پێش ئەوەی هەلوێستێك وەربگرن وردببنەوە بزانن تا چ رادەیەك بۆ خۆتان و بۆ دەورووبەرەکەتان سوودمەندە.

9 (جووجەلێ وەهاری پاییزەنە بژمارە= جووجکەی بەهار لەپاییزدا بژمێرە)، ئەگە تەنها لە رووە روالەتییەکەیەوە بڕوانینە ئەم واتەیە، واتێدەگەین کەسێك ئەگەر لە بەهاردا بۆ نموونە (20) جووجکەی هەبوو، مەرج نییە هەتاکو پاییز هەموویان بمێنن، بەلاَم لەراستیدا ناوەرۆکی واتەکە ناوەرۆکێکی ئەقلانییە و مەبەستی ئەوەیە نابێت مرۆڤ لەبەرنامەی ژیانیدا زەمەن و رووداوە چاوەڕواننەکراوەکانی فەرامۆشبکات، چونکە مەرج نییە هەموو کاتێك رووداوە چاوەڕواننەکراوەکان بەپێی حەز و ویستەکانی ئەوبن.

10 زوان بازەم سەرەم سلاَمەت= زمان بمهێلە سەرم سەلامەت)، ئەم واتەیە ئەگەر بەو مانایە لێکبدرێتەوە کەمرۆڤ بەرامبەر (چەوساندنەوە، ژێردەستی، ستەملێکردن، دیاردە و کرداری ناڕەوا) بێدەنگبێت وراستییەکان لەخۆی ونبکات هەر لەپێناوی ئەوەدا سەری سەلامەتبێت، ئەوە بێجگە لەخۆگێلکردن و بێهەلوێستی و دابڕان لەبەها جوانەکان مانایەکی تری نییە و ئەو سەرسەلامەتییەش سەرشۆڕی و سازشکارییەکی پەتییە، بەلاَم لەبوارێکی تردا ئەگەر بەومانایە لێکبدرێتەوە کەمرۆڤ بەقسەی نابەجێ و بێسەروبەر هەستی خەلکانی تر بریندارنەکات و کێشە بۆ خۆی دروونەکات ئەوە کارێکی چاك و سوودمەندە، شتێکی ئاشکرایە لەناو کۆمەلێکی دواکەوتووی وەك کۆمەلی کوردەواریدا ئەم واتەیە و واتە هاوشێوەکانیشی





هەمیشە کاریگەری خراپیان لەسەر مرۆڤی کورد درووستکردووە و بەئاکارە خراپەکەیاندا بەکارهێنراون.

11ا (ئاگات ئافەرمی بۆ= ئاگات لە ئافەرین بێت)، ئەم واتەیە ناوەرۆکێکی ئەقڵانی هەیە و لای خەڵکی هەورامان بۆ ئەوە دەوترێت کە مرۆڤ هەرشتێك پێیدەوترێت لە سەری پێویستە بیداتە بەرتیشکی ئەقڵ و ژیری و لەمێشکی خۆیدا ڕاڤەیبکات، وانەکات بەخۆی خەڵکی فێڵاوی و هەلپەرست بەقسەی چەور سابوون لەژێر پێی بدەن و یاری بە ئەقڵیبکەن، بۆ ئەوەی بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریبهێنن ئافەرینی درۆزنانەی لێبکەن و بیکەن بەئامێرێك بەدەستی خۆیانەوە.

12ا (هەر کەس چەنێوەت چەڤنۆ پۆرە گۆچەوەنێوەش چەڤنە پۆرە= هەر کەس دەرزییەکت پیا دەچەقێنێ سووژنێکی پیا بچەقێنە)، ئەم واتەیە ناوەرۆکێکی خراپ و تۆڵە ئامێزانەی هەیە، هەرچەندە ئەگەر لەسەردەمی خۆیدا واتەیەکی لەم چەشنە جۆرێك ڕەوایی تێدا بووبێت، بەلاّم بۆ ئێستا زۆر بێکەڵکە چونکە گیانی کینە و تۆڵە سەندنەوە پەروەردەدەکات و لەگەڵ ڕۆحی لێبوردن و دونیای پێشکەوتندا نایەتەوە، هەقە لەم ڕۆژانەدا ئەم جۆرە واتانە بخەینە لاوە و تەنانەت لە کاتی گەورەترین ڕقیشدا نەیانکەین بە نموونە.

13ا (کە ئەدا بیە بە بابەژەنی تاتێچ بۆ بە بابەپیارە= کە دایك بوو بە باوەژن باوکیش دەبێت بە باوە پیارە)، ئەم واتەیە ڕاستە و ڕاست پەیوەستە بەباری پەروەردەیی خێزانەوە پاش ئەوەی یەکێك لە کۆڵەکییە سەرەکییەکانی کە (دایك)ە، چ بەهۆی مردن، یاخود تەلاّقدان، یاخود هەر هۆیەکی ترەوە لەدەستدەدات، واتەکە هەرچەندە بە گشتگیری دەڕوانێتە ئەو باوکانەی باوەژن دەخەنە ناو منداڵەکانییانە و هەمان تێڕوانینیشیان بەرامبەر باوەژنەکان هەیە، بەلاّم تارادەیەکی زۆر بە واقعبینانە سەیری ئەم مەسەلەیە دەکات، هەموومان شتێك لە هەڵوێستی باوەژنەکان بەرامبەر (منداڵی مێردەکانیان= هەنەزاکانیان) کە لە خۆیان نین و بەهەمانشێوە هەڵوێستی باوەپیارەکان بەرامبەر (منداڵی ژنەکانیان= کۆڵە بەستەکانیان) کە لە خۆیان نین، دەزانین، بۆیە لەسەر ئەم لایەنە ناڕۆین، بەلاّم پێویستە ئەوە بڵێین لەگەڵ ئەوەشدا ئەم واتەیە تێڕوانێکی واقعبینانەیە، بەلاّم چەندین باوکیش هەن سەرەڕای ئەوەی پاش مردنی ژنەکانیان، یان تەلاّقدانیان، یاخود لە دۆخی فرەژنیشدا دەژین، کەچی سۆز و خۆشەویستییان بۆ منداڵەکانیان هیچ گەردێکی لەسەر نییە، هەروەها چەندین باوەژنیش هەن منداڵی مێردەکانیان وەك منداڵی خۆیان پەروەردەدەکەن بەتایبەتی ئەوانەیان منداڵیاننابێت.

14[أ] (ئـەدا هەشـەنە بـۆش وەشـەنە= دایـك ورچـیش بێـت بـۆنی خۆشـە)، دیـارە لـە هەورامانـدا هەرکەسـێك زۆر ناشـیرین و نـاقۆلاَ بێـت بـە (ورچ) دەیـشوبهێنن و دەڵـێن ئـەجو (هەشەنە) بەمانای دەڵێی ورچە، شتێکی ئاشکراشە کەدایك چەندە خۆشەویستە و کەسێك نییە دایکی هەر چۆنێك بێت خۆشی نـەوێت، ئـەم واتەیـە ئەگـەر لـەرووی مانـا رواڵەتییەکەیـەوە و لیکـشوبهاندنەوەکەیەوە سـەیریبکەین لەوانەیـە پێمـان جوانـنـەبێت، بـەلاَم ناوەرۆکەکـەی لەگەورەیی و خۆشەویستی دایك لای منداڵەکانی باسـدەکات، ئـەو خۆشەویـستییەش بەرادەیەکـە دایك هەرچەندە (هەژار، ناشیرین، نەخۆش، پەککەوتـە) بێـت، بـەلاَم لای منداڵـەکانی هەمیـشە خۆشەویتە و رێزی لێدەگیرێت.

15[أ] (دنیـا پۆچـی وەشـا بـیٚ بـەرە بـۆ= دونیـا بۆیـە خۆشـە بێـدەرگا بێـت)، ئـەم واتەیـە مانایەکی زۆر گەورەی هەیە و یەکێکە لەواتە چاکەکان، شـتێکی ئاشـکرایە هـیچ کـەس ناتوانێـت دەرگابخاتە دونیا، کلیلەکەی بخاتە گیرفانییـەوە و بەهەوەسـی خـۆی بیکاتـەوە و دایبخـات، بـەلاَم کـۆنترۆڵکردنی ئـازادی خـەڵك و دەسـتتێوەردانی سەربەسـتییەکانی وەك ئەوەیـە هـەموو ئـەم دونیایە کرابێت بە هۆدەیەك بـۆی و کلیلـدرابێت لەسـەری، لێـرەوە دەبیـنین نـاوەرۆکی واتەکە باس لەئازادی مرۆڤ دەکات بەوەی چۆن بیردەکاتەوە و لـە چ جێگایـەك دەیـەوێت بـژی کەسـێك نەبێت ئەو مافانەی لێزەوتبکات.

16[أ] (گـاوە جـە گاوگـەلی برپـو شـاخیٚ وێـش مـارۆ= گـا لەگاگـەل ببڕێـت شـاخی خـۆی دەشکێنێت)، ئـەم واتەیـە قـسە لەسـەر ئـەوەدەکات کـە کۆمـەڵ سەرچاوەی ژیـانی ئاسـوودەیی و بەختەوەرییە، مرۆڤ پێویستە هەمیشە لەناو کۆمەڵدا بژی و دابرانی لێیدەبێتە مایـەی زیـان و نارەحەتی بۆی.

17[أ] (کەڵەشیریچ نەبۆ هەر رۆ بۆوە= کەلەشـێریش نـەبێت هـەر رۆژ دەبێتـەوە)، شـتێکی ئاشـکرایە هـەموو شـەوێکی تاریـك بـە رۆژێکـی رووناـك کۆتایـدێت و زەمـەن ناوەسـتێت، پێـشتر خەڵکی زۆر حیسابیان بۆ خوێندنی کەڵەشێر بۆ دیاریکردنی کات کردووە، بـۆ نموونـە وتوویانـە (کەڵەشێری نیوەشەو خوێندی، کەڵەشێری چێشتەنگا خوێندی، کەڵەشێری عەسـران خوێنـدی)، بەو شێوەیە ئیتر کەڵەشێر تارادەیەك دەوری سەعاتی بینیـوە، نـاوەرۆکی ئـەم واتەیـەش ئەوەیـە زەمـەن ناوەسـتێت و ژیـان بەردەوامـە، زیـاتریش لـەو کاتانـەدا دەوترێتـەوە کەسـێك بـۆ

جێبەجێکردنی کارێك پێویستی بە هاوکاری کەسێکی تر بێت، بەلام بەرامبەرەکەی هاوکارینەکات و بەتەنگییەوە نەبێت، هاوکات خۆشی لەوبڕوایەدابێت کە هەرچۆنێك بێت دەتوانێت کارەکەی ئەنجامبدات.

18 (تەوەنێوە ئاسمانۆ وەرەبۆوە گنو ملو سەرۆ فەقیریویەرە= بەردێك لە ئاسمان بەربێتەوەکە دەدات بەسەرسەری هەژارێکدا)، ئەم واتەیە ناوەرۆکێکی کۆمەلایەتی دواکەوتووانەی هەیەو لەسەربنەمایەکی سازشکارانە داڕێژراوە، مەبەست لەواتەکە ئەوەیە گوایا خەڵکانی هەژار (نەگبەت، کلۆڵ، داماو)ن و ئەو حاڵەتە بووە بە مۆرێك نراوە بەنێوچاوانیانەوە، هەموو هەوڵێکیشیان بۆ دەربازبوون بێهودەیە، هەروەها تەنیا لەرووی جۆرە سۆز و بەزەییپیاهاتنێکەوە دەڕوانێتە ئەو چەوساندنەوەی لە سەریەتی.

19 (دار کرمیش جەوێش نەبۆ هەزار ساڵێ مژیوۆ= دار کرمی لە خۆی نەبێت هەزار ساڵ دەژی)

ئەم واتەیە یەکێکە لە واتە چاکەکان و کاریگەری گەورەی لە بوارەکانی (کۆمەڵایەتی، سیاسی، حوکمڕانی)دا هەیە، شتێکی دیارە دار ئەگەر نەخۆش و کرمەڕێز نەبێت ماوەیەکی زۆر دەژی و تەمەنی خۆی دەگوزەرێنێت، بەلام ئەم واتەیە داری شوبهاندوە بە کۆمەڵ و ئەو خەڵکاش گیانی (سیخوڕی، نۆکەرایەتی، جاشایەتی، پیاوخراپی)یان هەیە شوبهاندوونی بە (کرم)، هەر چۆن کرمەکە لەسەر دارەکە دەژی لێیدەخوات و کلۆڵیدەکات، ئەو کەسانەش بەکردارە ناڕەواکانیان دووبەرەکی و دڕدۆنگی دەنێنەوە، لەپێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان و تەخشان و پەخشانکدنەوەی پارە بەسەریاندا دەبن بەنۆکەری دوژمنانیان، بەو کردارانەشیان جەستەی کۆمەڵەکەیان کلۆڵ و بێهێزدەکەن و دوژمن بەسەریدا زاڵدەکەن.

20 (سوار هەتا نەگنۆ مەبۆ بەسوار سوار هەتا نەگلێت نابێت بەسوار)، وەڵاخ بەهەموو جۆرەکانییەوە شان بەشانی مرۆڤ لە هەموو بوارەکانی ژیاندا رۆڵیگێڕاوە، سوارە چاپك و کارامەکانیش هەمیشە شوێنی تایبەتیان هەبووە لەناو تیرە و خێڵەکاندا و ریزیان لێگیراوە، حوکمڕانەکان لەشەڕ و لەشکرکێشییەکانیاندا بۆ داکۆکیکردن لە قەڵەمڕەوی حوکمڕانییەکانیان زۆر پێویستیان بە سوارە ئازاکان بووە، خێڵ و تیرەکانیش بە هەمانشێوە لە پاراستنی ماڵ و حاڵیان و بەگژاچوونەوەی نەیارەکانیاندا پشتیان بەسوارە ئازاکانیان بەستووە، شتێکی شاردراوە نییە سوارەکان هەتاکو بوون بەسوار چەندینجار گلاون و زۆریشیان لەئەنجامی گلانەکەیاندا دەست و قاچیان شکاوە و تووشی کێشەی تەندرووستی هاتوون، ئەم واتەیە زۆرجار لەو کاتەدا

دەوترێت کەسێك لە ئـەنجامی کارێکدا تووشـی نارەحـەتییببێت، یـاخو لەئـەنجامی کەمـشارەزایی لەو کارەدا وەکو پێویست نەیەت بەدەستییەوە.

21 (دۆستت ئانەنـە گراونـۆت، دوژمنـت ئانەنـە لاونـۆت= دۆسـتت ئەوەیـە دەتگرێنێـت، دوژمنت ئەوەیە دەتلاوێنێت)، ئەگەر لەرووی وشەسازییەکی رواڵەتییەوە بڕوانینـە ئـەم واتەیـە دەبینین جۆرە ناکۆکییەکی تێدایە چونکە لەم بوارەدا لاواندن باشـترە تـا گریانـدن، بـەڵام مـرۆڤ پێویستە بزانرێت ئەو لاواندنە کێ دەیکات و بەرامبەر بەچییە؟ بەهـەمان شـێوە گریاندنەکە کێ دەیکات و لەسەر چییە؟ دیـارە ئەگـەر دۆسـتەکەت بـە ئامۆژگـاری و قـسەی زبـر بتگرێنێـت، بێگومان ئەوە لەسەر سوودی خۆتە و لەهەڵەیەك دوورتدەخاتەوە کە بۆی هەیە لـەو کاتـەدا تـۆ وەکو ئەو پەی بـەو مەسـەلەیە نەبـەیت کـە لـە پێناویـدا دەتگرێنێـت، بـەڵام لاواندنەکـە ئەگـەر کەسـێك بیکـات بیـەوێت فریوتبـدات و بەقـسەی چـەور بتخاتەسـەر رێگـەی هەڵـە و راسـتی مەسـەلەکانت لێـچواشەبکات، ئـەوە بێگومـان ناحەزتـە و کێـشەت بـۆ درووسـتدەکات، پاشـان پێتپێدەکەنێت و لێتدووردەکەوێتەوە و هەرچی زیان و نارِەحەتییەکیش تووشتببێت بەلایـەوە گرنگ نییە.

22 (هامسا جە هامسای گیرۆ سەراسێ = دراوسێ لە دراوسێ دەگرێت سەراسێ)، سەراسـێ جۆرە سەرئێشەیەکی زۆر توند و مرۆڤ بێتاقەتکەرە و پێیدەوترێت (شەقیقە)، زۆجار بە حـەپ و دەرمانیش سوکنابێت، ئەم نەخۆشییە وەك هەڵامـەت و ئـەنفلۆنزا و نەخۆشییە درمییـەکانی تـر نییـە لەمرۆڤێکـەوە دەگوێزرێنـەوە بـۆ یـەکێکی تـر، بـەڵام مەبەسـتی واتەکـە ئەوەیـە کـە هەنـدێك خـەڵك هـەن هەمیـشە چـاو لەیـەکتری دەکـەن و بەئاسـانی خـووی یـەکتری دەگـرن، بەبێئـەوەی هـیچ بـیر لـەوە بکەنـەوە ئایـا ئـەو چاولێکردن و خووگرتنـە پڕبەپێـستی حاڵـەتی ئەوانە یـان نـا؟ بـەڵام تـەنها وەك جۆرە بەخیلییـەك و لاساییکردنەوەیەکی کوێرانـە بـەو کـارە هەڵدەستن.

23 (زەڕ دیین بەرۆ و دیینیچ مدۆ = پـارە دیـین دەسـێنێتەوە و دیینـیش دەدات)، ئـەم واتەیـە خوێندنەوەیـەکی ژیرانەیـە بـۆ هەڵـسوکەوتی خـەڵکانی پـارەدار و دەوڵەمەنـد لـەناو کۆمەڵدا، ئەگەر ئەو پارەدار و دەوڵەمەندانە پارەکانیان بە ئاکارێکی خراپ بەکار بهێـنن و گـوێ بـەوە نـەدەن ئایـا شـێوازی کۆکردنـەوە و خـەرجکردنی پارەکانیـان چاکە یـاخود خـراپ، هـیچ





هاوکارییەکی خەڵکی هەژار و نەداری پێنەکەن و تەنها مەبەستیان قەبەکردنی سەرمایەکانیانبێت، بێگومان ئەو پارانە وەك بەڵایەکە بەسەریانەوە و کاریگەری خراپی هەیە لەسەر پایەی دینی و کۆمەڵایەتییان لەناو خەڵکدا و خوای گەورەش لەخۆیان دەرەنجێنن، بەڵام سەبارەت بەو پارەدار و دەوڵەمەندانەوە کە پارەکانیان بۆ خۆشگوزەرانی خۆیان و خێزانیان و کەسوکاریان بەکاردەهێنن، یارمەتی هەژاران و لێقەوماوان دەدەن و کەموکوڕیان جێبەجێدەکەن، پارەکانیان ناو و نەنگێکی باشیان بۆ پەیدا دەکات و دەبێتە هۆی ئەوەی پایەی کۆمەڵایەتی و دینیان لەناو خەڵکدا بەبەرز بنرخێنرێت، هاوکات خوای گەورەش لەخۆیان رازیدەکەن.

24 ئۆجاخەش رۆشنەنە وەجاخی روونە[*]، ئەم واتەیە زۆر کۆنە و قووڵیی لە ناو کولتووری دینی خەڵکی ناوچەکەدا هەیە، شتێکی ئاشکرایە هەورامییەکان پێش سەرهەڵدانی دینی ئیسلام لەسەر دینی زەردەشتی بوون، یەکێك لە سیما دیارەکانی دینی زەردەشتیش ئەوەیە کە پێویستە ئاگری ناو کوانووی ماڵ بەردەوام بسووتێت و نەکوژێتەوە، خەڵکی هەورامان بە کوانوو دەڵێن (هۆجاخە، هارگا) و ئەرکی ئاگرکردنەوەش لەئەستۆی نێرینەدا بووە، هەر ماڵێك نێرینەیان نەمابێت ئاگرەکەیان کوژاوەتەوە وخەڵکەکە وتوویانە وەچاخیان کوێر بووەتەوە، هەر لەم بوارەدا پێویستە باس لەوە بکەین تا ئێستاش لە هەورامانندا ئەو ژن و مێردانەی کوڕیان نییە، وە یان هەر مندالیان نییە پێیانـدەڵێن (ئوجاخ کور=وەچاخ کوێر)، هەروەها ئەو باوك و دایکانەی کوڕەکانیان خراپ و بێکەڵکن چ خۆیان وەیاخود خەڵکی تر دەڵێن خوزگە فلانە کەس وەچاح کوێر بوایە نەك فلانە کوڕی بووایە.

25 خاکو چێرو پایش پێ حۆت دەرمانەی مشیۆ= خۆڵی ژێر پێی بۆ حەوت دەرمانە دەشێت، پێش ئەوەی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان بەم شێوەی ئێستا پەرەبسێنن، جۆرێك لە پزیشکی و دەرمانگەری میللی باوبووە، (حەوت دەرمانە)ش یەکێکبووە لەو دەرمانانەی بۆ چارەسەری چەند نەخۆشیەك بەکارهێنراوە، شتێکی دیارە خۆڵ خاسییەتی خۆی هەیە و داودەرمانیش خاسییەتی خۆیان هەیە، بەڵام کەبە کەسێك دەوترێت (خۆڵی ژێر پێی بۆ حەوت

---

[*] دەربارەی وەچاخ (د. شوکریە رەسوول) لە زمانی (رۆدینکۆ)وە نووسیویەتی: (وەجاغ) بەکۆمەڵە دەوترێت کە ژمارەیان لەنێوان (10 20) خێزانێك بێت.

بڕوانە (مەلا مەحمودی بایەزیدی) داب و نەریتی کوردەواری وەرگێڕانی لە رووسییەوە (د. شوکریە رەسوول) لاپەڕە (24).

دەرمانە دەشێت)، مانای ئەوەیە کەسێکی لە (خواترس، بێوەی، سوود بەخش، نەرموونیان)ەو هەڵسوکەوتی لەناو کۆمەڵداباشە.

26 سەرو ئاو و حەمامیۆ پیاوەتی کەرۆ = بەسەر ئاوی گەرماوەوە پیاوەتیدەکات، ئەم واتەیە زۆر کۆن نییە، چونکە پێشتر خەڵکی هەورامان لە (ناوماڵ، حەوزی مزگەوت، کانی ژنان، جۆگە، چەم ... هتد) خۆیانشتووە، پاشان لە هەندێك گوندی ناوچەکەدا گەرماوی گشتی درووستکراوون، بەتایبەت لە (شارەدێی تەوێڵە، شارەدێی بیارە، بەڵخە، پاوە، نۆدشە ... هتد)، پاشان خەڵك بەرەبەرە لەناوماڵەکانیانـدا گەرماو و سەرشۆرگەی تایبەت بە خێزانیان درووستکردووە، شتێکی ئاشکرایە هەرکەسێك دەچێت بۆ گەرماوی گشتی بەرامبەر بە بڕێك پارە خۆیدەشوات و هەرچەند ئاو بڕژێنێت ئازادە، ئەم واتەیە بەرامبەر ئەو کەسانە دەوترێت قسەی زڵ دەکەن و بەڵێنی شت دەدەن بەخەڵکی تر کە لەسەرخۆیان نەکەویت، یاخود شتێك دەبەخشن پشتیان پێوەینەیەشابێت.

27 بیبە رەفیقو قەلەندەری، جە ریش و سمیڵی بی بێبەری = بوبەهاوڕێی قەلەندەر لە ریش و سمێڵ بێبەریبوو، ئەم واتەیە بنەمایەکی مێژوویی هەیە، دەربارەی کەسێتی قەلەندەر دوو بۆچوون هەن بەم شێوەیە:

أ هەندێك لە خەڵکی ناوچەکە دەڵێن (قەلەنـدەر) مەبەست لە پیر قەلەنـدەری هەورامییە کە وەستای درووستکردنی کلاشەکانی پیرشالیار بووە و تا ئێستاش تاکێکیان لەمەرقەدەکەی ناوبراودا پارێزراوە.

بـ ابن بطوطة دەڵێت: قەلەنـدەری تیرەیەکن (سەر، ریش، سمێڵ، برۆ)یان دەتاشن و دەچنەوەسەر (شێخ جەمالەددینی ساوەیی) و رازێك دەربارەی ناوبراو دەگێڕێتەوە بەم شێوەیە: شێخ جەمالەددین کەسێکی جوان و تەڕپۆش بووە، ژنێك حەزی لێکردووە، چەند جارێك نامەی بۆ ناردووە و سەرڕێی لێگرتووە، بەلام بێسوودبووە و ناوبراو گوێینەداوەتێ، دواجار پیرەژنێکی کردووە بە تووشییەوە و رۆژێك سەرڕێی مزگەوتی لێگرتووە و پێیوتووە: کوڕەکەم کاغەزێکی بۆناردووم و دەمەوێ جەنابت بۆم بخوێنیتەوە، بەلام ئەوەندە ئەرکبکێشیت لەگەڵما تەشریفبهێنیت بۆ ماڵەوە هەتا بووکەکەشم گوێی لەنامەکەبێت، کاتێك شێخ لەگەڵیا چووە بۆ ماڵەوە پیرەژنەکە دەرگاکەی لەسەر داخستووە و دووکارەکەری ژنەکەش بەزۆر شێخیان بردۆتە

ناو هۆدەیەکەوە، ژنەکە هاتۆتە لای شێخ و ویستوویەتی دەستی لەگەڵ تێکەڵبکات، شێخ کە زانیویەتی چارینییە بە ژنەکەی وتووە جارێك دەستی ئاووم هەیە، بابێمەدەرەوە بەدڵی تۆ دەبێت، کە چووەتە سەرئاو بەچەقۆیەك (سەر، سمێڵ، ریش، برۆ)ی خۆی تاشیوە، کاتێك هاتۆتە دەرەوە ئەوەندە سیمای ناشیرین بووە، لەبەرچاوی ژنەکە کەوتووە و بەدووکارەکەی وتووە بەشەق بیکەنە دەرەوە، پاشان هەموو موریدو شوێنکەوتووەکانی وەك شێخ (سەر، سمێڵ، ریش، برۆ)ی خۆیان تاشیوە.

ئەم واتەیە بەرامبەر ئەو کەسانە دەوترێت بۆ دەربازبوون لەکارێکی نارەوا شتێك لەتایبەتمەندییەکانی خۆیان دەدۆڕێنن.

28 یەز دوورا گەز نزیکا = یەزد دوورە و گەز نزیکە، دەربارەی ئەم واتەیە دەڵێن: رۆژێك کەسێکی درۆزن و فشەباز لەکاتی دەمەتەقێکردندا لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵك وتوویەتی: لەشاری (یەزد) چل گەز بازمداوە، خەڵکەکە بەئەقڵیانەوە نەچووە و یەکێکیان وتوویەتی کاکە ئەگەر یەزد دوورە خۆ گەز نزیکە، وەرە لێرەدا باز بدە بابزانین دەتوانیت چەند گەز باز بدەیت.

ئەم واتایە بەرامبەر بەو کەسانە دەوترێت لەقسەکانیاندا خۆیان هەڵدەنێن و بەزیادەرۆییەوە باسی شتەکانی خۆیان دەکەن و گومان لای خەڵك دروستدەکەن.

29 بارە وەزش بنییە ونە خرەش نمێو= بارە گوێزی لێنبنێی خرەی نایە، ئەم واتایە زۆر جار بەوکەسانە دەوترێت کە خۆیان گێل و نەزانن، ئەوەی زۆرینەی خەڵك دەرکیپێدەکەن ئەوان چاك نایزانن و هیچ فێڵ و فڕێکیشیان نییە، ئیتر هەندێك کەس بەهەوەسی خۆیان هەڵیاندەسوورێنن و بۆ مەرامی خۆیان بەکاریاندەهێنن، یاخود بەو کەسانە دەوترێت زۆر گوێڕایەڵن و لە فەقیری خۆیانەوە هەرچییان پێبوترێت ملەجیڕێ ناکەن، ئەم واتەیە ئەگەر بۆ ئەوە بوترێت هەتاکو ئەو کەسانە وریاببنەوە و نەبن بەکەرەسەیەکی ئامادەباش لەبەردەست خەڵکی تردا ئەوە باشە، بەلاّم زۆرجار وەك توانجێك دەدرێت لە کەسێتی ئەوانەی بەو شێوەی باسمانکرد رەفتاردەکەن.

30 هەری پیرو قەڕاسە= کەری پیر و قەڕاسە، ئەم واتەیە یەکێکە لەواتە خراپەکان چونکە لە نرخ و بەهای مرۆڤ کەمدەکاتەوە، مەبەستی ئەوەیە مرۆڤ کەگەیشتە تەمەنی پیری ئیتر بەتەواوی لە دونیا هیوابڕاو ببێت، لە گشت رواڵەتێکی پۆشتەیی و خۆڕازاندنەوە وازبهێنێت، شتێکی دیارە هەموو قۆناخێکی تەمەن پێویستی بە جۆرێك لە خۆڕازاندنەوە و

ئارایشکردن هەیە، بۆیە هەرگیز ناکرێت هەرکەس بەساڵدا چوو ئیتر هەموو جوانییەکانی لێحەرامبکرێن و تەنها و تەنها چاوەڕێی مردن بکات.

# ڕەمەزانی هەورامان

شتێکی ئاشکرایە (ڕۆژوو) یەکێکە لەو ئەرکە سەرەکییانەی خودای گەورە لەسەر بەندەکانی خۆی دایناون و تایبەت نییە بە دینێکەوە، یاخود ڕێوڕەچەیەکی دینی دیاریکراوەوە، گشت دینە ئاسمانی و ئینسانییەکان ڕۆژووی تایبەتی خۆیان هەیە، هەر بۆ نموونە (هیندۆسی و بودائییەکان) ڕۆژووی خۆیان هەیە و پێیانوایە ئەو ڕۆژووەیان لە تاوان و خراپەکاری پاکیاندەکاتەوە، شوێنکەوتوانی دینی عیسایی ڕۆژووی خۆیان هەیە و بەدرێژایی ماوەی بە ڕۆژووبوونیان خوداپەرستی تایبەت بە خۆیان دەکەن و خۆیان لە هەندێك خواردن و خواردنەوە دووردەخەنەوە، لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی (ڕۆژوو) خۆی لە خۆیدا هەوڵدانێکی مرۆڤە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو هێزەی مرۆڤ بە گەورە و بالادەستی دەزانێت، دیارە ئەو هێزەش لای شوێنکەوتووانی دینە ئاسمانییەکان، خودایەکی تاك و تەنیایە، لای خەڵکی تریش خواوەندەکان و هێزە شاردراوە و ئەفسووناوییەکانن، شتیکی ئاشکرایە دینی ئیسلام وەك دوا پەیامی خودایی بۆ بەندەکانی هەر وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: (الیوم اکملت لکم دینکم واتممت علیکم نعمتی ورضیت لکم الاسلام دینا[1])، بە جۆرێکی جیاواز و بالاتر لە گشت دینەکانی پێش خۆی چوارچێوەی گشتی و وردەکارییەکانی ڕۆژووگرتنی دیاریکردوون، ماوەکەشی بەیەك مانگ کە ئەویش مانگی (ڕەمەزان)ە دیاریکردووە.

مانگی ڕەمەزان یەکێکە لە مانگە پیرۆزەکانی ساڵ و لای موسڵمانان گەورەیی خۆی هەیە، چونکە مانگی (بەڕۆژووبوون و خوداپەرستی و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودای گەورەیە)، ئەم مانگە پاش مانگی (شەعبان)دێت  کە خەڵکی هەورامان پێیدەڵێن (کوڵە مانگ)، لە سەر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆز کە دەفەرمێت: (فمن شهد منکم الشهر فلیصمه[2])، یەکەم

---

[1](قورئانی پیرۆز) سوورەتی (المائدة)ئایەتی (3).

[2](قورئانی پیرۆز) سوورەتی (البقرة)ئایەتی (185).





رۆژی ئـەم مانگـە بـە دیتنـی مـانگ دیاریـدەکرێت، هـەر لەسـەر رۆشـنایی قورئـانی پـیرۆز بۆماندەردەکـەوێت کـە لـەم مانگـەدا بـۆ (حـەزرەتی محەممـەدی کـوڕی عەبـدوڵلاّ د.خ) هاتووەتەخوارەوە، لەم بوارەدا خودای گەورە فەرموویەتی: (انا انزلناة فی لیلة القدر وما ادراك ما لیلة القدر لیلة القدر خیر من الف شهر[لخلجلخ]).

مانگی رەمەزان لە سەرانسەری دنیای ئیسلام، رێوڕەسمی خۆی هەیـە، هـەر لـە (هەسـتان بۆ پارشێو، ئامادەکردنی خواردەمەنی و بایەخدان بە فرەجۆریان، سـەرقاڵبوون بـە بـەجێهێنانی ئەرکـە دینییەکانـەوە بیگـرە، هـەتاکو گلێربوونـەوە لـە چـایخانە و شـوێنە گـشتییەکان و بەسـەربردنی چـەند کـاتێکی خـۆش بـە هەنـدێك لـە یارییـە میلییـەکان ...هتـد)، ئەمانـەی باسمانکردن جۆشوخرۆشێکی زۆر دەدەن بەم مانگە و چێژێکی تایبەتی دەدەنێ.

سەبارەت بە ناوچەی هەورامانیش مانگی رەمەزان تێیدا تایبەتمەندییەکی گەورە و مانـا و چێژی خۆی هەیە، بێجە لەوەی مانگی بەرۆژوو بوون و خوداپەرستییە، مانگی (تێکەلاّوبوون، هاوکـاریکردن و بەتەنگەوەهاتن)ی یەکترییـە، رێورەسمـەکانی بەسـەربردنی مـانگی رەمـەزان لـە هەورامانــدا بــوون بەبەشــێك لــە کولتــووری خــەڵکی ناوچــەکە و شــوێنێکی دیاریــان لــە یادەوەرییەکانیاندا هەیە.

پێشتر هەموو خێزانێکیان هەر چـەند رۆژێـك پـێش رەمـەزان خۆیـان بـۆ پیـشوازی ئـەم مانگـە ئامـادەکردووە، زانیویانـە جـیرەی مـانگی رەمـەزان لـە جـیرەی مانگـەکانی تـر جیـاوازە و قورسـایی لەسـەر گیرفانیـان درووسـتدەکات، بۆیـە پێـشوەخت بودجـەی پێویـستیان بـۆ ئامـادەکردووە، زۆر بەپەرۆشـەوە چـاوەڕوانی یەکـەم شـەوی ئـەم مانگـەیان کـردووە و زۆریـش مەبەسـتبووە بەلایانـەوە دیاربێـت، پێـشتر مـەلای گونـدەکان و ئەوانـەی پێیـانوتراوە (حیـسابۆگیر=حیـسابگر) لـە دیـاریکردنی یەکـەم شـەوی مـانگی رەمـەزان و یەکـەم شـەوی جەژنەکەشیدا رۆڵـی گـەورەیان گێـڕاوە، هاوکـات خەڵکەکـەش خۆیـان بـە وریاییـەوە چـاودێری مانگیان کردووە، پاشان کە رادیۆ گەیشووەتە گوندەکان، ئیتر ئەم کارە بۆیـان ئاسانبووە و زیـاتر لەرێی گوێگرتنەوە بۆ رادیۆ زانیویانە یەکەم شەوی رەمەزان کەی دەستپێدەکات.

خەڵکی هەورامان زۆریان بەلاوە گرنگبووە، پارشێوبکەن، واتە (لەکاتی پارشێودا لە خـەو هەسـتن و خـواردن بخـۆن)، خواردنـەکانی پارشـێویش زیـاتر بـریتیبـوون لـە (گێتـە مـەژگێ=

---

[لخلجلخ](قورئانی پیرۆز) سوورەتی (القدر) ئایەتی (3،2،1).

کولێرەی بەکاکڵە  ناواخنکراو، ناوساجی، خورماو رۆن، نان و ماست) و بەپێچەوانەی خەڵکی هەندێك ناوچەکانی تر، هەورامییەکان لە پارشێودا کەمتر شلە و برنجیان خواردووە، بەلآم سفرە وخوانی ئێوارانیان هەمیشە قەڵەباڵغبووە و جۆرەها خواردنی لەسەر بووە، هەر لەشۆربا و شیرینییەوە بیگرە، هەتاکو (شلە و برنج بەگۆشتەوە، یاپراخ، شفتە، کفتەشۆربا) و چەندین خواردنی تر کە بەپێی حەزی خێزان رۆژانە ئامادەکراون، ئەمە بێجگە لە (ترشیات، تەڕەساز، میوە، سەوزە، دۆ،  ماستاو) کە بە پێی وەرزەکانی ساڵ لە سەر سفرە ئامادەبوونیان هەبووە، چایی لە رەمەزاندا گرنگی خۆی هەبووە و لە پارشێو و ئێوارانـدا خوراوەتەوە، ئێواران پێش ئەوەی دەستبکەن بە خواردن چاییەکی شیرینیان بە پارچەیەك ناوساجییەوە، یان گێتەمەژگەوە، یاخود هەر بە تەنها خواردووەتەوە، ئینجا دەستیان بە خواردنی نانی ئێوارە کردووە.

ئەوانەشیان لە مزگەوتەکاندا نوێژی ئێوارەیان بە جەماعەت کردووە، هەر لە مزگەوتدا رۆژووەکەیان بە شیرینی وەك: (نوقڵ، چکلێت، لوقم، هەنجیری وشك، خورما)یان بە خواردنی وەك: (کولیچە، ناوساجی)، یان هەر شتێکی تر لەبەردەستدابووبێت شکاندووە و پاش نوێژکردنیش گەڕاونەتەوە ماڵەوە بۆ سەر سفرەی نانی ئێوارە، پاش خواردنی نانی ئێوارە و کەمێك پشوودان (پیاوان، هەرزەکاران،  مێرد مندالآن)، رووە و مزگەوتەکان و خانەقاکان کەوتوونەتەڕێ و کەڕەسێڵیانبەستووە بۆ تەراوێحکردن، ئەوانەی چوون بۆ نوێژی (تەراوێح) لەوسەرەوە بەگیرفانی پڕ لە (گوێز، مێوژ، هەنجیری وشك)، یان هەرچی شتێکی تر کە هاتبێتە مزگەوت و خانەقاوە گەڕاونەتەوە.

پاش نوێژی (تەراوێح) هەرکەسێك بە پێی حەزی خۆی روویکردووەتە شوێنێك، ئیتر ئەو شوێنە چایخانە بووبێت، یان کۆڕی شەونشینی مالآن بووبێت، ئەوانەی چوونەتە چایخانەکان هەندێکیان بە یاریکردنەوە، ئەوانی تریشیان بە کارکردن لە هەندێك لە پیشە دەستییەکاندا بە تایبەت (کلآشچنین)ەوە سەرقاڵبوون، ئەوانەش ئامادەی کۆڕی شەونشینی مالآن بوون، کاتی خۆیان بە (دەمەتەقێ، یاری میللی، گۆرانیچڕین)ەوە بردووەتەسەر، هەندێك لە پیشەوەرەکانیش بە تایبەت (پێکەنەگیر، کلآشکەر، کلآشچن)کان، وەك نەریتێکی کۆمەلآیەتی هەر شەوێك لە ماڵی یەکێکیاندا کۆبوونەتەوە، بەدەم دەمەتەقێ و گاڵتە و گەپ و گۆرانی

چڕینەوە کارەکانی خۆیان کردووە، زۆرجار ئەم کۆڕی شەونشینییانە، چ لە ماڵاندا و چ لە چایخانەکاندا هەتاکو پارشێو بەردەوامبوون، بۆ پارشێوکردنیش هەر کەسێك گەڕاوەتەوە بۆ ماڵی خۆی و لەگەڵ خێزانی خۆیدا پارشێویکردووە.

شەونشینییەکانی ماڵان لە ڕەمەزانی هەورامانـدا لێوانلێوبوون لە جوانی و بۆ ئامادەبوانیان دڵخۆشکەربوون، بەپێی وەرزەکانیش چەندین شەوچەرەیان تێدا خوراوە. (لەم کتێبەدا و لە باسی شەونشیندا لەم بارەیەوە قسەمانکردووە).

خەڵکی هەورامان زۆر بەلایانەوە مەبەستبووە لە ڕەمەزانـدا نوێژەکانیان بە جەماعەت بکەن، لەم بوارەدا بەجەماعەتکردنی نوێژی عەسر زۆر بایەخی دراوەتێ، چونکە لە زۆربەی گوندەکاندا پاش نوێژی عەسر، لە لایەن مەلای گوند، یاخود کەسێکی تری شارەزاوە، باسی گەورەیی مانگی ڕەمەزان و خواپەرستی و بابەتە دینییەکان کراوە، هاوکات هەر کەسێك پرسیارێکی دینی بووبێت ڕووبەڕووی ئەو کەسانەی کردووەتەوە و وەڵامی پێویست دراونەتەوە.

هەورامییەکان لە مانگی ڕەمەزاندا زیاتر لە مانگەکانی تر هاوکاری یەکتریان کردووە، داراکانیان زۆر یارمەتی (نەدار، هەتیو، نەخۆش، لیقەوماو)ەکانیان داوە، زۆریش مەبەستیان بووە سفرەی هەموو کەسێك بەخواردەمەنی جۆرا و جۆر پۆشتە و قەڵەباڵغبێت، بۆ ئەوەی لەم مانگەدا هیچ کەسێك هەست بە نەبوونی و هاوچەشمانکەمی نەکات، هەموویان سەرفیترە و داراکانیشیان زەکاتیان داوە، دیارە کە زەکات و سەرفیترەش دراون بە: (هەژار، هەتیو، بێوەژن، پیرێژن، مەلا)کان و ئەوەش یارمەتیدەرێکی چاکبووە لە بواری دابینکردنی هەندێك پێداویستی بژێوییاندا.

ڕەمەزان لە هەورامانـدا ئەوەنـدە پیرۆزی هەبووە، کەسێکیش کە بەرۆژوونەبووبێت، نەیوێراوە بە ئاشکرا ڕێزینەگرێت و ڕێگەی بە خۆی نەداوە لای خەڵکی تر دەریبخات کە بە ڕۆژوو نییە، ئەگەر کەسێکیش بە ئاشکرا ڕێزی ڕەمەزانی نەگرتبێت، ئەوە لە سەر کەسێتی کەوتووە ولە ناو خەڵکدا بە کەسێکی بیزرا و قێزەون سەیرکراوە.

باوك و دایك زۆر مەبەستیانبووە منداڵەکانیات هەر لە منداڵییەوە فێری ئەوەبکەن بەرۆژووبن، منداڵەکانیش بوێرانە هاتوونەتە مەیدان و زۆربەیان بەدرێژایی مانگی ڕەمەزان بەرۆژووبوون، ئەمەش وایکردووە کە ڕۆژوو بەدەر لەوەی جێبەجێکردنی یەکێك لە ئەرکە دینییەکان بووە، وەك نەریتێکی کۆمەڵایەتیش شوێنی خۆی گرتووە.

خەڵکی هەورامان هەر لە شەوی (21)ی ڕەمەزانەوە هەتاکو شەوی (29)ی ئەم مانگە، بەتایبەت لەشەوە تاکەکاندا لەمزگەوتەکاندا کۆبوونەتەوە بۆ نوێژکردن و قورئانخوێندن، هاوکات پرسیاری جۆرا و جۆریان لە بابەتە دینییەکاندا لە زانا دینییەکان کردووە و وەڵامدراونەتەوە، ئەو پرسیار و وەڵامانە جۆرە مشتومڕێکیان لە ناو هەندێك لە ئامادەبواندا دروستکردووە، لەوێشەوە زیاتر لە بابەتەکان تێگەیشتوون.

خەڵکی ناوچەکە بە تایبەت داراکانیان لە مانگی ڕەمەزاندا قورئانخوێنەکانیان ڕاسپاردوون بۆ ئەوەی ڕۆژانە، یان بەتەنها ڕۆژانی هەینی، بەسەر مەزاری مردووەکانیانەوە قورئانبخوێنن و بەرامبەر بەوەش یارمەتیانداون.

بۆ کۆتایهێنان بەم باسە ئەوە ماوە بڵێین: ڕۆژێکیان کەسێکی هەورامی لە مەلای گوندەکەیانی پرسیوە، مامۆستا ئەگەر کەسێك نوێژنەکات لە ڕووی دینییەوە چییە، ئەویش وتوویەتی (کافر)، کابراش وتوویەتی ئەی ئەگەر ڕۆژوونەگرێت، مەلاش وتوویەتی (کافر هەی کافر)، خۆ ئەگەر بەوردی لە بنەماکانی دینی ئیسلام وردببینەوە، حوکمی کافربوون بەسەر نوێژنەکەر، یاخود ڕۆژوونەگردا نادرێت، بەڵام دەبینین تەنانەت بەلای مەلایەکیشەوە لێکدانەوەیەکی کۆمەڵایەتی لەم بوارەداکراوە.

**تێبینی:**

**ئەم باسە وەك ڕابووردوو خراوەتەڕوو لەبەرئەوەی ئێستا گۆڕانکاری بەسەر ڕێوڕەسمەکانی ڕەمەزاندا هاتوون.**

## یاری منداڵانە

هەموومان منداڵبووین و لەو دنیا ئەفسووناویدا ژیاوین، ئەو ژیانە پاك و ڕۆحسووکەمان گوزەراندووە کە شیرینترین قۆناغی تەمەنە، هیچ شتێك لە شتە ڕەزاقورس و بێتاقەتکارەکانی ڕۆژگار و ڕەنج و ماندووبوونی تاقەتپڕۆکێنی تێدا نیین، هەموویەکێکمان پاش گەورەبوونیشمان ناو بەنا و یادیدەکەینەوە، هەندێك جاریش لە ناخی دڵمانەوە ئاواتی بۆ دەخوازین و حەزدەکەین جارێکی تر بچینەوە ناو دنیای منداڵی، ژیانی منداڵ ئەوەندە ژیانێکی





شیرین وپاك وبێگەردە هەموو ماناجوانەكانی ژیانی راستەقینەی مرۆڤانەی تێدان، لەو ژیانـەدا تەنها لەتە نانێك سكتێردەكات و تـەنها نوقڵێـك، یـان چكلێتێك، زەردەخەنـە دەخەنەسـەر لێو، تـەنها كراسـێك، یـان جووتێـك پـێڵاو، خۆشـییەكی شاگەشـكەئامێز بـە منـداڵ دەبەخـشن، دەرچوونێكی ئاسایی لە ماڵ، یان سەیران و گەشتێك، ئـیتر ئـەوە بەهەشـتی راسـتەقینەی دنیـای منداڵییە، دیارە شادی جەژن و چاوەڕوانیی جەژنانە و شیرینی و بەسەربردنی رۆژەكانی جەژن، ئەوە منداڵ دەخەنە ناو حاڵەتێكی دەروونی واوە، وا دەزانێت لەم دنیایەدا كـەس لـە و دڵخۆشـتر نییە، چونكە منداڵ تا رادەیەكی زۆر بێئاگایە لەو گرفتانەی كە ئـەرك و مانـدووبوونی رۆژگـار لـە هـەموو بوارەكـانی ژیانـدا، رۆژانـە دەیانخەنـە بـەردەم گـەورەكان و هەنـدێكجار بێتاقـەت و بێزاریاندەكەن. پاش ئەم چەند دێڕە دێینە سەر كرۆكی باسەكەمان دەربارەی یاری منداڵانە.

هەموومان باش دەزانـیین منـداڵ لـەو تەمەنـەوە دەكەوێتـە كرِوگـاڵ، ئـیتر لـە نـاو ماڵـدا دەبێت بە مایەی خۆخـەریككردن لـە گەڵیـدا لـە لایـەن: بـاوك، بـرا، خوشـك و كەسـە نزیكـەكان لێیەوە، سەبارەت بە دایكیش ئەوە لە هەموو چركەكانی تەمەنی منداڵەكەیـدا لـە گەڵیـدا دەژی، یاریكردن لە گەڵ منداڵ لە تەمـەنی گرِوگاڵـدا بریتییـە لـە (لاوانـدنی، دوانـدنی، گرتنەباوەشـی، هەڵپەڕاندنی بەدەم گۆرانییەوە)، پاش ماوەیەك كـە منـداڵ دەكەوێتـە (گـاڵكۆكێ) و خـۆی دێتـە باوەشـەوە، لـەم تەمەنـدا دەیـەوێت زیـاتر لـە دەوروبەرەكـەی تێبگـات، بۆیـە هـەموو شـتێك سەرنجیڕادەكێـشێت و دەسـتی بـۆ درێـژدەكات، لێـرەدا هەنـدێك شـت كەبەدەسـت ئـەو كەسـەوەن دەدیدوێنێت، بۆ نموونە (تەسبیح) كە لە ناو كۆمەڵی كوردەواریدا زۆرباوە، یان بازن وملوانكـەی دەست وگەردنی ژنان و كچان، یان شـتێك بەدەست منداڵەكـە خۆیـەوە بێـت، دەبـن بـە ئـامرازی یاریكردن لە گەڵیدا، دەبینین ئەو كەسەی منداڵەكە دەدوێنێت ئەو شـتانەی دەسـتیان بـۆ دەبـات بەینا و بەین لێیدووردەخاتەوە، ئەویش هەوڵدەدات جارێكی تر بكەونەوە ژێردەسـتی، بۆیـە بـە گـاڵكۆكێ و بـەخێرایی چـەندە لێـشیەوە دووربـن بۆیـان دەچـێت، لێـرەدا منداڵەكـە دەبێـت بـە لایەنێكی كاریگە ر لە یاریەكەدا و دەیەوێت بیسەلمێنێت توانـای بەدەسـتهێنانەوەی ئـەو شـتانەی هەیــە لێیدوورخراونەتــەوە، خــۆ ئەگــەر رێگــەی بەدەستهێنانەوەشــی لــێگیرا، ئــەوە زۆرجــار نارەزاییدەردەبرِت، هەر لە دەست و پەل وەشاندنەوە بیگرە، هەتاكو گریان و هاواركردن.

منداڵ پاش ئەوەی دەكەوێتەسەرپێ و دەتوانێت بە پێی خۆی برِوات، لەم تەمەنەدا ئیتر لــە رووی زمانگرتنیــشەوە پێــشدەكەوێت و دەتوانێــت چــەند وشــەیەك بــە زمــانی منداڵانــە دەربرِێــت، بــە پێــی ئــەم گۆرِانكارییانــە كــە لــە رووی جەســتە و تەمەنییــەوە روودەدەن،

یارییەکانیش دەگۆڕێن و چەند یارییەکی نمایشکارانە دێنە گۆڕێ، وەك: (بزێ بزێ، هەتۆلْ مەتۆلْ تەکامە زەرد و سوور و شەمامە، زەقنیرە من و فلان پەنیرە دیارە فلان ناوی ئەو منداڵەیە یارییەکەی لە گەڵدا دەکرێت و لە و کاتەدا ناویدەهێنرێت).

یارییەکانی ئەم تەمەنە یارمەتی منداڵەکە دەدەن هەم لە رووی جووڵە و قسەکردن، هەم لە رووی دەرککردن بە شتەکانی دەوروبەریەوە زیاتر پێشبکەوێت، لە رووی دەروونیشەوە دڵخۆش و ئاسوودەی دەکەن، بۆ نموونە کاتێك ئەو کەسەی یاری (زەقنیرە)ی لەگەڵدەکات و دەڵێت (زەقنیرە من و فلان پەنیرە) منداڵەکەش هەوڵدەدات لە گەڵیدا قسە و جووڵەکان دووبارە بکاتەوە، دیارە هەر لەم تەمەنەشدا هەندێك ئامرازی تری یاریکردن دەکەونە بەردەستی منداڵ وەك: (تۆپ، میزڵدان، فیقفیقە...هتد)، ئەمانەش هەر یەکێکیان رۆڵی خۆیان هەیە بۆی هەم چێژپێیدەگەێنن، هەم ئەگەر بە باشی و بەهاوکاری گەورەکان بەکاربهێنرێن، لە فراوانکردنی مەودای بیرکردنەوەیدا کاریگەریاندەبێت،چونکە منداڵ هەوڵدەدات لە بەکارهێنانیاندا ئەفراندنبکات، بەلاَم ئەم جۆرە ئامرازانە و چەندین ئامرازی تریش ئەگەر بەهەرەمەکی بخرێنە بەردەست منداڵ، تەنها ماوەیەکی کەم خۆی پێیانە سەرقاڵدەکات، پاشان بێجگە لە شکاندن و فرێدانیان هیچ ئایندەیەکیان نابێت، هەر بۆیە هاوکاریکردنی منداڵ لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی یاریکردندا زۆر گرنگە و بایەخی خۆی هەیە.

کاتێك منداڵ ئەوەندە گەورەدەبێت، ئیتردەردەچێت بۆ کۆلاَن و لەگەڵ منداڵانی تردا تێکەڵاویدەکات، هەندێك یاری تری منداڵانە بۆی دێنەئاراوە، بەلاَم لەم تەمەنەیدا ژمارەیەك لە یارییەکانی کوڕان و کچان لە یەکتری جیادەبنەوە و ژمارەیەکیشیان هەر بە تێکەڵاوی دەمێننەوە، بۆ نموونە جاری واهەیە کوڕان و کچان پێکەوە یاری (یانەقۆڵێ= ماڵە باجێنە) دەکەن، کەچی هەر پاش کەمێك کچەکان دەچن بە لای (پەتپەتێن)ەوە و کوڕەکانیش خەریکی (مووشێن)، یان (هەلووکێن)، یاخود (تۆپێن) دەبن، یان دەبینین لە کاتێکدا کە پێکەوە یاری (خەتخەتێن) دەکەن، کەچی لە پڕ کچەکان جیادەبنەوە و خەریکی یاری (پەتپەتێن) دەبن، هاوکات کوڕەکانیش دەچن بەلای یاری (بازبازێن)، یان راوڕاوێنەوە، بەلاَم پاش ئەوەی تەمەنی منداڵ زیاتر دەبێت، یارییەکانی کوڕانە و کچانە بە تەواوی لە یەکتری جیادەبنەوە، ئیتر نەوەك

هەر پێکەوە یاریناکەن، بەڵکو بە پێی نەریتی کۆمەڵایەتی تێکەڵاوبوونیان بەجۆرێك لە شوورەیی دەزانن.

بەهەرحاڵ، یاری منداڵانە ئەگەر بە رێکوپێکی ئەنجامبدرێن، دەبن بە هۆی زیاترگەشەکردنی بەهرە و سەلیقەی منداڵان و کاریگکەرییان هەیە لە سەر فراوانبوونی مەودای بیرکردنەوەیان، هاوکات منداڵ لە گۆشەگیری و قەتیسبوون لەناو پەردەی شەرم دووردەخەنەوە، بەڵام بەرەڵاکردنی منداڵان بە بێ لێپرسینەوە لە کۆڵانانـدا کاردانەوەی پێچەوانەی هەیە، چونکە لە لایەکەوە گوێڕایەڵنابن بۆ لە خۆیان گەورەتر و لە لایەکی تریشەوە لەسەر پەروەردەکردنیان دەکەوێت، هەر بۆیە نابێت (باوك و دایك)، یان ئەندامە گەورەکانی تری ناوخێزان خۆیان لە یاریکردنی منداڵەکانیان دوورەپەرێزبگرن و رۆژ تائێوارە بەرەڵای ناو کۆڵانەکانیان بکەن، یاخود بەتەواوی رێیان لێبگرن و یاریکردنیان لێقەدەغەبکەن، بەڵکو دەبێت بەپێی بوار و کاتی خۆیان لەم لایەنەوە چاودێری منداڵەکانیان بکەن، چونکە لایەنێکی گرنگی پەروەردەی منداڵە و کاریگەریشی لەسەر کەسێتی منداڵەکە هەیە، بەوەی لە ئایندەدا کەسێکی خاوەن بڕوا بە خۆ و کراوە بە ڕووی خەڵکدا دەربچێت، یاخود کەسێکی بێبڕوا بە خۆ و داخراو بەڕووی خەڵدا دەربچێت.

شتێکی ئاشکرایە یارییە منداڵانەکان هەندێکیان یاری ناوچەیین و هەندێکی تریان سنووری ناوچەییان بەزاندووە و تا رادەیەکیش جیهانی بوونەتەوە، بەڵام لە رووی شێوازی ئەنجامدانیانەوە و ئەو ئامرازانەی تیایاندا بەکاردێن کەمێك جیاوازیان هەیە، هەیانن بەکەرەسەی مادی دەکرێن و هەشیانن تەنها یاری نمایشکارانەن و هیچ کەرەسەیەکیان تێدا بەکارناهێنرێت، بەڵام زۆربەیان ئەگەر لە ژێرچاودێری و ئامۆژگاری گەورەکاندا ئەنجامبدرێن، ئەوە بەدڵنیاییەوە هەم لەڕووی تەندروستییەوە، ەم لە رووی رێکخستنی پەیوەندی منداڵان بە یەکترییەوە سوودبەخشن.

وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد،بەدەر لە و یارییانەی منداڵانی ناوچە جیاجیاکان بە شێوازی جیاجیا ئەنجامیاندەدەن، هەمو ناوچەیەك یاری منداڵانەی تایبەت بە خۆی هەن، ناوچەی هەورامانیش لەم بوارەدا لە ناوچەکانی تر کەمتر نییە، گرنگترین یارییە منداڵانەکانی هەورامان بریتین لە: (بژێ بژێ، زەقنیرە، هەتۆڵ مەتۆڵ، چالانی، واغانی، خواجەڕۆ، هەنۆری مەنۆری، فڕیانشەق، قولەقانێ، کێلەماڕانی، تۆپقارنی.....هتد)، هەر یارییەکیش شێوازی خۆی هەیە، ژمارەیەك لە مامۆستاکانی هەورامان کاتی خۆی بە توندی دژایەتی ئەم یارییانەیان

دەکرد و هەوڵی بنەبڕکردنیان دەدان، بە رادەیەك هەندێك قوتابی و خوێنکاریان فێری جۆرە سیخوڕییەك کردبوو بەوەی ناوی ئەوانەیان بۆ دەنووسین کە لە رۆژانی هەینی و پشوودا ئەم یارییانەیان دەکرد، دارکاری ناو گۆڕەپانی قوتابخانە و خوێندنگاش لە ناو ریزی بەیانیان و لە نا و پۆلەکانی خوێندندا و سزای ئەو قەتابی و خوێندکارانە بوو ئەو یارییانەیان دەکردن، بەڵام هەندێك مامۆستای تر بە پێچەوانەوە سەیری ئەو مەسەلەیان دەکرد، هەوڵیاندەدا ئەو یارییانە شێوازێکی پەروەردەیی وەربگرن و دوور لە بەرەڵایی ناو کۆڵانان ئەنجامبدرێن، هاوکات باسی ئەوەیان دەکرد ئەو یارییانە بەشێکن لە کولتووری ناوچەکە، رێگەلێگرتنیان دەبێت بە هۆی فەوتان و لەبیرکردنیان، بۆیە پێویستە شێوازەکەیان رێکبخرێتەوە و لە ژێرسەرپەرشتی گەورەکاندا ئەنجامبدرێن و سوود لە خاڵە چاکەکانیان وەربگیرێت، لە بیرمە ساڵی (1964ز) لە پۆلی چوارەمی سەرەتایدا بووم لە قوتابخانەی تەوێڵەی سەرەتایی[*]، رۆژێك مامۆستایەکمان

[*] شتێکی ئاشکرایە پاش هەڵایسانی شۆڕشی ئەیلوول رژێمی ئەوسای ئێراق هەموو قوتابخانەکانی ئەو ناوچانەی داخستن کە لەژێر دەسەڵاتی شۆڕشدابوون و مامۆستاکانیانی بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی کێشایەوە، تەوێڵە کە مەڵبەندێکی گەورەی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش بوو، چەند بارەگایەکی تێدا بوون و ژمارەیەکی زۆر خێزان کە پیا و کوڕیان کادر و پێشمەرگەی شۆڕش بوون، هاتبوونە تەوێڵە و نیشتەجێبووبوون، ئەوەش وایکردبوو سەدان قوتابی هەم لە منداڵانی تەوێڵە و هەم لە منداڵانی ئەو خێزانانەش هاتبوونە ئەوێ لە خوێندن دابڕێن و بێ قوتابخانە بمێننەوە، ساڵی خوێندنی (1963–1964ز) هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی خوێندنەوە بە هیمەتی چەند مامۆستا و کارمەندێکی تەوێڵەیی و چەند خوێندکارێکی قۆناغی ئامادەیی کەهێشتا خوێندنیان تەواو نەکردبوو، بەهۆی باری سیاسییەوە لە کارەکانیان دابڕابوون، قوتابخانەی سەرەتایی تەوێڵە کرایەوە، ئەوەی لەبیرممابێت مامۆستاکان ئەم بەڕێزانە بوون:

مامۆستا بارامی سەعدی بەگ: ئێستا لە ژیاندایە و بەڕێوەبەری سریەی (انظباط)ە و لە سلێمانی نیشەجێیە.

مامۆستا عەلی قادر ئاغا: بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بوو، لەبەر ئەوەی ئەو دەمە شیوعی بوو لەلایەن رژێمەوە لەسەر کارەکەی لابرابوو، ئێستا لە ژیاندایە و لەسلێمانی نیشتەجێیە.

مامۆستا عەلی حەمەئەمین: لەبەرئەوەی پارتی بوو لەسەر کارەکەی لابرابوو، ئێستا کۆچی دواییکردووە.

عەباس محەممەد قادر ناسراو بە عەباسی حەمەی حاجیلە: ئێستا لە ژیاندایە و خاوەنی (چاوێلکەسازی عەباس)ە و لە شاری سلێمانی و هەر لەوێش نیشتەجێیە.

حەمەڕەشید عوسمان: ئێستا لەژیاندایە و لە سلێمانی نیشەجێیە.

مامۆستا بابا محەممەد حەسەن: ئێستا لە ژیاندایە و مامۆستایە، لە سلێمانی نیشتەجێیە.

مامۆستا عەبدولکەریم: ئێستا لە ژیاندایە و لە سلێمانی نیشتەجێیە.

مامۆستایەکی عەرەب بە ناوی (کامیل).

کەوتە وێزەی چەند قوتابییەك، هەر لەبەر ئەوەی رۆژی پێشووتری بینیبوونی لەسەربانێك یاری (خواجەڕۆ)یان کردبوو، ئەوەندە بە توندی دارکاریکردن چەند قوتابییەکی کچمان لە گەڵدا بوون، یەکێکیان بە ناوی (حەمیدەی مەحموودی ئاسنگەر) بۆ هاوڕیکانی دەستی کرد بە گریان، بۆ رۆژی دوایی مامۆستایەکی تر هاتەسەرمان و باسی دارکارییەکەی دوێنێی قوتابییەکانی کرد و وتی: (هەندێك مامۆستا زۆر بە چەواشەیی لە پەروەردە و فێرکردن گەیشتوون، وادەزانن هەموو شتێکی میللی حەرامە)، دیاربوو ئەو مامۆستایە دارکاری قوتابییەکان زۆر بێتاقەتیانکردبوو، ئێمەش ئەویٚ رۆژیٚ هیچکاممان لەو تەمەن و لە وئاستی تێگەیشتنەدا نەبووین لە بێتاقەتییەکەی ئەو تێبگەین.

منداڵانی هەورامان زۆر بە ئازادییە و لەبەر چاوی گەورەکانییانەوە زۆربەی یارییە میللییەکان دەکەن و ئەوەش هیچ سەرئێشەیەکیان بۆ دروستناکات، تەنها لەسەر ئەوانەیان سەرزەنشتدەکرێن کە خراپن و منداڵ فێری تەماع دەکەن، وەك (شێر و خەت)، دیارە ئەم یارییە بە پارە دەکرێت و کاریگەری خراپی لەسەر پەروەردەی منداڵ هەیە، بۆیە گەورەکان چەندیان پێبکرێت نایەڵن منداڵەکانیان لێینزیکببنەوە.

یارییە منداڵانەکان بە پێی رۆژگار دەگۆڕێن، هەندێکیان لەناودەچن ویاری تر جێگەیان دەگرنەوە، هەر بۆ نموونە ژمارەیەکی زۆر لە گەنجەکانی ئێستای هەورامان، پێیدەچێت ناوی هەندێك لە یارییە منداڵانەکانی وەك: (خواجەڕ، هەنۆریٚ مەنۆریٚ)یان نەبیستبێت.

# هونەری گۆرانی

مرۆڤ هەر لە سەرەتای ژیانییەوە گوێی بۆ جریوە و ئاوازی جۆراوجۆری باڵندە وگیاندارەکانی تر، گڤەی با، خوڕە و هاژەی کانیاو وچەم، چرپەی درەختی دارستانەکان هەڵخستووە، ئەم دەنگانە کاریان لێکردووە و کاردانەوەی مرۆڤیش بەرامبەریان بە پێی

---

ئەم مامۆستایانە لەو ساڵەدا خۆنەویستانە ئەرکی فێرکردن و پێگەیاندنی قوتابیانی تەوێڵەیان بێبەرامبەر لە ئەستۆگرتبوو، ئەوەندەی من ئاگاداربم مانگانە چەردەیەکی کەم پارە لە ژمارەیەك لە خەڵکە داراکەی تەوێڵە کۆدەکرایەوە و هەریەکەی تەنها یارمەتییەکی پێنج دیناری، یان کەمتریان وەردەگرت.

سەرچـاوەی دەنگــەکان جیــاواز بــووە، هەنـــدێکیانی بــە خــۆش و دۆســت زانیــوە و لێیــان نزیکبووەتــەوە، لــە هەندێکیــشیان ترســاوە و لەبــەریان هــەڵهاتووە، لــە لاســاییکردنەوەی ئــەم دەنگانەوە سەرەتاکانی گۆرانیچڕین سەریانهەڵداوە[1].

لـە هەنـدێك سەرچاوەدا هـاتوە، سـەبارەت بـە سـەرەتای گـۆرانی دوو را هـەن، یـەکێکیان پێیوایە گۆرانی کارکردن کۆنترین جۆرە، ئەویتریان گۆرانی ئایینی بە کۆنترین جۆر دەزانێت[2].

هـەر لـەم بـارەوە (ئـەدویت ئەصـلاَن) نووسـیویەتی: سـەماو مۆزیـك و شـیعر وەك سـێ دەستەخوشك هاوتەمەنی ژیانی مـرۆڤن، ئـەم سیانە لـە نـاو خۆیانـدا بازنەیـەکیان پێکهێنـاوە و بەپێکهاتنی ئەم بازنەیەش سەرەتای هونەر سەریهەڵداوە، هەر بۆیە ئەم سێ رەگەزە هەرگیز لـە یەکتر دانابڕێن و جیاکردنـەوەیان بازنـەی هونـەر تێکدەشـکێنێت[3]. هـەروەها (شـڵدۆن تـشینی) نووسـیویەتی: سـەما لـە ریـزی پێـشەوەی ئـەو کارانـەوە دێـت کـە گەلـە سـەرەتاییەکان پـاش کارکردنیان بۆ دابینکردنی خۆراك و شوێنی حەوانەوە، کردوویانن[4].

گۆرانی فۆلکلۆری[5] (میللی)چەندین پێناسەی بۆ کـراوە و تائێـستاش پێناسـەی جیاجیـا دەردەکەون، ژمارەیەك لە لێکۆڵەرەوانی ئەم بـوارە دەڵـێن: (گـۆرانی فۆلکلـۆری) سـەرەتا کەسـێك دایهێناوە، پاشان کۆمەڵ خستوویەتیە ژێر رکێفـی ئـەقڵ و ویژدانییـەوە، گـۆڕانی تێـداکردووە و بووە بە موڵکی کۆمەڵ.

هەنــدێکی تــریش دەڵــێن (گــۆرانی میللــی) گۆرانییەکـە خــەڵکان دەیـچڕن و دەمــاودەم وەچەکان بۆ یەکتری دەیگوێزنەوە بە بێئەوەی بنووسرێتەوە[6].

---

(1) د.حمید مجید، الاثنولوجیا و الفواکلور، ص (38) من منشورات جامعة بغداد.

(2) د.عزەدین مستەفا رەسوول، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، لاپەرە (75، 76)، ساڵی 1979.

(3) ادویت اصلان، فن المسرح، الجزء الاول، ص (16)، ترجمة الدکتورة سعدیة اسعد، القاهرة، 1970.

(4) شڵدۆن تشینی، تاریخ المسرح فی ثلاثة الاف سنة، الجزء الاول، ترجمة – درینی خشبة، مراجعة، علی فهمی، المؤسسة العربیة العامة للتالیف والترجمة والطباعة والنشر.

(5) فۆلکلۆر: بریتییە لە: (هەڵسوکەوت، خوو نەریت، بڕوای ئەفسانەیی، جووڵەی سەما ئامێز، گۆرانی و پەندی میللی، سەرگوزەشتە)، کەواتـە زانستێکە لـە رۆحـی میللـی دەکۆڵێتـەوە. (بورهـان قـەرەداخی، شـانۆکاری کـورد لـە یۆتۆپیای ئەزمووتگەریدا، لاپەڕە (74)، سلێمانی 2004.

(6) ئەیوب رۆستەم، هەگبە و هەوارگە، لاپەڕە (17).

ئێمەی کورد گەنجینەیەکی گەورەمان لە هونەری گۆرانیدا هەیە[7]، گۆرانی و مۆزیکی ناوچە جیاجیاکانی گوردەورای هەریەکە و بەشێکی ئەو گەنجینەیە پێکدەهێنن، لە ناو ئەو ناوچانەشدا هەورامان مەڵبەندێکی گەورەی گۆرانییە، گۆرانییە هەورامییەکان پانتاییەکی گەورە لە هونەری گۆرانی کوردی دەگرنەوە، شیعرەکانی ئەم گۆرانییانە سروشتی ناوچەی هەورامان لە: (شاخ و کێو، یاڵ و دۆڵ، چەم و کانیاو، رەز و باخ، سەیرانگە و هەوارگە، گوڵ و گوڵاڵە، گژوگیا...هتد) هەروەها جۆری ژیانی خەڵکەکە لە هەموو بوارەکانی (کۆمەڵایەتی، ئابووری، رۆشنبیری، سیاسی، دینی) بە زمانێکی تەڕوپاراو و بە نموونەی ناسك و بێگرێ و گۆڵە دەدەن بە گوێی گوێگرەکانیاندا و سەرمەستیاندەکەن، زمانی گۆرانییەکان زمانێکی ئاساییە وئەو شیعرانەش گۆرانییەکانیان پێدەوترێت هینی شاعیرەکان بن، یاخود شیعری فۆلکلۆری بن، بابەتەکانی (جوانی سروشتی هەورامان، دڵداری و خۆشەویستی، گلەیی وسەرزەنشتکردن، دابڕان و لێکجیابوونەوە، بێزاری لە دووری و غەریبی و بێمەیلی، پاڕانەوە و ستایشکردن، گاڵتە و سووکایەتیکردن بە خەڵکانی بەد و ناحەز و پیاوخراپ، ، ترس لە پیری و نەخۆشی و پەککەوتن، ترس لەمردن...هتد) دەگرنە خۆیان. هەر بۆ نموونە چەند دێڕە شعرێك کە باس لەم بابەتانە دەکەن دەخەینەپێشچاو:

**یەکەم**

## شیعر بۆ جوانی سروشتی هەورامان

وەشەن هۆرامان بەگوڵەن رەنگینەن
تەماشە کەردێش تەمام خەمگینەن

کۆساڵان وەشەن کۆساڵان وەشەن
میرزام سەیری هەرد کۆساڵان وەشەن

---

[7] مامۆستا عەلائوددینی سەجادی نووسیویەتی: کوردان هەر لە سەرەتاوە گۆرانییان بە شیعری بەستە وتوە، هەر بۆیە ئەگەر بەو لێکدانەوەی فەرەنسییەکان بۆ شیعری گۆرانییان کردووە شیعری کوردی تەماشا بکەین، زۆربەیان بەر شیعری گۆرانی دەکەون.

**تازە وەر کۆتەن کەنار و دەشتا**
**بدیە هۆرامان ماچی بەهەشتا**

**سوورە هەراڵە سەرگوڵش سوورا**
**واردەنش وەرواو هامساش چنوورا**

**دووەم**

## شیعری دڵداری و خۆشەویستی

**قەزات لە ماڵم لامل ئێلاّنچی**
**سەروچەمەکام هەرچی تۆ ماچی**

**دەمەرە سوورای[8] گێرو گیانەوە**
**تا بێ ویەرۆ بە عینوانەوە**

**یانەت وەراوەر ملٚکت پا کەشا**
**ئەداو حۆتی بی پنەت گەرو حەشا**

**ئەگەر من زانێم تۆ مێشلە ملی**
**راکێ دەرۆڵێ چەقنێنی ولی**

**سێیەم**

## شیعری طلةیی و سةرزةنشتکردن

**تایێ چا زوڵفە وزە وە گەردەن**
**با خەڵکی واچۆ پا داخێ مەردەن**

---

[8] **دەمەرە سوورا: یەکێکە لە کوچەکانی گەڕەکی (چلانە)ی سەر بە شارەدێی تەوێڵە.**

ئەگەر لەيلەنی رەويەی لەيلت بۆ
تۆش بە وێنەی لەيل وەفا و مەيلت بۆ

چەمانت رەشتەن زولْفان گرێدان
ئاخۆ تالانيت ئۆ يانۆ كێ دان ؟.

هەر گلەيێت با تا روێو هەنی
دلْەكەت دەربارەم بيەن تەوەنی

**چوارەم**

## شيعری دابران و ليَكجيابوونةوة

تۆ جە شارەزوور هۆرت دان دەوار
من جە هۆرامان بڕيانم قەرار

**ماڵ جەماڵێدەر دۆس جە چلانە**

**نە پای بەرم هەن نە نیشتەی یانە**

**گەمێ مەنیشە ئاویش گەرمەنە**

**بۆرێ ئاوێسەر چەمەش وەروەنە**

**هەر کەس من و تۆش جە یۆ کەردەبۆ**

**جە وەهارەنە ئازیز مەردە بۆ**

**<u>پێنجەم</u>**

## شیعری بیَزاری لة دووری و غةریبی و بیَمةیلی

**ئەگەر لەیلەنی رەویەی لەیلت بۆ**

**تۆش بە وێنەی لەیل وەفای مەیلت بۆ**

دووریت چون ئەڵماس نیشتەن نە جەرگم
ها وەختا بەیۆ وادەکەی مەرگم

چەوساوە دیدەم نە دیدەت دوورەن
وە دیدەت قسەم دیدەم بێ نوورەن

هەر کەسێو واچۆ غەریبی خاسا
بێشك ئا کەسە خوا نەژناسا

**شەشەم**

## شیعری ثارانةوة و ستایشکردن

به چوار مەزەبە[9] من لاڵیانێ تۆ
ئەر موسڵمانی رەحمی خێرت بۆ

[9] مەبەست لە (چوار مەزەبە)، مەزهەبەکانی (حەنەفی، شافیعی، مالیکی، ئەحمەدی= حەنبەلی)یە.

**ساقی سا دەخیل وە فریادم رەس**

**وەرووی نازەوە جام گێرە وەدەس**

**خاس بێ تەشریفت هەم ئاوردەوە**

**گەرد پات وەتەن ئاوا کەردەوە**

**چەرمای چەمەکات شۆقو هەسارەی**

**سووری کوڵمەکات ساوۆ نسارەی**

**حەوتەم**

# شیعری سووکایەتیکردن بە خەلکانی بەد و ناحەز و ثیاوخراث

**یاخوا بەدکارا رۆڵەشا مرۆ**

**پێشا کەردیمی بوختان و درۆ**

**هەر باوەحیزێ سەرە چون تاسێو**

**بیەن بە شەریك دەم و لێو خاسێو**

**هەر کەسێو کەرو مەنعو دوێ دلاێ**

**تاقانلەش مرۆ سەروەختو گولاێ**

**سەرە تەپلە هەنگەونێ یاپراخە لووتێ**

**لاقنگ هەسانێ گەڵ و قنگ رووتێ**





**هەشتەم**

# شیعری ترس لە نەخۆشی و پیری و پەککەوتن

**پیری ئامانۆ وە پیریمەوە**

**کەس نیا بەیۆ زویریمەوە**

**پیری پڕ عەیبەن هەر چن بیوەی بۆ**

**خێزان مەواچۆ ئاخ مەرگش کەی بۆ**

**دەردێم گرتێنە باشقەی دەردانەن**

**لوقمانی حەکیم لێم سەردەردانەن**

**تەرسو دەردەکێم کار کەرۆ ونەت**

**پۆچی ئیسە وێم مەرمانو پنەت**

**نۆیەم**

# شیعری ترس لە مردن

**تەرسو مرونە قەبرەکێم غار بۆ**
**ئیزائیل جە دەس نالێم بێزار بۆ**

**تەرسو مرونە پی گرد دەرداوە**
**بە ئاهو نالەی لامله زەرداوە**

**پام نە وێزەنگی ئارۆ سەوامەن**
**رەفیقێم لوێ وادۆ لوامەن**

**تەرمەکێم بەردێ بە وەراوەردا**
**هەر کەس ناحەزا بدۆ وەسەردا**

**گۆرانییــە هەورامییــەکان زۆر و جــۆراو جــۆرن و بــە شــێوەیەکی ســەرەکی بەچــەند بەشێکەوە بەم شێوەیە:**

***1. سیاچەمانە:***

**جۆرێکـە لـە گـۆرانی رەسـەنی ناوچـەی هـەورامان و فوولاّییـەکی گـەورەی لـە مێـژووی هونــەری میللەتەکەمانــدا هەیــە، بەشــێکی هەمیــشە زینــدووە لــە ناســنامەی هەورامییــەکان و دەتـوانین بڵـێین سـروودی میللـی و مەزهـەبی خـەڵکی هەورامانـە، دیـوە میللیەکـەی لەوەدایـە (سروشـتی هـەورامان و جـۆری ژیـانی خەڵکەکـەی) بـە جـوانترین شـێوە وێنادەکـات و دیـوە مەزهەبیەکەشی رەگەکانییەتی لە ناو (دین و ریورەچە دینییەکان)دا.**

**ئەوانەی سەبارەت بە سیاچەمانە نووسیویانە، لە کتێبەکانیانـدا، یـان لـەو لێکۆڵینـەوە و بابەتانەی لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا بلاّویانکردوونەتەوە، چەند راو بۆچـوونێکیان بـەم شـێوەیە خستوونەتەڕوو:**

**هەیانن رەگەکانی (سیاچەمانە) دەگەڕێنەوە بۆ (زەردەشت و ئاڤێستا)، لەم بـارەوەدەڵێن (ماگاکان) کەلە بنەڕەتدا یەکێکبوون لـە تیرەکـانی (مـاد) و بـەپێی دابەشـبوونی چـینایەتی ئـەو سەردەمەش چینێکی (دینی) بوون، ئەم چینە وەك هـەموو چـینەکانی تـر جلوبـەرگی تایبـەتی خۆیان هەبووە، کە بریتیبووە لە (چۆغەی رەشی درێژ، شەرواڵی رەش، مێزەری رەش، پـشتوێنی ســێگرێ) و لــەکاتی لەبەرکردنیانــدا چــۆغەکەیان بەســەر شــەرواڵەکەیاندا درێژکردۆتــەوە و پێیـانوتراوە (سـیاجامگان= سـیاجامانە= رەشپۆشـاك)، (ماگاکـان) لەسـەردەمی بـاوبرەوی دیینـی زەردەشـتیدا وەکـو ئـەرکی دیینـی سەرشـانیان هەمووسـروودەکانی (گاتاکـان)یـان لەبـەربووە و بەئاوازەوە بۆ چینەکانی تری میللەتیان خوێندوونەتەوە، شێوەی خوێندنەوەکەش بەجۆرێك لە ئاواز و گۆرانی بووە بەدەنگێکی خۆش و هەناسەیەکی درێژەوە، لێرەوە هەڵگرانی ئەم بۆچـوونە نــاوی سیاچــەمانە دەگەرێننــەوە بــۆ (ســیاجامگان = ســیاجامانە)[10]. لـەم رووەوە (مامۆسـتا محەممەد ئەمین هەورامانی) نووسیویەتی: وشەی سیاچەمانە لە رووی وشەسازییەوە وشـەیەکی ساکارە، لە (سیا+ چەمان)+ (ە) وەك پاشگرێك بۆ ناوەکە پێکدێت، واتای وشەکەش بەم شـێوەیە: (سـیا= سـیاو= رەش) و (چـەمان= چـامان= دامـان= داوێـن)، واتاکەشـی بەسـەر یەکـەوە دەبێتـە**

---

[10] ئەیوب رۆستەم| بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی تایبەت بە سیاچەمانە| بۆ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان ئامادەکراوە و هەر لەو کەناڵەشەوە پێشکەشکراوە.

(کراسی ڕەشی دەرەدامان)، ئەم جۆرە کراسە تایبەتبووە بەو پیر و پیاوانەی ئاینی زەردەشت کە سروودیان وتوە[11].

هەندێکی تریان پێیانوایە ناوی سیاچەمانە لە: (چاوی ڕەش، چۆمی ڕەش، چەمانەوەی ڕەش)ەوە هاتوە[12].

ژمارەیەکیش لە خەڵکی ناوچەکە پێیانوایە داهێنەری سیاچەمانە (یوسف ئاسکەی گۆرانیبێژی تایبەتی خان ئەحمەد خانی ئەردەلآنی[13])یە، لەم بارەیەوە رازێك دەگێڕنەوە و

---

[11] محەممەد ئەمین هەورامانی‌ا مێژووی هەورامان‌ا لاپەرە (1100).

[12] فەرزین کەریم‌ا گۆرانییەکانی هەورامان‌ا ڕۆژنامەی برایەتی‌ا ژمارە (209)‌ا ئەدەب و هونەر‌ا لاپەرە (10) –ساڵی 2001.

[13] (خان ئەحمەد خان) یەکێکبووە لە میرە بەرجەستەکانی (ئەردەڵان)، ساڵی 1014ك= 1605 بووە بە میری (ئەردەلان)، هەر لەسەرەتای دەستبەکاربونییەوە دۆستایەتی لە گەڵ (شا عەباسی صەفەوی) دامەزراندووە، بە هاوکاری ناوبراو پەلاماری قەڵەمرەوی ژمارەیەك لە میرایەتییە کوردییەکان و قەڵەمرەوی دەوڵەتی عوسمانیشی داوە، سەرەتا هێرشیکردوەتە سەر خێڵەکانی موکری و پاشان (رەواندوز و ئامێدی) زەوتکردوون، ساڵی (1034ك) هاوڕێی (شاعەباس) بووە بۆ هێرشکردنە سەر (بەغدا) و لەو کاتەدا قەلآی (کەرکووك)ی گرتووە، سنووری قەڵەمرەوەکەی بەجۆرێك فراوانکردووە هەر لە خۆرئاوای (ئامێدی)یەوە، تا سنووری (کرماشان و هەمەدان) و لە (لوڕستان)ەوە، هەتا دەریاچەی (ورمێ) درێژبووەتەوە.

ساڵی (1039ك) دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەندنەوەی (بەغدا) لە صەفەوییەکان (صدر الاعظم خوسرەو پاشا)ی راسپاردووە، ناوبراو بۆ ئەو مەبەستە هاتووەتە (موصل)، لەوی لە سەر رۆشنایی پێشنیاری (سەی خانی ئامێدی و میرەبەگی سۆران)، هێرشیکردووەتە سەر قەڵەمرەوی ئەردەلآنییەکان، لەو کاتەدا لە نێوان میر و پیاوماقوولآنی سونەی کوردان زۆرێك هەبوون،حەزیان بە لایەنگری عوسمانییەکان کردووە، بۆیە هەموویان لە (خوسرەو پاشا) نزیکبوونەتەوە، هەر کە لەشکری عوسمانی لە (کەرکووك)ەوە کەوتووەتەڕێ، ژمارەیەك لە گەورەپیاوانی خانەدانی ئەردەلآن و بیست خانی تری کورد چوونەتە لای (خوسرەو پاشا)، لەشکری عوسمانی رووە و شارەزوور کەوتوونە ڕێ و بۆ نۆژەنکردنەوەی قەلآی (گولعومەر)، ماوەی پەنجا رۆژێك لە شارەزوور ماونەتەوە، پاشان بەشێك لەو لەشکرە هێرشیکردووەتە سەر قەلآی (مهریان= مەریوان) و داگیریکردووە.

بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی لەشکری دەوڵەتی عوسمانی (زەینەڵ خان و خان ئەحمەد خان) بە لەشکرێکی (45) هەزار کەسییەوە لە هەمەدانەوە کەوتوونەرێ و بەرەنگاری عوسمانییەکان بوونەتەوە، هەر لە گەرمەی ئەو شەڕەدا کۆمەکی (خوسرەو پاشا) گەیشتووەتە لەشکری عوسمانی، لەشکری (زەینەڵ خان) پاش ئەوەی چەند هەزار کەسێکیان لێکوژراوە، زۆر بە خراپی تێکشکاوە، لە ئەنجامی ئەو تێکشکانە گەورەیە بە فەرمانی شای صەفەوی (زەینەڵ خان)لە سێدارە دراوە، (خوسرەو پاشا)پاش ئەو سەرکەوتنەی پەلاماری مەڵبەندیی حوکمڕانی

دەڵێن: ناوبراو گەنجێکی جوان، شاعیر، گۆرانیبێژێکی دەنگخۆشبووە، حەزیکردووە لە (خاتوو کلاّوزەڕ= خاتووکلاّوزێڕ= زێڕین کولاه[14])ی هاوسەری خان ئەحمەد خان، کە ژنێکی چاوڕەشی شۆخ و شەنگبووە و ئەم گۆرانییەی بۆ چاوە رەشەکانی خۆشەویستەکەی چڕیوە، بەپێی ئەم رازە گوایا ناوەکە لە چاوی رەشەوە هاتووە، هەر لە درێژەی رازەکەدا باس لەوەدەکەن پاش ئەوەی خان بەڕازی خۆشەویستییەکەیانی زانیوە، فەرمانی کوشتنی (یوسف ئاسکە)ی داوە و بە شێوەیەکی تراژیدی کوژراوە بەوەی بەزیندوویەتی گیراوەتە گەچ، شوێنەواری ئەو رووداوە تائیستاش لەناو شوێنەوارەکانی حوکمڕانی (خان ئەحمەد خان)دا لە چەمی زەڵم دیارە. باس لەوە دەکرێ ناوبراو لەو کاتەدا گرتوویانەتە گەچ، بەردەوام بە زمانی شیعر لە (خان ئەحمەد خان) پاڕاوەتەوە بۆ ئەوەی دەست لە کوشتنی هەڵبگرێت، وەك لەم دێڕەدا هاتووە:

**تو خوا مەمکوژە چونکە جوانم**

**یەکەم غەریبم، دووەم مێمانم**

بەلاّم پاڕانەوەکەی یەك تۆسقاڵ کار لە (خان) ناکات و دڵی نەرمنابێت، هەتا پێش ئەوەی دوا تۆپەڵی گەچ بدەن لە دەمی وتویەتی:

**ئەگەر ئەمکوژی هەر بە ......مەوە**

**ئەگەر نامکۆژێ هەر بە ......مەوە**

**خاتوو کلاّوزەڕ بـــــوو بە......مەوە**

---

ئەردەلاّنی داوە و قەلاّی (حەسەن ئاوا)ی داگیرکردووە، ساڵی (1040ك= 1630ز) شاری (هەمەدان)یشی داگیرکردووە و پاشان بۆ (بەغدا) گەڕاوەتەوە.

هێشتا (صدر الاعظم خوسرەو پاشا) لە موصڵ بووە، خان ئەحمەد خان پەلاماری شارەزووری داوە و دەستی بەسەردا گرتووەتەوە، پاش چەند ساڵێك لە ئەنجامی هەڵکۆڵینی چاوی کوڕەکەی بە فەرمانی (شا صەفی)، پشتیکردووەتە صەفەوییەکان و پەیوەندی بە دەوڵەتی عوسمانییەوە کردووە، بە فەرمانی سوڵتانی عوسمانی کراوە بە حوکمڕانی (موصڵ)، پاش ناوبراو میرایەتی ئەردەلاّن کەوتووەتە دەست (سلێمان خانی ئەردەلاّنی).

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محەممەد ئەمین زەکی بەگ، خولاّصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، بەرگی دووەم، لاپەڕە (211)، چاپی نوێ 2000.

[14] خاتووکلاّوزەڕ= زێڕین کولاه) ژنێکی زۆر جوان و شۆخ و شەنگو خوشکی شائیسماعیلی صەفەوی بووە، لەبەر ئەوەی (خان ئەحمەد خانی ئەردەلاّنی) زۆر لە شاوە نزیکبووە و یەکێکبووە لەو کەسانەی جێگای باوەڕی بووە، لەهەمان کاتیشدا خاوەنی دەسەلاّتێکی گەورە و حوکمڕانی قەڵەمڕەوێکی بەرفراوانبووە، ئەو خوشکەی خۆی لێمارەکردووە.

پاش ئەم دێڕانە سەبارەت بە (یووسف ئاسکە)، دێینە سەر ئەوە ئەگەر کەمێك لەم بۆچوونانە وردبببینەوە و لەگەڵ مێژووی سیاچەمانەدا بەراوردیانبکەین، ئەوە بەبێدوودڵ دەتوانین بڵێن: هەیانن بۆچوونی زۆر رواڵەتی و سەرپێیین و دوورن لە راستییەوە، چونکە ئەگەر تەنها وەك گریمانیش (سیاچەمانە) لە رەگە زەردەشتییەکەی دابڕین، چەندین بەڵگە هەن ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن، مێژووەکەی بە سەدان ساڵ لەسەردەمی ژیانی (یوسف ئاسکە و خان ئەحمەدخان) کۆنترە، هەربۆ نموونە باس لەوەدەکەین هەڵگرانی (رێو رەچەی یارسان= ئەهلی هەق= کاکەیی) لەکاتی کۆبوونەوە دینییەکانیاندا کە پێیاندەڵێن (جەم)، هەندێك لە سروود و پەخشانە دینییەکانیان لەسەر شێوازی سیاچەمانە دەخوێننەوە، شتێکی ئاشکراشە لەسەر رۆشنایی (دەفتەری سەرەنجام) کە دەفتەری پیرۆزی هەڵگرانی ئەم رێورەچەیە، (بالوولی ماهی) یەکەمین کەسبووە ئەم رێبازەی لە هەورامانـدا داناوە و لە ناوەڕاستی سەدەی دووەمی کۆچیدا لەدایکبووە[15]، هەروەها هەریەك لە (باوا قەیسەری هەورامی، باواسرنجی کەلاتی، باواگەرچەکی هەورامی، دایە تەورێزی هەورامی) کە لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاون (شاعیر، تەمبوورژەن، دەنگخۆش) بوون، شیعرەکانی خۆیان بەئاوازەوە و بەدەم ژەنینی تەمبوورەوە لە جەمخانەدا خوێندۆتەوە، ئەگەر مێژووی ژیانی ئەمانەی ناومانهێنان لە گەڵ مێژووی ژیانی (خان ئەحمەد خان و یوسف ئاسکە) بەراورد بکەین، ئەوە بە دڵنیاییەوە بۆمان ئاشکرادەبێت زیاتر لە (675)ساڵ بەینیانە، چونکە زۆربەی سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن (خان ئەحمەد خان) ساڵی (1637ز) حوکمڕانی ئەردەڵانی گرتۆتە دەست، کەواتە مێژووی سیاچەمانە زۆر لە مێژووی ژیانی (یوسف ئاسکە) کۆنترە، بۆیە هەرگیز ناکرێت ناوبراو بە داهێنەر و باوکی یەکەمی سیاچەمانە بدرێتە قەڵەم، بەڵام دەکرێت کەسێك بووبێت بەتوانا و سەلیقەوە سیاچەمانەی چڕیبێت و داهێنانی تێداکردبێت، کەواتە هەر لێرەوە ئەوەش دەدرێتە دواوە کە ناوەکە لە چاوەرەشەکانی (خاتوو کلاوزێر)ەوە هاتبێت.

هەروەها سەبارەت بەوەی ناوەکە لە (چۆمی رەش)ەوە هاتبێت، گوایا بەو دیمەنە دەوترێت لە دوامانگی پاییزدا دەردەکەوێت کە (باخ، چەم، دۆڵ)ەکان سەوزاییان نامێنێت و رەشدادەگەڕێن، ئەمەیان هەر فڕی بەسەر راستییەوە نییە، چونکە ئەوەی لە زاراوەی سۆرانیدا

---

[15] سەرەنجام‌ا بارگە بارگە‌ا لاپەرە (23).

پێیـدەوترێت (چـەم) لـە هەورامیـدا پێیـدەوترێت (دەرە)، کەواتـە ئەگـەر ناوەکـە لـە (چـەمی رەشە)وە بهاتایە، دەبوایە سیاچەمانە لە هەوراماندا (دەرەی رەش) بوایە.

سەبارەت بە (چەمانەوەی رەش)یـش ئەمـە دەخەینـەڕوو کـە سیاچـەمانە تـەنها تایبـەت نییە بەوانەی باری گرانی رۆژگار و تەمـەن پـشتی چـەماندوونەتەوە، بـەڵکو هـەموو چینەکانی کۆمەڵ و هەموو ئاستەکانی تەمـەن تێیـدا بەشـدارن، هـەروەها پێویـستە ئـەوە بـزانین کـرداری چـەمانەوە لـە هەورامیـدا (ئەوەچـەمیای) پێـدەوترێت، کەواتـە ئەگـەر ناوەکـە لـە چـەمانەوەوە بهاتایە، بە هەورامی دەبووە (ئەوەچەمیای سیاو) کە ئەمـە هـەر زۆر لـە نـاوی (سیاچـەمانە)ەوە دوورە.

پاش خستنەڕووی ئەم رایانەی سەرەوە، بە پێویـستی دەزانم ئـەوە بڵـێم مـادام گـۆرانی و مۆزیــك هاوتەمــەنی ژیــانی مــرۆڤبن، کەواتــە تەمــەنیان لــە تەمــەنی دینــە ئاسمــانی و ئینسانییەکانیش کۆنترە، من بۆ خۆشم بڕوای تەواوم هەیە کە مـرۆڤ بـەر لـەوەی هـەڵگری دیـن بێت، گۆرانیچڕیوە. ئیتر ئەو گۆرانییە ئەگەر گۆرانی کارکردن بووبێت، یان لـە ژێـر کاریگەرییـە سروشتییەکانی دەوروبەریدا بووبێت، ناوچەی هەورامانیش وەك ناوچـەیەیەك کـە مێژوویـەکی دێرینی هەیە، بە دڵنیاییەوە شێواز و ریتمی گۆرانی تایبـەت بـە خـۆی هـەبووون، مێـژووی ئـەو ریتم و شێوازانەش زۆر لە مێژووی هەردوو دینی (میترایی و زەردەشتی) کە خەڵکی ناوچـەکە شوێنکەوتوویان بوون کۆنترە، بەڵام دەبێت باش لەوەش ئاگاداربین دیـن و رێوڕەچـە دینییـەکان کـاری گـەورەیان لـە نـاو کولتـووری جیاوازەکـان لـە ناویانـدا هونــەری گۆرانیـدا کـردووە و تایبەتمەندیی خۆیان پێبەخشیون، هەر بۆیە دەڵێم ئـەو ریتمـە گۆرانییـەی بـەر لـە هـاتنی ئـەو دوو دینـە بـۆ ناوچـەکە هـەر نـاوێکی بووبێت، پـاش گەیـشتنی دینـی زەردەشـتی بـە هـەورامان ئاوازەکانی چوونەتە ناو سرووتە دینییەکانی زەردەشتییەوە و ناوەکەشی لە رێـی بـچڕەکانییەوە بووە بە (سیاجامگان= سیاجامانە= سیاچەمانە). هەر لەوێشەوە بەدەر لە ناوەرۆکـە میلییەکـەی، نــاوەرۆکێکی دینیــشی هــەڵگرتووە و وەك پێــشتر ئاماژەمپێــدا بــووە بــە (ســروودی میللــی و مەزهەبی) خەڵکی هەورامان.

هەنــدێك بـــەڕێز پرســـیاردەکەن و دەڵــێن ئەگــەر (سیاچــەمانە) لــە ســیاجامگانی زەردەشتییەوە بهاتایە دەبوایە گۆرانی هـەموو هـەڵگرانی دینـی زەردەشـتی بوایـە، نـەوەك تـەنها خەڵکی هەورامان، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە بخەینەڕوو:

[1] کولتووری هەر پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی بەگشتی بریتییە لە: (هونەر و ئەدەب، دابونەریت، فەلسەفە و ڕێباز و شێوازی ژیان)ی ئەو پێکهاتەیە، کاتێك دەیان پێکهاتەی کۆمەڵایەتیش هەڵگری دینێك دەبن، ئەگەرچی لە ڕووی ڕۆحییەوە یەکدەکەون، بەڵام لە هەندێك بواری کولتووریاندا کە یەکێك لەو بوارانە (هونەر)ە تا ئاستێکی زۆر تایبەتمەندییەکانی خۆیان دەپارێزن، هەر بۆیە دینەکە ناتوانێت هەموو تایبەتمەندییە کولتوورییەکانیان بسڕێتەوە، ئەگەرچی خۆگونجاندن و تێکەڵاوبوون لە گەڵیان دروستدەکات، ئەو خۆ گونجاندن و تێکەڵاوبوونەش لە پێکهاتەیەکەوە بۆ پێکهاتەیەکی تری کۆمەڵایەتی ناو هەمان دین جیاوازن، هەر بۆیە هەرگیز ناکرێت بمانەوێ (هیندیی، یان فارس)ێکی زەردەشتی وەك هەورامییەکی زەردەشتی سیاچەمانەچڕ بووبن و بە هەمان ریتمەکانی هەورامان سروودە دینییەکانی ئاوێستایان چڕیبن، بەڵکو ئەقڵ پێماندەڵێت ئەوانیش بە ریتم و ئاوازەکانی خۆیان سروودەکانیان چڕیون.

[2] ئەو دین و ڕێورەچە دینیانەی کە لە قۆناغە مێژووییە جیاوازەکاندا بە مرۆڤ گەیشتوون، ئەگەرچی کاریگەری ڕۆحی گەورەیان دروستکردوە، بەڵام هەرگیز نەبوونەتە جێگرەوەی هەموو کەرەسە مادییەکانی دەوروبەری وەك: (شاخ و داخ، یاڵ و دۆڵ، دەشت و دەر، باخ و بێستان، گوڵ و گوڵاڵە، کانیاو و چەم)، هەروەها شێوازە جیاجاکانی ژیانی خەڵك، ئەمانە هەمیشە کاریگەریان لە سەر (سۆز و ویژدان، ئاراستە و دەربڕینی) مرۆڤەکان دروستکردوە، دینەکەش لایەنە ڕۆحیەکەی بە تەواوی کۆنترۆڵکردوە، هەر بۆیە دەبینینین تێکەڵاوییەکی بەرچاو کە هەموو بوارەکانی کولتووری گرتووەتەوە لەم نێوەندەدا دروستبووە، هەورامییەکانیش وەك هەڵگرانی دینی میترایی و پاشان زەردەشتی ئەم دوولایەنەیان پێکەوە موتوربە کردووە، لە گۆرانییەکانیاندا چەندە لایەنە ڕۆحییەکە بەهێزبووبێت، لە گەڵ ئەو بەهێزییەیدا نەیتوانیوە هەموو شتێك بێت، بۆیە دەبینین لە گۆرانییەکانیادا کێوەکانی (شاهۆ، کۆساڵان، عەواڵان، لووتی هەسوون) و گیاو گوڵە بۆنخۆشەکانی ناوچەکەیان لە (چنوور، شەوبۆ، بۆژانە، بەرزەڵنگ...هتد)یان لاواندوونەتەوە، نەوەك شاخەکانی (هەمالایا و کێوی ئەلبورز) و ئەوەش مافی خۆیانە، تەنها زەردەشتی بوونیشیان بەسنەبووە بۆ ئەوەی ئەم دەوروبەرە مادییەی خۆیان فەرامۆشبکەن و بۆشیاننەکراوە، کەواتە بە هەمانشێوەی هەورامییەکان خەڵکە





هینـدی و فارسـەکانیش دەورووبـەرە مادییەکـەی خۆیـان کاریگـەری لەسـەر درووسـتکردوون و هاوشانی لایەنە رۆحییەکە لە گۆرانییەکانیاندا رەنگیداوەتەوە، ئیتر چۆن دەبێت بوترێت ئەمانە مادام یەك دینیان هەبووە، دەبێت هەموو گۆرانییە دینییەکانیان وەك یەك و بە هەمان ریـتم و ئاوازەوە بچرێن. بەڕای من تەنها دەرخستنی ئـەم دوو خاڵـەی سـەرەوە بەسـن بـۆ وەڵامدانـەوەی ئەوانەی دەڵێن ئەگەر رەگـی سیاچـەمانە لـە نـاو دینـی زەردەشـتییەوە بهاتایـە، دەبوایـە هـەموو زەردەشتییەکان وەك هەورامی سیاچەمانەیان بچڕیایە.

بەزمـەکانی سیاچـەمانە زۆرن، لـەم بـوارەدا کەسـێکی وەك (مـام هەیـەری نۆدشـی) کـە گۆرانبێـژێکی دەنگخـۆش و سیاچەمانەچـڕێکی بەسـەلیقە و شـارەزابوو، دەیـوت: (42) بـەزمی سیاچەمانە دەزانم، لێرەدا وەك نموونە، نەوەك سـەرژمێر نـاوی هەنـدێك لەبەزمـەکان دەهێـنین لەوانە:

(بـەزمو پەسـەکی = بـەزمی پەسـەك، بـەزمی هـەورامی، سیاوچـەمانۆ مێوبڕیـەی = سیاچەمانەی رەزبڕین، سیاوچەمانەی دەرەیی (3) بەزمن، سیاوچەمانەی ژەنانە= سیاچـەمانەی ژنانە، سیاوچەمانەی شێخانە چـەند بـەزمێکن، سیاوچـەمانەی ئـەحلی، خواڵـەداد، عەرعـەرداد= هۆعەرعەر، رەفیقداد، خاڵسیاولەی، خاڵخەنێن گیان، خانمەلی گیان، قامـەتوەش= قامـەت خـۆش، تاقڵە تەشابی= تاقە تەشانی، خاڵخەنێن، مینـاوەی (2) بەزمـە، حـەلیم داد، نـازاروەی، ئایشێ رۆ (2)بەزمـە، عـەتیلێ، پـێچ پێـچا راوهـەزارانی= پـێچ پیـچەکانی رێـی هـەزارانی، سـەیری وەزەرا، بەزمو مام هێدەری= بەزمی مام هەیەر، بەزمو حەمەکەریمو عەبوولـەی= بـەزمی حەمەکـەریمی عەبووله، بەزمو قاله مرادی= بەزمی قالەمراد= بـەزمی ئـەوڕەحیم بـەگی، بـەزمو مـامۆ قـادرەی پاوەیی= بەزمی مام قادری پاوەیی= کاکەگیان، بـەزمو یوسـولۆ جانـەی= بـەزمی یۆسـۆلەی جانـە، بەزمو ئەحەو نازارێ= بەزمی ئەحمەدی نازارێ، بـەزمو حەمـە قولتـەی= بـەزمی حەمـە قولتـە، بـەزمو حـاجی یـاقۆی= بـەزمی حـاجی یـاقۆ، بـەزمو تـۆفیقی زاوەری= بـەزمی تۆفیـق دزاوەری، تەقەی تەوەنمیر، هەوای زوڵفی تۆ...هتد ئەم دوو بەزمەی دوایی بەزمی (رەشەغوڵام)ن.

لـە چـڕینی سیاچـەمانە زۆرجـار دوو گۆرانیبێـژ بەشـداریدەکەن بـەوەی یـەکێکیان نیـوە دێـڕی شـعرێك دەچـڕێت و بەرامبەرەکەشـی نیـوە دێڕەکـەی تـری بـۆ تـەوا و دەکـات، یـاخود هەریـەکێکیان دێڕیکـی تـەواو دەچـرن ئەمـەش بـەپێی جـۆری سیاچـەمانەکە و (توانـا، حـەز، سـەلیقە)ی گۆرانیبێـژەکان، ئـیتر بـەو شـێوەیە بەردەوامـدەبن هـەتاکو کۆتـایی سیاچـەمانەکە، یاخود چەند سیاچەمانەیەك بەسەر یەکەوە دەچڕن.

شتێکی ئاشکرایە هەموو گۆرانیبێژێك ناتوانێت سیاچەمانە بچڕێت و تەنها دەنگخۆشی مەرج نییە بۆ چڕینی سیاچەمانە، بەڵکو چەند مەرجێك هەن بۆ گۆرانیبێژ بۆ ئەوەی ببێت بە سیاچەمانەچڕ و گرنگەکانیان ئەمانەن:

1 بەزمەکانی سیاچەمانە بزانێت و بتوانێت لە یەکتریان جیابکاتەوە.

2 شارەزای شێوازی چڕینی سیاچەمانە بێت.

3 تەبەقەی دەنگی گونجاو بێت بۆ چڕینی سیاچەمانە، هەروەها بتوانێت ئەو لەرزشەی کە پێویستە بۆ چڕینی لە قوڕگیدا دەریبخات دوور لە دەمدادڕین، چونکە لە چڕینی سیاچەمانەدا قوڕگ دەلەرێتەوە و دەمیش نیوەبەستراوە.

هەر لەکۆنەوە تا ئێستا ژمارەیەك سیاچەمانەچڕی بەسەلیقە و دەنگخۆش لە هەورامانـدا هەڵکەوتوون، بەڵام بەداخ و کەسەرەوە زۆربەیان گومناوکراون چونکە مێژووی ژیانیان نەنووسراوەتەوە و لە سەردەمی ژیانی ئەوانیشدا ئامێرەکانی تۆمارکدن نەبوون هەتاکو دەنگیان بگاتە لای نەوەکانی دوای خۆیان، ئەوانەشیان لە هەندێك تێکستدا بە تایبەتی تێکستەکانی (یارسان= ئەهلی هەق) ناویانهێنراوە، لەسەردەمی ژیانی خۆیاندا دەیان تۆمەتی ناڕەواخراوەتە پاڵیان و پلاریان لێگیراوە بە مەبەستی ئەوەی شمشێر بخرێتە گەردەنیان و خوێنیان حەڵاڵبکرێت، هەروەها سەردەمانێکی زۆر دوور و درێژ ئەو تێکستانە لەژێر پەردەی دیین و بەبڕوبیانووی جیاواز بە(بڤە) لەقەڵەمدراون، بۆیە زۆربەیان تۆز نیشتووەتە سەریان و لە حەشارگەکانیاندا رزیون، هەڵگرانی ئەو رێوڕەچەیەش بەدەر لەخۆیان ئەو تێکستانەیان پیشانی کەس نەداوە و تائەم رۆژانەش گومانیان لە ئاشکراکردنیان هەیە.

شتێکی ئاشکرایە لە ئەنجامی گومناوبوونی ژمارەیەکی زۆر لە سیاچەمانەچڕەکان، چەندین بەزمی سیاچەمانەش فەوتاون و گۆرانیبێژەکانی ئێستا هەواڵێکیان لێنازانن، بۆ سەلماندنی ئەم دەربڕینەش ئەوە دەهێنینەوەیاد ساڵی (1968ز) پرسیاری سیاچەمانەی (پەسەك)مان لە سیاچەمانەچڕی شارەزا و بەسەلیقە (مام هەیەر نۆدشی) کرد، لە وەڵامدا وتی ناویم بیستووە، بەڵام نایزانم، ئەمە لەکاتێکدا کە دەیوت (42) سیاچەمانە دەزانم.

بەهەرحاڵ دیێنە سەرناوی ئەو سیاچەمانەچڕ و گۆرانیبێژانەی کە تا رادەیەك لە هەورامان و هەندێك ناوچەی تردا ناسراو بوون، هەروەها ژمارەیەکیشیان بەش بەحاڵی خۆیان لە چڕینی سیاچەمانە و گۆرانییەکاندا داهێنان و ئەفراندنیانکردووە، لەوانە:

1ـ ئەحمەد محەمەد داود بە (ئەحل نەوسوودی[16]) ناسراوە.

2ـ مام جافر بە (جافە شێت) ناسراوە.

3ـ حەمەکریم عەبدوڵا قادر بە (حەمەکەریمی عەبووله) ناسراوە.

4ـ حسێن حەمەلاو فەتحوڵا بە (حسێنولاوەی) ناسراوە.

5ـ ئەحمەد حمەحسێن حەمەمراد بە (ئەحمەد و نازارێ) ناسراوە.

6ـ قادر موراد بە (قالەمراد) ناسراوە.

7ـ مام حەیدەری نۆدشی بە (مامۆ هێدەر) ناسراوە.

8ـ قادر نادر بە (مامۆقادری پاوەیی) ناسراوە.

9ـ محەممەد بەخشە بە(حەمۆبەخشەی) ناسراوە.

10ـ محەمەد پیلو.

11ـ عەبدوڵا کافێ بە (عەودە کافیلە) ناسراوە.

12ـ حەسەن رەحمان بە (حەسەنی رەحمانە سیاو) ناسراوە.

13ـ فەرەج حەمەمین تەوێڵەیی.

14ـ عەبدوڵا صاڵح بە (عەبەی صەلاٚحە) ناسراوە.

15ـ یوسف جانوڵا بە (یۆسۆلۆ جانەی) ناسراوە.

16ـ عەمیر هاواری بە (مامۆ عەمیر) ناسراوە.

17ـ حاجی ئایزە بە (ئایزە بۆڕیزەن) ناسراوە.

18ـ حەمەسەلیم نادر.

19ـ مەحموود حەمەساڵح بە (مەمووله) ناسراوە.

---

[16] نەوسوودـ شارۆچکەیەکی دێرینی هەورامانی لهۆنە و ماوەیەکی زۆر مەڵبەندی حوکمڕانی سانەکانی لهۆن بووە، لە هەندێك سەرچاوەدا ناوی بە (نەرزوور) هاتووە، دەوترێت (نەرزوور) ناوێکی یۆنانییە، ئەم شارۆچکەیە ساڵانێکە ناوەندی ناحییەیەکە بە هەمان ناوەوە و سەر بە قەزای (پاوە)یە، (نەوسوود) سروشتێکی ئەفسووناوی و کەشوهەوایەکی زۆر خۆشی هەیە، ژیان لە (قەڵوەز و حەوزە لارە) کە دوو جێگەی دڵڕفێنی ئەم شارۆچکەیەن کە مرۆۋ سەرمەست و دیدەمەست دەکەن، خەڵکەکەی بە شێوەیەکی گشتی ژیر و بە سەلیقە و رۆحسووکن.

20ـ کەریم حەمەڕەحیم حەمەعەلی بە (کەریم دەرەتوێیی) ناسراوە.

21ـ حەمەجافر حەمێ.

22ـ ئەلیلەی نەوسوودی.

23ـ محەممەد عەلی محەممەد بە (مامۆ حەمە) ناسراوە.

24ـ حەمەکەریم سلێمان.

25ـ مەژنوون محەممەد زۆراب بە (مەژنوون کێمنەیی) ناسراوە.

26ـ حەیران محەمەد زۆراب بە (واڵە حێرانێ) ناسراوە.

27ـ زۆراب محەممەد کێمنەیی.

28ـ سۆفی حەمەعەلی بە (حەمەعەلییە خاوە) ناسراوە.

29ـ رەشید غولاّم بە (مامۆ رەشە) ناسراوە، ئەم گۆرانیبێژە هەورامی نییە.

30ـ حاجی یاقۆ.

31ـ عەلی عەبدولعەزیز تەوێڵەیی بە (عەلییە گوڵە) ناسراوە.

32ـ محەممەد ساڵح فەرەج بە (حەتە فەرەح) ناسراوە.

33ـ حەمەحسێن یووسف عەزیز  بە (حەمە حسێن کێمنەیی) ناسراوە.

34ـ عوسمان مۆمن بە (عوسمان هەورامی) ناسراوە.

35ـ جەمیل عەبدولاّ ئەحمەد بە (جەمیل ئەحمەدی) ناسراوە.

36ـ سەباح حەمەصاڵح خارگێلاّنەیی[17] بە (سەباح هەورامی) ناسراوە.

---

[17] خارگێلاّن ـ گوندێکە لە هەورامانی لهۆن و سەر بە ناحیەی (بیارە)یە، دەکەوێتە لای راستی رێگەی نێوان (خورمالّ ـ بیارە)، سەبارەت بە ناوەکەی چەند بۆچوونێك هەن، هەندێك دەڵێن کاتێك لەشکری (نادر شا)ی ئەفشار لەبەردەم پەلاماری عوسمانییەکاندا شکستێهێناوە، پاشماوەی لەشکرەکە بەخێرایی کەوتووەتە پاشەکشێ و هاتوە لە شوێنی (خارگێلاّن)ی ئێستادا پشوویداوە، گوایا خەڵکەکە وتوویانە بە (غارگێلاّنۆ) بە واتای بەغارکردن گەڕاوەتەوە، پاشان ناوەکە بووە بە (خارگێلاّن، هەندێکی تر پێیانوایە لە (خێرەگێڵێنۆ) بە واتای خێرگەڕاوەتەوە هاتووە، دوابۆچوونیش ئەوەیە دەڵێت: کاتێك (نادرشا) گەڕاوەتەوە ماڵی خانمێکی ژیر و نانبدە بە ناوی (خاتوو گێلاّن) لەو شوینەدا بووە، (نادرشا) لایداوەتە ماڵەکە و ئەو خانەمەش پێشوازی گەرم و خزمەتی باشیکردووە، بۆیە دواتر فەرمانی تاپۆکردنی ئەو شوێنەی لەسەر (خاتوو گێلاّن) دەرکردووە، گوایا ناوەکە لە ناوی ئەو خانمەوە هاتووە.

37ـ حەمەمین حەمەعەلی عەبدولحسێن بە (حەمـەمینی خوایەشـتی) ناسـراوە، نـاوبراو هەورامی نییە.

38ـ مەولوود ئەنوەر ئەحمەد سەلیم بە (مەولوودی سەلیمی) ناسراوە.

39ـ مستەفا حەمەلاو تەوێڵەیی.

40ـ جەلال هەرسینی.

41ـ رەحمەت دەڵەمەرزی.

42ـ تۆفیق فەتاح بە (تۆفیق دزاوەری[18]) ناسراوە.

---

(خـارگێلاَن) بـە هەوارگـەی زسـتانەی خـەڵکی تەوێڵـە لـە قەڵەمـدەدرێت، لـە بـەر ئـەوەی زسـتانی تەوێڵـە بـەفر و باراناوییـە، ژمارەیـەك لـە ئاژەڵدارەكانیان هاتوونەتـە ئـەوێ و وەرزی سـەرما و سـۆڵەیان تیـا گوزەرانـدووە، هـەر بـۆ نموونـە (حـاجی حەمەكـەریم) لـە تیرەی (ئـەلی حـاجی) هاتووەتـە خـارگێلاَن و تێیـدا نیشـتەجێبووە، پاشـان نـەوەكانی بنەماڵـەیـەكی گـەورەیان پێكهێنـاوە. هـەروەها (حـاجی عەبـدولا حەمەحـسێن و كورەكـانی حـاجی عەلییـە سـوور) هاتوونەتە خارگێلاَن و ئاژەڵدارییان تێداكردووە.

زەوی خـارگێلاَن تـا رادەیـەك تـەخت، بـەلاَم بەردەلاَنـە، خـەڵكی گوندەكـە بـۆ بەرهـەمهێنانی دانەوێڵـە سـوودی لێوەردەگرن، هـەروەها كاتێك تـووتن رەواجی هـەبوو تـووتنی باشـی تێدا بەرهەمـدەهێنرا، لەبـەر ئـەوەش لەوەرگـە و پاوانی باشیان هەیە، ئاژەڵداریش لە گوندەكەدا بایەخی گەورەی هەیە و لە ئێستادا زۆربەیان سەرقاڵی ئاژەڵدارین.

[18] دزاوەر: خەڵكی هەورامان پێیدەڵێن (زاوەر)، یەكێكە لە گوندە دێرینـەكانی هـەورامانی لهـۆن و لـە خۆرهـەلاَتی كوردستاندایە، دەكەوێتە باكووری خۆرهەلاَتی (تەوێڵە)وە وكەمتر لە (2) كیلۆمەتر لێیەوە دوورە، لە چەند شوێنێكدا بـاخی تەوێڵـەیی و دزاوەرییـەكان تێكەڵـدەبن، هـەر لـە كۆنیـشەوە ژنوژنخـواز لـە نێوانیانـدا هـەبووە، هـەر بۆیـە چـەند تیرەوەیەكی تەوێڵەیی و دزاوەری یەك رەچەڵەكیان هەیە، هەر بۆنموونە:

1ـ مەنووچـەر كـوڕی مـەحموود ئاغـا لـە تیرەی ئاغەلـەر، لـە تەوێڵـەوە چووەتە (دزاوەر) و لـەوێ نیشتەجێبووە و نەوەكانی بوونەتە بنەماڵەیەكی دزاوەری.

2ـ خوسرەو كە بە (خەشیل) ناسراوە، لە (دزاوەر)ەوە هاتووەتە تەوێڵە و تێیدا نیشتەجێبووە، پاشـان نـەوەكانی بوونەتە بنەماڵەیەكی تەوێڵەیی.

3ـ محەممەد ئەحمەد تەیب لە گوندی (خانەگا)ی نزیك (پاوە)وە هاتووتە (دزاوەر)، لەوێشەوە هاتووەتـە تەوێڵـە و بنەماڵەیەكی لێكەوتووەتەوە.

4ـ فەرەج كوڕی خالید لە تیرەی (فەرهاد)ی تەوێڵەیی، چووەتە (دزاوەر) و تێیدا نیشتەجێبووە.

ئەم گوندە لای هەڵگرانی رێوڕەچەی یارسان زۆر پیرۆزە و پێیانوایە (بازنەی چلتەن) بـە فـەرمانی سـان سـەهاكی بـەرزنجی لـەم گوندەدا ژیـاون و ئـەركی دینـی خۆیـان جێبـەجێكردووە. بـۆ زانیـاری زیـاتر بڕوانـە (سـەرەنجام: دەورەی چلتەن: لاپەڕە (402).

لە دەورووبەری گوندەكەدا چەندین گۆڕستان هەن كە ژمارەی گۆڕەكان و رووبەری گۆڕستانەكان هـەرگیز لـە گـەڵ رێژەی دانیشتوانی ئەو گوندەدا نایەنـەوە، لـە باشـووری خۆرئاوایـشەوە كـەزەوی و بـاخی تەوێڵـەیی و دزاوەرییـەكان

43 فەتحولاَ ئەمینی، ناوبراو خەڵکە جوااانڕۆیە و هەورامی نییە..

44 عەلی حەمەی ڕەجەب دزاوەری.

45 مەولوود مستەفا بە (مەولوودی دشەیی) ناسراوە.

46 عومەر عەزیز بە (عومەری خوسرەوی) ناسراوە.

47 ڕۆستەم کەریم ڕۆستەم بە (ڕۆستەم کێمنەیی) ناسراوە.

48 قوربانی تۆفیق مەحیەدین بە (قوربانی خالیدی) ناسراوە.

49 ئەشرەف دزاوەری.

50 ڕەحمان بەڵخەیی.

51 فەرزاد ئەمین محەممەد ئەمین بە (فەرزادی ئەمینی) ناسراوە.

52 سیروان حەمەحسێن یووسف عەزیز بە (سیروان خالیدی) ناسراوە.

53 ئیسماعیل ڕەسووڵ بە (ئیسماعیل هانەگەرمڵەیی) ناسراوە.

54 ئیسماعیل حەمیدی نۆدشەیی.

55 سەعدی جەمیل بە (سەعدی ئەحمەدی) ناسراوە.

56 محەممەد شەریف ئەمین بە (عەتا زەڵمی) ناسراوە.

---

تێکەڵدەبن و پێیدەوترێت (دەرۆ تەرتیبا= چۆمی تەرتیبا)، شوێنەواری نیشتەجێبوونی دێرین تا ئێستاش دیارە، چەندین کووپە و سکەی جۆرا و جۆر لەو شوێنەدا دۆزراوەتەوە، مەزاری یەکێك لە دیندارە گەورەکانی ناوچەکە بە ناوی (شێخ شەهابوددینی دزاوەری) لە خوار گوندەکەدایە، هەر لەکۆنەوە و ئێستاشی لە گەڵدا بێت خەڵکی ناوچەکە بۆ ڕزگاربوونی منداڵەکانیان لە کۆکەڕەشە دەیانبەنە سەر ئەو مەزارە،

دزاوەر ئاو و هەوایەکی سازگاری هەیە، چەندین پارچە باخی ڕەنگینی تێدان، باخەکانی (مەرە، دۆڵانا، هامنۆ) سەیرانگەی ئەفسووناوین و گەواهی جوانی سرووشتی ناوچەکەن، بەرهەمی باخەکانی بریتین لە (گوێز، توو، هەرمێ، هەنار، هەنجیر، ترێ) و میوەکانی تر، هاوکات سەدان دۆنم ڕەزەدێمی تێدایە کە تایبەتن بە بەرهەمهێنانی بەتامترین جۆری ترێی ڕەش.

دزاوەرییەکان بۆ بژێوی خێزانیان بێجگە لە باخداری ئاژەڵداریشیان دەکردو باشترین جۆری ماس لە هەورامانداا ئەمان بەرهەمیان دەهێنا، بەیانیان زوو دەیانهێنایە تەوێڵە بۆ فرۆشتن و بە پارەکەی پێداویستی خۆیان دەکڕی، هەروەها لە ناو تەلاَنە باخەکانیاندا بەتامترین جۆری (پەتاتە، پیاز، توور، سڵق، چەوەنەر)یان بەرهەمدەهێنا.

بەداخێکی گرانەوە ئەم گوندە لە ئەنجامی شەڕی ناڕەوای (ئێراق ئێران) بە سووتماککرا، زۆربەی خەڵکەکەی تا ئێستاش لە شارەکانی (مەریوان، پاوە، ڕوانسەر، سنە، کرماشان)دا دەژین، ئەگەرچی هاوینان هاتوچۆی باخەکانیان دەکەن، بەلاَم تا ئێستا گوندەکەیان ئاوەدانیان نەکردووەتەوە.

57ـ جیهانبەخش نەوسوودی کە بە (پەخشە= بەخشە) ناسراوە..

58ـ یوونس میرزا عەبدولاّ.

59ـ یەحیا رواری.

60ـ رزگار حەمەڕەحیم بە (رزگار گەچێنەیی) ناسراوە.

61ـ نەوزاد نەسرولاّ بەگ هانەدنی.

62ـ حەمە سوور نەوسوودی بە (حەمەلە) ناسراوە.

63ـ حەمە حاجی گۆڵپی بە (حەمەڕووش) ناسراوە.

64ـ لایەق فەتحولاّ ئەسکەندەر بە (لایەق ئیبراهیمی) ناسراوە.

65ـ عەبدولاّ فەتاح بە (مامۆ عەبەی گولّپی) ناسراوە.

66ـ حاجی رەحمان فەتاح تەوێڵەیی.

67ـ ئیسماعیل عەزیز بە (ئیسماعیل خوسرەوی) ناسراوە.

68ـ عەلی خەرامان بەڵخەیی.

69ـ حەمەخان بەڵخەیی.

70ـ خشیار مەولوودی.

71ـ جەمال چەشمیدەری.

72ـ کوێخا حەمەحسێن وڕایی[19].

73ـ وەهبی حەمەڕەشید

74ـ یەعقووب سۆسەکانەیی[20].

---

[19] وڕاـ گوندێکی هەورامانی لهۆنە و دەکەوێتە پشتی ئەو شاڕێیەی لە (پاوە) وە بۆ (نۆدشە) دەچێت، لە شوێنێکی بەرز و سەختدایە، لە سەر رۆشنایی سەرژمێریساڵی (2000ز) ژمارەی خانووەکانی (94) خانوو، ژمارەی دانیشتوانەکەی (418) کەسن.

[20] سۆسەکان: ئەم گوندە دەکەوێتە سەر شاڕێی سەرەکی نێوان (بەڵخە و تەوێڵە، سەبارەت بە ناوەکەی چەند بۆچوونێك هەن، دووانیان بەم شێوەیەن:

1ـ دەڵێن لە بەرئەوەی سوێسکەی زۆر بووە پێیانوتووە (سۆسەکان)، دیارە خەڵکی هەورامان بە (سوێسکە) دەڵێن (سۆسی)، گوایا ئەم شوێنە کانگای سوێسکە بووە.

2ـ هەندێکی تریش دەڵێن لەو شوێنەدا خاتوونێکی ژیر و سەلارە بە ناوی (سۆسەن خان) ژیاوە، گوایا ناوەکە لە (سۆسەن خان)ەوە هاتووە و پاشان بووە بە (سۆسەکان).

75ـ روحولاّ زۆمی.
76ـ صدیق حەسەنی.
77ـ خاتووعاسێ شێخانی.
78ـ سابیر شیانی.
79ـ عەلادین شیانی.
80ـ خاتوو سەفیە نەوسوودی.
81ـ رەزا حەسەنی.
82ـ عەلی مەولوودی.
83ـ دەروێش رەسووڵ نۆدشەیی.
84ـ حەمەعەلی رەزایی.
85ـ خاتوو سوەیبا هەجیجی.
86ـ خاتووعەتیێ نەروییەیی.
87ـ سەمین نگڵی.
88ـ نزار سابیر فەرەج
89ـ لوقمان شۆشمەیی.
90ـ ئەمین حەمەمراد بە وەستا ئەمین ناسراوە.

---

بە پێی ئەو گۆڕستانە زۆرانەی لە دەوروبەری گوندەکەدان دەبێت هەر لە دێر زەمانەوە شوێنی نیشتەجێبوون بووبێت، چونکە گۆڕی یەکێك لەو گۆڕستانانە لە سەر شێوازی گۆڕی موسڵمانان نین.

***2/ گۆرانی خاو:***

**جۆرێکن لەگۆرانی رەسەنی ناوچەی هەورامان و لەسیاچەمانەکان ئاسانترن، ژمارەیەکی زۆر لەگۆرانیبێژە هەورامییەکان دەتوانن زۆربەیان بچڕن، ئەم گۆرانییانە زۆر زۆرن وسەدان بەزمیان هەیە، هەندێکیان زۆر کۆنن و وەچە وەچە دوای وەچە گوێزراونەتەوە و هەندێکیشیان تارادەیەك تازەن، گۆرانییە خاوەکان لێوان لێون لەشیعری خۆماڵی و وێناکردنێکی ریالیستانەی سروشتی ناوچەکە و جۆری ژیانی خەڵکەکەین، ئەم گۆرانییانە هەندێکیان پێیاندەوترێت (نەرمە بەزم = وردە بەزم)، هەندێکیشیان پێیاندەوترێت (بەزمێ گێلاێ= بەزمی گەڕیان) و هەشیانن پێیاندەوترێت (بەزمی دەرەیی)، هەروەها هەشیانن پێیاندەوترێت (بەزمی شێخانە)، لەبەر ئەوەی راو بۆچوونی گۆرانیبێژە ناسراو و کارامەکانی هەورامان دەربارەی جیاکردنەوەی ئەم گۆرانییانە وەك یەك نییە و تێکەڵوپێکەڵی لە نێوانیانداهەیە، هەر بۆ نموونە رای دووگۆرانیبێژی گەورەی هەورامان دەربارەی هەندێك لە بەزمەکان دەخەینەروو:**

**خوالێخۆشبوو (مام هەیەری نۆدشی) دەیوت ( لەیلی گیان، چاوڕەشە کاڵێ، مەچۆ مەچۆ، ئای لەرەعناخان، ولەکاڵ گیان) هەموویان (بەزمی دەرەیی)ن، کەچی گۆرانیبێژی ناسراو (عوسمان هەورامی = عوسمان کێمنەیی) ئەم گۆرانییانە و چەند گۆرانییەکی تری وەك: (زەنگیانە، هاوار من وەتۆمە، باوانەکەی باوانم، ئەرێ هۆنازارگیان) بە (بەزمی گەڕیان) دەداتە قەڵەم، بۆیە ئێمە لێرەدا هەروەك نموونە نەوەك سەرژمێر بەبێئەوەی لەسەر ئەو شێوازەی ئاماژەمانپێدا لەیەکتریان جیابکەینەوە ناوی ژمارەیەکیان دەنووسین، مەسەلەی جیاکردنەوەشیان بۆ شارەزایانی بواری مۆزیك بەجێدەهێڵین، بەڵکو رۆژێك بتوانن هەموو بەزمە خاوەکان لەسەر بنەمای ریتمەکانیان لە یەکترجیابکەنەوە، ئەو بەزمانەش ناویاندەهێنین ئەمانەن:**

**(خاوەر گەلاوێژ، کورپەی قەدباریك، مەلەسەرشین گیان، هۆری لەمل، کافلەی هەواری، کەوا خامەك خاڵ شیرینێ، ئەی رۆ، ئەمنەی باڵابەرز، گەردەن زەرد و لامل زەرد، خاوەر خاوەر، شوەکەت رۆ، شیرین ئای شیرین، گەردوون چیبکەم، باوانەکەی باوانم، ئەری هۆنازارگیان، هۆ ڕابە (3) بەزمە، سەلەسەلە (3) بەزمە، بەنەرمە نەرم وخاوخاو، ئەی لاوەلاوە، ئەی شل، ئەی خاڵ، ئامان میم گورجی، مەچۆ گیان مەچۆ، لەیلێ گیان (3) بەزمە، ئای شلێ گیان شەماڵ، ئای لە رەعناخان، چاوڕەشە کاڵێ، یاران یاران، زەنگیانە، ولەکاڵ گیان، ئامان شیرین سۆزە، ئازیز، کەژەڵ، گەردوون گەردوون، ئانا بارش کەرد، لایە لایە، هویە وسەرهویە، خانمێ گیان، کەسەکەم**

لامل زەرد، نەجیبەگیان بەلەنجە، بنوە، عەمرم پەروانە، ئەی خاڵ= گیانە شیرینەکەم، نەرەی دارەپان، سوێبڵەگیان، پەروین گیان، بەزمو پاچاڵی، تەنکە، گوراڵە سووری دۆروهەوارا، ئامین مەچۆ جافی، وەسەدمەرۆ (5) بەزمە، چاومەسێ گیان، دەلیل گیان، ئەرێ هۆ گەلاوێژ، حەلاو، ئامان من وە تۆمە، عادزە مەبە و مەتۆریە، لاوەلاوەکە، گوڵعەلی لەیل، بابا عەلی گیان)، ئەم سێ بەزمەی دواوەیان گۆرانی شێخانەن)، شایانی باسکردنە هەندێك گۆرانی خەمناك هەن تایبەتن بە ژنان لەکۆڕی شیوەن و لاواندنەوەی ئازیزانیاندا، یان هەرکاتێك بیری لە دەستدانی ئەو ئازیزانەیان بێت بەمێشکیاندا، بە سۆزێکی قووڵ و بەچاوی پڕئەسرین و لەگەڵ هەنسکداندا دەیانچڕن، ئەوانەش هەموویان لە بەزمە خاوەکانن.

هەر لە باسکردنی ئەم گۆرانییانەدا پێویستە باس لەوە بکەین، هەر لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە چەند بەزمێکی گۆرانی کە فڕیان بەسەر هونەری گۆرانی هەورامییەوە نییە، هێنراونەتە ناو بەزمە خاوەکانەوە، ئەم بەزمانە بە شیعری هەورامی دەچڕرێن و هەشیانن لای گۆێگرانیان پەسەندن، ئێمە لاریمان لەوەدا نییە گۆرانیبێژە هەورامییەکان تێکەڵاوی گۆرانی دەرەوەی شێوەزمان و ناوچەکەی خۆیان بکەن، بەڵام پێویستە ئەو بەرێزانە باش لەوە ئاگاداربن بە تەنها چڕینی ئەو گۆرانییانە بە شیعری هەورامی، نایانکاتە گۆرانی هەورامی، چونکە تام و بۆن و بەرامەی هونەری گەلێکی تریان پێوەیە، لە نموونەی ئەم گۆرانیانەش (مەردا مەردانێ، لەیلا گیان لەیلا)، بۆیە پێویستە ئەو هونەرمەندەی ئەمجۆرە گۆرانییانە دەچڕێت، هەمیشە ئاماژەبدا بەوەی کە گۆرانییەکە لە بنەڕەتدا لە کوێوە هاتووە و لە هونەری گۆرانی کام نەتەوەوە وەرگیراوە، بۆ ئەوەی سەر لە گوێگرانی گۆرانییەکانیشی تێکنەدات، لە چاوپێکەوتن و دەمەتەقێکانی لە کەناڵەکانی میدیادا نەیانکاتە بەرهەمی خۆی.

### 3أ گۆرانی چەپڵەڕێزان:

ئەم گۆرانییانە ئاسانترین جۆری گۆرانی هەورامین و هەموو گۆرانیبێژە هەورامییەکان دەتوانن بیانچڕن، ماوەیەکی دوور و درێژە شوێنی خۆیان لەناو فۆلکلۆری بیستراوی هەورامانـدا کردوەتەوە و بەشێوەیەکی گشتی دیوی خۆشی ژیانی خەڵکی ناوچەکە دەخەنەڕوو، گۆرانی چەپڵەرێزان لەچەندین شوێن و کاتی جیاوازدا خۆشی و بەشارەت دەبەخشنەوە لە: (شایی و

زەماوەنـدەکان، گەلکارییـەکان، سـەیرانەکان)دا گەرمکـەری کـۆڕی هەڵپـەڕکێ و ڕەشـبەڵەکن ولـە گەرمــەی شەونــشینی نــاو(مــاڵ یــاخود بــاخ و هەوارگــەکان)یــشدا ئامــادەبووان دڵخــۆش و سەرمەستدەکەن، گۆرانیبێژەکان جارجـار لەگـەڵ ژەنینـی شمـشاڵ و زۆربـەی کاتـەکانیش لەگـەڵ چەپڵەرێزانێکی گەرمدا دەیانچڕن، شتێکی ئاشکرایە ئەو چـەپڵەرێزانە ئیقـاعی گۆرانییەکانـە و بەزمەکانیان لەسەر ڕیتمی تایبـەت بـەخۆیان ڕێکدەخات، چـەند بـەزمێکی کەمیـشیان هـەن لـە گەڵ جۆرە چەپڵەیەکی خاودان، ئەم گۆرانییانـە پێـشتر (شـیعری فۆلکلـۆری ناوچـەی هـەورامان، شـیعری شـاعیرە هەورامییـەکان، شـیعری ئـەو شـاعیرانەی کـە هـەورامی نـەبوون و بەهـەورامی شـیعریان هۆنیوەتـەوە) تێدابـەکارهێنراوە، بـەڵام پاشـان چـەندین شـیعری شـاعیرەکانی تـر و شــیعری فۆلکلــۆری دەرەوەی هەورامانیــشیان تێکــەڵکراوە، هــەر لێرەشــەوە خــەڵکی دەرەوەی هەورامان زیاتر لە جۆرەکانی تری گـۆرانی هـەورامی پێیـان ئاشـنابوون، ئـەم گۆرانییانـە سـەدان بەزمیان هەیە و بۆ نموونە لێرەدا ناوی ژمارەیەکیان دەنووسین لەوانە:

(ئای نەخش، ئاخ بەلەنجەگیان، ئامەکە و ئامینم، ئـەی کـەڵی ملبـەرز، ئامـەکوڵێ و فاتـە کوڵێ، ئەی خاڵ، ئامەگری مەگری، ئامان لەرزانە (3) بەزمە، ئامینێ تۆ گوڵەکەمی، بیمـارم خـڕ بیمارم، بێتاوان، بەتۆرتکرد بـەتۆرای، بـەرزی بـەرزی، بـامن بلـوۆ قاسـم خـان، بـیرۆ گیـان بـیرۆ، جەژنەن شادیەن، دادەنگ دادەنگ، دیسان دووبارە، هـەناری وەی هـەناری، وەی عەڵەکـە عەڵەکـە (2) بەزمە، وەشەن هۆرامان، کەتانە و کەتانە، کاڵەبەی کاڵە، کەنیشکە کاڵەکەم، کرمان کرمانـە، کاوە شنگییێنە بەرزەکۆ ژیواری، کوڵەلێ باوانم، گوڵەکەم نەخشانم، گوڵ یاحاجی مریەم، گـەردە و گەردە، لە کلاۆرۆچن خۆم داهێڵم، نارنجە و نارنجە، نەهیەی خاڵماوی، نـەشمیل گیـان نـەشمیل، خەجێ خەجێ، خرنگـە، ڕێحان، شـۆڕێ بالآبـەرز، شـنە گیـانم شـنە، شـۆنم و شـیلان، پـەپووەکۆ شـاهۆی، سـەرعێل عـەرزم هـەن، خڕبینـاوی دیـدێم، خـاڵ نـازار، خـاڵ سـیاوگیان لـەیلی گیـان، خانمەکە، خاڵداری خاڵداری، خەجێ حـەجێ، شـیرینەوخانم، عەمرەکـەم بـی کـەنی) و چـەندین گۆرانی تریش.

ژمارەیەك لـە گۆرانیبێـژەکانی ناوچـەی هـەورامان هەوڵیانـداوە هەنـدێك لـەگۆرانییکانی (چـەپڵە ڕێـزان، نەرمـە بەزمـەکان= وردەبەزمـەکان) تێکـەڵ بـەئامێرەکانی مۆزیـك بکـەن، ئـەو هەوڵانـەش هەرلەسـەرەتای شەسـتەکانی سـەدەی ڕابـوردووەوە دەسـتیانپێکردووە و تـا ئێـستاش بـەردەوامن، هەوڵـەکانیش ئەگەرچـی لـە سـەرەتاوە سـاکاربوون و گۆرانییـەکان لەسـەر شـێوازی (موسایرە) و بەزیندوویی پەخـشکراون، بـەڵام تـا ئێـستا لـە یـادەوەری گوێگرانیانـدا ماونەتـەوە،

هەوڵەکانی دواتریش بە تایبەت پاش راپەرین و ئازادی ئەگەرچی بێکەموکوڕی نین، بەڵام جوانتر و فراوانترن و ژمارەیەکی زۆر لە گوێگرانیان لە دەورەی گۆرانی هەورامی کۆکردووەتەوە، ئەو گۆرانیبێژانەش هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا لەم بوارەدا شوێن دەستیان دیارە ئەمانەن:

1- حاجی نەسروڵا کەیکاوس بە (ناسکۆڵ) ناسراوە.
2- شەفیع محەممەد زۆراب بە (شەفیع کێمنەیی) ناسراوە.
3- دارا محەممەد عوسمان بەگ بەڵخەیی.
4- ئەرجومەن شەوکەت بە (ئەرجومەن هەورامی) ناسراوە.
5- عادل رەحمان بە (عادل هەورامی) ناسراوە.
6- حەسەن حسێن کەریم خارگێڵانەیی.
7- تارا جاف. ئەم گۆرانیبێژە مۆزیسیانیشە و ئامێری چەنگ دەژەنێت، خەڵکی هەورامان نییە.
8- نەجمەدین عەلی عەبدولعەزیز بە (نەجمەدین هەورامی) ناسراوە.
9- سیروان جەلال عەبدوڵا بە (سیروان لهۆنی) ناسراوە.
10- ئەدهەم سلێمان جافر بە (ئەدهەم هەورامی) ناسراوە.
11- عیسا سلێمان رەمەزان بە (عیسا عەلیزادە) ناسراوە.
12- دڵسۆز حەمەحسێن کێمنەیی.
13- ناهیدە فەتاحی.
14- هێرش هەورامی
15- بەهرۆز عەلی بەڵخەیی.
16- فەرزین عەزیز بە (فەرزین هەورامی) ناسراوە.
17- بیژەن پاوەیی.
18- بەهمەن شەریفی
19- رزگار فەتاحی.
20- هەورامان عێزەت مستەفا تەوێڵەیی.

21ً عادل شەفیع كێمنەیی.

22ً رەحیم هەجیجی.

23ً نەوشیروان عارف زەردەهاڵی.

24ً رەمزی محەممەد عوسمان بەگ بە (رەمزی لهۆنی) ناسراوە.

25ً صدیق كەمانگەر بە (صدیق ئافریانی) ناسراوە. ئەم گۆرانیبێژە هەورامی نییە.

هەروەها چەند گۆرانیبێژێكی تریش.

هەندێك لەگۆرانیبێژە ناسراوەكان لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان هەورامی نین بەلآم گۆرانی هەورامیان چڕیوە و ژمارەیەكیشیان لەم بوارەدا سەركەوتووبوون، بەو سەركەوتنەشیان توانیویانە شتێكی نوێ بخەنە سەر گۆرانییەكان، بەتایبەت كە لەگەڵ مۆزیكدا بەسەلیقە و تواناوە چڕیویانن و جۆرە ئەفراندنێكیان تێداكردوون، ئەو گۆرانیبێژانەش لەم بوارەدا شوێن دەستیان دیارە ئەمانەن: (عەباسی كەمەندی، ناسری رەزازی، نەجمەددینی غولآمی، حسێنی شەریفی، پەیوەند جاف، دانا غەنی)، دیارە ئەم گۆرانیبێژانە لەلایەكەوە بەچڕینی گۆرانییە هەورامییەكان و لەلایەكی تریشەوە بەئاماژەدانیان بەدەوڵەمەندی گۆرانی هەورامی لەكاتی چاوپێكەوتنەكانیان لەگەڵ كەناڵەكانی راگەیاندن، یاخود لە مەجلیسە تایبەتییەكانیاندا، خزمەتێكی باشیان بە فۆلكلۆری بیستراوی ناوچەی هەورامان كردووە.

بەلآم بەداخەوە چەند گۆرانیبێژێك چ ئەوانەیان خەڵكی ناوچەی هەورامانن، یاخود ئەوانەیان خەڵكی دەرەوەی هەورامانن و پێویست بەناوهێنانیان ناكات، لە ئەنجامی كەمشارەزاییان بە فۆلكلۆری هەورامان و مێژووی گۆرانییە هەورامییەكان، زیادەڕۆیی دەكەنە سەر ئەم گۆرانییانە و حەشریان پێدەكەن و كورد واتەنی وایانپێدەكەن (با بەدەواری شڕی نەكردبێت)، بۆنموونە هەیانە لەگەڵ ئەوەی خۆی خەڵكی هەورامانە كەچی گۆرانی (عەرەبی، توركی) دەهێنێت و بە شیعری هەورامی دەیانچڕێتەوە، دەیانئاخنێتە ناو گۆرانییە هەورامییەكانەوە و دەڵێت ئەم بەزمە داهێنانی خۆمە، یاخود لەكاتی چاوپێكەوتنەكانیدا بەئارەزووی خۆی (شەلم كوێرم ناپارێزم) دەنیشێتە سەریان، هەندێكیان دەكات بە (فۆلكلۆر) كە داهێنەرەكانیان تا چەند ساڵێك لەمەوبەر مابوون، یان تائێستاش زڕتەی چاویان دێت، هەروەك چۆن گۆررانیبێژێكی هەورامی لە یەكێك لەبەرنامەكانی كەناڵی (كوردسات)دا گۆرانی (كەڵمل باوانم)ی كرد بە فۆلكلۆر، لەكاتێدا ئەم گۆرانییە هینی گۆرانیبێژی خوالێخۆشبوو (نەسرولآ كەیكاوس ناسراو بە ناسكۆڵ)ە، یاخود لەگۆرانییە فۆلكلۆرییەكان دەكات بەهینی

گۆرانیبێــژێك کــە ئــەو گۆرانیبێــژە خــۆی لــەو شــتە بێخبــەرە، هــەروەك چــۆن لەهــەمان چاوپێکەوتندا (گۆرانی خانم خانمی) کرا بـە هینـی گۆرانیبێـژ (جـەمیل ئەحمـەدی)، هەشـیانە خــەڵکی دەرەوەی هەورامانــە، گۆرانییــە فۆلکلۆرییــەکانی هــەورامان دەچــڕێت، بــەڵام لــەکاتی چـاوپێکەوتنەکانیدا دەیانکـات بـە گـۆرانی خـۆی، یـاخود لـەکاتی وێنـەگرتنی گۆرانییەکـەدا و پیشاندانی لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆنـدا، هـیچ ئاژەیـەك بـەوەنادات کـە ئـەو گۆرانییـە فۆلکلـۆری ناوچەی هەورامانە، وەیان گۆرانییەکە فۆلکلۆر نییە و بەزۆرەملێ دەکرێت بە فۆلکلۆر، بۆ زیـاتر روونکردنەوەی ئەم باسە ئاماژە بەچەند نموونەیەك دەدەین بەم شێوەیە:

1ـ گـۆرانی (گـوڵ یاحـاجی مریـەم) لـە تایتڵەکەیـدا کـراوە بـە فۆلکلـۆر کـەفرێ بەسـەر فۆلکلۆرەوە نییە، ئەم گۆرانییە خوالێخۆشبوو (نەسروڵا کەیکاوس ناسراو بە ناسکۆڵ) دایهێنـاوە و گۆرانییەکــەش رازی ئــەوینێکی گەورەیــە، هــەمووی خــەڵکی تەوێڵــە و زۆرێــك لەخــەڵکی هەورامانی ئەمدیو بەتایبەت ئەوانەیان هاوتەمەنی ناوبراون شتێك دەربارەی ئەو رازە دەزانن.

2ـ گۆرانی (خاڵداری خاڵداری)، لەبەرنامەیـەکی تایبـەتی تەلـەفزیۆنی گـەلی کوردسـتاندا کەبەبۆنـەی یـەکێك لەجەژنەکانـەوە پەخـشکرا، خـانمێکی گۆرانیبێـژ ئـەم گۆرانییـەی کـرد بـە گۆرانی هونەرمەند (فەیزی نەژادی)، لەگەڵ رێزێکی زۆرمان بۆ ئـەم خانمـە و بـۆ هونەرمەنـدی ناوبراو دەڵێین: ئەم گۆرانییە رازی ئەوینێکی راستەقینەیە و مێژووی ئـەو ئەوینـەش بـۆ پـێش لـەدایکبوونی هونەرمەنـد (فـەیزی نـەژادی) دەگەڕێتـەوە، تـا ئێـستاش یـەکێك لـە لایەنـەکانی خۆشەویستییەکە ماوە و تەمەنی نزیکەی سەد ساڵە، هەر لێرەدا دەڵێین ئەم گۆرانییە لە کاسێتە هەورامییەکانی سەرەتای شەسـتەکانی سـەدەی رابـوردوودا بـەدەنگی گۆرانیبێـژە هەورامییـەکان تۆمارکراوە.

3ـ گــۆرانی (ســەرعێل عــەرزم هــەن) لــە کــاتی چــاوپێکەوتن لەگــەڵ یــەکێك لــە گۆرانیبێژەکانی کوردستانی ئەودیودا، ئەو بەرێزە گۆرانییەکەی بە داهێنانی خـۆی دایـە قەڵـەم، بــەڵام ئــەم گۆرانییــە پــێش لــە دایکبــوونی ئــەو بــەرێزە بەماوەیــەکی زۆر لــەناو گۆرانییــە هەورامییەکانــدا تۆمــارۆکراوە و بەڵگــەشمان لــەم بــوارەدا کاســێتە کۆنــەکانی گۆرانیبێــژە هەورامییەکانن.

ئەمانەی سەرەوە تەنها مشتێکن لە خەروارێك و چەندین نموونەی تریشمان لەم بـوارەدا هەن، بەلاّم ئەوەندە دەڵێن: ئەمانەیان بۆ ئاشکراکردنی هەنـدێك لـەو زیـادە ڕۆییانـەی دەکرینـە سـەر گۆرانییـە هەورامییـەکان خرانـەڕوو، زۆربـەی گـوێگران و بینـەرانی کەناڵـەکانی رادیـۆ و تەلەفزیۆنەکانیش لەم بوارەدا خۆیان شایەتحاڵن.

پێدەچێت خوێنەری ئازیز لـەکاتی خوێندنـەوەی ئـەم بابەتـەدا بڵێـت: دەبوایـە نووسـەر ناوی ئەو هونەرمەندانەی بهێنایـە کـە ئـەم زیـادە ڕۆییانـەیان کـردووە و وەکـو جـۆرە مەتـەڵێك نەیهێــشتنایەتەوە، منـــیش دەڵـــێم مـــادام ئێمـــە مەبەســـتمان تـــوانجگرتن و کەمکردنـــەوەی بەخـشیندەیی ئـەو بەڕێزانـە بـۆ هونـەری کـوردی نییـە، نموونـەکان تـەنها بـۆ دەرخـستنی ڕاستییەکانن، کەواتە پێویست بە ناوهێنانیان ناکات.

هەر لەبواری گۆرانی هەورامیدا دەڵێن: بێجگە لەو گۆرانیبێژانەی ناومانهێنان کە خۆیان هـەورامی نـین و گـۆرانی هـەورامییان لەگـەڵ مۆزیکـدا چـڕیوە، ژمارەیـەکی تـر لەگۆرانیبێـژە ناسراوەکانی ناوچە جیاجیاکانی دەرەوەی هـەورامان بـە سـەلیقەیەکی زۆر و توانایـەکی باشـەوە گۆرانی هەورامییان چڕیوە و دەچـڕن تەنانـەت هەندێکیـشیان توانیویانـە سیاچـەمانە بـچڕن و هەشیانە سیاچەمانەی داهێناوە.

پاش ئەم کورتە باسەی سەبارەت بە گۆرانی هەورامی کردم، دێمە سەر ئەوەی هەنـدێك لـە گۆرانییـەکانی هـەورامان گـۆرانی تایبـەتن لەوانـە: (گـورانی شـێخانە، گـۆرانی گـەڕیان)، ئـەم گۆرانییانە لەرووی ریتمەکانیانەوە جۆرێکی جیاواز نـین لـە جۆرەکـانی تـری وەك (سیاچـەمانە، بەزمی خاو، گۆرانی چەپڵەڕێزان)، بۆنموونە گۆرانییە شێخانەکان هـەر لەسیاچـەمانەکانییانەوە هەتا بەزمە خاوەکان و بەزمە خێراکانیان لە سەر شێوازی هەمان ئـەو ریتمانـەن لـەم بابەتـەدا قـسەمان لەسـەریانکردووە، تـەنها جیاوازییـەك لـەم بـوارەدا هـەبێت ئەوەیـە گۆرانیبێـژەکان لەچـڕینی گۆرانییـە شـێخانەکاندا شـیعری عیرفـانی و ئـەو شـیعرانە دەڵێنـەوە کـە لـەبواری پەیوەندی ڕۆحی نێوان شێخ و مورید و خۆشەویستی شێخەکانی هەورامانـدا هۆنراونەتـەوە بـۆ نموونە:

ئانا ئامێوە جۆتێو سوارێ
عەلی[21] باخەکۆن عەلادین بیارێ

کەمەندەت وستە هۆیە و بێساران
موريد جەم بیەن چوون گەلای داران

سووچو چەتفەکێت بدەره لاوە
سابلاغ و بانە ئینێ جەڕاوە

شرامی بیناش مێزەرەی تەمین
شین و زاریشەن کۆن حیسامەدین

ئەمانە و سەدان دێڕە شیعری تر کە لە ناو گۆرانییە شێخەنەکاندا هەن.

سەبارەت بەو گۆرانییانەش کە گۆرانی (گێلاێ= گەڕیان) پێیاندەوترێت و وەك پێشریش وتم رای جیاواز لەسەر بەزمەکانیان هەیە، هەموویان لەسەر ریتمی گۆرانییە خاوەکانن، بەلام زیاتر لەکاتی زەماوەندەکان و لەگەڵ جۆرە هەڵپەرکێیەکی نەرم و خاودا دەچڕرێن، بەتایبەت پێش ئەوەی زەماوەند گەرمبکرێت و ریزەکان دەست بەهەڵپەرکێی خێرا و گەرمبکەن. هەورامییەکان (هۆرپڕای گێلاێ= هەڵپەرکێی گەڕیان)ی پێدەڵێن، هەروەها دوو گۆرانیش هەن کە پێشتر زیاتر تایبەتبوون بە رێوڕەسمی گواستنەوەی بووك لەماڵێ باوکییەوە بۆ ماڵی زاوا، بەزمەکانیش (وەی وەی بالابەرز، بادە و بادە)ن، بەزمی (بادە و بادە) لە کاتی رۆیشتن بۆ هێنانی بووك لە لایەن گۆرانیبێژەکانەوە چڕراوە هەتا گەیشتن بە ماڵی بووك، پاشان ئیتر بەزمی (وەی وەی بالابەرز) دەستپێکردووە هەتا گەیاندنی بووك بە ماڵی زاوا.

هەر لەبواری گۆرانیچڕیندا پێویستە باس لەوەش بکەین، چەند ئامێرێکی مۆزیکی هەر لەسەردەمە کۆنەکانەوە و ئێستاشی لەگەڵدا بێت لە هەوراماندا بایەخیان بووە و هەیە لەوانە:

---

[21] لێرەدا مەبەست لە (عەلی) حەزرەتی (شێخ عەلی حوسامووددین)ە.

(شمشاڵ، دەف، دەهۆڵ، زوڕنا، تەمبوور، ساز)، سەبارەت بە ( دەهۆڵ، زۆرنا، شمشاڵ) لە کاتـەکانی (زەماوەنــدگێڕان، گەلکارییــەکان، ســەیرانەکان)، هــەورەوا لــە (ئــالآی کۆتــەڵ= کۆتــەڵگێران)ە گەورەکانــدا بــەکارهێنراون، هەنــدێکجاریش گۆرانیبێــژەکان هــاوڕێ لەگــەڵ ژەنینــی (دەف، شمـشاڵ)دا گـۆرانی دەچـڕن، (تـەمبوور و سـاز)یـش لـە کـاتی جەمـە دینییـەکانی هـەڵگرانی ڕێوەڕەچەی یاریسان ئامادەبوونیـان هەیـە، (دەف) زۆرجـار بەتـەنها و هەنـدێك جـاریش هـاوڕێ لەگەڵ شمشاڵدا لە کۆڕی زیکری خانەقادا ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی (دەف) لـە زۆربـەی بۆنـە دیینـی و کۆمەڵایەتییەکانـدا وەك: (خوێندنـەوەی مەولوودنامـە، بەخاکسپاردنی مـردوو) شوێنی دیاری هەیە.

دواجــار دەڵــێن گۆرانییــە هەورامییــەکان تــەنها ســەرنجی گۆرانیبێــژە کوردەکانیــان ڕانەکێـشاوە، بــەڵکو گۆرانیبێـژێکی فارسـی وەك (لـەیلا فرۆهـەر) شـانازی بـەگۆرانی (بـەرزی بەرزی)یەوە دەکات وە بەیەکێك لـە گۆرانییـە خۆشـەکانی لەقەڵەمـدەدات، هەربۆیـە بەشـەوق و زەوقێکی خۆشەوە دەیچڕێت.

### هەڵپەڕکێ لای هەورامییەکان

هەڵپـەڕکێ هونـەرێکی میللـی گەورەیـە و لەگـەڵ ژیـانی مرۆڤـدا بەردەوامـە، کاریگـەری دیاریشی لەسەر ڕەوتی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵە جیاوازەکان بووە و هەیە، هـەرکاتێك بـاس لـە (خۆشـی وئاهـەنگ، زەماوەنـد، ژنهێنـان، سـەیران و گەشـت) دەکرێـت یەکسەر هەڵپـەڕکێ دێتـە مەیدانەوە، هەڵپەڕکێ بەشێکی زیندووە لە فۆلکلۆری گەلان، هـەموو گـەلێك تایبەتمەنـدی خـۆی لـە هەڵپەڕکێـدا هەیـە، ئـەو تایبەتمەندیانـەش لـە چـەند هۆکارێکـەوە سەرچـاوەدەگرن وەك: (سروشــتی ئــەو ناوچــەی مرۆڤــی تێــدا دەژیــی، کەشــوهەوا، جــۆری ژیــان و گــوزەران لــەبوارەجیاجیاکانی کۆمەڵایــەتی، سیاســی، ڕۆشــنبیری، ئــابووری ..هتــد)، هــەر بــۆ نموونــە هەڵپـەڕکێی گەلـە کوێستاننـشینەکان هەمیـشە خێـرا و بـە جووڵـە و گـەرموگوڕە، چوونکە لـەو شوێنانەدا مرۆڤەکان پێویستە گورجوگۆڵبن، بەڵام هەڵپەڕکێی گەلە گەرمیانـشینەکان خـاوترە و ئەو گەرمو گوڕییەی نییە، دیارە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری سروشت.

ئەگـەر بـەراوردێك بکـەین لـەنێوان هەڵپـەڕکێی ئـەو گەلانـەی کـە سـەربەخۆ و خـاوەن دەوڵەتن، کەمتر ژیانی چەوساندنەوە و ژێردەسـتیان چێـشتووە، دەبیـنین جیاوازییـەکی تـەواوی هەیــە لەگــەڵ هەڵپــەڕکێی ئــەو گەلانــەی کــە زۆربــەی ژیانیــان بەژێردەســتی و کولەمــەرگی

وچەرمەسەرێ بردۆتە سەر، لێرەدا نموونەیەك لەسەر جۆرێك لە (هەڵپەرکێی کوردی) و (هەڵپەرکێی ئەورووپی) دەهێنینەوە، دەبینین ئەورووپییەکان لەکاتی سەما و هەڵپەرکێکانیاندا زۆر ئازادن، بەشێوەیەکی تاك لەناو کۆمەڵی هەڵپەرکێکاراندا دەجوڵێنەوە تەنیا و تەنیا لە رووی ئیقاع و نەزمی هەڵپەرکێکەوە بەکۆمەڵەکەیانەوە وابەستەن، ئیتر لە ووردەکاریەکانی تردا ئازادانە دەجووڵێنەوە و دەتوانن ئەفراندنبکەن، دیارە ئەمەش ڕەنگدانەوەی جۆری ژیانی (کۆمەڵایەتی، ئابووری، رۆشنبیری، رامیاریی ...هتد) خۆیانە، چونکە خەڵك لەوێ ژێردەستنین و لە هەموو مافە مرۆڤایەتییەکانیشیان بەهرەمەندن.

بەڵام ئەگەر سەرنجی (هەڵپەرکێی کوردی) بدەین دەبینین ئەو کەسانەی ریزی هەڵپەرکێکەیان دروستکردووە راستەوراست شانیان لەیەکتری توند کردووە و بەیەکترییەوە بەسراونەتەوە و بەپێی جۆری هەڵپەرێکە وەك زنجیرێك پێکەوە گرێدراون، هەموو جوڵەکانیان وەك یەکە، هیچ تاکێکیان لە هەڵپەرکێکەدا ئازاد نییە و پێویستە وابەستەی کۆمەڵەکەی بێت، ئەوەیان تۆزێك ئازادبێت تەنها (سەرچۆپی کێش)ەکەیە بەیناو بەین دەتوانێت بەشێوەیەکی کاتی دەست لەڕیزەکەی بەربدات و چەندجووڵەیەکی بچووك بکات، بەڵام هەر دوای جوڵەکە دەگەڕێتەوە ناو ریزەکە و خۆی بەوانی ترەوە گرێدەداتەوە، ئەمە خۆی لەخۆیدا ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە ئازادییەکەی سەرچۆپیکێشیش هەر زۆر بەرتەسك و سنووردارە و بەبێ ریزەکەی هیچی پێناکرێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دۆخە ناهەمووارەی کە گەلی ئێمەی تێدا ژیاوە و هەرگیز ئەو سەربەستییەی بۆ مەیسەر نەبووە، کە بتوانێت ئازادانە بجووڵێتەوە.

لە هەڵپەرکێی کوردیدا وەك یەکێك لە دەرهاویشتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی جیاوازی گەورە لەنێوان هەردوو رەگەزی نێرومێدا کراوە، بۆ نموونە کاتێك هەڵپەرکێ دەستپێکردووە، (پیاو و کوڕ) سەربەستبوون لەوەی چۆن و کەی و لەکوێوە؟ دەستدەگرن و هەڵدەپەڕن هیچ کۆت و بەندێك لەسەریان نەبووە ، بەڵام (ژن و کچ) چاوەڕوانبوون هەتاکو کەسێکی نزیك بەخۆیان وەك (مێرد، برا، مام، خاڵ، ئامۆزا، خاڵۆزا، زاوا)، یان هەرکەسێکی تری نزیك بەخۆیان دەستی گرتبێت، ئینجا ئەوانیش توانیبێتیان بچنە ناو ریزی هەڵپەرکێکەوە، ئەمە لەکاتێکدا کە (رەشبەڵەك) یەکێکبووە لە سیماکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ژنیش تاراددەیەك تێیدا سەربەستبووە، کەچی ئەم کۆت و بەندانەشی لەسەربووە.





سەربەستی ژن لە رەشبەڵەکدا تـا رادەیـەك قاڵبـدراوبووە، سـەرەڕای ئـەوەی پێویـستبووە لەسەری لەگەڵ کەسی نزیك و مەحرەمی خۆیدا دەسـتبگرێت، لـەجۆری چوونیـشی بۆنـاو ریـزی هەڵپـەڕکێ هـەر جیـاوازیکراوە، چـونکە (پیـاو و کـوڕ) توانیویانـە لـە پـشتی ریـز و لـە رووی ریزەکەشەوە بەپێی حەزی خۆیان دەستبگرن، بەڵام (ژن و کـچ) هـەرگیز نـەیانتوانیوە لـە رووی ریزەکەوە بچنە ناو هەڵپەڕکێ، پێویستبووە لەسەریان لە پشتەوە بـچنە نـاو ریزەکـەوە، (پیـاو و کوڕ) لە قاوقیـل و قـیڕەو گـەرەلاوژێ کردنـدا ئـازادبوون، هەرچۆنێکیش لەشـی خۆیـان بادابێـت هیچ سەرئێشەیەکی بۆ دروستنەکردوون، بەڵام (ژن و کچ) زۆربەی کات بەشەرمەوە هەڵپـەڕیون و نـەیانتوانیوە ئازادانـە ئەندامـەکانی لەشـیان بجووڵێننـەوە، چـونکە ئـەو شـتانە لەسـەریان حسابکراوە و ترساون لەسەرنجڕاکێشان و لێپرسینەوەی خێزانیان، یان خزم و کەسوکاریان، یـان قسەوقسەلۆکی ناحەزان وتیروتوانجگرتن بۆ لەکەدارکردنی کەسێتیان.

ئەگەر روویدابێت (ژنێك)، یان (کچێك) لەکاتی هەڵپەڕکێدا سەربەستی خـۆی بەتـەواوی نوانــدبێت، ئــەوە بــووە بــە مایــەی گلــەیی و گازنــدەی خــەڵك لــە کەســوکاری و خۆشــی سەرزەنشتکراوە.

(ناوچەی هەورامان) هەروەك زۆربـەی ناوچـەکانی تـری کوردەواری، بایـەخێکی زۆریـان داوە بە هەڵپەڕکێ وەك بەشێکی زیندوو لە فۆلکلۆری خۆیان، تائێستاش لە زۆربـەی شـوێنەکانی (هەورامان)دا لەکاتی (سەیرانکردن، ژنهێنان، خەتەنەسووران، گـەلکاری و.... هتـد)، هەڵپـەڕکێ سازدەدکرێت و کۆڕی رەشبەڵەك گەرمدەکرێت، لە (هەورامان)دا چەند جۆرێك هەڵپـەڕکێ هـەن وەك: (چـەپی، سـێپێیی، فەتاحپاشـایی، گـێلاێ= گـەڕیان[*]) هـەروەها جۆرێـك (هەڵپـەڕکێی عیرفـانی) هەیـە کـە نایبەتـە بـە رێـورەسمی (جـەژنی پیرشـالیار)، ئـەم هەڵپەڕکێیـە سـرووتکی تێکەڵاوە لە (هەڵپەڕکێ و حـاڵ)، لـەم سـاڵانەی دواییـشدا بەتایبـەتی گەنجـەکان فێـری چـەندین هەڵپەڕکێی تر بوون، وەك: (مەریوانی، سەقزی، شێخانی... هتد).

زووتر هەڵپەڕکێ لەگەڵ گۆرانی، یان شمـشاڵ، یـان دەهـۆڵ و زوڕنـا بەڕێوەچـووە، زۆجـار یەکێك، یان زیاتر لە گۆرانیبێژە میللییەکان کۆڕی هەڵپەڕکێیان گەرمکردووە، بە ئاوازی شـیرین و زمـانی سـادە و شـیعری رەسـەن هەڵپـەڕکێکارەکانیان سەرمەسـتکردوون، شـیعرەکانیان زیـاتر

---

[*] (د. برهانەدیین وڵەدبەگی) زیکری ناو خانەقاکانیشی بە هەڵپەرکێی عاریفانە لەقەڵەمداوە، لەم رووەوە بڕوانە: (د. برهانەددین وڵەدبەگی) نکاهیٚ بە جاذبەهای اکو توریستی اورامان) لاپەڕە (37).

باسیان لە سروشتی ناوچەکە و پەیوەندی رۆحی نێوان نێرومێ و لایەنە خۆشەکانی ژیان کردووە، جاری واش هەبووە یەك گۆرانیبێژ بە بلیمەتی خۆی توانیویەتی کۆڕی هەڵپەڕکێ گەرمبکات و خۆشی و بەشارەت ببخشێتەوە.

هەروەها هەڵپەڕکی بە شمشاڵ سازدراوە، شمشاڵژەنی کارامە ئاوازەکانی هەڵپەڕکێی ژەندووە، جاری واش هەبووە گۆرانیبێژە مىللییەکان هاوکارییانکردووە و پێکەوە رێوڕەسمی هەڵپەڕکێکەیان بەرێوەبردووە، بە هەمانشێوە هەڵپەڕکێ بە زوڕناو دەهۆڵیش ساز دراوە، زوڕنا و دەهۆڵ زیاتر خەڵکەکەیان سەرمەستکردووە و هەڵپەڕکێکەیان گەرمتر کردووە، لەبەر ئەوە ئاوازەکانیان بەرزتر و سەنجڕاکێشترن.

سازدانی هەڵپەڕکێ رێوڕەسمی خۆی هەبووە، بۆ نموونە: زۆرجار بەرلەوەی هەڵپەڕکێ گەرمبکرێت چەند کەسێك لەشوێن خۆیانەوە کەوتوونەتە قونە قون و جوڵە و ووردەووردە دەستی یەکتریانگرتووە، ئینجا دەستیان بە هەڵپەڕکێ کردووە، پێشتر هەتاکو هەڵپەڕکێ گەرمبووبێ ئەوانەی دەستیانگرتووە بەنەرمی لەشوێنی خۆیاندا جوڵاونەتەوە و لەسەر هەندێك نەزم لە گۆرانی تایبەت کە بە زمانی خەڵکی ناوچەکە پیاندەوترێت گۆرانی گەڕیان هەڵپەڕیوون.

هەندێك جار کە کۆڕی زەماوزەند گەرمبووبێت ریزەکان بەسەرە هەڵپەڕیوون، هەر ریزێك هەتاکو سەرەیان هاتبێت گۆرانیبێژ، یان زوڕناو دەهۆل، یان شمشاڵژەن بگاتە لایان بە بەزمی (گێلاَی= گەڕیان) هەڵپەڕیون.

لە (هەورامان)دا لەوکاتانەی کە (رەشبەڵەك) سازدرابێت بۆ ئەوەی (کچان و ژنان) زۆر ماندوونەبن، زیاتر بە هەڵپەڕکێی (چەپی) هەڵپەڕیون، هەر لەبەر ئەوەشە بە (هەڵپەڕکێی چەپی) وتراوە (هەڵپەڕکێی ژنانە)، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ژنان هەر (بەچەپی) هەڵپەڕیبن، بەڵکو هەندێکجار (کچان و ژنانی گەنج) زیاتر حەزیانکردووە بە جۆرەکانی (سێپێیی فەتاحپاشایی) هەڵپەڕن.

هەڵپەڕکێ کە دەستپێکردووە (سەرچۆپیکێش) ئاراستەیکردووە و ریزەکەش لەگەڵیدا رۆیشتوون، پێویستبووە (سەرچۆپیکێش) چەن خەسڵەتێکی تێدابێت بەم شێوەیە:

1| لە هەڵپەڕکێدا وەستا و شارەزابووبێت.

2جلوبەرگی جوان و ڕێکوپێکی پۆشیبێت.

3 قەدوباڵای ڕێك وپێك و تاڕادەیەك سیمای جوانبووبێت.

4 دەستەسـرِی بەدەسـتەوە بووبێـت بـەپێی جـۆری هەڵپەڕکێکـە جوڵاندبێتییـەوە، بەبایەخترین جۆری دەستەسرِ لەهەوراماندا (دەستەسرِی ئاورێشم) بووە.

بەڵام ئێستا ئـەم مەرجانـە بایـەخیان پێنادرێت، چونکە هەڵپـەڕکیکاران ئێـستا نـاتوانن نەریتـەکانی هەڵپـەڕکێ بپـارێزن، لـە کۆنـدا خـەڵکانێك بـوون تەمـەنێکی زۆریـان گوزەرانـدوە و بەشـداری دەیـان شـایی و زەماوەنـدیان کـردووە، بـەڵام لـە هـەموو تەمەنیانـدا مـافی ئـەوەیان بەخۆیاننـەداوە ببنـە سەرچـۆپیکێش، بـەڵام ئێـستا بـەو شـێوەیە نییـە، زۆرکـەس ئـەو مافـە بەخۆیان دەدەن بەمەرجێك هەڵپەڕکێش نازانن، وەك خۆمان دەڵێین وا دەزانن هەڵپـەڕکێ هـەر گەڕەلاوژێیە، بێئاگان لەوەی کە هونەرێکی میللیە و ڕێورەسمی خۆی هەیە.

بێجگە سەرچۆپیکێش ئەو کەسانەی کەوتوونەتە ئـاخری ریـزی هەڵپـەرکێ پێیـانوتراوە (گاوان)، گاوان لە هەڵپەڕکێدا حسابی خۆی هەبووە لەبەر ئـەوە ئـەو شـوێنەی گرتـووە هـەتاکو ریزی هەڵپەڕکێکە تێکنەچێت، زۆرجاریش (گاوان) کەسی نزیکی خاوەن شایی وزەماوەنـد بـووە، جار جار هەندێك کەس بوون بە (گاوان) کە خەڵکێکی خۆنەویـست و لـەخۆبووردووبوون تـەنیا ئـەوە مەبەسـتیانبووە زەماوەنـد و شـاییەکە بـە ڕێکـوپێکی بـچێتبەرێوە، جـاری واش هـەبووە گاوانەکان ئەو کەسانە بوون کە باش هەڵپەڕکێیان نەزانیوە.

زۆرجـار خـەڵك نەچـوون لـەلای (گـاوان) و لـە کۆتـایی ریـزەوە دەسـتبگرن، بـەڵکو هەوڵیانداوە نزیك بە سەرچۆپیکێش، یان نـزیك بەسەرەتای ریزەکە هەڵپەڕن، ئەگەر وردە وردە خەڵکی تـر هاتبنـە نـاو ڕیـزی هەڵپەڕکێکـە، پێویـستبووە (گـاوان) بـە وریـایی کـۆنترۆڵی ریـزی هەڵپەڕکێکە بکات، چوونکە زۆرجار تەنها دەستبەردانی (گاوان) بۆ تێکچوونی ریزەکە بەسبووە.

هەڵپـەڕکێ لـە (هـەورامان)دا هۆکـارێکی ئاشـتەوایی و بنـەبڕکردنی هەنـدێك نـاکۆکی و کێشەی بچووك بووە، بۆ نموونە دوو خێزان، یـان دوو بنەماڵـە ئەگـەر کێـشەیەکیان هـەبووبێت، بەڵام بەرێکەوت دوو کەسـیان لـەریزی هەڵپەڕێکدا کەوتبنـە تەنیـشت یـەکتر، دەسـتی یـەکتریان گرتووە و هەر لەناو ریزەکەشدا یەکتریان ماچکردووە و ئاشبوونەتەوە.

خاڵێك هەیـە لـە هەڵپـەڕکێی (هـەورامان)دا بەتایبـەتی و هەڵپـەڕکێی کوردیـدا بەگـشتی زۆر سەرنجڕاکێشە، خاڵەکەش ئەوەیە ( ژن) یان (کچ) هـەرکیز بەدەسـتی مەبەسـت نەخراونەتـە

شـــوێن (گـــاوان)، ئەگـــەر ژنێكـــیش لەشـــوێنی گاوانـــدا دەســـتیگرتبێت بەشـــتێكی نـــەگونجاو لەقەڵەمدراوە.

لە هەڵپەڕكێی هەورامانـدا گیانێكی گەورەی پێشبڕكێ لە بـەینی ریزەكانـدا درووسـتبووە، هـەر ریزێـك سـەرەی هەڵپـەڕكێی هاتبێـت دەسـتیانداوەتە قاوقیـل و هەوڵیانـداوە باڵادەسـتی و زانـایی خۆیـان بـسەلمێنن، بەتایبـەت لـەكاتی رەشـبەڵەكدا، یـان ئەوكاتانـەی كـچ و ژن سـەیری هەڵپەڕكێكارانیان كردبێت، ئیتر هەر كوڕوكاڵ بوون هەوڵیانداوە بازاڕی خۆیـان گەرمبكـەن، نـاز و لەنجەی كیژانیش لەولاوە زیاتر كۆڕی خۆشی و سەرمەستی گەرمكردووە.




# 0

# ساباتی شیعری هەورامی و شاعیرە دیارەكانی هەورامان

بۆ ئەوەی بچینە ناوەرۆكی ئەم باسەوە، باشتر وایە ئاوڕێك لە پێناسەی شیعر لای ژمارەیەك لە (بیریاران، شاعیران، فەیلەسووفان، رەخنەگران) بدەینە و لە پیناسەكەی (ئیفلاتوون)ەوە دەستپێبكەین، هەڵوێستی ناوبراو دەرهەق بەشیعرلەسەر بناغەی (تیوری ئایدیا= نظریة المثل) دامەزراوە، لەسەر رۆشنایی ئەم تیورەش سێ جیهان بۆ زانیاری ئادەمیزاد بەم شێوەیە دیاریكراون:

1 جیهانی ئایدیا: بارەگای نموونەی بەرزی راستی هەمووشتەكانە.

2 جیهانی هەستپێكراو: شانۆی هەموو شتێكی ماددیە و ئادەمیزاد بەیەكێك، یان زیاتر لە پێنج هەستەكەی هەستیپێدەكات و لێیتێدەگات.

3 جیهانی سێبەر: ئەم جیهانە هونەرمەندەكان و هەستیارەكان بەهۆی هونەرە جوانەكانیانەوە دروستیدەكەن.

لەبەر تیشكی ئەم سێ جیهانە (ئیفلاتوون) پێناسەی شیعری بەم شێوەیە كردووە:

(شیعر) بریتییە لە لاسایكردنەوەی شتەكانی جیهانی هەستپێكراو، هەستیار لە هۆنینەوەیدا تەنها لاسایی ئەو شتانە دەكاتەوە[1].

---

[1] (د. كامیل حەسەن عەزیز البصیر) رەخنەسازی، مێژوو و پەیڕەویكردن، چاپخانەی كۆڕی زانیاری عێراق، 1983 بەغداد.

(ئەرســـتۆ)ش لەپێناســـەی شـــیعردا بەڕواڵـــەت شـــوێنپێی (ئیفلاتـــوون)ی مامۆســـتای هەڵگرتووە و لە كتێبی (بیوتیكا= هونەری شیعر)دا وتوویەتی:

شـیعر لاسـایكردنەوەی سروشـتە، لێـرەدا پێویـستە بڵـێین كـە كتێبـی (بیوتیكـا) لـە رەخنەسازی جیهانیـدا ڕۆڵێكـی گرنگـی گێـڕاوە و ئەوروپییـەكان لەسـەدەی یـانزەمی زایینییـەوە لـەرێی كورتكردنەوەكـەی فەیلەسـووفی عـەرەبی (ابـن الرشـد)ەوەئـەم كتێبـەیان ناسـیوە، (پرۆفیـسۆر هـەرمن) كتێبـی (بیوتیكـا)ی وەرگێڕاوەتـە سـەر زمـانی ئەڵـەمانی، هـەروەها سـاڵی 1498ز لە (شاری ڤینیـسیا) بـەزمانی لاتینـی لەلایـەن (جۆرجیـو بـلا)وە بڵاوكراوەتـەوە، سـاڵی (1508ز)ش بەیارمەتی (جیۆڤانی سكاریس) بەزمانی یۆنانی لەچاپدراوە[سملجلخ].

لە قورئانی پیرۆزدا ناوی شیعر و شاعیران هاتووە، لەسـەر ڕۆشـنایی سـوورەتی (الـشعراء) شاعیرەكان كراون بە دوو دەستەوە وەك دەفەرمێت:

(والشعراء یتبعهم الغاوون الم تر انهم فی كل واد یهیمون، وانهم یقولون مـالا یفعلـون، الا الذین امنوا وعملوا الصالحات وذكروا الله كثیرا وانتصروا من بعدما ظلموا وسـیعلم الـذین ظلمـوا ای منقلب ینقلبون)[شملجلخ].

ژمارەیەك لە زانایـان و رەخنگرانـی دنیـای ئیـسلام دەربـارەی شـیعر و شـاعیران كتێبیـان نووسیوە، لەوانە:

كوڕی سەلامی ئەلجەمحی كتێبێكی نووسیوە بە ناوی (طبقات الشعراء).

كوڕی قوتەیبەی ئەلدینەوەری[لمحلجلخ] كتێبێكی نووسیوە بە ناوی (الشعر والشعراء).

---

[سملجلخ] (هۆراس) فن الشعر وەرگێڕانی لویس عوض چاپی دووەم قاهیرە.

لێرەدا دەڵێن (هۆراسی فەیلەسووف) شاگردی (ئەرستۆ) بووە، دیارە كتێبە بەناوبانگەكەی ئەرستۆ (بیوتیكا) هەمان ناوی (فن الشعر)ی هەیە و پێدەچێت (هۆراس) لە خۆشەویستی مامۆستاكەیدا ئەم ناوەی لە كتێبەكەی خۆی نابێت. (ئەیوب)

[شملجلخ] بڕوانە قورئانی پیرۆز – سوورەتی الشعراء ئایەتی 22.

[لمحلجلخ] (كوڕی قوتەیبەی ئەلدینەوەری)، ناوی عەبدوڵا كوڕی موسلمی دینـەوەری سـاڵی (213ك=828 ز) بە پێـی هەندێك سەرچاوە لە (بەغداد) و بە پێی هەندێك سەرچاوەی تر لە (كووفە) لە دایكبووە، هـەر لـە منداڵییـەوە خراوەتـە بەر خوێندن، لە (دینەوەر، بەغداد، كووفە و بەسرا) خوێنوویەتی، یەكێكبووە لە زانا هەرە پایە بەرزەكانی سـەردەمی خـۆی و لـە دەریـای زانـست و ئەدەبـدا مەلـەوانێكی كـەمهاوتابووە، لەبـەر ئـەوەی كـورد بـووە و زۆر جـار بـە كـوردی





قدامه کوڕی جەعفەر کتێبێکی نووسیوە بە ناوی (نقد الشعر)[لمجلحلخ].

لەم بوارەدا (قدامە کوڕی جەعفەر) کە یەکێکبووە لە بیریاران و رەخنـەگرانی ناسـراوی عەرەب لەسەردەمی خۆیدا و سـاڵی (337 ك= 948 ز) کۆچی دوایـی کـردووە، لـە کتێبەکەیـدا بەم شێوەی خوارەوە پێناسەی شیعری کردووە:

شیعر قسەکردنێکی کێش و سەرواداره و مانایەك دەبەخشێت.

(رامبۆ)ش کە هەر لەساڵی (1837ز) بەمەبەستی داهێنان و چەسپاندنی ڕێبازێکی نـوێ لەشـیعردا، دەسـتیداوەتە بلاّوکردنـەوەی بۆچـوونەکانی، وتوویـوتی: جیهـانی شـیعر جیهـانێکی نوێیە، هیچ پەیوەندییەکی بەجیهانی بینراو و بیستراوەوە نییە، هەر لەدرێژەی دەربڕینەکەیـدا هاتووە: هەرچەندە بوون و واقیـع سەرچـاوەن بـۆ هەسـتیار، بـەلاّم هەسـتیار لەسـەری پێویـستە شتێك لەو سەرچاوەیە هەڵبژێرێت کەسی تر هەڵینەبژاردبێت.

(عەلائوددینی سەجادی) نووسیویەتی: (بەڵی هۆنـراو دەزگایەکـە بـۆ ئـەوەی پیـاو مانـای لەخەیاڵێکی ناسك پێبداتەوەو سۆزی خوێنەر وەکو کارەبا راکێشێ)، هۆنـراوەش چـەند جۆرێکـە، لای فەڕەنسییەکان سێ جۆرن بـەم ناوانـە: (هـۆنراوەی شـەڕ و شـۆڕ= ملحمـە، شـیعری گـۆرانی= غنـــائی، شـــیعری لاســـایکردنەوە= تمثیلـــی)[لجلحلخ] و هـــەر جۆرێکیـــان چـــەند لـــق و پۆپێکیـــان لێدەبێتەوە.

---

قسەیکردووە، ناحەزانی وتوویانە کەسێکی زەندیقە و بڕوای بە (ئاوێستا) هەیـە، لـە ماوەی ژیانیـدا چـەند کتێبێکـی داناون و ناودارەکانیان ئەمانەن:

1 المعانی لە دوانزە بەرگدایە 2 التقضیة لە دوو بەرگدایە.

3 عیون الاخبار لە دە بەرگدایە 4 الشعر والشعراء لە دووبەرگدایە

5 مشکل القرآن شیکردنەوە و راڤەکردنی قورئانی پیرۆزە

6 تآویل مختلف الحدیث 7 المعارف 8 ادب الکاتب 9 عیون الاخبار 10 غریب الحدیث

هەروەها چەند کتێبێکی تریش، ساڵی (271 ك=884 ز) لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە.

بڕوانـە کتێبـی (گەنجینـەی فەرهـەنگ و زانـست) لاپـەڕە (276-279) نووسـینی (محەممـەد سـاڵح ئیـبراهیم محەممەدی)، چاپخانەی (مهارت-تهران).

[لمجلحلخ] (د.کامل حسن عزیز البصیر) رەخنەسازی-مێژوو و پەیڕەویکردن لاپەڕەکانی (44-49) چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق 1983ز بەغداد.

[لجلحلخ] (عەلائوددینی سەجادی) مێژووی ئەدەبی کوردی چاپی دووەم لاپەڕە (155).

پاش ئەم چەند دێڕەی سەرەوە دەچینە سەر ئەوەی بزانین مێژووی کۆنترین تێکستی شیعری کوردی بۆ چ سەردەمێك دەگەڕێتەوە، لەم بوارەدا (د.صدیقی بۆرەکەیی) نووسیویەتی:

ئەوەی روون و ئاشکرایە پێش سەرهەڵدانی ئیسلام هۆنراوە بەزمانی کوردی هۆنراوەتەوە و هۆنراوەی کوردیش سەری بە گەلێك دەرگادا کردووە، کتێبی (گاتاکان) کە بەشێکە لە کتێبی (ئاوێستا) هەمووی هۆنراوەیە، لە درێژەی ئەم نووسینەدا هاتووە شیعری کوردی دەکرێن بەچوار بەشەوە بەم شێوەیە:

1- شیعری دڵداری و گۆرانی 2= شیعری خوداناسی 3- شیعری لاسایکردنەوە 4- شیعری نەبەردی و پاڵەوانی[1].

(ئەنوەر مایی) نووسیویەتی: (د. بلەج شێرکۆ) لە یاداشتەکانیدا باسی ئەوەی کردووە، یەکێك لە خۆرهەڵاتناسان بە ناوی (فلیامینۆف) لە باکووری ئێراندا بەردێکی دەستکەوتووە دوو دێڕ شیعری لەسەر بووە و مێژووی نووسینیان بۆ ساڵی (330پ.ز) گەڕاوەتەوە[2].

بە پێی نووسینی (د.سەعید خانی کوردستانی)یش پارچە چەرمێك لە (ئەشکەوتی جێشانە)ی نزیك شاری سلێمانی دۆزراوەتەوە، چەند دێڕە شیعرێکی بەدیالێکتی هەورامی لەسەر نووسراوە، مێژووی شیعرەکان بۆ نزیکەی (1400) ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە.

ئەو شیعرانە کە لەو ئەشکەوتەدا دۆزراونەتەوە ئەم چەند دێڕەن:

**هورمزگان رمان ئاتران کژان — وێشان شاردەوە گۆرە گۆرەکان**

**زۆرکاری ئارەب کردنە خاپوور — گناو پاڵەیی هەتا شارەزوور**

**شەن و کەنیکا وەدیل بشینا — مەرد ئازا تلی وەرووی هونینا**

**رەوشت زەردەشت مانۆوە بێکەس — بەزیکا نیکا هورمزد وەهیچ کەس[3].**

هەندێك سەرچاوە باس لەوەدەکەن، ئەو بەڵگانەی کەوتوونەتە بەردەست دڵنیایدەدەن کە شاعیرانی کورد، هەر لەسەدەی دووەمی کۆچییەوە هەتا سەدەی پێنجەمی کۆچی بەملاوە،

---

[1] (د. صدیقی بۆرەکەیی)- مێژووی وێژەی کوردی- بەرگی یەکەم- لاپەرە (38، 39).

[2] (ئەنوەر مایی)- الاکراد فی بهدینان- لاپەرە (196).

[3] بۆ زیاتر ئاشنا بوون بەمانای ئەم شیعرە و ئەو رووداوانەی کە بەشێوەیەکی ریالیستانە وێنایکردوون، لەم کتێبەدا باسوخواسی تایبەت هەیە. (ئەیوب)





زۆربەیان لەسەر (ڕێوڕەچەی یارسان= کاکەیی) بوون، بەشێوەیەکی سەرەکیش بەدوو دەستەوە بەم شێوەیە دابەشبوون:

دەستەی یەکەم: رابەران و پیرانی یارسان

دەستەی دووەم : شوێنکەوتووانی رابەران و پیرانی یارسان

هەر لەم بوارەدا باسی ئەوەیان کردووە شاعیرەکانی سەدەی دووەمی کۆچی، هەتاکو سەدەی پێنجەمی کۆچی زۆربەیان لە رابەران و پەیڕەوکارانی یارسان بوون، بەڵام لەسەدەی هەشتەمی کۆچی بەدواوە هەتاکو سەدەی یانزەمی کۆچی زۆربەی شاعیرانی کورد لەشیعرەکانیاندا بەدەوروخولی ئەم بابەتانەدا سووڕاونەتەوە:

1ـ دیمەنی سروشتی 2ـ دڵداری 3ـ خوداناسی 4ـ چیرۆکی و ئەفسانەیی[ترلحلخ].

هەر لەبواری دەستنیشانکردنی بابەتەکانی هۆنراوەی کوردیدا، (د. کامل ئەلبەصیر) نووسیویەتی: بنەڕەتەکانی هۆنراوە چوارن:

1ـ ویستەمەنی کە بەرهەمەکەی ستایش و سوپاسکردنە.

2ـ ترس کە ئاکامەکەی سکاڵا و داوای لێبوردنە.

3ـ خۆشی و ناخۆشی کە سەرئەنجامەکەی دڵداری و حەزلێکردن و باسی ئافرەتە.

4ـ تووڕەبوون کە زمانلێدان و گلەیی و سەرزەنشتکردن دەهێننە بەرهەم.

هەروەها باسی ئەوەشی کردووە کە ئەم دابەشکردنە لە رووی ژمارە و دەستنیشانکردنی مەبەست و بابەتەکانی هۆنراوەوە، ورد و فراوان نییە و ناتوانێت هەموو لایەنەکانی هۆنراوەی کوردی بگرێتە خۆی[يرلحلخ].

پاش ئەم پێشەکییە کورتە کە بە پێویستمانزانی، دێینە سەر ئەوەی چەردەیەك لە ژیان و بەرهەمی شیعری ژمارەیەك لە شاعیرە گەورە و ناسراوەکانی هەورامان بخەینەڕوو، هاوکات پێویستە باسی ئەوە بکەین، ئەو شاعیرانەمان کە هەڵگری (ڕێو ڕەچەی یارسان= کاکەیی) بوون ژمارەیان تەواو زۆرن، بەرهەمە شیعریەکانیان لە کتێبی پیرۆزی (سەرەنجام) و لە کتێبە دینییەکانی تری هەڵگرانی ریوڕەچەی یارساندا بڵاوکراونەتەوە، ئێمە لێرەدا تەنها

---

[ترلحلخ]ـ(د. صدیقی بۆرەکەیی)ـ مێژووی ویژەی کوردیـ بەرگی یەکەمـ لاپەڕە (44).

[يرلحلخ] ـ(د. کامیل حەسەن عەزیز البصیر)ـ رەخنەسازیـ مێژوو و پەیڕەویکردنـچاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراقـ 1983 بەغداد.

**ناویانــدەهێنین، مەســەلەی باســکردن لــە مێــژووی ژیــان و بەرهــەمی شــیبعریان بــۆ رۆژگــار بەجێــدەهێڵین، ئەگــەر تەمــەن و تەندرووســتی بواریانــداین دەیانخەینــە دووتــوێی کتێبێکــی تایبەتەوە.**

**ئەمەش ناوی ژمارەیەك لە عاریف و شاعیرەکانی هەڵگرانی رێوڕەچەی یارسان)ە:**

**بـالوولی مـاهی، بـاوا لـوڕەی لوڕسـتانی، بـاوا رەجـەبی لوڕسـتانی، بـاوا حاتـەمی لوڕستانی، باوانجوومی لوڕستانی، باوا سەرهەنگی دەودانی، باوا قەیسەری هەورامی، بـاوا سـرنجی کـەلاتی، باواگەرچـکی هـەورامی، دایـە تـەورێزی هـەورامی، موبـارەك شـا= شاخۆشێنی لوڕستانی، جەلالـە خـانمی لوڕستانی، بابا تایـەری هەمـەدانی، فاتمـە لـوڕەی گـۆڕان[سملخ]، لـزا خـانمی جـاف، کاکـە رەدائـی لوڕسـتانی، سـوڵتان چـەلەبی، بـاوا بـوزورگی لوڕستانی، باوا هندۆی هەورامی، باوا ناوسی جاف، دایە خـەزانی سـەرگەتی، قازی نـەبی سـەرگەتی، سـان سـەهاکی بـەرزنجی، خـاتوودایراکی رەزبـار، شـائیبراهیمی ئێـوەت، بـاوا یادگـار، عابـدینی جـاف، نـەرگز خـانمی شـارەزووری. شاوەیسقولی، خـاتوون رەزبـانووی دەرزیانی، کاکە عەرەبی هەورامی، کاکە رەحمانی دەرزیـانی، کاکـە پـیرەی دەرزیـانی، عـالی قەلەندەر، هەروەها (72) پیرە و خەلیفەکانی (یارسان) وەك: خەلیفە ئەمیر، خەلیفە جەبار، خەلیفە محەممەد، خەلیفە شەهابوددین، خەلیفە عەزیزی سلێمانی، خەلیفە باپیر، خەلیفە شاشا.**

**بێجگـە لەوانـەی ناومانهێنـان، ژمارەیـەکی زۆر لـە شـاعیرەکانی یارسـان لـە تێکستەکاندا تــەنها نازناویانهــاتووە و پێدەچــێت لــەو رۆژانــەدا لەبــەر بــارودۆخی ناوچــەکانیان و فــشاری دەسەڵاتداران لەسەریان نەیانوێرابێت شیعرەکانیان بـە نـاوی تـەواوی خۆیانـەوە بنووسـن، وەك ئەمانەی خوارەوە:**

**دەمام، شەمام، ئەژدەر، ئەنوەر، قامووس، گەوهەر، نگین، مـسکین، مـۆمن، سـەفیر، کـەبیر، ناری، سەیاد، قانوون، لامی، پێشەنگ، ئـەوڕەنگ، خـەزاوی، خوونـچی، عـەزازیل، ئیـدراك، وردی،**

---

[سملخ] (سیسل جۆن ئێدمۆندز) پێیوایە ئەم خانمە هەمان (بیبی فاتمە)یە کە دایکی بابا تایەری هەمەدانی بووە. بڕوانـە کتێبـی (کـورد، تـورك، عـەرەب) لاپـەڕە (170) نوسـینی (سیـسل جـۆن ئێدمۆنـدز) وەرگێڕانـی بـۆ زمـانی عەرەبی (جرجیس فەتحولاّ).





(نۆدشــە) پێــشینەیەکی مێــژوویی دێرینــی هەیــە و یەکێکــە لــەو شــوێنانەی ســکەی ئەشکانییەکانیان تێدا دۆزراوەتـەوە، هـەروەك زۆربـەی دیهاتـەکانی تـری کوردسـتان لەشـوێنێکی شاخاویدا دروستکراوە، ئەوەش یاریـدەرێکی باشـبووە بـۆ نۆدشییەکان بـۆ ئـەوەی لەسـەردەمە جیاجیاکانـدا باشـتر بتـوانن بەرامبـەر هـەر دەسـتدرێژیەك کەکرابێتـە سـەریان بەرگریبکـەن و هەمیشە بەسەربەرزی ماونەتەوە، زۆربەی خانووەکانی دوونهۆم و سێ نهۆمن و پاڵیانـداوە بـە یـەکترەوە، بەشـێوەیەکی زۆر رێکوپێـك لەلایـەن وەسـتا کارامـە و سـەلیقەدارەکانی هەورامانـەوە دروستکراون.

خـەڵکی نۆدشـە بەشـێوەیەکی گشتگیر لەچـەند تیرەیـەك پێکـدێن بـەم ناوانـە: (تـیرەی مـەلاکان، تـیرەی بەگـەکان، تـیرەی سـیانزە، تـیرەی شـوانە، تـیرەی مـورادی، تـیرەی حەمـەڕەش)، ژمارەیـەکی زۆریـشیان (سـوورو سـپی و چاوشـین)ن، هەمووشـیان پـاکو تـەمیز و تەڕپۆشـن، زۆر خزمەتی خۆیان و منداڵەکانیان دەکەن و ناوماڵەکانیشیان هەمیشە پاك و رێکوپێکن.

ئـەم دێیـە بەمـەلای زانـاو بـەناوبانگ ناویـدەرکردووە، ئـەو زاتانـە لەسـەردەمی ژیـانی خۆیاندا رۆڵێکی دیاریانبووە وخاوەنی پایەی دینی و کۆمەڵایەتی بەرز بوون، لەوانە:

1 مەلا عەبدولڕەحمانی نۆدشی: زیاتر لە بیست پشتی ئـەم زاتـە مـەلای گـەورە بـوون و هەموویان لـە (نۆدشـە)دا ژیـاون، مـەلا عەبـدولڕەحمان ماوەیـەك چـۆتە (سـنە) و لای میرەکـانی ئەردەڵان بووە بە مودەڕیس، پاشان هـاتووە بـۆ سـلێمانی و لـە (مزگـەوتی مەڵکەنـدی) بـووە بـە ماموۆستا و پێشنوێژ، لەبەر پایەی زانستی و ئایینـاسی لەلایەن حوکمڕانی بابانـەوە بـە (مـوفتی سلێمانی) دانـراوە[1].

2 حاجی مـەلا ئەحمـەدی نۆدشـی: نـاوی ئەحمـەد کـوڕی مـەلا عەبدولڕەحمانـە و سـاڵی (1228ك= 1813ز) لــە نۆدشــە لــەدایکبووە، لــەدەریای زانــستدا مەلــەوانێکی بێهاوتــابووە، چەندین کتێبی داناوە یەکێك لەوانە بەناوی (ظرفی حـاجی مامۆسـتا)وەیـە کـە تـا ئێـستاش لـە خوێندنگە دینییەکاندا دەخوێنرێـت[2]، هـەر لەبـەر پایـەی زانستیـشی بـووە کـە پـاش کۆچـی دوایی باوکی، لەجێی ئەو بە (موفتی سـلێمانی) دانـراوە، ئەوینـدارێکی تـواوەی نـاو رێوڕەچـەی نەقشبەندی بووە و یەکێکبووە لە خەلیفەکانی (شێخ عوسمـانی سـیراجوددین)، دەسـتێکی بـاڵای

---

[1] (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس)، یادی مەردان، بەرگی دووەم، لاپەڕە (352).

[2] (محەممەد بەهائوددین مەلا صاحب)، پیرشالیاری زەڕدەشتی، لاپەڕە (45).

هەبووە لە شیعر هۆنینەوەدا و نازناوی شیعری (فانی)یە، ساڵی (1302ك=1884 ز) کۆچی دواییکردووە.

بێجە لەم دوو زاتەی ناومانهێنان لە (نۆدشە)دا چەند کەسێکی تری شاعیر و رۆشنبیر هەڵکەوتوون لەوانە: (مەلا محەممەدی نۆدشی، عارفی نۆدشی، بەهائوددینی نۆدشی، مۆمنی شاعیری میللی...هتد[*]).

نۆدشە دێیەکی ئاوەدارە وچەندین کانیاوی سازگاری تێدایە وەك: (هانەکۆڵ، هانۆ بەرنۆی، هانۆ دەشتێ، هانۆ دەربەنی...هتد)، چەندین پارچە باخی رازاوەشی تێدایە کەتایبەتن بەبەرهەمهێنانی میوەی جۆرا و جۆر و یەکێکن لەسەرچاوەکانی داهات بۆ نۆدشییەکان، بێجگە لە باخداری (پیشەسازییە دەستیەکان، ئاژەڵداری، ئاڵوویردکردنی سەر سنوورەکان)یش سێ سەرچاوەی تری داهاتن بۆیان، سەبارەت بە پیشەسازییەدەستییەکانیش بایەخێکی ئێجگار زۆریان لەناویاندا هەیە ، نۆدشییەکان سەلیقەیەکی وردیان لە بەرهەمهێنانی کالاّ دەستییەکاندا هەیە، وەستاکانیان نەك هەر لە ناو نۆدشەدا کاریانکردووە لەبەرهێنانیاندا، بەڵکو زۆربەی کات بۆ هەندێك شوێنی دەرەوەی ناوچەکەی خۆیان رۆیشتوون و لەو شوێنانەدا ماوەیەکی زۆر ماونەتەوە، لەماوەی مانەوەیاندا خۆیان بە (جۆلاّیی، کلاّشکردن)ەوە خەریککردووە.

ژمارەیەك هونەرمەندی گۆرانیبێژ لە (نۆدشە)دا هەڵکەوتوون لەوانە: (مامۆ هەیەر، مامۆحەمەجافر، تۆفیق نۆدشی)، ئەم گۆرانیبێژانە خزمەتێکی زۆریان بە گۆرانی هەورامی کردووە و گۆڵزاری ئەم گۆرانییانەیان بەدەنگی بەسۆزیان رازاوەترکردووە.

دێی نۆدشە ئێستا زۆر گەورەیە و زیاتر لە (800) خانووی تێدا دروستکراوە، رێی ئۆتۆمبێلی هەیە و (کارەبا، بنکەی تەندرووستی، تەلەفۆن) و چەند قوتابخانە و خوێندنگەیەکیشی تێدان، خوێندکارەکانیان دەتوانن هەتاکو تەواوکردنی ئامادەیی لە دێکەی خۆیاندا بخوێنن.

---

[*] (هادی بەهمەنی) لە کتێبی پەیامی هەوراماندا نووسیویەتی (محەممەد صدیقی موفتی زادە) خەڵکی نۆدشەیە. بڕوانە: (هادی بەهمەنی) پەیامی هەورامان) لاپەڕە (232)
ئێمەش دەڵێین ئەمە راستنییە و ناوبراو خەڵکی گوندی (دشە)یە.





لە کۆتایی ئەم بابەتەدا دەڵێین: کۆنە قەلایەك لە نێوان هەردوو دێی (نۆدشـە و دشـە)دا هەیە بەناوی (قەلای پازگە) و شوێنەواری نیشتەجێبوونی دێـرینیش لـە دەورووبـەری قەڵاکـەدا هەیە، هەر ئەوەش وایکردووە هەندێك کەس بڵێن ئەم دوو دێیە لەبنەڕەتدا دەچنەوە سەریەك، لـەم بـوارەدا مامۆسـتا (محەممـەد ئـەمین هـەورامانی) دەڵێـت: لەوانەیـە خـەڵکی (نۆدشـە) لـە بنەڕەتدا (دشەیی) بن، ئەگەرچی لەزۆر رووەوە لەیەك ناچن، بەڵام ئێمە هیچ سەرچاوەیەکمان بەردەستنەکەوت ئەم بۆچوونە بسەلمێنێت و مامۆستای ناوبراویش بۆ ئـەم بۆچـوونەی ئامـاژەی بەهیچ سەرچاوەیەك نەکردووە.

## دزڵی پیشینەیەکی مێژوویی دێرینی هەیە

دزڵی یەکێکە لە دیهاتە کۆنەکانی هەورامان و جارجـاریش بـە (شـهردزدان= شـاری دزان) ناوبـراوە، لەم بوارەدا (یاقووتی حەمەوی) لە زمانی (میسعەر کوڕی هوهەلهەلەوە) نووسـیویەتی: ( نیم از رای[سمبرتر]) لـە نزیکـی (دزدان)دایـە، لـە هەنـدێك شوێنیـشدا بـە (دژڵـە= قـەڵای بـچکۆلە) نـاوبراوە، ئـەم دێیـە چـەندجارێك رووبـەرووی سـووتاندن و وێرانکـاری بۆتـەوە و شـوێنەکەی گوێزراوەتـەوە، دواجـاریش لـە رووبەرووبوونـەوەی لەشـکری ئیـسلامدا سـووتێنراوە و بـۆ ئـەو شوێنەی ئێستای گوێزراوەتەوە.

دزڵــی دێیــەکی خنجیلانەیــە و کەشــوهەوایەکی کوێــستانی هەیــە، روویکردۆتــە کێوەبەرزەکانی (داڵانی، زەڕەوە، مڵەوەرد= مڵەخورد، قـەڵا برووسـکە)، لەچـاو شـوێنەکانی تـری هەورامانــدا زەوی و زاریــان زۆرتــرە، سەرچــاوەی بــژێویان بەشــێوەیەکی ســەرەکی بــریتین لــە (کـشتوکاڵ، ئاژەڵـداری، باخـداری)، باخەکانیـشیان زیـاتر تایبـەتن بـە بەرهـەمهێنانی (گـوێز، هەرمێ) و هەندێك میوەی تر، ژمارەیەکیشیان سەرقاڵی (کاسبیکردن و دوکانداری)ن[شمبرتر].

خــەڵکی ئــەم دێیــە هەمیــشە قارەمــانبوون و رووبــەرووی داگیرکــاران وەســتاونەتەوە، (ئەسکەندەری مەکدۆنی) لەلەشکر کێشییەکەیدا بۆ سەر ناوچەکە بەو هەموو هێزوو توانایـەوە کە هەیبووە، زیاتر لە (15) رۆژ هەوڵیداوە ئینجا نـەیتوانیوە لـە (دەربەنـد دزڵـی و دەربەنـدی

---

[سمبرتر] (نیم از رای) مەبەست لـە مەڵبەنـدی کۆنـە شـتاری شارەزوورە کـە لەسـەر دەستنمیـشانکردنی شـوێنەکەی جیاوازی لە نێوان مێژوونووسەکاندا هەیە.

[شمبرتر] بڕوانـە کتێبـی (دیـوانی مـەلا حەسـەنی دزڵـی) لاپـەڕە (14) کۆکردنـەوە و لێکۆڵینـەوە و لێکدانـەوەی (ئەحمەدی نەزیری).

کەڵەم) تێپەڕێت و ناچار ڕێگەی سووڕێنی گرتۆتەبەر[*]، قارەمانی (هەسەن سان) و کوڕەکانی و براکانی دژی دەسەلأتدارانی قاجاری هەمیشە مایەی سەربەرزی هەورامییەکانە، شۆڕشگێڕی (مەحموود خانی دزڵێ) و جەنگاوەرە هەورامییەکانیش لە ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ئینگلیز و هاوکاریکردنی شۆڕشەکانی (شێخ مەحموودی نەمر)دا هەمیشە میدالیای شەرەفە بەسنگی خەڵکی ناوچەکەوە.

دزڵی چەندین زانای دیار و کەسێتی بەناوبانگی تێدا هەڵکەوتووە، لەناویاندا (مەلا حەسەنی دزڵی) کە زانایەکی ئایینی پایە بەرز و شاعیرێکی کەمهاوتابووە.

### دەگاشێخان نەوەك دەرگاشێخان

یەکێکە لەگوندە رازاوەکانی هەورمانی لهۆن و دەکەوێتە سەر رێگەی ئۆتۆمبێلی نێوان (تەوێڵە و بیارە)، لە رووی ئیدارییەوە سەر بە ناحیەی (بیارە)یە، لە دامێنی چیاسەرکەشەکەی (هەوارەبەرزە)دا درووستکراوە و لە خۆرهەلأتیەوە لووتکەی (چنارە) و لە خۆرئاوایشیەوە هەردوو لووتکەی (ملەخانەگای سەروو) و (ملەخانەگای خواروو) دەوریدەدەن، کەشوهەوای ئەم گوندە لە وەرزی (زستان)دا سارده و بەفر و بارانی زۆری لێدەبارێت، بەلأم لەوەرزی هاویندا بەهەشتێکە بۆخۆی ساباتی فێنکی باخەکان و ئاوی ساردی کانیاوەکان کەشوهەواکەیان تەواو خۆشکردووە.

(دەگا شێخان)پێشینەیەکی مێژوویی دێرینی هەیە، شوێنێك کە پێیدەوترێت (کەلارۆ گاورا= کەلاوەی گاوران) و لە نزیك چایخانەکەی ئێستای گوندەکەدایە، تا ئێستاش شوێنەواری نیشتەجێبوونی تێدا دیارە، دیارە کە دەوترێت (کەلارۆگاورا= کەلاوەی گاوران) ئەوە ناگەیەنێت خەڵکی ئەو شوێنە لە کۆندا لەسەر دینی (حەزرەتی مەسیح) بووبن، بەڵکو ئەوانیش هەر وەکو هەمووو خەڵکی ناوچەکە پێش سەرهەڵدانی دینی ئیسلام (زەردەشتی) بوون و بوونی (ئاتەشگە)ش لە بیارە کەتەنها (2)کم لە دەگاشێخانەوە دووره ئەم راستییەمان بۆ دەسەلمێنێت، لێرەدا پێویستە ئاماژەبکەین بەوە خەڵکی ناوچەکە پاش ئیسلامبوونیان بە هەموو نا موسڵمانێکیان وتووە (گاور)، هەر بۆیە ئەو شوێنەش بە (کەلاوەی گاوران) ناویدەرکردووە.

---

[*] بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (15).





نـــوێترین ئامـــاژە بـــۆ ئاوەدانکردنـــەوەی (دەگاشـــێخان) لەســـەردەمی ئیـــسلامدا، دەمانگەڕێنێتەوە بۆ زیاتر لە (850)ساڵ لەمەوبـە ر و کاتێـك لـە سـەردەمی ژیـانی (حـەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی)دا، دووبرا لە بنەماڵەی شێخەکانی (جـام و لەنگـەر) لـە ئێرانـەوە هاتوونەتە (هەورامانی ئەمـدیو)، لـە شـوێنێکدا کـە ئێستا پێیـدەوترێت (داشـارە) و کـەمێك لـە خوار کۆنەگوندی دەگاشێخانەوەیە، خانوویـان درووسـتکردووە، ئـەم دوو زاتـە دینـداری گـەورەی سەردەمی خۆیان و ئایینناسی کەمنموونەبوون، هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆر لـە هەورامییـەکان لـە دەوریان کۆبوونەتەوە و لە دەوروبەری خانووەکانی ئەواندا خانوویان درووستکردوون، ئـەوەش وایکردووە شوێنەکە ببێت بە ئاوەدانییـەکی گـەورە و بـە (دەگاشارە) واتـە دێیـەك کـە هێنـدەی شارێك گەورە بووە، ناویدەرکردووە، پاشان ناوەکە گۆڕانی هاتووە بەسەردا و بـووە بـە (داشـارە)، لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی پەتا کوشندەکانی سەردەمی کۆن وەك: (چاوەقووڵە= کۆلێرا، تـاعوون، ئاوڵە)، خەڵکی (داشارە) زۆربەی هەرە زۆریان مردوون، تەنها چـەند کەسـێکیان ماونەتـەوە ئـەو شـوێنەیان بەجێهێـشتووە و رۆیـشتوون لـە نزیـك سەرچـاوەی ئـاوی (دەگاشـێخان)ەوە خانوویـان کردووەتـــەوە، بەرەبـــەرە ژمـــارەی خانووەکانیـــان زیادیـــانکردوە و شـــوێنەکەیان نـــاونراوە (دەگاشێخان= دێی شێخان).

شایانی باسکردنە هەر لەکۆنەوە و ئێستاشی لەگەڵدا بێت، ناوی ئەم گوندە نەك هـەر لـە لایەن خەڵکانی دەرەوەی گوندەکە، بەڵکو لە لایەن ژمارەیـەکی زۆر لـە گوندنشینەکانیـشەوە، بـە هەڵە ناویدەهێنرێت و پێیدەڵێن (دەرگاشێخان)، بۆ راستتکردنەوەی ئەم هەڵەیە دەڵێن: خـەڵکی ئەم گوندە هـەر لەسـەرەتاوە هـەورامی بـوون، شـتێکی ئاشکراشـە لـە شـێوەزمانی هەوراميـدا بـە (دەرگـا) دەوترێـت (بـەرە)، کەواتـە ئەگـەر نـاوی گوندەکـە (دەرگاشـێخان) بوایـە دەبوایـە بـە هەورامی پێیبوتراوە (بەرۆ شێخا)، لێرەوە بۆمـان ئاشـکرادەبێت ناوەکـە (دەگاشـێخان)ە نـەوەك (دەرگاشێخان).

پاش راپەڕینە شکۆدارەکەی ئـازاری (1991ز) ژمارەیـەك لـە خێزانـە دەگاشـێخانەیەکان بۆ سەر ماوای خۆیان گەڕاونەتەوە، بەڵام نەچوونەتەوە شوێنی گوندە کۆنە سـووتماککراوەکەیان و لە شوێنێکدا کە بە تەنشت (کەلارۆگاورا= کـەلارەی گـاوران)ە وەیـەو پێیـدەوترێت (تفویـابنی= تووی یابن) خانوویان درووستکردووە.

کەواتــە ئــەوەی ئاشــکرابێت هــەر لــە کۆنــەوە تــا ئێــستا، ســێ قۆنــاغی جیــاواز لەئاوەدانکردنەوە و وێرانبوونی ئەم گوندە دیارن بەم شێوەیە:

**قۆناغی یەکەم: ئاوەدانکردنەوە و وێرانبوونی (کەلارۆ گاورا= کەلاوەی گاوران).**

**قۆناغی دووەم: ئاوەدانکردنەوە و وێرانبوونی (داشارە).**

**قۆناغی سێیەم:ئاوەدانکردنەوە و وێرانبوونی (کۆنە گوندی دەگاشێخان).**

**دیارە قۆناغی چوارەمیش بە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکە لە شوێنی ئێستایدا و پاش بەهاری (1991ز) دەستێپێکردووە.**

**خەڵکی (دەگاشێخان) بە شێوەیەکی گشتی بەسەر چەند بنەماڵەیەکدا دابەشبوون، بەم ناوانە:**

1- **بنەماڵەی وەستا مستەفا**
2- **بنەماڵەی کوێخا ئیبراهیم**
3- **بنەماڵەی فەقێ**
4- **بنەماڵەی شێخ سلێمان**
5- **بنەماڵەی ئەلأموراد**
6- **بنەماڵەی لالۆ تۆفیق**
7- **بنەماڵەی سەیدەکانی کەلجینی**

**هەموو بنەماڵەکانیش لە گوندەکەیاندا وەك یەك خیزان ژیاون و لە خۆشی و ناخۆشیدا هاوکاری یەکتریان کردووە، یادەوەری خەڵکەکە لێوان لێون لە نموونەی جوانی پێکەوەژیان و بەدەنگەوەهاتنی یەکتری، ژمارەیەك کەسێتی دیار و پیاوماقووڵ لەم گوندەدا هەڵکەوتوون کە رۆڵێکی دیاریان لە ژیانی کۆمەڵایەتی گوندنشینەکاندا گێڕاوە، لەوانە: (شێخ حەمەعارف و شێخ مستەفای کوڕی، کوێخا ئیبراهیم، خاڵۆ کەریم و خاڵۆ حەمەڕەزا، خاڵۆ ئەمین)، لێرەدا پێویستە بڵێین (خاڵۆ ئەمین) ئەو کەسە قارەمانە بووە (ساڵی 1963ز) لە نەبەردییەکەی (پردی زەڵم)دا لە گەڵ شەهید (حەمەگوڵپی) بە خەنجەر هەڵیانکوتاوەتە سەر دەبابەکانی (زەعیم صدیق) و لەو نەبەردییەدا شەهیدبوون.**

**سەرچاوەکانی بژێوی خەڵکی (دەگاشێخان) بە شێوەیەکی گشتگیر بریتین لە: (باخداری، کشتیاری، ئاژەڵداری) و ژمارەیەکیشیان بەکاسپیکردن و کاروباری دەوڵەتییەوە سەرقاڵن، بەرهەمی باخەکانیان بریتین لە: (گوێز، توو، هەنار، هەڵووژە، هەنجیر، سێو، قەیسی...هتد) و رووبەرێکی فراوان رەزەدێمیشیان هەیە زیاتر تایبەتن بە بەرهەمهێنانی (ترێی رەش)، لە**

زەوییە تەختاییەکانیشدا چەند بەروبوومێك بەرهەمدەهێنن وەك: (تووتن، تەماتە، بامێ، باینجان، کوولەکە) و تەڕەکاڵی تر.

ئەم گوندە هەر وەك زۆربەی هەرە زۆری گوندەکانی کوردستان بەسووتماککراوە، رۆژی (1 /10/ 1978ز) لە لایەن دەسەڵاتدارە شۆفێنیستەکانەوە وێرانکراوە و خەڵکەکەی بۆ کۆمەڵگەی زۆرەملێی (سیروان) راگوێزراون، ئەوەش وایکردووە هەتاکو راپەڕینە شکۆدارەکەی ئازاری (1991ز) لە زێد و ماوای خۆیان دابڕێن و زۆربەی باخەکانیان وشکبوون، بەلاّم هەر پاش راپەڕین چەند خێزانێکیان گەڕاونەتەوە بۆ گوندەکەیان و (خانوو، باخ)ەکانیان ئاوەدانکردوونەتەوە، تا رادەیەکیش لە پرۆژە خزمەتگوزارییەکان سوودمەندبوون بەوەی تا ئیستا (قوتابخانە، ئاو و ئاوەرۆ، باخچەی ساوایان)یان بۆ دروستکراون و مۆلیدەیەکی کارەبایشیان بۆ دانراوە.

### گوندی هاوار مەڵبەندی هانابۆبردنی یارسانەکان بووە

یەکێکە لە گوندەکانی هەڵگرانی رێوڕەچەی (یارسان= کاکەیی) لە هەورامانی لهۆندا، دەربارەی ناوەکەی دەوترێت: ئەم گوندە بۆ ماوەی زیاتر لە (800)ساڵ شوێنی داڵدەدانی کاکەییەکان بووە، بە واتا هەر کەسێکیان لە هەر شوێنێکی ترەوە زۆری بۆهاتبێت هانایهێناوە بۆ خەڵکی ئەم گوندە و ئەمانیش چوون بە هانایەوە، لێرەوە ئیتر گوندەکە ناوی (هاوار)ی لێنراوە.

هاوار کەشوهەوایەکی خۆشی هەیە، لە هەر چوار لاوە شاخی بەرز دەوریداوە وەك: (شنروێ، ئەشکەدۆڵ= ئەشکەهۆل، رووتاوا، مەکۆی ماغە)، رووبەرێکی زۆر باخی رازاوەی تێدایە کە مێوەی جۆراوجۆریان تێدا بەرهەمدەهێنرێت، وەك: (گوێز، هەنار، هەنجیر، ترێ....هتد)، ژمارەیەك (کانی و ئەستێڵ)یش لە ناو هاوار و دەوروبەریدا هەن لەوانە: (وێشەیی، کانی درێژ، کانی وەزگێڵ، کانی گۆیژەگەڵوەزان، کانی باخچەی جانێ)، ئاوی ئەم کانییانە بۆ خواردنەوەی مرۆڤ و ئاژەڵ و ئاودانی باخەکان سوودیان لێوەردەگیرێت.

چەند شوێنەوارێکی مێژوویش لەدەوروبەری گوندەکەدا هەن، (قەلاّی هاوار) یەکێکە لەو شوێنەوارانەی کە مێژوویەکی دێرینی هەیە، لەسەردەمی (بێگە بەگی ئەردەلانی)دا ئاوەدان و پۆشتەکراوەتەوە، چەند نشینگە و مەزارگەیەکی گەورەپیاوانی کاکەیی لە گوندی (هاوار) و دەوروبەریدان، لەوانە: (داودی رەهبەر، مەزاری میر ئەسکەندەر، کاکەی جاور).

خەڵکی هاوار بەشێوەیەکی گشتی بەسەر چەند بنەماڵەیەکدا دابشدەبن بەم ناوانە: (بنەماڵەی کوێخاکان، بنەماڵەی وسێن، بنەماڵەی ئەحمەد)، ئەم بنەماڵانەش هەر لە زووەوە پێکەوەدەژین و لە خۆشی و ناخۆشیدا هاوکاری یەکتری دەکەن، چەندین کەسێتی دیار و پیاوماقووڵی سەردەمی خۆیان لەم گوندەدا هەڵکەوتوون، لەوانە (خەلیفە رەشیدی هاواری[*]) کە پیاوێکی (دیندار، بەسەلیقە، خاوەن هەڵوێست) و خۆشەویستی خەڵك بووە،

[*] دەربارەی هەڵوێستی مەردانەی ناوبراو، خوالێخۆشبوو (کوێخا رۆستەم کەریم)ی باوکم دەیوت: ماوەیەك هەردوو حکومەتی پادشایی (ئێران و ئێراق) پێکەوە تەنگیان بە بەگزادە کوردپەروەرەکانی هەورامان هەڵچنیبو، دەسەڵاتدارانی هەردوولا بەدوایاندا دەگەڕان بۆ ئەوەی دەستگیریانبکەن و بیانخەنە زیندانە تاریکەکانیانەوە، خوالێخۆشبوو (هەسەن بەگی حەمەڕەزابەگ) یەکێکبوو لەو کەسانەی لەو بارودۆخەدا قاچاخبوون، رۆژێکی سەرەتای هاوین بوو، ناوبراو لە (وەزڵی)یەوە کە باخ و کانیاوێکی خۆشە، تارادەیەکی زۆریش دابڕاوە لە ئاوەدانییەوە و دەکەوێتە نێوان هەردوو گوندی (تەوێڵە و نەوسوود)، جوابی بۆ ناردم گوایا رانکو چۆغەیەك و بڕێك شەکر و چایی و جگەرەیان پێویستە، منیش ئەو شتانەم ئامادەکردوون، خێڵخەوتنانێك بردمن بۆیان، پاش ئەوەی شەو و رۆژێك لایان مامەوە، (هەسەن بەگ) کە حەوت تفەنگچیشی لەگەڵدابووە، پێیوتم: دوو سێ رۆژێك دەچین بۆ هاوار و حەزدەکەم هاوڕێیەتیمانبکەیت، سەر لەئێوارە هەموومان بەرە و گوندی (هاوار) کەوتینەڕێ، بۆ شەو گەیشتینە ئەوێ و یەکسەر چووین بۆ ماڵی (خەلیفەرەشید)، بۆ رۆژی دوایی کاتێك کە لەماڵی ناوبراودا میوانبووین و زۆربەی خەڵکی گوندەکە لیمانکۆبووبوونەوە، لە پشتی کانیەدرێژەوە دەنگی چەند تەقەیەك هاتن، ئێمەش کەوتینە خۆمان و دەستماندایە تفەنگ، لەپڕ گوندنشینێکی هاواری بەڕاکردن لێمان هاتە پێشەوە و وتی: زیاتر لە پەنجا پۆلیس بۆ ئێرە دێن، خەلیفە رەشیدیش بە هەسەن بەگی وت: ئەگەر دەتانەوێت تەقەبکەن ئەوە هەم ئێوە و هەم ئێمەش تووشی زەرە رو زیان دەبین و گوندەکەشمان دەسووتێت، پیاوی چاکبن وەرن بڕۆنە ئەم دیوەخانەوە و دڵنیابن کەس قسەیەکتان لەسەرناکات و سەلامەت دەبن، پاش کەمێك بیکردنەوە (هەسەن بەگ) بەناچاری قایلبوو، پۆلیسەکان هاتن و ئەفسەرێکی پۆلیس و چەند دەرەجەدارێکیان لەگەڵدابوون، ئەفسەرەکە وتی: (خەلیفەرەشید) زانیاریمان بۆ هاتووە (هەسەن بەگ) و چەتەکانی بەینا و بەین هاتوچۆی ئێرەدەکەن و ئێوەش هاوکارییاندەکەن، (خەلیفەرەشید)یش وتی: بەگم ئێمە کاکەیین و خەڵکێکی بێوەین، هیچ پیاوخراپێك ناتوانێت رووبکاتە (هاوار) و دڵنیابە ئێمە لەم شتانەی جەنابتان باسیدەکەن زۆردوورین، هەر لە درێژەی قسەکانیدا و بۆ ئەوەی ئەفسەرەکە هیچ گومانێك لەو هەموو خەڵکە نەکات لە ماڵەکەیدا کۆبوونەتەوە، وتی: بەگم وادەبینی هەموو خەڵکی ئەم دێیە لێرە کۆبوونەتەوە و ئەمڕۆ خەتەنەسوورانی منداڵەکانمان دەکەین، ئێوەش گەورەمانبکەن و نانێکمان لە گەڵ بخۆن، بەو شێوەیە ئەفسەرەکە لە لایەن خۆیەوە هیچ دوودڵیەکی لانەما بەوەی (هەسەن بەگ) لە هاواردا نییە، ئیتر ئەوان دانیشتن و ئەو خواردنەوی بۆ ئێمە ئامادەکرابوو خواردیان، پاشان لێیاندا و بە (شنروێ)دا بۆ (هەڵەبجە) گەڕانەوە، پاش نیو سەعاتێك لە گەڕانەوەیان (خەلیفەرەشید) دەرگای لێکردینەوە، (هەسەن بەگ)یش بەرامبەر هەڵوێستی مەردانەی خەلیفە و هاوارییەکانبە گەرمی سوپاسیکردن و ویستی ماڵئاواییان لێبکات، بەڵام (خەلیفەرەشید)

هەروەها (کوێخا تۆفیقی هاواری)  کە لای هاوارییەکان بە (مامۆتۆفیق) بەناوبانگبووە، ناوبراو پیاوێکی (ئازا، خاوەن هەڵوێست، ژیر و بەسەلیقە، پزیشکی میللی) بووە، بەدرێژایی تەمەنی سەرقاڵی خزمەتکردنی خەڵکی و چارەسەکردنی شکستەکانی لاشەیان بووە، چەندین کەسی لە کەمئەندامی و شکستی دەست و قاچیان رزگارکردووە.

هاوارییەکان شۆڕشگێر و قارەمانن، هاوکاری (شێخ رەشیدی عەبابەیلێ)یان کردووە لە بەرەنگاربوونەوەی  سوپای ئینگلیز و گەورەترین داستانی قارەمانانەیان لە (دەربەندی ئەشکەهۆڵ)دا تۆمارکردووە، لەئەنجامی ئەو هەڵوێستەیاندا (هاوار) سووتێنراوە، هاوکات ژمارەیەکی زۆری خەڵکەکەی دەستگیرکراون و خراونەتە زیندانی کەرکووکەوە، لێرەدا پێویستە باس لەوەبکەین لە داستانی (دەربەندی ئەشکەدۆڵ)دا چەند کەسێك رۆڵی قارەمانانەیان گێڕاوە، لەوانە: (کوێخا تۆفیقی هاواری، حەمەعەلی بەیجانی رێشاوی، حەمەسەعید زەردۆیی)، جەنگاوەرێکی هاواری بە ناوی (مارف ئەحمەد) کوژراوە و سوپای ئینگلیزیش (70) کوژراویان لەگۆڕەپانی جەنگەکەدا جێهێشتووە، یەکێکیان پلەی (کاپیتان) بووە.

لە شۆڕشی ئەیلوول و شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا (هاوار) بەردەوام جێژووانی پێشمەرگە بووە، لەگەڵ ئەوەدا خەڵکەکەی هاوڕاز و هاوکاری شۆڕشەکان بوون، ژمارەیەکیشیان کادر و پێشمەرگە بوون، چەندین شەهیدی قارەمانیشیان بە کاروانی سەرفرازی گەلەکەمان بەخشیوە لەوانە شەهیدان: (کەمال هاواری، سەیفەدین هاواری، سەریاس هاواری) و چەندانی تریش .

پاش ئەوەی رژێمی لە گۆڕنراو هاوارییەکانی گواستووەتەوە بۆ کۆمەڵگەی زۆرەملێی (عەنەب) و گوندەکەیان بووە بە ناوچەی قەدەغەکراو، چەند کەسێکیان بەردەوام بە نهێنی هاتووچۆی هاواریان کردوە و ئاوی باخەکانیان دێراوە، کاتێکیش کە بە ناوی قەرەبووکردنەوەی زەرەر و زیانەوە پارەیداوە بە خەڵکانی ناوچە راگێزراوەکان، ژمارەیەکیان بە هیچ شێوەیەك قایلنەبوون پارە وەربگرن، دیارە ئەوەش بەڵگەیەکی گەورەی نیشتمانپەروەرییانبووە.

سەرچاوەی بژێوی هاوارییەکان بە شێوەیەکی گشتی بریتین لە: (باخداری، بنێشتکردن، ئاڵوویردکردنی سەرسنوورە) و ژمارەیەکیشیان کارمەندی فەرمانگە دەوڵەتییەکانن، ئێستا

---

قایلنەبوو، وتی: (وە سلتانی ساق) هەتاکو ناننەخۆن لەم ماڵە دەرناچن، ئیمەشماینەوە هەتاکو نانمانخوارد و بەرە و (پەرونی) گەڕاینەوە.

زۆربەیان لە (کۆمەڵگەی عەنەب) نیشتەجێن و چەندین خێزانیشیان لە (هەڵەبجەی تازە، سلێمانی) و شوێنەکانی تردا دەژین، بەڵام هاوینان زۆربەیان بنەباخ دەبەنەوە باخەکانیان و لە ساباتییاندا دەحەوێنەوە.

هەر ئەوەوە ماوە بڵێین هاوارییەکان بە شێوەیەکی گشتی باوەڕی پتەویان بە ڕابەرەدینییەکانی خۆیان و ئەو کەسانەش هەیە کە خۆیان بۆ خزمەتی کاروباری دینی ڕێوڕەچەکەیان تەرخانکردووە، راز و بەسەرهاتەکانی ئەو کەسانە بە لایانەوە پیرۆزن و زۆربەیان بە (پەرجوو= موعجیزە) لە قەڵەمدەدەن، لەم بوارەدا باس لەوە دەکەن گوایا لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا یەکێك لە (سەرسپەردەگان)ی کاکەیی بە ناوی (دەروێش حەبیب) لە ناو کاکەیەکانی ئێرانەوە هاتووەتە (هاوار) و چەند ساڵێك لە ناویاندا ماوەتەوە، ناوبراو لەو ساڵانەدا هەم وەك کەسێکی دینی و هەم وەك پزیشکێکی میللی کاریکردووە، لە گژوگیای ناوچەکە دەرمانی جۆروجۆری دروستکردووە و چەندین نەخۆشی چارەسەرکردوون، هەروەها سەرپەرشتی دروستکردنی (جەمخانە)کەی هاواری کردووە و لە رووی مادیشەوە کۆمەکیکردووە، لە بواری پێشبینیکردندا چەند شتێکی سەیری لێوەدەگێڕنەوە، بۆ نموونە دەڵێن: جارێکیان بزنێکی کابرایەکی هاواری دزراوە و بۆ دۆزینەوەی پەنای بۆ (دەروێش حەبیب) بردووە، ئەویش ناوی دزەکەی بۆ ئاشکراکردووە و هاوکات ناردوویەتی بە دوایدا بۆ ئەوەی پێیبڵێت بزنەکە بداتەوە بە خاوەنەکەی، کاتێك بزن دز هاتووەڕوو سەرەتا نەچووەتە ژێرباری دزیەکەی، بەڵام کە زانیویەتی سوودی نیە، ناچار بڕیاریداوە بزنەکە بداتەوە بە خاوەنەکەی، بە (دەروێش حەبیب)یشی وتووە: ئەمە دواجارت بێت لە گەڵمدا ئەگینا شەوێك سەرتدەبڕم، دەروێش لە وەڵامدا پێیوتووە: بریا تۆ سەرتببڕیمایە، چونکە دواجار من هەر سەرمدەبڕن، ساڵی (1961ز) پێشبینییەکەی هاتووەتەدی و لە مەزاری (شائیبراهیمی ئێوەت) کە یەکێکبووە لە (حەوت تەنی جاویدان)ی سەردەمی ژیانی (سان سەهاکی بەرزنجی)، لە لایەن زیرگەوانی ئەو مەزارەوە سەربڕدراوە.

**دشە و رازەکانی مێژوو**

گونـدێکی دێرینـی (هـەورامانی لهۆن)ە و لـەرووی ئیدارییـەوە سـەر بـە ناوەنـدی قـەزای (پاوە)یە لەسـنووری پارێزگـای (کرماشـان[*])دا، دەربـارەی ناوەکـەی بۆچـوونێك هەیـە دەڵێـت: پـاش هێرشـەکەی ئەسـکەندەری مەکـدۆنی ناوچـەکە زیـاتر لـە (150)سـاڵ لـەژێر دەسـەڵاتی یۆنانییەکاندا بووە و پاش ئازادکرنی ئـەو یەهودییانـەی (بـەخت نەسـر) بـە دیلـی هێنـاونی بـۆ بابل، (42360) کەسیان لە گەڵ (7337) خزمەتکار و کارەکەریان و (200) گۆرانیبێژ کە لـە گـەڵیان بـوون بـۆ (ئۆرشـەلیم و یـەهودا) و شـارەکانی تـر گەڕاونەتـەوە، بـەڵام ژمارەیـەکیان نەگەڕاونەتــەوە و بــەولاتی ئێرانــدا بڵاوبوونەتــەوە و چــەند خێزانێکیــان لــە هەوامانــدا نیـشتەجێبوون، لـەوە ئـیتر چـەندین نـاو و دەسـتەواژەی یۆنـانی و عیـبری لـە نـاو شـێوەزمانی خەڵکی ناوچەکە جێگیربوون، یەکێك لەو ناوانە (تشی، تشەن)ە کە بە واتای (پەرستگە= شـوێنی پەرستنی خواوەندەکان) دێت.

---

[*] پارێزگای کرماشان یەکێکە لە پارێزگا گەورەکانی خۆرهەڵاتی کوردستان و رووبەرەکەی نزیکـەی (24434) کیلۆمـەتری دووجایـە، ژمـارەی دانیـشتوانی بـەپێی سـەرژمێری سـاڵی (1996ز) بریتیـە لـە (1778596) کـەس کـە بەسەر مەڵبەندی کرماشان و قەزاکانی: (پاوە، ئیسلام ئابادی خۆرئاوا، جوانڕۆ، سەرپێڵی زەهاو، سنگوڕ، صەحنە، قەسری شیرین، کەنگاوەر، گێلانی خۆرئاوا، هەرسین)دا دابەشبوون.

لەسـەر رۆشـنایی ژمارەیـەك لـە سەرچـاوە مێژوویـیـەکان (بـارامی یەکـەمی ساسـانی) لەسـەردەمی پادشـایەتی باوکیدا حوکمڕانی هەرێمی (کرمان) بووە و پێیانوتووە (کرمان شا) واتا شـای کرمـان، پاش مردنـی بـاوکی چووەتە سەرتەختی پادشایەتی و فەرمانی دروستکردنی ئەم شارەی داوە و ناویناوە (کرمانشا).

پــاش شکــستهێنانی ساســانییەکان لــە جــەنگی نەهاوەنـد (کرماشــان) کەوتووەتــە ژێردەســەڵاتی عەرەبــە موسڵمانەکانەوە، لەسەدەی دەیەمی زاینیدا کوردەکانی (حەسنەویە) توانیویانە میرایەتییەکی سـەربەخۆ پێکـەوەبنێن و (کرماشــان)یــش یــەکێکبووە لــەو شــارانەی لــە چوارچـێوەی قەڵــەمڕەوی میرایەتییەکەیانـدا بـووە، لەسـەردەمی حـوکمڕانی (سـەلجووقییەکان)دا پێـشکەوتنێکی بەرچـاوی بـەخۆوەبینیوە، بـەڵام لەسـەردەمی لەشکرکێـشییەکانی (هۆلاکـۆ) و پاشـانیش (تـەیمووری لـەنگ)دا رووبـەڕووی وێرانکـاری بووەتـەوە، هـەروەها لەسـەدەکانی چـواردەم و پـانزەمی زایینیـدا چـەندجارێك بەدەسـتی عوسمانییـەکان رووبـەڕووی پـەلامار بووەتـەوە، لەئەنجامـدا خەڵکەکـەی تووشی زەرەر و زیان هاتوون.

کرماشان بەشوێنەواری مێژوویی بەناوبانگە و سەدان (کۆشك، باڵاخانـە، قەڵا، تـەپ و گردۆڵکـە، پرد و رێگا)ی دێرینی تێدایە، هەریەك لەو شوێنەوارانەش رازی رۆژگارە زێڕینەکانی خۆیان لە ئامێز گرتووە، هەر بۆ نموونـە نـەوەك سەرژمێر ناوی ئەمانەیان دەهێنین:

تـەلاری خوسـرەوی، کۆشـکی شـاپوور، شـوێنەوارەکانی تاقەوسـان، قـەڵای هـەژیر، قـەڵای سـەرماج، قـەڵای بێستوون، تەپەی گۆدین، تەپەی رۆستەم ئاباد، پردی خوسرەوی، پەرستگەی ئەناهیتا....هتد.

(دشـە) شـوێنی نیـشتەجێبوونی زەردەشـتییەکان بـووە و ژمارەیـەك لـە (مووبـدەکان)ی زەردەشتی تێدا ژیاون و تا ئێستاش شوێنەواری ئاتەشگەی زەردەشتی تێدایە.

(دشـە) گونـدێکی سەیدنـشینە و (ئایـەتولاّ مـەردۆخ) پێیوایـە (سـەیدەکانی دشـە) بـە رەچـەڵەك دەچنەوەسـەر (پـیر یـوونس کـوڕی پـیر ئـەلیاس کـوڕی پیرخـدری شـاهۆ)، بـەڵام دشەییەکان خۆیان دەڵێن گوایا رەچەڵەکیان دەچێتەوەسەر (سەی مەحموودی ئەصفەهانی) کـە لە نەوەی (ئیمام جەعفەری صادق) بووە.

چەند شوێنەوارێك لەم گوندەدا هەن کە لـە رووی مێژوویـیـەوە بایـەخ و گرنگـی خۆیـان هەیە و گـەواهی ئـەوەدەدەن ئـەم گونـدە شـوێنی نیـشتەجێبوونی دێـرین بـووە، لەوانـە: (قـەڵای پاسگە[*]، گەنجگا، شوێن پێی ئەسحابە، مزگەوتی دشە)، ئەم مزگەوتە بە فـەرمانی عەبـدوڵای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب درووستکراوە.

(دشە) مەڵبەندێکی گەورەی دینداری بووە، چەندین گـەورە پیـاوی دینـدار لـەم گونـدەدا ژیانیان گوزەرانـدووە، وەك بنەماڵـەی موفتییـەکان، هـەروەها ژمارەیـەك لـە شـاعیران و زانایـانی دشەیی شاسواری ناو کـاروانی رۆشـنبیری کوردی بـوون، هـەر بۆنموونـە نـاوی چـەند کەسـێکیان دەهێنین:

(مەلا مەحموودی دشەیی[*]، مەلا عەبدوڵای دشەیی، د. محەممەدصدیقی مـوفتی زادە)، هـەر لـەم رووەوە ئاماژەبەوەدەکـەین مـەزار و نـشینگەی چـەندین دینـدار و ئاییناسـی گـەورەی سەردەمی خۆیان لەم گوندەدان لەوانە:

1 مەزاری مەلامەحموودی موفتی زادە= مەلا مەحموودی دشەیی.

2 مەزاری شێخ حەبیبوڵای نەقشبەندی زۆربەی خەڵکی جوانرۆ موریدی ئەم زاتەبوون.

---

[*] لەسەر رۆشنایی سەرچاوە مێژووییەکان (قەڵای پاسگە) لە لایـەن (پـاو کوڕی کیوس کوڕی ئەنەوشیروانی ساسانی)یەوە درووستکراوە، کاتێك کە بەفەرمانی (یەزدەگوردی سێیەم)ی کیسرای ساسانی هاتووەتە ناوچەکە بۆ گێرانەوەی خەڵك بۆ سەر دینی زەردەشتی.

بڕوانە کتێبی (مجموعه راهنمای جامع ایران دیگردی استان کرمانشاه) تالیف حسن زندەدل ودستیاران تهران .1379

[*] ئەم زاتە زۆر پیاوچاك و خوداپەرستبووە و هیچ مەبەستێکی بە دنیا نەبووە، هەر لەوەوە (حەزرەتی شێخ عوسمانی سیراجوددین) کردوویەتی بە مامۆستای ژمارەیەك کوڕەکانی.

3 مەزاری شێخ شەهاب خەڵکی خانەگا بە تێکڕایی خۆیان بەموریدی دەزانن.

هەروەها ژمارەیەکی زۆر لـە مـەلادیارەکانی کوردسـتان لـەم گونـدەدا و لەژێردەسـتی زانـا ئایینییەکانی دشەیی خوێندوویانە.

ژمـارەی خانووەکـانی (دشـە) لـە (400) خـانوو زیـاترە و (دانیـشتوانەکەشی (3000) هــەزار کەســن، سەرچــاوەی بژێویــشیان بریتییــە لــە (ئاژەڵــداری، باخــداری، کاســبیکردن، بنێــشتکردن)، ئاژەڵــدارەکانیان ســاڵانە بــۆ لەوەڕانــدنی ئاژەڵــەکانیان دەچــنە هەوارگــەکانی هاوینــەیان وەك: (سیاســەر، دەرەتفــێ، مەرەسـیاوە، هـێلاو)، دەوترێـت نـاوی (هـێلاو) لـە نـاوی (هــێلین)ی یۆنانییــەوە هــاتووە و لەبــەر ئــەوەی شــوێنەکەی زۆر بــەرزە، یۆنانییــەکان بــۆ ئەستێرەناسی چوونەتە ئەوێ.

چەندین سەیرانگەی رەنگین لە دەورووبەری (دشە)دا هەن وەك: (هانەکوان، هومان) کـە خەڵکان بەمەبەستی سەیرانکردن روویان لێدەکەن.

یەکێك لە رۆشـنبیرە هاوچـەرخەکانی (دشـەیی) بـە نـاوی (مامۆسـتا رەفعـەتی مـورادی)، بەزمانی شیعر هاتووەتە گوفتار و بەم شێوەیە باسی گوندەکەی خۆی کردووە:

رووێ جە روان پەی شەرح ئەحواڵ
جە دشەی کۆنم من کەردم سوال
واتم ئەی ئازیز نام و نیشانت
شەرحۆ حاڵو وێت بارە سەر زوانت
جوابش داوە پیری کۆهەن ساڵ
واتش ئەی رەفیق خەستەی پەشێو حاڵ
من نامم (دژەن) مەشهوور بە (دشە)
پەی فەتح ئەمن جەنگ بێ هەمیشە
پاسگەی مەشهوور و قەڵای مورادم
شاهیدی زیندەن پەی شەرح یادم
هەرکەس فاتح بێ جە دوو قەڵای من
ریشەی دوژمنان بەر ئارێ جەبن

راگەی تجارەت عێراق و ئێران
جەمن ویەرێ (قدیم الزمان)

ئاوم فراوان باخاتی پڕ بەر

مێوەی ڕەنگاوڕەنگ ماوەرۆ سەمەر

هەوای گەرم و سەرد کویستان و گەرمیان

چوار فەصڵی وەش خەڵاتم کریان

دار و درەخت و چیا و هەرد و کۆ

کێ هەن پێسە من خەڵات کریابۆ؟

هانەی (هانە کوان)، هەم سەر تاوێران

هەر ڕاگوزەرێ پێش مەبۆ حەیران

هانە و (دەرەتفێ) جە وەهارەنە

مەشهوور بێ دڵێ هاوارانەنە

کۆچێ لوێنێ روو بە (سیاسەر)

هەواری پڕ ئاو پڕ باخ و سەمەر

(هێڵاو) هەوارگەی بەرزە هەواران

(بەران شاخ)ی سەوز نەزرگای یاران

(بەرۆژ) و (شەرگە)، یا (کەلە قەندی)

هەرچن وەشسشا بە وێشا نەدی

ئا کەشە بەرزێ ماوا و صەیادان

جیاتی وەشی بیە یاگێ خەمان

موفتیانی زانا خاوەن عیلمم بێ

شێخی تەریقەت ڕاگەی دینم بێ

ڕۆڵە وەسیەتم یاونە بە یاران

ئینەن شەرتۆ من پەی وەفاداران

دار و درەختم قەل و قەم نەبۆ

لاشەم زامدار و باڵام ڕێش نەبۆ

هەوارم هاڵی و بێ کۆچەر نەبۆ

باخاتم بێ ئاو بێ سەمەر نەبۆ

خەڵکم پەرێشان سەرگەردان نەبۆ

**دڵشان جه یەکتری نیگەران نەبۆ**
**بەڵێ ئازیزم یه حاڵی من بێ**
**داستانی تەڵخ و شیرینی من بێ**
**ئاگرێ وەر بی حوجرەی دەروونم**
**حاڵم بی پەشێو پەی (دشه)ی کۆنم**
**واتم زێدی من دنیا دەورانەن**
**گا خەنەبەندان گاهێ گریانەن**
**ئارۆ وەی تەورەن چەرخی زەمانە**
**دڵ چەنی دڵدار کریان بێگانە**
**کۆچێ نەمەنێ هەواران بی چۆڵ**
**جیای سەیرانگەی بیەن خاك و خۆڵ**
**نەسەدای شمشاڵ نه سیاچەمانە**
**دەنگشا نەمەنەن جه سەرکەشانە**
**(مەڕە سیاوە)، (تالگە و هومان)**
**شادی و وەشیشا جه دەسما لوان**
**(هێلاو)، (بەران شاخ)، (شەرگە و سیاسەر)**
**هەوارنشینێ گرد بیێ دەربەدەر**
**یاخوا هەر کەسێ ئینەش کەرد بە تۆ**
**لیلاویش لێڵ بۆ، چەمانش کۆر بۆ**
**بەش سەروچێر بۆ چەرخ و زەمانەش**
**(بایەقوش) وانۆ جه ماوا و یانەش**
**بەڵکو دەورێ تەر دەورانو تۆ بۆ**
**(دشه)م ئاوابی و شادی بەشت بۆ**
**(رەفعەت) بە موراد گێڵۆ سەرکەشان**
**وانۆ سروود پێ بە ئاهەنگشان**

**بێساران زیدی بێسارانی و گەورە زانایانە**

یەکێکە لەگوندە دێرینەکانی (هەورامانی ژاوەرۆ)، نزیکەی (30) میل لە شاری (سنە)وە دوورە و کەوتووەتە باشووری خۆرئاوای ئەو شارەوە، دەربارەی ناوەکەی دوو بۆچوون هەن، ئەوانەی لەسەر بۆچوونی یەکەمن پێیانوایە لە بەر ئەوەی ناوچەکە شاخاوییە و هیچ

تەختاییەکی تێدا نییە پێیوتراوە (بێسارایی)، ئاشکرایە خەڵکی هەورامان بەتەختایی دەڵێن (سارایی)، بەم پێیە ناوەکە لە (بێسارایی)یەوە هاتووە.

ئەوانەش لەسەر بۆچوونی دووەمن دەڵێن: لەبەر ئەوەی خەڵکی گوندەکە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەلایەن نوێنەری سانەکانی هەورامانەوە و هەندێکجاریش لەلایەن نوێنەری حوکمڕانەکانی ئەردەڵانەوە حوکمکراون، ئەو نوێنەرانەش خەڵکی گوندەکە نەبوون، بە واتا خۆیان سەرداری خۆیان نەبوون، بۆیەپێدەچێت ناوەکە لە (بێسەرداران)ەوە هاتبێت.

چەند شوێنەوارێك هەن دڵنیایدەدەن کە (بێساران) مێژوویەکی دێرینی هەیە لەوانە:

1ـ قەڵای دارسەیران: ئەم قەڵایە وا بەشوێنێکی بەرزاییەوە و لە درووستکردنیدا (قسڵ و جۆرە قوڕێکی تێکەڵ بە موو) بەکارهێنراون، کە پێکەوە وەك کۆنکرێتیان لێهاتووە، لە کانییەکی بەرزەوە بە جۆرە بۆرییەك کە لەخۆڵی سووری سوورەوکراوە درووستکراون، ئاوی بۆ راکێشراوە، زۆرجار لە دەوروبەری قەڵاکەدا شتی کۆنی گرانبەها لەلایەن گوندنشینەکانەوە دۆزراونەتەوە و فرۆشراون، دواجار بەمەبەستی پاراستنی شوێنەوارەکانی ئەم قەڵایە دەسەڵاتدارانی ئێرانی دەستیانگرتووە بەسەریدا.

2ـ قەڵای میرحاج: ئەم قەڵایە دەکەوێتە بەرامبەر خۆرنشینی قەڵای (دارسەیران)، سێ بەردی زۆر گەورە و تەخت و سپی لەناو قەڵاکەدان، دارقەزوانێکی گەورەش بەسەر مەزارەکەی (میرحاج)ەوەیە، دەربارەی ئەو بەردانە و دار قەزوانەکە، (مامۆستا محەممەد ئەمین هەورامانی) دەڵێت: تەمەنی ئەو دارە زیاتر لە هەزار ساڵە و پێدەچێت ئەو سێ بەردەش لە شوێنی ترەوە هێنرابن، چونکە لەو ناوچەدا هیچ جۆرە بەردێکی تری وەهای لێنییە.

لەدەوروبەری (بێساران)دا چەندین نشینگە و مەزاری پیاوچاکان هەن، خەڵکی ناوچەکە زۆر باوەڕیان بەسەردانی ئەو شوێنانە هەیە و بەمەبەستی رزگاربوون لە نەخۆشی روویان لێدەکەن، لەوانە:

1ـ مەزاری باواشێخ: خەڵکی ناوچەکە باوەڕیان وایە ئەو ژنانەی منداڵیان نابێت، ئەگەر بچنە سەر ئەم مەزارە، پاش ماوەیەکی کەم دووگیاندەبن و منداڵیاندەبێت[***].

---

[***] لەبەر گەورەیی و پیرۆزی (باواشێخ) لای خەڵکی هەورامان زۆرجار سوێندیپێدەخۆن، هەندێك لەو سوێندانەش چوونەتە دووتوێی شیعر و گۆرانییەکانی ناوچەکەوە، هەر بۆ نموونە با لەم دێرە شیعرە وردبببینەوە:





2 مەزاری پیرمحەممەد: بەمەبەستی رزگاربوون لەهەموو جۆرە نەخۆشییەك.

3 مـەزاری حـاجی ئـاڵی: بۆرزگـاربوون لـە نەخۆشـی (لـەرز و تـا)، هەورامییـەکان بـەم نەخۆشییە دەڵێن (سێبەڕۆ).

4 هانەوا: بۆرزگاربوون لە نەخۆشییەکانی (ئاوسان) و (ژان و با= رۆماتیزم).

ژمارەیەکی زۆر مەلای گەورە و زانای ئایینی ناودار لەم گوندەدا هەڵکـەوتوون، بۆنموونـە ناوی چەند کەسێکیان دەهێنین وەك:

(مـەلا عـەلی بێـسارانی، مەلاحامیـدی کاتـب، شـێخ سـەلامی بێـسارانی، مەلائەحمـەدی بێـسارانی، مـەلا مـستەفای بێـسارانی= بێـسارانی شـاعیر)، پێویـستە ئاماژەبەوەبکـەین (مـەلا ئەحمەدی بێسارانی) باوکی (بێسارانی)شاعیرە و هـەموو نـەوەکانی (مـەلا)بـوون، بـەرەی (قـازی جوانرۆ)ش هەر لەنەوەی ئەم زاتەن ٭٭٭.

خەڵکی بێساران بەشێوەیەکی گشتی بەسەر چەند تیرەیەکدا دابەشدەبن بەم ناوانە:

(تیرەی عەلی رەمایی، تیرەی یاقووبی، تیرەی غولامەویسی، تیرەی پیرەیـی، تـیرەی باسامی، تیرەی زەبیحی، تیرەی ئەلیاسی، تیرەی بێسارانی، تـیرەی ئیمـامزادە= سـەیدەکانی بێـساران، هـۆزی وەستا باوە)، دەوترێت (وەستا باوە) یەکێکبووە لەو یەهودییانـەی هاتوونەتـە ناوچـەکە و تێیـدا نیشتەجێبوون.

## پاڵەنگان رازێکی گەورەی لە مێژووی گەلەکەماندا هەیە

(پاڵەمگان) دەکەوێتە خاکی (ژاوەرۆ) و لـە پـەنای چیای سـەربەرزی (شـاهۆ) دایـە، ماوەیـەکی زۆر شـارێکی گـەورە و مەڵبەنـدی میرایـەتی بـووە، ژمارەیـەك دەسـەڵاتداری دیـاری سـەردەمی خۆیـان حوکمڕانیـان تێـداکردووە، کۆنەشـاری (پاڵـەنگان) لەشـوێنێکی سـەختدا درووستکراوە و دەورووبوری ئەوشوێنەچەند کانیاوێکی تێدایە، ئاوی کانیاوەکان کە کۆدەبێتەوە ئەوەندە زۆرە کاتی خۆی حەوت پردیان لەسەری بۆ ئاسانکردنی هاتووچۆ درووستکردووە.

---

دڵ ئەسیری تۆن شای وەفاداران          بەو باوا شێخە ماڵ لە بێساران

٭٭٭ (مامۆستا عەلائوددینی سەجادی)، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، لاپەڕە (207).

چەندین شوێنەواری کۆن لە پاڵنگاندا هەن وەك (گەڕەکی خومخانـە، مووسـایان، شـوێنی گەرماو، شوێنی کۆنەبازاڕ و شوورای شارەکە)، هەروەها ئەودەروازە بەردیینەی کەبۆ هاتووچۆی ناو قەڵاکە بەکارهێنراوە و قولەکانی دەوروبەری شار.

(میرەکانی پاڵنگان) لەسەردەمی خۆیاندا حوکمی شەش قەڵایان کردووە بەم ناوانە:

1ـ قەڵای دێودزە، دێودز لە ئێستادا گوندێکە بەناوی( دێوەزناو).

2ـ قەڵای مرواری، مرواری لە ئێستادا گوندێکە دەکەوێتە پەنای (ملـەمرواری) و لـەنێوان ( بێڵەوار و ژاوەرۆدا)یە.

3ـ قەڵای یەمەن، ئێستا گوندێکە بەناوی (یەمێنان).

4ـ قەڵای نشوور، نشوور ئێستا گوندێکـە دەکەوێتـە پـەنای چیای (عـەودالان)، سـەعاتێك بەپێ لە قەڵای (نشوور)ەوە دوورە.

5ـ قەڵای کێلانە، ئێستا گوندێکە بە هەمان ناوەوە.

6ـ قـەڵای دێزمـان، ئـەم قەڵایـە دەکەوێتـە لای سـەرووی (ژاوەرۆ)وە، لـەنێوان (هۆیـە) و (ئەوێهەنگ)دایە، ئێستا (دێزمڵی) پێیدەوترێ.

ئەم قەڵایانە کە ناومانهێنان هـەموویان سـەر بـە (میرایـەتی پاڵـەنگان) بـوون، دەربـارەی میرە بەناوبانگەکانی(پاڵەنگان)، مێـژوونووس (شـەرەفخان بەدلیـسی) لـە کتێبـی (شـەرەفنامە)دا ناوی چەند کەسێکیانی هێناوە لەوانە:

1ـ (میر غەیبولا) لەبارەی ئەم مـیرەوە نووسـیویەتی: میرێکـی پیـاو چـاك و خواناسـبووە، دەسەڵاتێکی زۆری هەبووەو هەمووقەڵکانی دەورووبەری خستوونەتە ژێر فەرمانییـەوە، سـەرەتا لەژێر فەرمانی (شائیسماعیلی صەفەوی)دا بووە.

2ـ (میرمحەممـەدی کـوڕی مـیر غـەیبولا)، لەلایـەن (شاتاماسـب)ەوە کـراوە بـە حـوکمڕانی (پاڵەنگان)، پیاوێکی (زانـا، دانـا، ئەدەبدۆست) بـووە، دیوەخانەکـەی هەمیـشە کـۆڕی ئـەدیبان و شـاعیران بـووە، مزگـەوت و خوێندنگـەی ئـاییـنی لـە(پاڵـەنگان)دا درووسـتکردوون، (مـەلاجامی) کردووەبە مامۆستا و سەرپەرشتیاری خوێندنگەکە، تائێستاش شوێنەواری مزگەوتەکە ماوە.

3ـ (مـیر محەممـەد)، زۆر لـە (شاتاماسـب)ەوە نزیکبـووە، بـەجۆرێك کـچێکی بـووە بـە هاوسەری شا.

 (میرئەسکەندەر)، تەنها ساڵێك حوكمیكردووە.

لێرەدا پێویستە باس لەوە بكەین، (میر حسێن تەكلۆ)ی میری دینەوەر، پاش ئەوەی هەواڵی مردنی( میر ئەسکەندەر)ی بیستووە، بەلەشكرێكی زۆر گەورەوە هاتۆتە سەر(پاڵەنگان) و داگیریكردووە، ناوچەكەی خستۆتە ژێر دەسەلأتی خۆیەوە، (حسێن تەكلۆ) كەسێكی ستەمكارو خوێنرێژ بووە، تەنانەت براكانی خۆی لێیترساون، (سوڵتان حەسەن تەكلۆ)ی برای لەترسی ئەودا ڕایكردووە و پەنای بۆ لای (مەحموود پاشای كوڕی شەمسیپاشای میری میرانی شارەزوور) بردووە، پاش مردنی(شائیسماعیلی دووەمی صەفەوی)، (وەلێخان تەكلۆی میری هەمەدان) پاڵەنگانی داگیركردووە، (سۆلاغ حسێن تەكلۆ)ی كوشتووە، لەگەرمەی هێرشەكەی (وەلێخان تەكلۆ)دا بۆ سەر (پاڵەنگان)، (مەحموود پاشای میریمیرانی شارەزوور) هێرشیكردووەتە سەر ناوچەكە و گرتوویەتی، ئیتر لەو كاتەوە (میرایەتی پاڵەنگان) لەلایەن عوسمانییەكانەوە هەر كاتێك دراوە بە كەسێك، بەتایبەت بەو كەسانەی كە لەبەرژەوەندی ئەواندا هەڵسووڕون و هەمووشیان بەناوچەكە بێگانە بوون.

## گوندی دەمەیەو جانولأبەگ ئاوەدانی كردووەتەوە

گوندی دەمەیەو یەكێكە لە گوندەكانی هەورامانی تەخت و پێشتر شوێنەكەی هەوارگە بووە، سنوورەكەی لە خۆرهەلأتەوە (دەربەنە، سەكۆی سان، عەوالأن و پیر رۆستەم)، لە خۆرئاواوە (قەلأی برووسكە و مەیدان) لەباكوورەوە (كێوی زەڕە) و لە باشووریشەوە (كەلی دڵێ و كەماجەڕ و وەزەران)، سەبارەت بە ناوەكەی خەڵكی گوندەكە دەڵێن، لە بەر ئەوە گوندەكەیان لە شوێنێكی كەم ئاودایە و زۆربەی بەرهەمی كشتیاری بریتییە لە (جۆ)، وەك ئاشكراشە خەڵكی هەورامان بە جۆ (یەو) دەڵێن، بۆیە پێدەچێت ناوەكە لەسەرەتاوە (دێمەیەو) بووبێت و پاشان بۆ (دەمەیەو) كورتكرابێتەوە.

سەرەتاكانی ئاوەدانكردنەوەی ئەم گوندە بۆ نزیكەی سەد ساڵێك لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، كاتێك كە (جانولأبەگ) لە ئەنجامی ناكۆكی و كێشمەكێشی نێوان كوڕەكانی و ئامۆزاكانییەوە، واتە كوڕەكانی (برزووم بەگ)، گوندی (بارام ئاوا)ی داوە بە كوڕەكانی و خۆی هاتووە (دەمەیەو)ی ئاوەدانكردووەتەوە، دەربارەی كۆنترین شوێنەواری مێژوویی لە ناوچەدا، (محەممەد ئەمین هەورامانی) دەڵێت: توولە رێیەك هەیە پێیدەوترێت (رێی تەبەرلەنگ)، هەندێك پێیانوایە ئەم ناوە لە بنەڕەتدا (رێی تەیمووری لەنگ)بووە و ناوبراو لەكاتی

لەشکرکێـشییەکەیدا بـۆ ناوچـەکە بـەو رێیـەدا گـوزەریکردووە، هـەروەها شـوێنێك هەیـە پێیدەوترێت (کەلوتاقی= کەل تـاق)، یـەکێك لـە بـەگزادەکانی ناوچـەکە بـەناوی (حامیـد بـەگی کوڕی جانەلأبەگ) وتوویەتی: ناوی (کەل تاق) لەوە هاتووە چـەند خانوویـەك لـەو شـوێنەدا لـە سـەر شـێوەی (تـاق) درووسـتکراون و دارەڕانـەکراون، ئـەو خانووانـە نزیکـەی (40) خانوویـەك دەبن و هەر ژوورێکیان (4) کەس تێیدا جێیاندەبێتەوە، (حامید بـەگ) لـە درێـژەی قسەکانیدا باسی لەوەکردووەچەند نـاوێکی تـەر هـەن لـە ناوچـەکەدا پێـشینەیەکی مێـژوویيان هەیـە وەك: (هەردی جیهانشا، پلەی جیهانشا، زەوی جیهانشا[*]، ئاوەرۆی پیشالیار).

ئەم گوندە هەندێك چەم و دۆڵی تێدایە بەم ناوانە:

1ـ دەرۆ هۆشو ئاساوی= چەمی حەوشەی ئاش

2ـ دەرۆ باخو میرا= چەمی باخی میران

3ـ دەرۆ مووسالەی= چەمی مووسالە

4ـ دەرۆ دەربەنی= چەمی دەربەند

هەروەها چەند کانییەك لە ناو گوندەکە و لە دەورووبەریدا هەن وەك:

1ـ هانۆ جانەلأبەگی= کانی جانەلا بەگ

2ـ هانۆ ژەنا= کانی ژنان

3ـ هانۆ میرانی= کانی میران

5ـ هانۆ باپیری= کانی باپیر

6ـ هەسارۆ شێخی= ئەستێڵی شێخ

7ـ کارێز و بێڵوە چەرمێ= کارێزی بێڵوە سپی

8ـ هانۆ جەمیلی= کانی جەمیل

9ـ هانۆ حەمەرەحیمی= کانی حەمەڕەحیم

10ـ هانۆ مزگی= کانی مزگەوت

---

[*] پێویستە باس لەوەبکەین ئەو سەرچاوانەی باسی مێژووی حوکمڕانەکانی هەورامانیان کردووە، لەناو هیچ کامیاندا ناوی (جیهان شا) نەهاتووە، بۆیە پێدەچێت ناوبراو لەدەرەوەی ناوچەکەوەو ئایا بەهۆی لەشکرکێشییەوە بووبێت، یاخود بەهەرهۆیەکی ترەوەبووبێت هاتبێتە ئەوێ.

سەرەڕای ئەو هەموو بەسەرهاتانەی لە رووە جیاجیاکانەوە بەسەر خەڵکی ئەم گوندەدا هاتوون، کەچی رووداوێك هەیە هەمیشە لە یادەوەری خەڵکەکەدایە و تا ئێستاش ئەوەی رووبکاتە (دەمەیەو) ئەو رووداوەی بۆ دەگێڕنەوە، کورتەی ئەو رووداوەش بەم شێوەیە بووە: یەکێك لە کوڕەکانی (جانولآ بەگ) بە ناوی (حەمەڕەشید بەگ)، لەگەڵ ژمارەیەك لە خەڵکی گوندەکەدا چوون بۆ راو بۆ (دەربەند کەڵەوێ)، لەوێ لە توولەرێیەکی زۆر سەختدا تووشی ورچێك بوون، (حەمەڕەشید بەگ) فیشەکێکی پێوەناوزە و برینداریکردووە، ئەوانەی لە گەڵیدا بوون بە جۆرێك دەوری ورچەکەیانداوە هیچ رێگەیەکی دەربازبوونی نەبووە، (حەمەشەریف بەگ)یش زۆر لێیچووەتەپێشەوە و بەتەواوی لێینزیکبووەتەوە، کاتێك پیرە ورچ زانیویەتی دەربازبوونی مەحاڵە خۆی کردووە بە خەوتوو، هەتاکو لە پڕ پەلاماری (حەمەشەریف بەگ)ی داوە، تفەنگەکەی لەدەستسەندووە و لەو شاخە هەزار بەهەزارەوە فڕێداوەتە خوارەوە و هەپروون بە هەپروون بووە.





2 ئینجیلی مەتی بەرچڤەی (قەشە یووسف پەری و کەریم زەند) چاپخانەی راپەڕین سلێمانی 1972.

3 سەرەنجام دەستنووس ساڵی (1315 ك) لە لایەن (کاکا رەدائی)یەوە نووسراوە

4. دەفتەری شندروێ دەستنووس یەکێکە لە دەستنووسە پیرۆزەکانی (یارسان).

5 مێژووی هەورامان دەستنووس نووسینی (مامۆستا محەممەد ئەمین هەورامانی).

6 تاریخ اورامان دەستنووس نووسینی (ملا عبدالله قاضی اورامانی شیدا).

7 پاسداران مرز ایران= تاریخ اورامان دەستنووس نووسینی (موزەفەرخانی رەزاو).

8 (د.جلیل دوستخواه) اوستا جلد (1و2) گزارش و پژوهش چاپ چهارم 1377 انتشارات ممروارید.

9– (صدیق صفی زادە بورەکئی) (نامە سرنجام = کلام خزانە) تحقیق وتفسیر چاپ اول 1375 تهران انتشارات هیرمند

10 (حسن پیر نیا= مشیر الدولة) تاریخ ایران باستان جلد (1و2و3 ) نوبت چاپ نهم 1378 ناشر انتشارات افراسیاب.

11 (عبدالعظیم رضایی) تاریخ ده هزار ساله ایران جلد (1و2و3و4) نوبت چاپ دهم 1378.

12 (ایرج بهرامی) اسطوره اهل حق نوبت چاپ اول، تابستان 1378.

13 (ابو القاسم پرتو) اندیشهای فلسفی در ایران چاپ اول انتشارات اساطیر –1373 تهران.

14 (مهندس جلالدین اشتیانی) زرتشت مزدیسنا و حکومت) چاپ هفتم ناشر شرکت سهامی.

15 (د. علی شریعتی) تاریخ و شناخت ادیان جلد دوم.

16 (هاشم رضی) ائین مهر= میترائیسم انتشارات فروهر چاپ اول 1359 تهران.

17 (هاشم رضی) وندیدات جلد (اول) تحقیق چاپ اول انتشارات فکر روز تهران 1376.

18 (جمیل افشار) راستی علی کیست تالیف چاپ اول 1376 انتشارات هیرمند تهران.

19 (عباس قدیانی) تاریخ ومذاهب در ایران چاپ اول 1374.

20 (محمد علی سلطانی) ایلات وطوایف کرمانشاهان جلد 2/1 تالیف نوبت چاپ اول 1372 تهران.

21 (محمود طلوعی) فرهنگ جامع سیاسی چاپ دوم 1377 چاپخانه حیدری.

22 (محمد علی سلطانی) حدیقه سلطانی تهران 1364.

23 (شیخ محمد مردوخ کردستانی) تاریخ مردوخ جلد دوم چاپخانه ارتش.

24 (فخر الکتاب میرزا شکرالله سنندجی) تخفه ناصری در تاریخ و جغرافیای کردستان انتشارات امیر کبیر تهران(1366 ه.ش).

25 (عبدالقادر بابائی) تاریخ وجغرافیای کردستان سیر الاکراد تهران (1366 ه.ش).

26 (د. برهان الدین ولەدبەگی) نگاهی بە جاذبەهای اکوتوریستی اورامان انتشارات طاق بستان 1388.

27 (حسن زینده دڵ و دستیاران) مجموعه راهنمای جامع ایرانگردی استان کرمانشاه.

28ـ راهنماى سياحى شهرستان پاوهـ فرهنگ وارشادات اسلامى پاوه.

29ـ (د. زكى نجيب محمود)ـ مجتمع جديد او الكارثةـ دار الشروقـ بيروت 1978.

30ـ (ارثر كريستنسن)ـ ايران فى عهد الساسانيين)ـ ترجمة (يحيى الخشاب) مراجعة (عبدالوهاب عزام)ـ مطبعة لجنة التاليف والترجمة و النشرـالقاهرة 1957.

31ـ (ابو الحسن على بن حسين المسعودى) ـمروج الذهبـ ج 4ـ القاهرة 1938.

32ـ (سيسل جون ادموندز)ـ كرد، ترك، عربـ ترجمةـ (جرجيس فتح الله)ـ مطبعة التايمس 1971.

33ـ (باسيل نيكتين)ـ الاكرادـ دار الروائعـ بيروت 1985.

34ـ (الدكتور جمال رشيد امين)ـ دراسات كردية فى بلاد سوبارتوـبغداد 1984.

35ـ (جوزيف طاير)ـ حكمة الاديان الحيةـ ترجمةـ (المحامى حسين الكيلانى)ـ مراجعة )ـ (الاستاذ محمود الملاح)ـ منشورات دار مكتبة الحياةـ بيروت.

36ـ (هوراس)ـ فن الشعرـ ترجمة (د.لويس عوض)ـ الطبعة الثانيةـ قاهرةـ 1970.

37ـ (الدكتور على عبدالمعطى محمد)ـ فلسفة الفنـ رؤية جديدةـ ص(24)ـ دار النهظة العربية للطباعة والنشرـ بيروت 1985.

38ـ (جان مارى جويو)ـ مسائل فلسفة الفن المعاصرةـ ترجمة (سامى الدروبى)ـ دار اليقظة العربيةـ بيروت 1965.

39ـ (د.نورى جعفر)ـ فلسفة التربيةـ مطبعة الزهراءـ بغدادـ 1959.

40ـ (اديب صعب) ـ الدين والمجتمعـ دار النهار بيروتـ 1983.

41ـ (د. محمد عمارة)ـ الخلافة ونشاة الاحزاب الاسلاميةـ المؤسسة العربية للدراسات والنشرـ بيروتـ 1977.

42ـ (عبدالسلام هارون)ـ رسائل الجاحظـ جلد 1ـ تحقيقـ القاهرة 1964.

43ـ (محمد عاطف العراقى)ـ النزعة العقلية فى فلسفة ابن الرشدـ تاليفـ الطبعة الثالثةـ 1968 دار المعارف بمصر.

44ـ (الدكتور محمد عمارة) ـ الاسلام والسلطة الدينيةـ الطبعة الثانيةـ المؤسسة العربية للدراسات والنشرـ بيروت 1980.

45ـ (انورالمائى)ـ الاكراد فى بهدينانـ بغدادـ1960.

46ـ (ارنست فيشر)ـ ضرورة الفنـ دار النهضة العربية للطباعة والنشرـ 1985

47ـ (شلدون تشينى)ـ تاريخ المسرح فى ثلاثة الاف سنةـ ترجمه (درينى خشبه)ـ مراجعه (على فهمى)ـ المؤسسة العربية للتاليف والترجمة و الطباعة و النشر.

48ـ فريد انطونيوـ المذاهب الادبية الكبرى في فرنسا ـ الطبعة الثانيةـ1975ـ بيروت.

49ـ (د.حميد مجيد)ـ الاثنولوجيا والفلكلورـ من منشورات جامعة بغداد.





50٫ (محمد جميل رۆژبیانی و شكور مطظفی)٫ مذكرات مامون بیگ بن بیگه بیك٫ مطبعة المجمع العلمی العراقی٫ بغداد 1980.

51٫ (محمد جميل بندی الروذبیانی)٫ بندنیجین= مندلی فی التاریخ قدیما وحدیثا٫ گۆڤاری كۆری زانیاری عێراق٫ دەستەی كورد٫ بەرگی حەوتەم٫1980.

52٫ (مەسعوود محەممەد)٫ مرۆڤ و دەوروبەر٫ بەشی دووەم٫ چاپخانەی كۆڕی زانیاری عێراق٫ بەغداد 1984ز.

53٫ (هادی رەشید بەهمەنی)٫ پەیامی هەورامان٫ بەرگی یەكەم٫ 2001ز=2701 كوردی.

54٫ (محەممەد ئەمین زەكی بەگ)٫ خولاصەیەكی تاریخی كورد و كوردستان٫ بەرگی یەكەم٫ بەرگی دووەم٫ چاپی نوێ، سلێمانی 2000.

55٫ (عەبدولا موبلیغی ئابادانی)٫ مێژووی ئایینی زەردەشت٫ وەرگێڕانی (وریا قانیع)٫ چاپی دووەم٫ خانەی چاپ و بلاوكردنەوەی قانیع٫ سلێمانی 2004.

56٫ (ئەندازحەوێزی)٫ ئاڤێستا نامەی مەنەڤی ئایینی زەردەشت٫ نیگاكردنەوە٫ بەشی یەكەم٫ سوید 1992ز.

57٫ (ئەمین شێخ عەلائودین نەقشبەندی)٫ تەصەووف چی یە٫ دار الحرية للطباعة 1985.

58٫ (د.كامل حەسەن عەزیز ئەلبەصیر)٫ رەخنەسازی٫ (مێژوو و پەیرەویكردن)٫چاپخانەی كۆڕی زانیاری عێراق٫ بەغداد 1403كۆچی=1983زایینی.

59٫ (محەممەد رەسووڵ هاوار)٫ كورد و باكووری كوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان٫ بەرگی یەكەم٫ چاپی یەكەم٫2000.

60٫ (ڤلادیمێر مینۆرسكی)٫ كورد٫ وەرگێڕانی بۆ عەرەبی (د.مارف خەزنەدار)٫وەرگێڕانی بۆ كوردی (حەمەسەعید حەمەكەریم)٫ 1984.

61٫ (عەلائوددینی سەجادی)٫ مێژووی ئەدەبی كوردی٫ چاپی دووەم ساڵی 1971.

62٫ (محەممەد ئەمین هەورامانی)٫ مێژووی هەورامان٫ انتشارات بلخ 1380.

63٫ (د.صدیقی بۆرەكەئی)٫ مێژووی وێژەی كوردی٫ بەرگی یەكەم٫ بەرگی دووەم٫چاپخانەی چهر٫ تبریز 1370.

64٫ (محەممەد ئەمین هەورامانی) ٫ مێژووی رێبازی زمانی كوردی٫ مەڵبەندی رۆشنبیری و كۆمەڵایەتی زانكۆی سەلاحەدین٫1990ز.

65٫ (د.جەمال رەشید ئەحمەد)٫ لێكۆڵینەوەیەكی زمانەوانی دەربارەی وڵاتی كوردەواری٫ لە بلاوكراوەكانی دەزگای رۆشنبیری و بلاوكردنەوەی كوردی٫ 1988.

66٫ (محەممەد ئەمین هەورامانی)٫ كاكەیی٫ بەغداد 1984ز.

67٫ (مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس)٫ یادی مەردان٫ بەرگی دووەم٫ چاپخانەی كۆڕی زانیاری عێراق٫ بەغداد 1983.

68٫ (محەممەد صالح ئیبراهیمی محەممەدی)٫ گەنجینەی فەرهەنگ و زانست٫چاپخانە مهارت٫ تهران.

69 (هینی هارۆڵد هانسن) ژیانی ئافرەتی کورد وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە (عەزیز گەردی) چاپخانەی کۆڕی زانیاری ئێراق بەغدا 1983

70 (د.مارف خەزنەدار) کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا بەغداد 1962.

71 (شەرفخانی بەدلیسی) شەرەفنامە وەرگێڕانی هەژار موکریانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس (2006).

72 (د. عزەدین مستەفا رەسوول) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی 1979.

73 (مەلا مەحموودی بایەزیدی) داب و نەریتی کوردەکان وەرگێڕانی لە رووسیەوە (د.شوکریە رەسوول) بەغداد 1982.

74 (محەممەد بەهائەدین مەلا صاحب) پیشالیاری زەردەشتی بەغدا ساڵی 1968.

75 (محەممەد سیراجوددینی نیزلی) رۆڵە بزانی شیکردنەوە تاران 1405.

76 (د. شوکریە رەسوول) پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی هەولێر 1984.

77 (محەممەد ئەمین هەورامانی) دیوانی میرزا ئەولقادری پاوەیی چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق 1984 بەغداد.

78 (محەممەد ئەمین کاردۆخی) دیوانی صەیدی هەورامی چاپخانەی کامەرانی 1971ز.

79 (محەممەد ئەمین کاردۆخی) دیوانی کارۆدخی بەشی یەکەم و هەندێ لە بەشی دووەم چاپی دووەم 1982 چاپخانە و ئۆفسێتی سەرکەوتن سلێمانی.

80 (ئەحمەد نەزیری) دیوانی مەلا حەسەنی دزلی مەردۆخی کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە چاپی یەکەم چاپخانە خرمی.

81 (ئەمین نەقشبەندی بێوەی) دیوانی هۆنراوەکانی بە ناوی بەرهەمی ژیان چاپخانەی شەفیق 1980زایینی.

82 (محەممەد ئەمین کاردۆخی) دیوانی شاهۆ کۆکردنەوە و رێکخستن بەرگی دووەم چاپی یەکەم چاپخانەی کامەرانی1980.

83 (ئەیوب رۆستەم) هەگبە و هەوارگە چاپی یەکەم 2003زایینی 2703 کوردی.

84 (ئەیوب رۆستەم) یارسان چاپی دووەم چاپخانەی ئۆفسێتی قانیع سلێمانی.

85 (کیومەرث نیك رەفتار) دیوانی بێسارانی بەغدا 1360 هەتاوی.

86 ئەحمەد خواجە چیم دی بەرگی یەکەم.

87 (بەهائەدین شێخ مەحیەدین نەقشبەندی) کورتەیەك لە ژیانی مەولانا حەزرەی شێخ حسامەدین نەقشبەندی 2002.

88 گۆڤاری هەورامان ژمارە (1) زستانی (2003).

89 (گۆڤاری بانە رۆژ) ژمارە (5) نیسانی 2004.

90 گۆڤاری رەنگین ژمارە (53) ساڵی 1993.





91ـ گۆڤاری کەلەپووری کورد ژمارە (2) نەورۆزی 1993.

92ـ گۆڤاری پەیڤین ژمارە (8) ئاداری 2000.

93ـ گۆڤاری بژوێن ژمارە (1) ساڵی 1999.

94ـ رۆژنامەی برایەتیـ ژمارە (209)ـ ئەدەب و هونەر.ـ ساڵی 2001.

95ـ دەیان وتار و لێکۆڵینەوەی خۆم کە لە بارەی مێژوو و کولتووری هەورامانەوە نووسراون و لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە.

96ـ ئەرشیفی دەساڵ بەرنامەی رادیۆیی (وەشەن هەورامان) کە هەفتانە ئامادە و پێشکەشیدەکەم و لە رادیۆی دەنگی گەلی کوردستانەوە بڵاودەکرێتەوە.

بێجگە لەم سەرچاوانە لەم بەڕێزانەش سوودم وەرگرتووە:

(دایکی خوایێخۆشبووم، مام حەمەسوور تەوێڵەیی، هونەرمەندی گۆرانیبێژ عوسمان کێمنەیی).

**لە رووی ئەمەکدارییەوە سوپاس و پێزانینمان بۆ ئەم بەڕێزانە**:

1ـ کاک جەمیل هەورامیـ چەند سەرچاوەیەکی پێداوم.

2| مامۆستا عوسمان محەمەد هەورامی| بۆ چاپی یەکەمی هەردوو بەرگی ئەم کتێبە بەرگی پشتەوەی بە پیتی لاتینی بۆ نووسیم.

3| (زەکیەخانی هاوسەری خوالێخۆشبوو مامۆستا مەحیەدین حاجی سەلیم تەوێڵەیی و کاکە زانای کوڕی)،چەند لاپەڕەیەك زانیارییان دەربارەی مێژووی ژیانی شاعیر (میرزا عەبدولقادری تەوێڵەیی) لە ناو کتێبخانەکەی (مامۆستا مەحیەدین)دا بۆ دەرهێنام، هەرچەندە لەوەتی ئەو کۆچی دواییکردبوو هیچ دەستکارییەکی ئەو کتێبخانەیان نەکردبوو، بەڵام کە من چووم بۆ لایان دەستیانەنا بە رووومەوە.

4| کاك فەخرەدین حاجی سەلیم تەوێڵەیی|چەند لاپەڕەیەکی دەربارەی ژیاننامەی (میرزا عەبدولقادری تەوێڵەیی) بۆ نووسیم.

5| کاك صبوور حەمەشەریف| لە تایپکردن و نەخشەسازی کۆمپیوتەریدا بۆ چاپی یەکەمی هەردوو بەرگەکەی هاوکاریکردم و سێ سەرچاوەشی پێداوم.

6| کاك ڕەفعەتی موورادی دشەیی| (c.d)یەکی بۆ هێنام چەندین وێنە و نەخشەی پارێزگاری کرماشان و هەندێك زانیاری لە بارەی مێژوو و کولتووری ئەو پارێزگایەوە لە بوارە جیاجیاکاندا تێدان.

7| کاك ئەکبەر کەریم هاواری| وێنەیەکی (دەروێش حەبیبی کاکەیی) بۆ پەیداکردم.

8| مامۆستا عەبدوڵا کەریم تەوێڵەیی| وێنەی مامۆستایانی شۆڕشی فوتابخانەی تەوێڵەی سەرەتایی ساڵی (1964ز)ی بۆ هێنام.

9| مامۆستا دڵشاد محەممەد مەلا صاحب | چەند لاپەڕەیەك لە ژیاننامەی مامۆستا (محەممەد بەهائوددین مەلا صاحب) ناسراو بە (دانای هەورامی) بۆ نووسیم و چەند دێڕێك شیعری بڵاونەکراوەیشی بۆ هێنام.

10| نەسرین صالح| وێنەیەکی (وەستا صالح ناسرا و بە صالح چەقۆ)ی بۆ هێنام.

11| کاك شێخ ئەمیر شێخ ئەمین| مێژووی کۆچی دوایی (شێخ ئەمین شێخ عەلائوددین نەقشبەندی) بۆ دەستنیشانکردم.

12| کاك شاهۆ شێخ محەمەد ئەمین کاردۆخی| دەربارەی بەرهەمە چاپنەکراوەکانی باوکی زانیاری پێدام.

13| کاك ئەرکان هاواری| شوێن و مێژووی کوژرانی (دەروێش حەبیبی کاکەیی) بۆ دەستنیشانکردم.

14| (مام کەریم عەبدوڵا)|چەند دێڕێك شیعری میرزا عەبدولقادری پاوەیی بۆ خوێندمەوە و تۆمارمکردن.

15| مامۆستا سەردار حەمەخان| هەندێك زانیاری دەربارەی گوندی (دەگاشێخان)پێدام.

ئومێدەوارم هەمیشە سەرفرازبن و نموونەیان زۆربێت.